

## نەرمین عوسمان

# لەبەر تریفەی مانگ خەونەکانی نیشتیمانمان دەچنی

# لەبەر تریفەی مانگ
# خەونەکانی نیشتیمانمان دەچنی


ناوی نووسەر: نەرمین عوسمان

بابەت: بیرەوەری

دیزاینی بەرگ و ناوەوە: ئومێد محەمەد

هەڵەچن: هێرش حەمەسەلیم

چاپ: چاپی یەکەم ٢٠٢٠

تیراژ: ١٠٠٠ دانە

نرخ: ٥٠٠٠ دینار

چاپ: چاپخانەی کارۆ

لەبەڕێوەبەرێتی گشتیی کتێبخانەکان
ژمارەی سپاردنی (١٤٢٧)ی ساڵی ٢٠٢٠ پێدراوە

لە بڵاوکراوەکانی ئنیستتیوتی نارین
بۆ توێژینەوە و بڵاوکردنەوە
ژمارە (١١)

## تێبینییەکی پێویست

لەم کتێبەمدا نەچوومەتە سەر باسی وردتری ئەرکە حزبییەکانم و بەشداریکردنم لە کۆنگرەکانی یەکێتیی نیشتیمانیی کوردستان، خوا یاربێت بە نیازم لە داهاتوودا لە دووتوێی کتێبێکدا بەوردی بیاننووسمەوە.

ئەوە بۆ من بەشێکی گرنگی ژیانی سیاسیمە، بۆیە بەدڵنیاییەوە بەڕاستی و دروستی دەیاننووسمەوە و چاپ و بڵاویان دەکەوە.

لەگەڵ ڕێزی زۆرم

**نەرمین عوسمان**

# پێڕست

## بیرەوەریی فرە پاڵەوان

لە سەرەتای دەستپێکردن بە نووسینی بیرەوەرییەکانییەوە جار نا جار لەگەڵ نەرمین خان لەسەر بە کۆی گەیشتنی نووسینەوەی بیرەوەرییەکانی قسەوباسمان کردووە، پێمخۆش بوو کە دەیووت لەو ماوەیدا کاتی زۆری بۆ نووسینەوەی بیرەوەرییەکانی خۆی تەرخانکردووە و دەیەوێ لەبارەی بەشداریی سیاسی خۆیەوە بەوردی بۆچوونەکانی خۆی بنووسێ و راستگۆیانە ئەوەی دەیزانێ و بینیویەتی و بەشداریی تێدا کردووە یاداشتی بکات.

وەکو رۆژنامەنووسێک لە سەرەتای کاری رۆژنامەوانیمەوە، سەوداسەرییەکم لەگەڵ خوێندنەوەی بیرەوەرییەکاندا هەبووە، بەشێکی زۆری کتێبخانەکەم بۆ بیرەوەرییەکان تەرخانکردووە. هیچم لێ نەپەڕاندوون و بەوردی هەموویم خوێندوونەتەوە، بیرەوەرییەکانی نەرمین خانیشم پێش چاپ بوونی بۆ چەند جارێک خوێندووەتەوە و سەرنجی خۆمم لەسەر خستووەتەڕوو.

جیاوازیی نووسینەوەی ئەم کتێبە لەوانی دیکە ئەوەیە، لێرە تەنیا نەرمین خان پاڵەوان نییە، لەگەڵیدا رەوانشاد دارۆی شێخ نووری مێردی، هاوڕێ و ئارام و نارین خانی کچی، لە کۆیەش ماڵە بابی (باوک و دایکی، شەهید ئازاد و هاوتای برای، نازەنین و کەژاڵی خوشکی)، جەعفەر عەبدولواحیدی خاڵی، لە ماڵە خەزوورانیشی خاڵە شەهاب و زۆری دیکە بەشێکن لە هاوبەشێتی خەباتی نەرمین خان کە رۆڵی بەرز نرخاندوون.

خاڵی جیاوازتری ئەم بیرەوەرییانە ئەوەیە لێرەدا بەدیدێکی ژنانە سەیری سیاسەت کراوە و بەشداریی کردووە و وەکو ژنێکیش خاوەن روئیای خۆی بووە جیاواز لە زۆرێک لە بیرەوەرییەکانی دیکە کە بیرکردنەوەی پیاوانەی لەسەر زاڵ بووە.

نەرمین خان هەر لە سەرەتای لاوێتییەوە بە هۆکاری ئەوەی خانەوادەیەکی سیاسی و نیشتیمانپەروەر بوون ئاشنای سیاسەت بووە، باوکی چەپێکی ئازادیخواز بووە تا دەگاتە خاڵەکانی خالید دلێر کەوا شاعیرێکی چەپی نوێخواز بوو لەگەل جەعفەر عەبدلواحید.

کە دەچێتە زانکۆ دەبێتە هاوڕێی کەسانێک هەم مارکسی و هەمیش نیشتمانپەروەر، یەکەم وێستگەی مانەوەی لە بەغدا ماڵی مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەدە و دەبێتە هەڤاڵی نزیکی هێرۆخان، لەماوەی چوار ساڵی خوێندنی زانکۆیدا خەبات دەکات، تەنانەت هەر بەهۆی سیاسەت و کوردایەتیشەوە دارۆی شێخ نوری دەناسێ و ئیتر سیاسەتکردن دەبێتە بەشێکی گرنگی ژیانیان.

لێرەوە چیرۆکەکە وردتر دەبێتەوە، لە دەزگیرانداریشدا بۆ چالاکییە سیاسییە مەترسیدارەکان دەچن، دوای پێکهێنانی ماڵ و حاڵیشیان زۆر نابات دارۆی شێخ نوری دەستگیر دەکرێ و چوار ساڵ و هەندەک لە زیندان دەبێ، ئیتر لەبری سەیران و سەفای تازە بووک و زاوایی، نەرمین خان هەفتانە سەردانی خۆشەویست و هاوسەرەکەی لە زیندانی ئەبوغرێب دەکات.

کاتێک کاک دارۆیش ئازاد دەبێ رووودەکەنە شاخ، ژیانی پێشمەرگایەتی، رۆیشتن بۆ سوریا و سەرقالبوون بە کوردایەتییەوە، لە سەهۆڵبەندانی سویدیشدا کاروانەکە ناپچڕێ، بەلکو شێوازەکەی دەگۆڕێ.
شێوازی گێڕانەوەی بیروەرییەکان سادەن، ئەم سادەییە لە نووسین و گێڕانەوە نەیتوانیوە رێگربێت لە قوڵبوونەوە لە وێستگەکانی خەباتی نەرمین خان، بەڵکو کەمندکێشت دەکات بۆ ئەوەی مێژووی نزیکەی چل ساڵی خەباتی ژنێک بخوێنیتەوە.

ئەوەی لای من جێگای سەرنجە زۆر بە کەمی نەرمین خان خۆی کردووەتە پاڵەوان، کەم وتوویەتی "ئەوەم کرد"، بەڵکو وتویەتی "پێکەوە ئەوەمان کرد"، لە کۆیەوە بۆ بەغدا، بۆ شاخ و سوریا و سوید و گەڕانەوە بۆ سلێمانی و دواتریش بەشداریی لە پرۆسەی حوکمڕانیی عیراقی دوای سەدام حسێن، نەرمین خان تێکۆشاوە، بەڵام بانگەشەی تەنیایی لە سەرکەوتنەکانی نەکردووە و بۆ خۆی تەنیا پاڵەوان نییە، بەلکو کۆششی خۆی نەخشاندووە بە هاوکاریی کەسە نزیکەکانی، لەمەیاندا سەری نەکردووە و پێکاوێتی.
لەم بیروەرییانەدا هەردوو قوناغەکەی بەشداریی نەرمین خان لە خەباتی شاخ و شار، ناخۆشی و دەردیسەری، ترس و زیندان، ئەمنەکانی بەعس لە نزیکەوە دەبینی چۆن خەڵک دەچەوسێننەوە و راوە کورد دەکەن، چۆن ژنانی کورد و شۆڕشگێڕەکان ئازار دەدەن، کۆتایی شانۆ سیاسییەکەش هەیە کە ئازادیی عیراق و نەمانی رژێمەکەی سەدام حسێنە.
لەگەڵ داوای تەمەن پانی و تەندروست بوونی نەرمین خان و بەردەوامی بەشداریکردنی لە سیاسەت و خزمەتی گشتی و چاکەخوازیی، سوپاسیشی ئەکەم متمانەی بە من هەبوو کە پێشەکی کتێبەکەی بۆ بنووسم و سەرنجەکانی خۆمی لەسەر بخەمەڕوو.

خەرمان بەرەکەت و رێزی زیاترم

**خەڵەف غەفور**

**٢٠١٩/١١/٢٧سلێمانی**

مرۆڤ كه دێته دونیاوه بیەوێ یا نەیەوێ، تووشی ململانێی ژیان دەبێ، بۆیە پێویستە بەردەوام ئامادەی رووبەڕووبوونەوە نابەرابەرەكانی ژیان بێت. رەنگە بۆ زۆربەمان چركەساتەكانی منداڵی، شیرینترین ساتەكانی ژیانمان بێ كه لەڕاستیدا ئەمە بۆ منیش هەروایە، بۆیە پێم خۆشە لە یادگارییە شیرینەكانی ئەو قۆناغە دەستپێبكەم، چونكە رەنگە ئاستەنگ و ئازارەكان، هەوراز و نشێوەكان، تاڵی و سوێرییەكانی قۆناغەكانی پاش منداڵی، من و تۆی خوێنەریش ماندوو بكەن.

ساتەكانی منداڵی و ئازادییەكانی ئەو قۆناغە سەرەڕای چێژی راستەقینەیان، تەنانەت گاڵتە و یارییەكانیشی راستەقینەتربوون لە ژیانی راستەقینەی پڕ ئاستەنگ و چەرمەسەریی هەر كەسێكمان، بۆیە پێم خۆشە لە یادەوەری و یاریيە پڕ لە چێژەكانی ئەوێ رۆژیی منداڵیمەوە، بتانبەمە نێو گەشتی یادەوەرییەكانم.

## یاریی منداڵان لە كۆڵان
## "میچەن گێزێ"

بەشێك لە یارییەكانی ئەو سەردەمەی ئێمە یادەوەرییە شیرینەكانی منداڵیی خۆمان لەگەڵیان تۆماركرد:

كەللایانێ و كەللابەردانی قورتانی، چاوشاركێ و دەستبەدیوار و راكە راكە و غار غارێن، شیشانی و ماڵەباجێن، پێنج بەردووكێی كچان، كێڵە بەردانێی كوڕان، پەلیكانێ، جگ جگێن (میچ) و پەتپەتێن، مۆری مۆریانێ و ئەلورێن، خول خولانی و مزراحین، هەدگ دگە، حووحانی، چاوبەستانی و لینگە شەلێ، سابونی رەقی، هەڵبەزین و بازدانی و تەلەفۆن بە قتووی بەتاڵ كە بە داو و دەزووی درێژ پێكەوە بەسترابوون.

یاریی كوڕان، زۆربەی لە تەل و تەنەكە و دار دروستدەكران، وەك سەیارە و ئەسپسواری و رەورەوێن بە سەری سیفۆن بە تەلێك لەناو كۆڵان پێی دەسووڕانەوە، هەندێ جار ئامێری مۆزیك بە تەنەكە و تەلی وایەری كارەبا دەكرا.

یاریی تۆپ تۆپێن (فتبۆلێن)، هەندێكجار تۆپ لە پەڕۆ یان لە لاستیكی تایەی ئۆتۆمبێل و پاسكیل دروستدەكرا پێیاندەوت (مزرووكە) سوكەڵە و تۆپی حەوت بەرگ (تۆپی تێنس) هەبوو.

بووکی دەستکردی پەڕۆ بە جلی کوردی و قلقلانە و تاسی سەری، دۆشەکۆرد و بالیفۆکە بۆ بووک و مارمارۆکە.

دروستکردنی لانک (بێشکە) و دەسترازە و جۆلانەی منداڵان لای دارتاش و هەندێکجاریش منداڵان بە پەڕۆ و دوو دارچیلکە لە کۆڵان دەیانکرد، خوانە (پنە)ی بچووک و تیرۆگ، ئاگردانێکی بچووک بۆ (شێوە قلۆکە)ی منداڵان. هەندێکجاریش یاریی مامۆستا و قوتابی یان شانۆی کۆڵان.

زۆربەی یارییەکان فت و براوە هەبوو واتە دۆڕاو و براوە، یاریی ڕێوی ڕێوی و هەندێکجاریش بە عەرەبی دەوترا: (الثعلب فات فات) کە بە دەست بەیەکادان و وتنی: (پین پان پۆست)، یارییەکە دەستپێدەکرد.

زۆرینەی ئەو یارییانەم کردووە، جگە لەو یارییە کوڕانەیەی لە کۆڵانان پێی دەسووڕانەوە. زیاتر لە هەر یارییەکی تر ماڵەباجێنەم دەکرد، هەروەها یاریی مامۆستا و قوتابی و شانۆ، زۆربەی شانۆکان خۆم ڕێکمدەخستن و ئەکتەریش بووم تێیاندا. ناخۆشترین ساتەکانی یاریکردنم، ساتەکانی دۆڕان بوو.

ئەو بەیت و باڵۆرانەی یارییەکانی سەردەمی منداڵی، هەموو لەیادەوەریمدا ماون و زۆربەیانم فێری نەوەکانیشم کردووە.

زۆرجار دایکم بووکەڵەی پەڕۆی بۆ دەکردم و بێشکە و دەسترازەی بۆ دەڕازاندمەوە. سەرگوزشتەیەک هەیە کە جارێک لە سەردەمی زۆر منداڵیمدا، بەرلەوەی بەباشی فێری قسە ببم، دەستگێڕێک دێتە کۆڵان کە نوقڵ و بنێشت دەفرۆشێت. بنێشتێک هەبووە کە ناوی ئەبوسەهم بووە و پێیانوتووە بنێشتی ئینگلیزی، کاتێک دەستگێڕەکە بانگەشەی بۆ ئەو جۆرە بنێشتە کردووە، منیش بە ڕاکردن چوومەتە ماڵەوە و ویستوومە ئەو پارەیە بهێنم کە بۆ دروستکردنی دەموچاوی بووک دادەنرا (قلقلانە)، ئەوکات لێیان پرسیوم: «چییە، بۆ وادەکەیت؟» منیش وتوومە: "میچەن گێزی"، دیارە مەبەستم ئەوەبووە کە پارەکەم پێویستە بۆ بنێشتی ئینگلیزی. ئەوە یەکێکە لەو بەسەرهاتانەی منداڵیم کە بووەتە یادەوەرییەکی شیرینی خێزانی و سەردەمانێک وەک ڕووداوێکی سەرنجڕاکێشی منداڵیم گێڕدراوەتەوە.

کەللایانی: هەڵماتێن.

کەللابەردانێ: دەستکەللا لە بەرد دروستدەکرا.

دەستبەدیوار: ڕاکردنی خێرا، کێ ئازایە زووتر دەستی بە دیوار دەکەوێ.

شیشانی: خەتخەتێن.

کێله بەردانێ: بەردێک دەکرا بەنیشانە و منداڵان یەک یەک بە بەردێکی بچووک نیشانیان لێ دەگرتەوە.

پەلیکانێ: هەلوکێن.

جگ جگێن: جگی حەیوان (میچ) وەک نیشان بەکاردەهات.

ئەلوورێن: ئەو بالۆرەیەی بۆ ئەلوورێن لە کۆیە بەکاردەهات؛ (ئەلوور بەلوور تەکامە - زەرد و سوورن شەمامە، ئارنجی بەر بازنجی - سمایلە قنجی، ئایشێ مامان - لە خۆشناوان - دەگری چاوان، چاری بە گوو - پێم تێوەرچوو - هەرگرە ئەتو).

خول خولانێ: دوو جۆر خول خولانێ هەبوو، یەکیان دەسوورِاینەوە تاکو گێژدەبووین و کێ دواکەس بوایە ئەو براوە بوو. ئەوی تر بە تەختەی بەکرە دەکرا، بە تەل دەبەسترا و دەیانسووراندەوە.

هەدگ دگە: راکردن بوو بۆ ئەو شوێنەی دەستنیشاندەکرا، ئەم بالۆرەیە بەکاردەهات: (هەدگ دگە قەمەندور کێندەر خۆشە مێرگەسۆر).

حووحانێ: لەسەر چیچەکان (ئەژنۆ) دەڕۆیشتن و خێراترین براوەبوو، ئەم بالۆرەیەی بۆ دەوترا:

حووحانێ بلی بلی
پێکەوە بچینە قەبری
قەبری تەنگ و تارە
پڕ لە مشک و مارە
مشک و مار عەزیایییە
خۆی لە رمبێ دایە
رمبی هووکە هووکە
بردیان جۆتە بووکە
بردیان بەیەخسیری
جۆتە بوکی میری
یەخسیری قەراتێ
ئەحمەد بەگمان گاتێ
دەسرۆکەی هەورییە
لە برینم پێچییە
برینی گامێشێ

بەردان دەقەرێشێ
بەردی ئەولا مارێ
بیدا لەدەسمارێ
دەسماری خشخشۆکێ
دەینی میری بەرۆکێ
میری پەڕۆک چ دەینێ
ئەرقەی گەیلانی دەینێ
بەسەر بووکی من دەینێ
بووکی من خەجیج خانە
خەجیج خانی لە دەشتێ
دوو دەسرۆکەی لە پشتێ

سابونی رەقی؛ پشت بەپشتەوە دەنووسا و یەکتریان هەڵدەگرت، ئەم بالۆرەیە بەکاردەهات:

سابوونی رەقی
پشتم تەقی
لە تەقتەقی
وەرە خوارێ بە سەلامەتی

هەڵبەزین؛ ئەم بالۆرەیە بەکاردەهات:

هەڵبەزە ئەمن و ئەتو
هەڵبەزە رەحمەت لە تو
هەڵبەزە ئەمن و ئایش
هەڵبەزە دەرپێ قایش

(دەرپـی قایش وەک جنێو وابـوو، گەر دەرپێ بە قایش بێ، دادەبـەزێ و دەکەوێتە خوارەوە، جاران دۆخین بەکاردەهات، توندوتۆڵ بووە).

قلقلانی: دەموچاوێکیان بۆ بووکی پەڕۆ دەکرد بە پەڕۆی سپی و چوار فلسییەکیان دەخستە سەری و بە قەڵەم دەموچاویان بۆ دەکرد.

دۆشەکۆرە: دۆشەکی بچووک (دۆشەکەڵە).

بالیفۆکە: بالیفی بچووک (سەرینی بچووک).

مارمارۆکە: ماڵەباجێن.

رێوی رێوی: کۆمەڵێک منداڵ دەستیاندەگرت و بەیەکەوە دەسووڕانەوە و

ئەم بالۆرەیان دەوت:

هۆ ڕێوی ڕێوی... هێی
ڕێوی بێ ئیمان... هێی
شەریکی شەیتان... هێی
کەرەکەم سمۆرە... هێی
کاغەز دەنووسم... هێی
لە باڵی مێشێ... هێی
ئەیدەم بە شەماڵ... هێی

بیدا بە (ناوی منداڵێکمان دەوت)، من خۆم زۆر ڕقم لە وشەی باڵی مێش بوو، گۆڕیبووم دەمووت: "کاغەز دەنووسم لەسەر پەلکی گور (پەڕەی گوڵ)".

الثعلب فات فات: منداڵان (کچان) بە دانیشتن و بە بازنەیی ڕیزدەبوون و کچێک دەسووڕایەوە بە گۆرانی:

پعلب پعلب، فات فات
بڑیلو، سابع لفات
یابنات یا حلوات
پعلب فات فات

دەستی دەخستە سەر یەکێک بۆ ئەوەی ڕاکات بەدوایدا تا دەیگرت ئیتر ئەو دەبووە ئەو منداڵەی دەسووڕایەوە.

– هەندێکجار ئێمە بەختەوەرتربووین لە منداڵانی تر، یارییان لە بەغدا و کەرکوکەوە بۆ ئەهێنایین، بەلام بۆمان نەبوو بیانبەینە ناو منداڵان نەوەک لێمان بشکێنن.

– یارییەکی تر، دوو کچ دەستیان دەخستە سەر دەستی یەک و کچێکی تر بەنێوانیاندا دەڕۆیشت، ئەگەر بگیرایە فت دەکرا و تێپەڕیایە ڕزگاری دەبوو.

هات هات قیتار هات، وەک شەمەندەفەر پشتی یەکمان دەگرت.

**حەمامکردن**

ئەو دەمانە ژیان وەک حەمامەکەی گەرمبوو، حەمامی گەرمی ماڵان، زۆربەی ڕۆژی هەینی بوو. حوشترە حەمامیش هەبوو، تەنیا تەشت و جام و سابون بوو. بۆنی دوکەڵی دار، یان دەنگی پەرەمێز، نیشانەی خۆشووشتن

بوو. منداڵان یەک بەیەکمان وەک مریشک ئاوەڕووت دەکراین، پەڕوباڵیان دەکردین. دادەنراین تا بخوسێین و بەتوندی و بەخواستی دڵی، دایک سەری دەشووشتین.

ئەو سەرە فەقیرە، دەیانسووڕاند و دەیانبرد وەک قومقۆمەکەی (قۆرییەکەی) عەلادین بۆ چڵک لێدەرکردن.

کەفی سابونی رەقی، لوت و دەمی دەگرتین تا هەناسەی لێدەبڕین، بۆ دڵنەواییش. دایک دەیوت: «ئەها بۆرییم نەهێشتن و سپی و پەمەییم کردن»، خۆ ئەوەندە توند دەشۆراین رەشپێستیش بووینایە رەنگەکەی لادەبردین.

بە لەچکێکی توندوتۆڵ لای عەلادین دادەنراین، بە زستان بۆمان نەبوو بجووڵێین و سەر لە دەرگا دەربێنین.

جارجاریش دەبراین بۆ حەمامی دەرەوە (گەرماوی گشتی) لەو حەمامانە (حەسەنە ئاغا، ناوەندێ و پیسکان). بەتایبەتی رۆژێک پێش جەژن یان لە کاتی منداڵبوونی یەکێک لە خزمان یان لەگەڵ بووک دەبراین.

دوای حەوت رۆژ لە منداڵبوون، خزمان کۆدەبوونەوە بەیەکەوە لەگەڵ (ژنە زەیستان) دەچووین بۆ حەمام، دایکی منداڵەکە و منداڵانیش دەستمان لە خەنە دەگیرا و لەشی زەیستانەکە بە (خەنە و هەزوا) دادەپۆشرا پاشان لە دەرەوە دەشێلدرا و دادەپۆشرا.

حەمامی دەرەوە بۆنی هەڵم و سابونی رەقی و گڵەسەری هێشتا لە لوتمایە. زۆرجار ئارەزووم بوو خۆم خۆم بشۆم، دایکم دەیوت نابێ، خۆت پشیلەشۆر دەکەی (واتە نازانی خۆت بشۆی و پاکنابیتەوە). هەندێ ماڵیش سەرشۆرێکیان هەبوو لەشێوەی حەمام بوو.

لە پۆلی پێنجی سەرەتایی، بۆ یەکەمجار بوو شامپۆ ببینم و بیکڕین و بەکاریبهێنین، لەئۆرزدیی بەغدا کڕیمان، شامپۆکە ناوی (جاکۆ) بوو، دایکم یەک کارتۆنی کری.

شانەش، شانەی داربوو، دۆمەکان دەیانهێنا و دەیانفرۆشت، لەلای دوکانداریش دەستدەکەوت. ئەو شانە دارە لە کاتی سەرشووشتن دەخرایە ئاوی گەرم. بەمەبەستی ئاسانکردنی داهێنانی قژ، هەموو قژ داهێنانی هاوارمان لێ هەڵدەستا. هەر ئەو جۆرە شانەیە هەبوو، رۆژانە بە تەڕکردن قژی پێ

دادەهات. دوو لای هەبوو، لایەکی شاش و دان گەورە، لاکەی تری ورد و چڕ، هەندێکجار بەشێوازێکی هونەری لا وردەکەی شانەکە بە دەزوێکی باریک رایەڵە دەکرا و قژی منداڵیان پێدادەهێنا بۆ ئەوەی ئەگەر ڕشکی هەبێ بەو شێوەیە لاببرێ. زۆر درەنگ شانەی پلاستیک هات.

## شەوانی زستان

### شەوچەرە، چیرۆک، حەیران

ئەوکاتەی منداڵبووم، زۆرجار شەوانی زستان کەسوکار کۆدەبوونەوە و شەوەکانیان بەشێوەی جیا جیا بەڕێدەکرد.

ئەم خواردنانەش زۆر باوبوون: گوڵەبەڕۆژە و ناوکە شوتی و کوولەکە و نۆکی برژاو، بەوانەیان دەوت برێشکە. قەزوان و گوێز و بادەم و چەقالە و گەنمی برژاو و دەنکە کاڵەکی برژاو، بەڕووی برژاو کە زۆرجار دەتەقی و بڵاودەبووەوە، زۆربەیان کۆکراوە و دەستکردی ماڵەوە بوون.

دایکم، هاوینان بە عارەبانە شوتی و کاڵەکی دەکڕی بۆ دەنکەکەی، تۆوەکەی بە ئێمە دەردەهێنا و کە تاقەتمان دەچوو دەکەوتینە شەڕەشوتی و لە دەموچاوی یەکمان هەڵدەسوو، کە یارییەکە درێژەی دەکێشا، دایکم بە توێکڵە شوتی ئەکەوتە لێدانمان و ئێمەش ڕاماندەکرد.

شێلمبەترش و شێلمی کوڵاو و تووری جنراو، تەڕۆزی (ترۆزی) و ئاروو (خەیار) و هەندێ میوەش وەک هەنار (چاڵە هەنار) و لەپارە دادەنران.

قەسپ و مێوژ و خۆشاو و کاکڵە گوێزی خۆشناوان، برمان، حەڵوای زەرد (تاعین)، باسوق و لەتکە میوەی وشک دائەنران و بەپێی بوون و توانا، لەگەڵ قاوە و چایی سەر ئاگردان دەخوران و دەخورانەوە، لە ژووری دانیشتنی ماڵی باپیرم، بە دەم چیرۆکی چیرۆکخوانەوە، ئێمەش لە هەموو ئەو خواردنانە بەشمان هەبوو.

لەو چیرۆکانەی کە لەبیرمن (ئەهنەسا و مەهنەسا، شەهرەیار و شەهرەزاد، ڕۆستەمی زاڵ، عەلی بابا و چل دزەکە و خوێندنەوەی شیعری حافیز، ئەمیر ئەرسەلان... هتد). هەروەها دایکیشم هەندێ چیرۆکی دیکەی بۆ دەگێڕاینەوە وەک: (مەڕۆکە و بزنۆکە، گورگ و گەلاوێژ، مریشکەقوندە، دەنکە هەنارە، کچە پاشا، پیرێژن و مام ڕێوی).

هەندێکجاریش وتنی حەیران و لاوکی کوردی یان قۆریاتی تورکی بوو، ئێمەی مندالبش بەبێ دەنگ گوێمان دەگرت تا خەو بەلایدا دەبردین.

**چاڵە هەنار**: هەنار بۆ زستان لەناو پوش هەڵدەگیرا، یان هەڵدەواسرا.

**لەپارە**: قەزوانی کوتراو و تووی کوتراو و گوێزی هارِراو بەیەکەوە تێکەڵ دەکران، وزە و گەرمییەکی زۆری دەبەخشییە جەستە، زۆرجار کاروانچییەکان لەگەڵ خۆیان دەیانبرد.

**خۆشاو**: میوەی وشک دەخرایە ئاوی شلەتێن و گەش دەبۆوە وەکو مێوژ و هەنجیر.

**برمان**: دەنکە هەناری وشککراوە دوای بەسرکەکردنی هەنار (روبەهەنار) تەڕ دەکرایەوە.

**قاوە**، بە خاوی (بە کاڵی) دەکڕدرا و لەماڵەوە لەسەر ئاگر دەیانبرژاند، بە هاوەن دەکوترا و بۆنەکەی ماڵی پڕ دەکرد.

## نانی بەیانیی ماڵان

جایەکی شیرین، ماست یان پەنیر،

شیری کوڵاوی (فرێش).

پەنیر، چەند جۆرێکی هەبوو. پەنیری بەهاران سوێر دەکرا و لەناو خوێیاو لەگۆزەدا هەڵدەگیرا، شەو دەیانخستە ئاوەوە بۆ ئەوەی سوێرییەکەی بڕوات و بەیانیان لە رەندە دەدرا. پەنیری سەلک و پەنیری ژاژی، پەنیری پێستە، زۆرجار ژنە بۆری دەیانهێنایە ناوشار و دەیانفرۆشت، شیر و ماستیش ژنێک لە دەشتی کۆیە دەیهێنا ناوی یورە هەمین بوو، گوێزیش بە ژمارە پێمان دەدرا و ساڵانە بە هەزاران وەک زەخیرە هەڵدەگیرا.

ئەستووکە بە رۆن (کولێرە بە رۆن)، زۆر باو بوو، پێخۆری نەدەویست. رۆژانی هەینی نانی بەیانی تایبەت بوو، لەبری ئەستووکە بە رۆن، ئەستووکی بە قیمە و هێلکە یان باسترمە و هێلکە دەکرا، یان هێلکە و قاورمە، هێلکەش خەڵکی لادێ دەیانهێنایە ناوشار و دەیانفرۆشت، هەمان ئەو ژنە ماستفرۆشەی ماستی بۆ دەهێناین، هێلکەشی بۆ دەهێناین.

رۆژانی نانکردن، ناسکەنانیان بۆ دەکردین، یان ئەستووکە بە شەکر کە تایبەت بوو بە منداڵ، کونجی بۆ ئەدرا (دەبرژا) و دەکوترا و لەگەڵ دۆشاو تێکەڵ دەکرا (وەک راشی ئێستا وابوو). زۆربەی کات نان تەنیا نانی تیری بوو، هەتا نانی کۆنیش هەبوایە نانی تازەمان بۆ نەدەڕشا. منداڵ، ماست و شەکری بۆ تێکەڵ دەکرا، شیری قوتووش پەیدا بووبوو.

بیرمە لە ساڵی ١٩٥٧ کە فرنی سەمون هاتە کۆیە، کوڕێکمان لابوو کاریدەکرد لەجیاتی سەمون دەیوت (بەمون) ئەو کوڕە خەڵکی سێوسێنان بوو، شەش ساڵ لامانبوو، ناوی حەمەد بوو، زورجار نانی بەیانی ئەو ئامادەی دەکرد.

هەندێکجاریش مرەبا دروستدەکرا، بەتایبەتی مرەبای کەباد، بۆ نانی بەیانی دائەنرا و جار جاریش هەنگوین هەبوو.

ژنە بۆری: بۆڵی؛ عەشیرەتێک بوون لە ناوچەکانی رانیە و قەڵادزێ دەژیان، لە کۆیە پێیاندەوتن: بۆری.

**شەوانی هاوین**
**نووستن لە سەربان**

نووستن، لە سەربانی گڵ بوو، چیغ هی ماڵان و چرپا و کوللە بۆ تازە بووک بوو. تەختەبەند بە چیغ دەور ئەدرا، چەند کەسێکی لەناو دەخەوت. هەندێ چیغ سادە بوون، هەندێکیش بە بەنی رەنگاورەنگ دەچنران، بە نەخشی جوان، پێیاندەوت: ئەسپەرەپێچ. لەدواییدا ئێمە چیغمان نەما، سواندەی دیوارەکانی سەربان بەرز هەڵچنرابوون و دیار نەدەبووین لە دەرەوە.

سەربانمان بە ئاو دەرشاند، بۆنی گڵەکە چێژی خۆی هەبوو، هەر زوو ئێوارە جێگاکانمان رادەخست، بۆ ئەوەی فێنک ببنەوە، بەیانیانیش لەبەر گەرمیی هەتاو زوو هەڵماندەگرتنەوە.

لەسەر سواندەوە قسە و دەمەتەقێمان لەگەڵ دراوسێکان دەکرد. شەربەی ئاوی ساردکەر بە کڵاوێکی چنراو لەگەڵ جامێکی فافۆن وەک ئاوێنە ئەدرەوشایەوە، لەسەر سینییەک دامانئەنا، ئەگەر شەو تینوومانبوایە، قوڕەی شەربە بەئاگایدەهێناین.

شووتی و کاڵەک و ترێ، لەسەر سینی و لەسەر دیوار بەمەبەستی ساردکردن دائەنران. پێخەو زۆربەی کات جاجم بوو، زۆر زبر بوو، من پێمخۆش نەبوو، هەموو گیانم پێی دەخورا، دایکم بەرگی بۆ تێگرتبووم، تا بەتانی پەیدابوو، کلیم-یشر هەبوو کە لەژێر دۆشەک دادەخرا.

ئەستێرەکان لە ئاسمانێکی ساف و بێگەردا ئەدرەوشانەوە، هەریەکەمان ئەستێرەیەکمان کردبووە هی خۆمان، ئەستێرەکەی من ئەستێرەیەکی بچووکی لای دوودە ئەستێرەی حەوتەوانە بوو، هەموو شەوێ شەوباشم لێدەکرد و ئەم بەیتەم بۆ دەوت: (حەفتەوانەی حەفتی شەوێ حەفتەکەی قوتبی شەوێ ئاگات لە ئەستێرەکەم بێ) ئەوسا دەخەوتم. هەندێکجار من و ئازادی برام دەمانکرد بە حەوت برا و خوشکێکی بچووک و چیرۆکمان بۆ هەڵدەبەستن.

بەیانیانیش زوو رووناکی و مێش تەنگی پێهەڵدەچنین و دەچووینە خوارێ بۆ کاروانی رۆژی دوایی.

لە کۆیە رەشەبایەکی ناخۆش زۆربەی شەوان لەخەوی دەکردین و دەم و چاومان پردەبوو لە خۆڵ.

دوو خوێندنگای کچان لە کۆیە هەبوون، یەکیان بە زمانی کوردی بوو، ئەوی تریان بە زمانی عەرەبی. من بەهۆی ئەوەی باوکم مامۆستا بوو و لەگەڵ ئەو دەچووم بۆ دەوام، خستیانمە خوێندنگای عەرەبی بەناوی مەکتەبی ئامینە، بەڕێوەبەرەکەمان مامۆستا خانە بوو، پێماندەوت: (ست خانە) بەرانبەر بە خوێندنگاکەی باوکم بوو. ڕۆژانە تا تۆزێ گەورە بووم، لەگەڵ باوکم دەرئەچووم، بەڵام لە یەکی سەرەتایی کۆڵبەریان بۆ گرتبووم بۆ ئەوەی هەڵمبگرێ، چونکە تەمەنم کەمبوو کە چوومە بەر خوێندن، ئەوکات زۆربەی مامۆستاکانمان موسڵاوی بوون.

خوێندکارێکی سەرکەوتووبووم، لە پۆلی شەشی سەرەتایی، لە تاقیکردنەوەی گشتی لە کۆیە لەسەر ئاستی کچان بە یەکەم دەرچووم.

جلوبەرگی مەکتەبمان کراسێکی ڕەش و قردێلەیەک و یەخەیەکی سپی بوو، دەبوایە ئوتووکراو بێ، زۆرجار بە ئوتووێکی ئاسن کە لەسەر سۆپای عەلادین دائەنرا بۆ گەرمبوون، ئوتوو دەکرا. پێڵاویش زۆربەی جار پاتە بوو، جانتاش لە پەڕۆ بوو، کوڕانیش بێ جانتا بوون.

ئەوسا لە خوێندنگا خواردن هەبوو، شیر و پسکیت و پاروویەکی نۆک و هەندێکجار حەبێکی ڕۆن ماسییان ئەداینێ زۆر ڕقم لێی بوو، بۆنی ماسی لێدەهات و قرقێنەی ماسیمان دەهێنایەوە.

هەندێکجاریش قوماشیان دابەش دەکرد، زۆرم ئارەزوو بوو وەریبگرم، بەڵام لەبەرئەوەی باوکم باری ئابووریی باشبوو نەیانئەدامێ.

ڕۆژانی پێنجشەممە سڵاوی ئاڵا (تحیە العلم) هەبوو، دەیانهێنام بۆ ئەوەی هۆنراوەی نیشتمانی بڵێم کە زۆربەیان باوکم فێری کردبووم.

یەکێک لەو وانانەی کە زۆر باشبووم تێیدا، ماتماتیک بوو. لە شەشی سەرەتایی بە بۆنەی ئەوەی بە یەکەم دەرچووم، حکومەت (منجد) قاموسێکی زمانی عەرەبی پێبەخشیم، زۆر دڵخۆشی کردم.

خواردنی بەر دەرگای خوێندنگا، شیرینی و کونجی و گەزۆ و شرووبیی ئارد (شەکر و ڕەنگ و ئاو دەکوڵێنرا، دوایی لەسەر سینیی ئارد کە بەبنی پیاڵە قووڵ دەکرا و شروبەکەیان دەخستە سەر و دانە دانە دەفرۆشرا)، نوقڵ پێیاندەوت: (شەکرۆکە) لوقم پێیاندەوت: (حەلقوم) لەناو پسکویت دائەنرا، لەدواییشدا عەریج پەیدا بوو. هەروەها بەلالووک هەبوو کە لە وەرزی خۆیدا لەبەردەم خوێندنگادا دەفرۆشرا، (بەلاڵوک، میوەیەکی ورد و بچووکی نیمچە تەڕی کێوییە، لەسەر پەڕەیەکی کاغەز دادەنرا، بەدەستمانەوە دەگرت و دەمانخوارد).

ئەو دەمە کە سەیری خوێندکاری گەورەمان دەکرد، هەندێکجار هەستماندەکرد کوڕ و کچەکان دەربڕینی خۆشەویستییان هەبوو، کە بەم شێوە سادەیە هەستمان پێدەکرد: بروسکەیەکی چاوی کوڕ، زەردەخەنەیەکی لێوی کچ، گوڵێکی وشکی ناو کتێب، وەستانی سەری کۆڵان، یا سەربانە قوڕەکان، یا بەر دەرگای خوێندنگا بوو، پیاسەی گۆڕەپانی خوێندنگا، قۆڵیان لە قۆڵی یەکتری، بەدەم خواردنی سماقەوە، بەفسکە فسک و حریتەوە (پێکەنین)، باسی هەموو شتێکمان دەکرد.

خوێندن دوو دەوام بوو، بەیانیان و نیوەڕوان. بەیانیان دەچووین و دەگەڕاینەوە بۆ نانخواردنی نیوەڕۆ و جارێکی تر دەگەڕاینەوە بۆ خوێندنگا، زۆربەی وانەکانی دەوامی دووەم هونەریی بوون، فێری ئیشی دەست و کاری ماڵ و چێشتلێنان و سفرە رازاندنەوە دەکراین، هەموو جۆرە کارێکی دەست لەوانەکاندا هەبوون.

### ئەوێ رۆژێ و دراوسێ

ئەو دەمانە پڕبوون لە متمانە، دەرگای ماڵەکانمان لەسەر پشت بوو، کلیل و قوفڵ زۆرکەم بوو، بۆ چوونە ناو ماڵە دراوسێ، یەک تەقولباب بەسبوو، بە نموونە؛ ئەگەر کەسێک لە دەرگای ئێمەی بدایە، دایکم هاواریدەکرد «ئەوە کێ هات؟، فەرموو وەرە سەرەوە لە (فلان) ژوورم».

ئەگەر دراوسیەکی تازەشمان بهاتایە، گەڕەک دەبوایە بۆ بەخێرهێنان، خواردنی نیوەڕۆیان بۆ بەرببکردایە، درواسێ خۆیان بە خزم و کەسوکاری یەکتری دەزانی، لە خەم و خۆشیدا بەشداریی یەکتری دەبوون، کاری هەرەوەزیی بەتایبەتی لە کاتی زەخیرەی زستاندا ئەنجامدەدرا.

زۆرجاریش لە هەندێ گەڕەک ژنان و منداڵان لە دەرەوە دادەنیشتن و باسوخواسی دونیا دەکرا و منداڵیش بەیەکەوە یارییان دەکرد. خواردنیش لەنێوان دراوسێدا بەشدەکرا، ئەگەر خواردنێکی خۆش یان دانسقە بوایە، ئیشی من بوو خواردن ببەمە ماڵە دراوسێ. ئاخر من گەورەترینی نێوان منداڵەکان بووم، هەندێکجاریش لەگەڵ دایکم مشتومڕم دەکرد، دەموت: «دەیبەمە فلان ماڵ»، داکیشم تووڕە دەبوو، جنێوێکی هەبوو دەیوت: «(دێرە سەگ) برۆ کوت پێ دەرێم وابکە».

هەندێ کولتووری جوان لەو سەردەمەدا هەبوو. هاوسێ، هاوبەشی خۆشی و ناخۆشی یەکتری بوون، بە کردەوە لە ئێستا گەرموگوڕتر بوو. لە کاتی پرسەدا، سفرە دەبرایەوە بۆ لای پیاوان و ژنان، خواردن بۆ ماڵی خاوەن پرسە لەسەر

سینی (ئاسن جاو) دەبرا، بە خاولییەک (پەشتەمار) دادەپۆشرا و ژن یان پیاوی ماڵەکەش لەگەڵی دەچوون بۆ ماڵی پرسەکە.

لەکاتی بووک بردن و منداڵبوون و ماڵ پێکەوەناندا، لەنگەری دەبرایەوە بە هەمان شێوە، بەڵام بە تارایەک یان دەسرۆکە سینییەکە دادەپۆشرا، بۆ لەنگەری هەر رۆژە ماڵێک دەیبردەوە، بەڵام بۆ سفرە زۆربەی خزمان هەر سێ رۆژی پرسەکە دەیانبردەوە و حەماڵ هەبوو بۆ بردنەوەی لەنگەری و سفرە.

**تەقولباب:** لە شێوەی دەست و برونزی یان ئاسنی رەش بوو، لەسەر دەرگا دائەنرا لەبری زەنگ.

**تارا:** قوماشی ئاوریشمی رەنگاورەنگ، بەزۆری قوماشێک بوو پێیاندەوت: قەنەوز.

## هەرموەزی و زەخیرەی زستان

ساوار کوڵاندن سرووتی خۆی هەبوو، کارێکی هەرەوەزیی بوو، لە کۆڵان یان لە حەوشەی ماڵە گەورەکان بە مەنجەڵی گەورە گەنم دەکوڵێنرا، دەبوو بە دانوولە، بەتریانە (سەبەتەی قوولینە) دەبرا بۆ سەربان لەسەر چەرچەف و جۆدەلی دادەخرا، بەمەبەستی وشککردنەوەی و بە تەڕی هەندێک دەبرا بۆ ماڵان، پێیاندەوت؛ دانوولە. کاری منداڵانیش دەرکردنی کێشکە (چۆلەکە) بوو لەگەڵ تێکدانی گەنمە کوڵاوەکە. دوای وشککردنەوە، پاکدەکرایەوە لە بەرد و زیوان، کاری دەستەکۆمەڵی بوو.

ساوار و بروێش و قەرەخەرمان لە ماڵان بە دەستاڕ دەهاڕدرا و گەنمەکوتاویش بە جۆینی بەرد و دەسکەوانە کە کوتەکێکی گەورەی داربوو سەرەکەی بزمارڕێژ کرابوو، هەموو لێدانێک ئەو پیاوەی کارەکەی دەکرد هاواری دەکرد و دەیوت: «های یائەڵڵا».

ئەو ئاردە ساوارەی لە کاتی هاڕینی ساوەرەکە بەدەستاڕ پەیدا دەبوو، یان ئاردی قەرەخەرمان، لەگەڵ شەکر بۆیان تێکەڵ دەکردین، پێیاندەوت (قاوت) و دەیاندا بە ئێمەی منداڵ، ئەوەندە وشکبوو دەمی دەگرتین، قسەیەکمان بکردایە وەک ئەوە وابوو رەشاش دەستریژ لێ بدا، لەدەمەوە دەردەپەڕی، بە کوکەیەکیش ساوارڕشێنی دەوروبەرمان دەکرد، زۆر جار ختووکەی یەکمان ئەدا بۆ ئەوەی پێبکەنین و لەدەممان دەرپەڕێ.

ئاردە ساوار لەگەڵ ئاردی برویش تێکەڵ دەکرا و تەڕ دەکرا، پیاز و کەرەوز و هەندێ خوێ و بیبەری ڕەشی تێدەکرا و دەشێلدرا و دەکرا بە ئەستوکە (کولێرە) ساوار، لە تەندور یان لەسەر سێڵ (ساج) دەبرژێنرا، دایکم لەو جۆرە خواردنانەدا زۆر شارەزابوو، تاقەتێکی باشی هەبوو بۆ خواردن دروستکردن و زۆرجاریش خۆی شتی نوێی تێکەڵ دەکرد، حەزی لە خواردنی تیژبوو، بۆیە بیبەری تیژی زۆر بەکاردەهێنا، ئەگەر بشمانوتایە: «تیژە»، دەیوت: «کوا تیژە؟ تۆزێکم بیبەر (دەلوچە)م تێکردووە»، لەڕاستیدا زۆرجار خۆشی لەبەر تیژیی بۆی نەدەخورا.

ئاوی تەماتە (دۆشاوی تەماتە) و لەتکە تەماتە، سەربانیان دادەپۆشی، لەناو سینی ریز دەکران، دیسان تێکدانی ئیشی ئێمەی منداڵ بوو.

وشککردنەوەی کدوو (کولەکە) و باینجان و پەلکەمێو (گەڵامێو) بۆ شلە و یاپراخ بوو. باینجان و کولەکە دەردەهێنرا بۆ یاپراخ، بەسەر قامیشی چیغەوە لەسەربان وشک دەکرایەوە، یان هەر لە سەربان وشکماندەکردەوە، لەسەر رست یان تریانە (سەبەتە) داماندەنا.

بامیەش بەپەتەوە دەکرا، بەمەبەستی وشککردنەوە، بۆ لەتکە نۆک، نۆکی بچووک دەشورایەوە و دەخووسا دوایی وشکدەکرایەوە و بە دەستاڕ لێدەکرا، قاورمەی گۆشتیش دەکرا و دەخرایە گۆزەوە بۆ زستان.

ئەستووکە بە چزڵیک (چزیلک) دەکرا، بە وردەی چەوریی دوگ و قاورمە، ناسکە نانیان پێ دەکرد و پێیاندەوت: «ئەستوکە چزلیک».

ئەوسا (هەرشتە) هەبوو، بۆ چەند خواردنێک بەکاردەهات، لەگەڵ ساوار یان خواردنی تایبەتی خۆی، فەقێ عەیشێ و یاساری دیان (مەسیحیی) بوو، هەرشتەیان بۆ دەبڕینەوە و سووریان دەکردەوە.

ئەویش هەر قاوتیی هەبوو دوای برژاندن، هەندێکجاریش ماڵی پوورم (پوورە هەیبەت) کە لای دایکم زۆر خۆشەویست بوو، زەخیرەی زستانیان بۆ ئامادە دەکردین و بایبریشم کە زۆر شارەزابوو گەنمەکەی بۆ دەکڕین.

**جۆدەلی**: سەرەپارچەی قوماشی بچووک لێک ئەدرا و پارچەی گەورەی لێ پێکدەهێنرا.

له خۆراک و چێشت، لەگەل هەموو شارەکانی تر هاوبەشیمان هەبوو، هەندێ چێشت هەبوون باو بوون له کۆیه و له شوێنەکانی تر کەمتربوون و سادەبوون، بەشی زۆری له ئێواران دەکران، ئەوانەی لەبیرەوەریمدا ماون و له ماڵی ئێمەدا ئامادەکراون و زۆرجار یارمەتیی دایکم ئەدا له ئامادەکردنیاندا، چونکه دایکم زۆر حەزی دەکرد هەموو شتێک بزانم و فێربم، هەمیشه دەیوت: «کچم، دونیا هەوراز و نشێوی زۆره، تا زیاتر بزانیت هێشتا کەمه»، به هاوکاریی یادەوەریم ئەمانەبوون:

جلبرۆکه، سپیاۆکه، شلکێنه، پیرخەنیله، گەنم و سرق (سڵق)، کاردی (کاردوو)، هێلکه و قاورمه، تورگه (تۆڵەکه) و رۆن یان سرق (سڵق) و رۆن، ترشۆکه، دۆشاو و رۆن، مزەوره، گیا برژای، جورجی، دۆینەی به پونگان، برنج به شیر، قوڕاو، کەنگر و ساوار، چۆله یاپراغ، تۆڵەکه به ساواره شله، ژێر چەنه.

کفتەی جوولەکان: ئەم خواردنه، زۆر تایبەت بوو له ماڵی ئێمه، کەم ماڵیش ئەم چێشتەی لێدەنا.

حەفت ترینگه: کولەکه و باینجان و سڵق و پیاز و شوێت و کەرەوز و دۆشاوی تەماته به برنج کەمێک خەست دەکرایەوه و هەندێکجار بیبەری تیژی تێدەکرا و به شلی دائەنرا.

هەرمێل: (جۆرێکه له کەلانه به قوڕاده دەکرێ) قوڕاده، سەوزەیەکی خۆڕسکه، تامی تێکەڵەیەکه له کەوەر و پیاز.

جلبرۆکه: پیازی جنراو، رۆن، هەرشته، دۆشاوی تەماته، هێلکه، خوێ و بیبەری رەش (ئاڵەت).

سپیاۆکه: پیازی جنراو، رۆن، هەرشته، هێلکه، خوێ و بیبەری رەش.

شلکێنه: هەویری شل، به رەحەتیی بەسەر سێڵێ (ساجی) چەورکراودا دەکرا و دەبرژا، دوایی رۆن یان دۆشاویان بەسەردا دەکرد.

پیرخەنیله: ساواری ورد و پیازی سورەوەکراو به شلی لێدەنرا (وەک شله ساوەر).

گەنم و سرق (سڵق): گەنمەکوتاو، سڵق، دۆشاوی تەماته و سماقاو.

کاردی: گەنمەکوتاو، کاردی خۆشکراو و سماقاو.

ترشۆکە: ئاوی هەناری ترش، خەیاری جنراو، تەماتەی جنراو، پیاز، خوێ و بیبەری رەش، نانی تێدەگوشرا.

دۆشاو و رۆن: دۆشاوی ترێ لە رۆندا سووردەکرایەوە و نانی رەقی تێدەکرا، هەندێکجار بۆ چاوبەستی منداڵ پێیاندەوت؛ پاقلاوەی کوردی.

گیا برژاوی (برژاو): کۆمەڵە گیایەکی دەشتی بەهاری، دوای پاککردنەوە دەخرایە سەر سێری (ساج) گەرم، ورد ورد بەخوێیاو تەڕ دەکرا تا دەبرژا.

مزەورە: برنج، پیاز، دۆشاوی تەماتە و پونگە، بە شلی لێدەنرا.

جورجی: پەنیری سوێر دەخرایە ئاوی گەرم و دوایی لەڕۆندا سووردەکرایەوە.

دۆینەی بە پونگان: گەنمەکوتاو، ماست و پونگە.

قوڕاو: ماستی بۆن سۆ، گۆشتی مەڕ، جاترە و تەڕەپیاز.

کەنگر ی ساوار: بەشلیی لێدەنرا و هەندێکجاریش جزلیکی (دونکی سوورەوەکراو)ی تێدەکرا.

چۆلە یاپراغ: بە قاورمە زیاتر دەخورا، سلق و شوێت و پیاز، ورد دەکران و برنج و خوێ و بیبەری رەش و قاورمە، هەمووی پەل بەدوای پەل لەمەنجەڵدا ریزدەکران و بە سماقاو ترش دەکرا.

تۆڵەکە بە ساوار: بە شلیی دەخورا، پیازی وردکراو، تۆڵەکە، ساوار، خوێ و بیبەری رەش.

ژێر چەنە: سەری گوێرەکەی پاکراو، ورد دەکرا و دەکرا بە تەشریب، وا باو بوو زۆر جار لە سەیرانان دەخورا.

(رەنگە خواردنی تایبەتی تر هەبێ، بەڵام من ئەوەندەم لەبیرە و دەمەوێ ئەوەندەی یادەوەریم یاریدەم ئەدات تۆماریان بکەم).

مەنجەڵەکان زۆربەی مس بوون، ساڵانە لای مسگەر سپیدەکرانەوە کە کارێکی زەحمەت بوو. برنج زۆربەی لەسەر ئاگر لێدەنرا، دەیانوت؛ لەسەر تەباخی نەوت بۆنی نەوت دەگرێ و جوان دەرناچێ.

### سەیران و سەیرانگا

«مرازمان گیرا دەبێت»

سەیرانە نزیکەکانمان لە ناوچەی حەمامۆک و ئۆمەر خوچان، چنارۆک، هەیبەت سوڵتان و تاتووکان و کانی غەریبان، هەرمۆتە و سێتاقان بوو، هەندێکجار دەچووینە میکوکا وماڵی باپیرم لەوێ رەزیان هەبوو.

ساڵی جارێکیش دەچووین بۆ حەمامٌ جەلی کە پێیاندەوت گەڕاوان و ئاوی کبریتی هەبوو، دەشچووینە ئەسحابان.

ئەو شوێنە دوورانە یا بە ولاخ دەچووین یا بە پاسی تەختە، ئۆمەرمەندانیش دووربوو هەر بە پاسی تەختە بۆی دەچووین.

رۆژانی چوارشەممە، ژنان پاشنیوەڕۆ دەچوونە باپیر فەقێ ئەحمەد، لە گردی قشڵە بوو (قشرە) بۆ نزاکردن.

بەردیان بە کێلێکەوە دەنووساند ئەگەر بیگرتایە دەیانوت: «مرازمان گیرا دەبێ» و دڵیان خۆش دەبوو، ئێمەی منداڵیش بە دڵخۆشییەوە لەگەڵیان دەبووین.

### جەژن و یادەوەرییەکانی

**«چاوەڕێ دەبووین دەست بە گیرفاندا بکەن»**

کاتەکانی رۆژانی جەژن زۆر خۆشبوون بۆ منداڵانی گەڕەک، دایکم زۆرکەم دڵی دەهات بماننێرێتە ناو قەرەباڵغی، یان دەبوایە کەسێکی گەورە پەیدابکات و لەگەڵمان بینێرێ بۆ (چەرخ و فەلەک). ئەو یارییانەی کە لێی بوون؛ جۆلانێ و حندرحۆ و چەرخ و فەلەک، ئەوسا لە گۆڕەپانی لای حەمامی ناوەندێ و حەمامی پیسکان دائەنران. چێشتلێنانی یەکەم رۆژی جەژن، بەیانیان بوو، تائێستاش ئەم کلتوورەمان تێکنەداوە.

جلوبەرگ و پێڵاوی تازەمان بۆ دەکرا، دەستیان لە خەنە دەگرتین بەتایبەتی نازەنینی خوشکم زۆری حەز لێبوو.

دڵمان خۆش دەبوو میوان بهاتایە، چاوەڕێ دەبووین دەستبکا بە گیرفانیدا و شتێ پارەی جەژنانەمان بداتێ. کولیچە و پاقلاوە و چەرەسات دائەنران، سەردانی خزمان و ماڵە گەورەکان دەکرا.

**بووک گواستنەوە و هاوسەرگیری**

**حەوت شەو و حەوت ڕۆژ ڕەشبەڵەک بوو**

چەند جۆرێک گواستنەوە هەبوون، هەیانبوو یەکسەر لەگەڵ بەربووکێک (ژنێک تایبەت بوو بەو کارە)، دەیانبردە ماڵی زاوا کە زۆربەی کات لەگەڵ ماڵی باوکی کوڕە بوون، زۆربەی ماڵە هەژارەکان یان بێوەژن بەو جۆرە دەگواسترانەوە. جۆرێکیش هەبوو لە ماڵی بووکێ دەبرایە ماڵی زاوا دوو کەس پیلی (قۆلی) بووکیان دەگرت، ژنانی خزمان بەدەسرۆکەوە لە پێش و پشتی بووکەوە بەسەماوە دەڕۆیشتن، پیاوێکیش ئاوێنەیەکی گەورەی لەسەر کۆڵی خۆی لەبەردەم بووک هەڵدەگرت و ڕێیدەکرد.

جیازیی بووک لەناو تریانە (سەبەتە)، لەم دیو و ئەودیوی بووک بەسەر شانیانەوە هەڵدەگیراو دەبرایە ماڵی زاوا، بە تارایەکی سوور دادەپۆشرا.

زۆربەیحار بووک بە سەروکلاوی کۆییانەوە بوو، بە تارایەک لە دەسرۆکەی ڕەنگاوڕەنگ دەموچاوی دادەپۆشرا و لەسەر تاراکەی بە سێ گەردانە قایم دەکرا و پێیاندەوت؛ گەردنلغ.

بەرەو ماڵی زاوا دەڕۆیشتین، لەسەر سواندەی بانی ماڵی زاوا، گەنجان بەڕیز دادەنیشتن و گۆرانیی دەوترا، لەو گۆرانیانە کە لەبیرمە (لەبەر نازی چاوبازان) و (دەچمە باخی حەمامۆکێ) بوون. کاتێ بووک دەگەیشتە ماڵی زاوا، لەگەنیکی (تەشت) مس پڕ دەکرا لە گەنم و چوکلات و شەکرۆکە و پارە، بەسەر بووکدا دەکرا، بووک دەبرایە ژوورەوە و بە تەنیا لەسەر کورسییەک دائەنرا، ژن و کچیش گۆرانیی (بوکانە بوکانە بوکێ)یان دەوت.

کوڕانیش لە حەوشە هەڵدەپەڕین، هەندێکجاریش دەبوو بە ڕەشبەڵەک، ماڵی وا هەبوو حەوت ڕۆژ و حەوت شەو ئاهەنگیان دەگێڕا، بەتایبەتی ماڵە هەبووەکان یان کوڕە تاقانە بوایە. هەندێکجاریش بووک بە سواری ماینەوە لەلادێکانەوە بە هەمان شێوە دەیانهێنایە ناو شار.

ئەو دیمەنانەم هەموو لەبەر چاوە، چونکە ئامۆزا و پوورزام زۆربوون و لە ژنهێنان و شووکردنی هەموویاندا بەشداریمان دەکرد. باش لەبیرمە بۆ کوڕێکی پوورم، حەوت شەو و حەوت ڕۆژ ڕەشبەڵەک بوو. خواردنی ژەمی نیوەڕۆی ئەو بۆنانە، یاپراخ، مزەورە، برنج بوون. من کەمێک شەرمن بووم و بە زۆر پیلیان ڕادەکێشام بۆ سەماکردن لەگەڵیان، نەدەچوومە نێو منداڵان و تارا هەڵگرتن یان سەماکردن لەگەڵیان.

**کارەبای کۆیە**

**حەقی ڕێگا، هەندێ بەفر بوو!**

کارەبای شاری کۆیە (DC) بوو، بۆیە ئامێری کارەبا زۆر کەم هەبوو، ئەو ئامێرانەی کە هەمانبوون تەنیا رادیو و گرامافۆن بوون کە یان بە کارەبای (DC) کاریاندەکرد یان بە پاتری. لەبری سادکەرەوە (سەلاجە)، سندوقێکی بەفرمان هەبوو، زۆربەی جار وەستا عومەری نەجاڕ ئەو سندوقی بەفرەی دروستدەکرد. بۆ ئاوی ساردیش کوپە یان شەربە هەبوو. فڕنیش یان هی دەرەوە یان فڕنێکی رەشمان هەبوو لەسەر تەباخی نەوت دائەنرا بۆ دروستکردنی ئیشی هەویر، تەباخەکەمان چوار چاوبوو، دابکم لەناو قاڵبێکی فافۆن لەسەر سۆپای عەلادین یان شەمسەدین، کێکی دروستدەکرد.

سندوقی بەفر، بەفری لەناو دائەنرا و لەلایەکی تانکی ئاو هەبوو، ئاوەکەی سارد دەکرد و میوە و خواردنیش لەلایەکی تری دائەنرا، بەفر لە بازاڕ ئەکڕدرا کە هی چاڵەبەفر بوو، درەنگتر سەهۆڵ پەیدابوو، ئێمەی منداڵ زۆرمان حەزدەکرد بچین بەفر بکرین، پیاوی بەفرفرۆش حەقی رێگای ئەداینێ کە هەندێ بەفر بوو، ئەو دەمانە ژیان چەند ساکار و سادە و جوانبوو.

رادیۆیەکی فلیپسی تەختەمان هەبوو، بۆ هەواڵی بەغدا و لەندەن و یەریڤان و دەنگی کوردستان، گۆرانیی (تایەر تۆفیق و عەلی مەردان و ئوم کەلسوم، ئەسمەهان، نهاوەند، سەباح، عەفیفە ئەسکەندەر، وەحیدە خەلیل، لەمیعە تۆفیق، ئەحلام وەهبی). ئوم کەلسوم، رۆژانی هەینی کاتی نیوەڕۆ لێ ئەدرا. ئەمانەم لەیادن، هەروەها شیعر خوێندنەوە لەلایەن شوکروڵای بابان لە (بەرنامەی هەوارگەی دڵان).

**سندوقی گرامافۆن**

**(هانی هانی)**

قەوانی ئەلفیس و دیمس رۆس کە خاڵم (شەهید جەعفەر) هێنابووی بۆمان، ئەسمەهان و ئوم کەلسوم و کاویساغا و عەیشەشان، تەنیا گەورەکان بۆیان هەبوو بەکاریبێنن نەوەک دەرزی سندوق بەدەستمانەوە بشکێ.

لە یادمە جارێک رادیۆکەمان خراپبوو، من و ئازادی برام بەبێ پرسی باوکم هەڵمانوەشاند، لە کاتی هەڵوەشاندندا پەتی ناو رادیۆکەمان پچڕاند، لەترسا

گریماندایەوە، دواتر رادیۆکە هەر یەک دوو ئێستگەی وەردەگرت، پاشان باوکم پێیزانی وتی: "جارێکی تر بێ پرس دەستکاری شتی وا نەکەن"، بەڵام راستییەکە ئەوەیە کە بەردەوامبووین و دەستنەسرەوت بووین، هەرچیمان بەخەیاڵدا بهاتایە دەستکاریمان دەکرد.

بۆ دەنگی کوردستانیش زۆر بە ئاسانی وەرنەدەگیرا، گۆرانیی تەشویشیان دەخستە سەر.

گۆرانیی (Kiss me hóney) شێرلی باسی دەخرایە سەر ئێستگەی کوردی، ئێستاش هەندێ خەڵک زۆر قسە بکات و لەجێگای خۆی نەبێ دەڵێن هانی هانی لەسەرە کە مەبەست لێی (هۆنی هۆنی)یە.

### خانووەکان

### هەموو پێکهاتەکانی خۆماڵی و ژینگەدۆست بوون

زۆربەی خانووەکانی کۆیە بەتایبەتی کۆنەکان، لە قوڕ دروستکرابوون و سەربانەکەشی دارەڕا بوو، قەدی داری ئەسپیندار (سپیدار) بوون و بە قوڕ و کا دادەپۆشرا. لەزستاندا بانگوش (باگردێن) دەکرا، یان ماڵەکە خۆیان دەیانکرد یان خەڵکی بۆ بەکرێ دەگیرا. دەرگاکانی تەختە بوون، لە زۆربەی سەربانەکان لوولەی سۆبا هاتبووە دەرەوە و بە هاوینان لولەکەیان دادەخست.

ئەو ماڵانەی کە باری ئابووریيان باش بوو، خانووەکانیان دوو نهۆمی بوو، لە گەچ و بەرد دروستدەکرا. لە کۆیە کوورەی گەچ زۆر بوو، بەشێوەیەکی سەرەتایی و سادە بەرهەمیان دەهێنا. کوورەی گەچەکان بە پانی و قووڵیی جیاواز هەڵدەکەنران، لە قەراغی چاڵەکە بەردی گەچ ریز دەکرا و هەڵدەچنرا بەشێوەی گومەز، پانتایی گومەزەکە هێندی پانتایی چاڵەکە بوو، بەرزاییەکەی بەپێی پێویست و توانا بوو، لە دەرەوەش بە گەچ سواخ دەدرا، کونێکی بچووکی تێدا جێدەهێلرا بۆ دەرچوونی گازی سووتان، لە ژێر چاڵەکەوە دەرچەیەک دروستدەکرا بۆ دارسووتان یان پەرەمێزی گەورە، ئەو ئاگرە بەردەوام دەسووتا و بەردەکانی ناو کوورەکەی دەسووتان و سووردەبوونەوە بۆ ماوەی (٢-٣) رۆژ، دوای ئەوە ئاگرەکە لادەبرا و کاتێ بەردەکان سارد دەبوونەوە، وردیان

دەکردن و دەیانهاڕین (بەردی گەچ لەناوچەی کۆیە و ئاغجەلەر و قەرەداغ و دەربەندیخان زۆرە و کانە بەردی گەچیان لێیە).

ئەو گەچە رەنگی زۆر سپی بوو، بە ئاو شل دەکرایەوە، وەستای تایبەتی هەبوو و خانووەکانیان بە بەرد و گەچ هەڵدەچنی. وەستای گەچکاری ئەو جۆرە گەچەی پێ خۆشترە بۆ بەکارهێنان، چونکە درەنگتر رەق دەبێ لەچاو گەچی پیشەسازی. دەرەوەی خانووەکان بەو گەچە سواخ ئەدرا، لە کاتی دروستکردنی خانووەکان سەرەتا رەنگی سپی و جوان بوون، بەڵام بەهۆی قوڕی سەربانەکان و باران بارین وردە وردە رەنگی دەگۆڕا، هەندێ خانووش بە بەردی (نەقاڕ) جوان دەکران، بەردی نەقاڕیش ئیشی دەستبوو کارێکی زۆر هونەری و زەحمەت بوو. ناو ماڵەکان زۆربەیان نیمچە کراوە بوون.

هەندێ خانووش لە خشتی قوڕ دروستدەکران، کا و قوڕ تێکەڵدەکران و بە قاڵب دادەڕێـژران و لەبەر هەتاو وشکدەکرانەوە، دوای ئەوە دیواری خانووەکانیان پێ هەڵدەچنی، پانیی دیوارەکان نزیکەی یەک مەتر دەبوون، بۆیە ئەتوانم بڵێم ئەو خانووانە ژینگەدوست بوون، گەرما و سەرمای لەخۆدەگرت، بۆیە بە هاوین فێنک بوون و بە زستانیش بە ئاگردانێک یان چەند کاژێرێک سۆپایەکی دار، ئیتر ناو ژوورەکە بۆ ژیان دەگونجا.

### کولتووری خوێندنەوە

کتێب خوێندنەوە رێـزی تایبەتی هەبوو، ئەوەی لە ماڵی ئێمەدا هەبوو کتێبەکانی ئەم نووسەرانە بوون:

ئەرنیست هەمەنگوای، دۆستۆیفسکی، مەکسیم گۆرگی، ڤیکتۆر هۆگۆ، گۆتە، دانتی. گۆڤاری (عەبیبک) بە رێگای پۆست دەگەیشتە دەستی باوکم. رۆژنامەی کوردییش کاک حەمە بەگرەزی کوردپەروەر دەیهێنا، بەدەم شیعر و گۆرانییەوە بەشی دەکرد، هەر ماڵە شیعری تایبەتی خۆی هەبوو، بۆ ماڵی ئێمە دەیوت: "عوسمان حەسەن سۆرانی، کەست نەهێشت لە بانی، هەمووت خزاندە خانی، نەرمینی عوسمانە فەندی، وەرە بیدە بابت رۆژنامەی کوردی".

هەروەها دەیان کتێب و دیوانی شاعیرانی کورد لەکتێبخانەکەماندا هەبوون،

یەک لەو دیوانانەی کە باوکم زۆری دەخوێندنەوە و ئەتوانم بڵێم ئێمەش لەگەڵیدا لەبەرمانکردبوو، دیوانەکانی خەیامی شاعیر بوو، وەرگێڕدرابوون بۆ سەر زمانی کوردی و تائێستاش بەشێ لەو شیعرانەم لەیادە.

کتێب، مولکی کەس نەبوو، ئەم دەست و ئەو دەستی دەکرد و ئەم ماڵ و ئەو ماڵ دەگەڕا، وەک زێڕیش سەیر دەکرا. زۆرجار باوکم منی دەنارد بۆ ئەوەی کتێبی بۆ بهێنم، جارێک ناردمی بۆ ماڵی د.فوئاد مەعسوم بۆ هێنانی کتێب، د.خدر نزیکە تەمەنی من بوو، هەر چوومە ئەوێ کەوتە لاقرتێ لەگەڵم، هەموو شتێکی بیربردمەوە، لێیانپرسیم؛ بۆچی هاتوویت؟ وتم: "کاک هێن، باوکم منی ناردووە بۆ هێنەکە". ئیتر بوو بە پێکەنین و تا ماوەیەکیش لە ماڵەوە پێیاندەوتم: "هێنەکە". هەندێکجاریش دەیناردمە کتێبخانەی عوسمان عەونی باوکی کاک فەرهاد عەونی بۆ هێنانی کتێب یان ڕۆژنامە.

باوکی باپیرم (مام حەسەن)، ناوی (مام قادر) بووە، لە جۆرجیاوە هاتووە، کاری کاروانچێتی کردووە، ئەو کاتەی کە سوپای عوسمانی لەوێوە دێنەوە، هەندێ خەڵکی ئەو ناوچانە، مسوڵمان دەبن و لەگەڵ سوپاکە بەرەو ئەو ناوچانە دێن کە لەژێر دەسەلاتی سوپای عوسمانیدایە، بۆیە دێن لە کۆیە نیشتەجێ دەبن و زۆربەیان ناویان بۆ ناوێکی ئیسلامی دەگۆڕن، زانیاریم نییە باپیرە گەورەمان ناوی چی بووە.

زۆرێک لەو خێزانانەی کە لە جۆرجیاوە هاتوون بۆ کوردستان، لە مەهاباد و کۆیە نیشتەجێ بوون، ئەم تێکەڵییەش هەر مابوو لەنێوان کۆییەکان و مەهابادییەکان.

وەک پێدەچێ، ماڵی باپیرم بە رەچەڵەک شەرکەسی بوون و لە دوای ساڵی ١٨٦٠ و لە سەردەمی شەری نێوان دەوڵەتی عوسمانی و روسیا هاتوونەتە کوردستان.

باپیرم (مام حەسەن)، ژندەهێنێ دوو کوری دەبێ و ژنەکەی دەمرێ. نەنکیشم (ئامینە) کە خەڵکی کۆیە بووە، شوودەکات و کوڕ و کچێکی دەبێ (مامە شەفیق و پورە بەهبە)م، ئەویش مێردەکەی دەمرێ، پاشان باپیرم و نەنکم خێزانی تازە پێکدەهێنن و تەنیا باوکم لەدایکدەبێ.

باپیرم، کاری کاروانچێتی کردووە لەنێوان کۆیە و وڵاتانی دەوروبەر. کوڕێکی گەنجی وریا لەگەڵ خۆی دەبا و دەهێنێ، بە کتوپڕ بە نەخۆشی دەمرێ، باپیرم لە خەما واز لە کاری کاروانچێتی دەهێنێ و پاش ماوەیەک ئەمیش کۆچی دوایی دەکات. مامە قادرم کاری کاروانچێتییەکەی کردووە تا من گەورەش بووبووم ناوە ناوە ئەو کارەیدەکرد، باوکیشم دەخەنە بەر خوێندن، باپیرم نەبینیوە و نەنکیشم بەحاڵ بیردێ.

باوکی دایکم، واحیدی موختار، سەرەتا سۆڵدروو بووە، دوایی دەکرێت بە موختاری کۆیە. پیاوێکی وریا و قسەخۆش و دەنگخۆش بووە، لەوە دەچێ دەنگخۆشی خێزانیی بووبێ. خالید دلێر، قسەکانی باپیرمی هەمووی لە کتێبێکدا کۆکردووەتەوە، زۆربەی نوکتەکانی وەک رووداو وابوون. باپیرم پێنج ژنی هێناوە، لە نەنکم دوو کور و دوو کچی دەبێ، خالید دلێر و شەهید جەعفەر و دایکم و پوورە زێبام. لە ژنێکی تری کوڕێک و کچێکی دەبێ، خاڵە حەمە نەزیر

و پوره هەیبەت. نەنکم (دایکی دایکم)، ئەویش هەر ناوی ئامینەیە و بن جووە، منداڵی زۆری دەمریّ، ژنێکی زۆر جوان دەبیّ و ئەویشم زۆر کەم لەبیرە. باپیرم (١٠٧) ساڵ ژیا، بەڵام نەنکم زۆر بە گەنجی مردووە.

هەردوو ماڵە باپیرم لە گۆڕەپانی بەفری قەندی دەژیان، ماڵی باپیرە واحیدم لە کۆڵانە تەنگژەی سەر گۆڕەپانەکە بوو.

ئەم ماڵانەی لە گۆڕەپانی بەفری قەندی بوون، ماڵی کەریم ئاغا، حاجی زرار، سەعیدی سەڕاج، ئەحمەدی وەستا قادر، وەستا مستەفای ناربەند (ناڵبەند)، شیخ باپیر، عەولای سابیری نەجاڕ، پلە هەمین (پورە هەمین) خوشکی باپیرم بوو. وەستا مستەفای نانەوا، رەزای مەلا حەبیبی، سەعیدی حەمە وسو (بەڕێوەبەری پۆست و بەرید). لە کۆڵانەکەی ئێمەش کە لەسەر گۆڕەپانی بەفری قەندی بووین، ئەم ماڵانە دراوسێمان بوون، ماڵی واحیدی حەمەشەلی، تاهیر عەزیز. حەمە فەقێ مەحمودی، حاجی سەعید (دوو کچی بەرگدرووی هەبوو بەناوی شکریە و کافیە)، کەریمی حەمە مەلا و هەندێ دراوسێ کە ئێستا ناوەکانیانم بیر نەماوە.

منداڵانی گەڕەک، وەک خوشک و برا وابووین، یاریمان بەیەکەوە دەکرد، لە خۆشی و ناخۆشیدا بەشداربووین. ئەو هەستە ئێستاش هەر بەردەوامە لەگەڵ ئەوانەی کە ماون، هەرچەندە من لە تەمەنی (١٣) ساڵی کۆیەم جێهێشتووە، ساڵێک پێش ماڵەوەمان.

ماڵی باپیرم (باوکی باوکم)، زۆر گەورەبوو، حەوزێکی ئاوی تێدابوو، هەندێ ژنی دراوسێ دەهاتن لەوێ نوێژیان دەکرد و ئاوی پێویستیان دەبرد. هەندێ تاشەبەرد لە دەوری حەوزەکە دانرابوون، دارمێو و دارهەنجیری تیابوو. لای خوارەوەی، تەویلەی ولاخەکان بوو، بەیتار چاودێری دەکردن. لەدواییدا ئەو خانووە لەسەر مامم و باوکم دابەشکرا، بوو بە دوو خانوو.

ماڵی باپیرم (باوکی دایکم) کە لە کۆڵانە تەنگژە بوو، ئەوانیش حەوزێکیان هەبوو. لەناو ماڵەکەدا ژوورێکیان هەبوو ئەو ژنانەی حوکم دەدران دەیانهێنان لەوێ زیندانییان دەکردن، بەهۆی نەبوونی گرتووخانەی ژنان لە کۆیە (وەک ماڵە موختار)، دەیان مەحکومی جۆراوجۆر لەوێبوون کە هەندێکیان کێشەی کۆمەڵایەتی بوون.

هەبوو لەسەر رەدووکەوتن و هەشبوو لەسەر کوشتن. ژنێکی لێ بوو ناوی (ئایشە باشە) بوو، تۆڵەی براکەی کردبووەوە، براکەی کوژرابوو لەسەر ئاوگرتنەوەی باخ، ئەویش بکوژەکەی کوشتبووەوە، بەڵام شاهیدی نەبوو. پاش ماوەیەک، لە ماڵی باپیرم و باوکم زۆر بە چاوی رێزەوە سەیریاندەکرد.

خەڵکی ئەو سەردەمە زۆر سادە و ساکار بوون، ئەوکاتەی ئایشە باشە لە ماڵی باپیرم زیندانی دەبێت، جارێکیان نەنکم دەینێرێتە ژووری پشت هەیوان بۆ کارێک، کە دەچێتە ژوورەکە پاش کەمێک بە پڕتاو دەگەڕێتەوە و بە سەرسوڕمانەوە بە نەنکم دەڵێت: "ژنێکی دیکە لەو ژوورەیە!". تومەس یەکەمجارە خۆی لە ئاوێنەدا بینیوە و پێیوابووە ژنێکی دیکەیە.

جارێک، ژنێک، شووەکەی خۆی بەجێهێشتبوو بەدوای پیاوێکی تر کەوتبوو، باپیرم لێی پرسی بۆ ئەم کارەتکردووە؟ وەڵامی دابووەوە "مام واحید، تۆ حەزت لە کەرەوز نییە و نایخۆی، منیش ئەو پیاوە پێشی دەوت (کسۆک) واتە سەگ، وەک ئەو کەرەوزە وایە حەزم لێ نییە و بۆم ناخورێ".

تاڕادەیەک لەناو ماڵی باپیرم ئازادبوون، هەیانبوو چەند ساڵێک مابوونەوە، یەکێکیشیان شیری دەدا بە نازەنینی خوشکم و بەخێوی دەکرد.

ژووری پشت هەیوان ژووری دانیشتن بوو، ئاگردانێکی تیابوو قاوە و چایی لەسەر لێ دەنرا، لە دیوارەکانیدا تاق هەبوون و پڕبوون لە کاری جوان، سێ دۆڵابی تەختەش لەناو دیوار بوو، دەرگاکانی لە تورکیاوە هێنابوویان، خواردنی خۆشیان تێدا دەشاردەوە.

هەر لەو ژوورەی کە پێیاندەوت؛ دیوەخان، سێ سندوقی بوراقی تیابوو کە دەرگاکانی وێنەی بوراقیان لەسەربوو، لەسەر ئەو سندوقانە نوێنیان هەڵدەچنی، زۆربەی ماڵەکان ئەو جۆرە سندوقەیان هەبوو.

نوێنەکان، دۆشەک و لیفەی سورمەدار بە دەست ئەدوورا و سەرینی گەورە گەورەی خڕ کە لە پەڕی مریشک و باڵندە دروستدەکرا. هەر چەند ساڵێ دۆشەک پەڕە دەکرایەوە و سەرینەکانیش (بالیف) شیدەکرانەوە و بەر هەتاو ئەدران، بەرگێکی سپی لە دەرەوەی بەرگی سەرینەکە هەڵدەکێشرا.

**بوراق**: لە میتۆلۆجیای ئەغریقییەکان و لای ئیسلامیش هەیە، جۆرە ئەسپێکی باڵدارە، لەئیسلامدا ئەو ئەسپەیە کە حەزرەتی جوبرائیل بۆ پێغەمبەری هێناوە لە سەفەری ئیسرا و میعراجدا، دەڵێن پێغەمبەر محەمەد (د.خ) وەسفی ئەو ئەسپەی کردووە و فەرموویەتی؛ لەنێوان کەر و وڵاخدایە.

**بوراق**، لە بەرقەوە(هەورە تریشقە)وە هاتووە لە خێراییدا، جۆرێکە لە مەلائیکەت.

له ساڵی ۱۹۱۹ له کۆیه لەدایکبووه، تاقانەکوڕی باپیر و نەنکم بووه، هەرچەندە دوو برا و خوشکێکی هەبووه له باوکی و له دایکی، بەڵام هەرگیز جیاوازیی نەکردوون.

خوێندنی سەرەتایی له کۆیه تەواو دەکات و مامۆستایەتی له بەغدا، بووەته مامۆستا و یەکەم دامەزراندنی له عەربەت دەبێ و دوایی دەگوێزرێتەوه بۆ بنگرد، لەوێوه بۆ گۆمەشین و له گۆمەشین من لەدایکدەبم، پاشان دەگوێزرێتەوه بۆ رانیه و دواتر بۆ کۆیه. دواتر و له ساڵی ۱۹٦٥ راژەکەی دەگوێزرێتەوه بۆ هەولێر و تا کۆتایی ژیانی لەوێ دەمێنێتەوه.

باوکم بەهۆی توانا و هێمنی و نەرمونیانی و کوردپەروەرییەکەی، جێگای رێزی هەموو لایەک بوو

مامۆستایەکی سەرکەوتوو بوو، لەپاڵ وتنەوەی وانە زانستییەکان سروودی کوردی و کوردایەتی فێری خوێندکارەکانی دەکرد. کەسێکی عەلمانی و زانستپەروەر بوو، باوەری به هەموو مافەکان هەبوو بەتایبەتی مافی ژن. بیرم نییه جیاوازی لەنێوان کور و کچ کردبێ، پیاوێکی خۆشگوفتار و دڵفراوان بوو، ماڵمان کراوەبوو بۆ هەموو کەسێک، جاری واهەبووه شوێنی نووستن بۆ خۆمان نەدەما، هەندێکجار میوانەکانمان له میوان بێزار دەبوون!

باوکم زۆر خوێندەواربوو، بەردەوام دەیخوێندەوه، هانی ئێمەشی دەدا بخوێنینەوه و دەیوت "چەند بخوێننەوه ئەوەندە له ژیان تێدەگەن"، هەندێکجار ئەگەر چیرۆک و رۆمانێکی بەدڵبوایه، بۆ دایکمی باسدەکرد، دایکیشم پەلەی لێدەکرد زوو تەواوی بکات، بۆ ئەوەی بزانێ بەسەرهاتەکه چی لێهاتووه.

کەسێکی زۆر خۆنەویست بوو، له دەمی خۆی دەگرتەوه بۆ خزمەتی خەڵک و پێداویستییەکانی ژیان و خوێندن و خۆشیی ئێمه.

زۆر هاورێ بووین بەیەکەوه، دەیوت "منداڵ نابێ له باوک بترسێ، بەڵکو دەبێ رێزی بگرێ". لەگەڵمدا دادەنیشت، مۆدێلی جلوبەرگی بۆ هەڵدەبژاردم، بیری له کورت و درێژیی جل نەدەکردەوه، رقی له پەچە و عەبا بوو، دەیوت: "کچی من هەرگیز نابێ سەرپۆش و عەبا بپۆشێ".

لای قورس بوو یەکێ به (باوکی ئازاد) بانگیبکردایه، هەر لەسەرەتاوه وتوویەتی: "یەکەم منداڵم کچه و دەبێ به باوکی نەرمین بانگمبکەن"، هەرواش

چووە سەر و لەناو خۆمان هەر بە "بابی نەرمین" بانگ دەکرا. ئەگەر لە ماڵەوە داواکارییەک هەبوایە، داوایان لێ دەکرد سوێند بخوا بە سەری من و بڵێ بە سەری نەرمین. ئەگەر ئەو سوێندەی بخواردایە ئەوا جێبەجێی دەکرد.

باوکم نهێنیپارێز بوو، باوەڕی زۆری پێمان هەبوو، دەیان خوێندکاری پێگەیاندووە و بە نهێنیی هاوکاریی دەکردن، لە ماڵەوە تەنیا من دەمزانی، تا درەنگ دایکیشم نەیدەزانی.

میهرەبانی لە رادەبەدەر بوو، تا هەموومان گەورەبووین، وانەکانی خوێندنی بە هەموومان دەوتەوە، بەیانیان کە دەچووین بۆ دەوام نانی بەیانی ئەدایێ و سەیری خشتەی وانەکان و دەفتەرەکانی دەکردین و رەوانەی دەکردین، زۆرکەم دایکمی بەخەبەر دەهێنایەوە. ئاگای لە جۆری خواردنمان بوو، دەبوایە خۆراکمان تەندروست بێ. من تاقەتی هەنار و پرتەقاڵ پاککردنم نەبوو، خۆی بۆی پاک دەکردم، هەندێکجار گوێزەکەشی بۆ دەشکاندم. ئەم میهرەبانییە، لە هەموو ژیانیدا بەردەوام بوو، کە چوومە زانکۆ هەموو جارێک جانتاکەی لەگەڵ ئامادە دەکردم نەکا شتێکم بیرچووبێ، گوێز و مێوژی بۆ پاک دەکردم و بۆی دائەنام، شەوانە بەسەرماندا دەگەڕا بۆ ئەوەی بزانێ خۆمان داپۆشیوە و بیرمان نەچووە سۆپا بکوژێنینەوە. هەرچەندە باسی میهرەبانی و خۆشەویستیی بکەم، ناتوانم مافی خۆی پێبدەم.

جگە لەوانە و زانیاریی خوێندن و ژیان، بەردەوام ئامۆژگاری دەکردین، دەمەوێ هەندێ لەو ئامۆژگارییانە باسبکەم کە کاریگەریی لەسەر ژیانمان جێهێشتووە:

- کاری گەورە بکە و سەرکەوتن بەدەستبهێنە، با خەڵک بە من بڵێن باوکی نەرمین، نەک بڵێن نەرمینی عوسمانە فەندی.
- ئەگەر هیچیشتان بۆ نەکرا، لە سەروەریی بنەماڵەکەتان کەم مەکەنەوە.
- شەرمکردن عەیبەیە و خۆبەکەمزانینە، حەیا گرنگە.
- مەترسن. ترس لە نەزانینەوە هاتووە، ئەگەر بە وردیی بزانن ترستان نامێنێ.
- کە قسەیەک دەکەی دووجار لە دڵی خۆتدا بیڵێرەوە، نەکا قسەی خراپ بکەیت و خەڵک زویر بکەیت و دڵیان بشکێنی یان قسەکەت بە هەڵە لێکبدرێتەوە.

- دەتوانی قسەکانت بەشێوەیەک بکەی دڵی خەڵک بریندار نەکەی، ئەگەر هاورێیەکت جلەکەی جوان نەبوو، بڵێ جلەکەی دوێنێت زۆر لێهاتبوو، ئیتر خۆی تێدەگات.

زۆرجار دەیوت: "وەک عەلی کوڕی ئەبو تالیب بن کە فەرموویەتی "خۆزگە ملم وەک ملی حوشتر دەبوو بۆ ئەوەی قسەکانم هەڵبسەنگاندایە".

- هەموو شەوێک لەناو جێگا، چاوێ بە کارەکانتدا بخشێنەوە، بزانە چیت باش و چیت بە دڵ نەبووە و کردووتە.

- "نانت جۆ بێ، رووت گەنم" هەندێکجار ئێمە لە میوان بێزار دەبووین، ئەمەی پێدەوتین، ئەمە دایکیشم زۆر بۆی دووبارە دەکردینەوە.

زۆر خەمی منی بوو بەتایبەت ئەو ماوەیەی کە دارۆ لە زیندان بوو، هەم خەمی سیاسی و دەربەدەریی من و هەمیش هیلاکیم بۆ پەیداکردنی بژێویی ژیان، ئەو کاتە من لەپاڵ مامۆستایەتیم جلوبەرگم دەدووری بۆ خەڵک. باوکم شەوانە بەدیارمەوە دائەنیشت بۆ ئەوەی تەنیا نەبم، ناوەناوەیش میوەیەکی پاککراوی بۆ دەهێنام، لیی دەپاڕامەوە بچێت بخەوێ، دەیوت: "خەوم نایە"، بەڵام من لام روونبوو دڵی نەدەهات جێمبهێڵێ.

پاش شەهیدبوونی شەهید جەعفەر، من و ماڵی شەهید جەعفەر (هاوسەرەکەی قانعە خان و دوو منداڵەکەی رەوا و رێباز) و ماڵی شەهید جەبار فەرمان (سەبیحە خانی هاوسەری و بڵێسەی کچی) ئەوسا کاک جەبار لە زیندان بوو لەگەڵ دارۆ، هەموومان بەیەکەوە لە ماڵی باوکم دەژیاین، بێ ئەوەی رۆژێک رووی گرژ کردبێ یان بۆڵەیەک بکات، ئاگای لە هەموومان بوو. کە پەیوەندیشم کرد بە هێزەکانی پێشمەرگەوە، هاورێی کوڕم لای ئەوان جێهێشت و بەرپرسیارێتیی هاوڕێشیان کەوتە ئەستۆ.

زۆر ئاگای لە منداڵەکانی شەهید جەعفەر دەبوو، چۆن ئێمەی پەروەردە دەکرد و بە هێمنییەکەی ئامۆژگاری دەکردین، بۆ ئەوانیش هەروا بوو، هەمان هەستی هەبوو بۆیان. لەبەر میهرەبانیی باوکم، رەوا، تا چووە بەر خوێندن وایدەزانی باوکم باوکیەتی.

بەهۆی ئێمە و سیاسەتەوە نەهامەتیی دونیای بینی، بەڵام هەرگیز نە ورەی بەردا و نە سەری نەوی کرد بۆ دوژمن، خۆڕاگرییەکەی بێسنوور بوو. حەوت

ساڵ لەگەڵ دایکم و کەژاڵی خوشکم بەهۆی ئێمەوە خۆیانشاردەوە، بەبێ مووچە ئەم ماڵ و ئەو ماڵ و ئەم لادێ و ئەو لادێیان دەکرد.

لە پاییزی ساڵی ١٩٨٧ جاشەکانی قاسمە کوێر، لە کۆیە پیاوێکیان لێدەبڕێ، یەکێک لەو کەسانەی ئەو چالاکییە ئەنجامدەدەن، شەهید ئازادی برام دەبێ کە ئەو سەردەمە چالاکییەکانی زیاتر لە دەشتی کۆیە بوو وەک پێشمەرگە. قاسمە کوێر دەزانی کە سەرپەرشتیی ئەو چالاکییە شەهید ئازاد دەبێ، خەڵک دەگرن و یەکێک ماڵی باوکم دەزانێ لە کوێن، دەیانباتە سەر ماڵەکەی و لەوێ باوکم دەگرن، داوا دەکەن بەردانی باوکم بەرانبەر بەو جاشە بێت، باوکم وەڵامێک بۆ دایکم دەنێرێتە دەرەوە و دەڵێ؛ نابێ شتێکی لەو جۆرە بکرێت.

دایکم دوای سێ ڕۆژ خۆی دەگەیەنێتە لای مەفرەزەکانی ئازادی برام، بەڕێز مام جەلال کە ئەمە دەزانێ، وەڵام بۆ شەهید ئازاد دەنێرێ دەڵێ "دەبێ ئەو ئاڵوگۆڕە بکەیت". باوکم، لای مام جەلال ڕێزی تایبەتی هەبوو، مامۆستای مام جەلال بووە و چەند ساڵێک وانەی پێ وتووە.

دوای ٤٥ ڕۆژ ئەو ئاڵوگۆڕە دەکەن، ئەویش تەندروستیی بەرەو خراپی دەچێت، چونکە باوکم هەر بە گەنجی تووشی نەخۆشی شەکرە بووە، لە زیندانیش نەیانهێشتووە هیچ جۆرە دەرمانێکی بۆ بچێ، ئەو ماوەیە چەندین ماڵیان کردووە، باوکم وتوویەتی "جاشەکان قسەیان لەگەڵ دەکرێ، بەڵام ئەمن و سیخوڕەکان هی قسەکردن نین، بۆیە دەبێ بچینە شوێنی تر و لە شوێنێک زۆر نەمێنینەوە".

لە هاوینی ١٩٨٨ هەندێ شوان لە دەشتی کۆیە دەگیرێن، لە هەواڵەکان وا بڵاویدەکەنەوە کە هەندێ پێشمەرگە گیراون، ئەو کاتانەش شەهید ئازاد لە دەشتی هەولێر دەبێ و لەوێ چالاکیی پێشمەرگایەتی دەکات و کەس نازانێ ئەوانە شوانن و ڕەمییان دەکەن. باوکم زۆر خەمدەخوا، وا هەستدەکات ئازادی برامیان لەگەڵە، بەو هۆیە جەڵتەیەکی بچووکی مێشک لێی ئەدا و تووشی نیمچە شەلەلیک دەبێ و دەبرێتە نەخۆشخانە، تەنیا دایکم بەدیاریەوە دەبێت، لە ڕۆژی جەژندا نەخۆشەکان دەنێرنەوە ماڵەوە لەبەر بێ شوێنی، دایکم لە دکتۆرەکان دەپاڕێتەوە نەیاننێرنە دەرەوە، بەڵام بەگوێیان ناکەن. دواتر وردە وردە بەرەو باشتر دەچێ، بەڵام ئەوەندەی پێناچێ لە ٢٨ی ئازاری ١٩٨٩ ئازادی

برام شەهید دەبێ، لە باوکمی دەشارنەوە و دەیبەنە ماڵی حەمەدی ئامۆزام بۆ ئەوەی ئاگای لە پرسەکەی نەبێ و دووربێ، ئەوسا پرسەی شەهیدیش زۆر بە نهێنیی دەکرا، بەڵام پاش ئەوەی دەیهێننەوە ماڵەوە دەبینێ دایکم و خزمان جلی رەشیان لەبەردایە و میوانمان زۆرە، هەستدەکات و دیسان نەخۆشدەکەوێتەوە و جەڵتەیەکی تر لێی ئەداتەوە. دوایی بەئاگادێتەوە، بەڵام تەندروستیی زۆر خراپ دەبێ، بەم شێوەیە تا ٢٩ی تشرینی دووەمی ١٩٩٦ لەسەر جێگا بوو. هەرچەندە هۆش و تێگەیشتنی هیچ نەگۆڕابوو، بەڵام زۆرکەم توانای قسەکردنی هەبوو، ئەوەشیان بەهۆی ٣١ی ئابەوە کە بینی کەسی بە دەورەوە نەماوە و لە هەواڵەکانی تەلەفزیۆن دەیزانی چی روویداوە، دەڵێن رۆژی چەندجارێک گریاوە، دیسان تەندروستیی رۆژ بە رۆژ خراپتر دەبێت، ئێمە نەمانئەتوانی بچینە هەولێر، بۆیە جەنازەکەیان هێنایەوە کۆیە و پرسەکەشی لە سێ شوێن بەڕێوەچوو.

ئەو ماوەیەی کە نەخۆشبوو، دایکم و کەژاڵی خوشکم و هاوتای برام خزمەتێکی یەکجار زۆریان دەکرد، هیچ رۆژێ نەیانهێشت تووشی برینی سەر جێگا ببێت. هاوتای برام بۆ شەوێکیش دڵی نەدەهات جێیبهێڵێ، هاوتا لەو کاتەی لە پێشمەرگایەتی گەڕایەوە، هەموو ژیان و کاتی خۆی بۆ ئێش و خزمەتی باوکم تەرخانکردبوو. من وەک خۆم، زۆر خۆم بە قەرزاری باوکم دەزانم و نەمتوانی بە دڵی خۆم بەشێک لەو هەموو قوربانی و قەرزانەی بدەمەوە، ویژدانم زۆرجار ئازارم ئەدا کە ئێمە بەهۆی سیاسەتەوە چەند نەهامەتیمان بۆ ماڵی باوکم دروستکردووە. جاری واش هەیە دەڵێم خۆی ئێمەی وا پەروەردە کرد کە خەمی خاک و خزمەتی وڵات و میللەتمان بێ، ئەو هەموو باوەڕەی بە ئێمەی هەبوو، دەیان جار دەیوت "کچەکانم وەک پیاو وان خەمیانم نییە، لەسەر بەردی رەقیش بێ نانی خۆیان پەیدا دەکەن". زۆر باوەڕی بە تواناکانمان هەبوو، هەرچەندە جار جار دەیوت "بەعس دڕندەیە، زۆر ئاگاتان لەخۆ بێ، ئەوەی ئێوە دەستتان داوەتێ ماڵوێرانییە" لەگەڵ ئەوەشدا هەرگیز نەیدەوت کاری سیاسیی مەکەن، تەنیا دەیوت: ئاگاداری خۆتان بن.

زۆرجار بەیانم ئەدایە بۆم بنووسێتەوە، دەستوخەتی زۆر خۆش بوو، چەند کۆپییەکی بۆ دەنووسیمەوە. چونکە چاپمان نەبوو، ئامێرێکی یاساغ بوو لە ماڵان هەبوایە، هەندێکجاریش بۆی چاک دەکردم.

رۆژێ گوێم لێ نەبوو بۆڵەبۆڵ بکات، پشوودرێژیی باوکم نموونەیی بوو، بیرم نییە لە جێبەجێکردنی داواکارییەکانمان بۆڵەی کردبێ.

لە یەکێک لە بیرەوەرییەکان کە تائێستاش ئازارم ئەدا، جارێک لە ئامادەیی بووم، پێویستم بە پێڵاو بوو بۆی کڕیم، بینیم خۆی پێڵاوەکەی لای پینەچی دەهێنایەوە، خۆمم زۆر بە خۆپەرست سەیردەکرد و هەرگیز بیرمناچێتەوە، هەرچەندە زۆرکەم دەمهێشت ئەرکم بەسەریانەوە هەبێ. باوکم مانگانەی ئەداینێ، بۆ ئەوەی کاری ڕۆژانەمانی پێ جێبەجێبکەین، ئێمەش بەپێی مانگانەکە کاری خۆمانمان ڕاییدەکرد، منیش و ئەوانی تریش پارەکەمان زۆربەی بە کتێب کڕین دەڕۆیشت.

یەکێکی تر لەو وێنانەی کە زۆر ئازارم ئەدا، ئەو کاتە بوو کە بە باوکم وت پەیوەندیی دەکەم بە هێزی پێشمەرگەوە، نەیتوانی هیچ بڵێ لەتاو گریان، باوەشێکی توندی پیا کردم وتی "کچم ئەترسم نەتبینمەوە". منیش لەتاو گریان تەنیا وتم "ئەمانەتی تۆو هاوڕێی کوڕم" و ڕۆیشتم.

بەداخەوە دوای (١٣) ساڵ باوکم بینییەوە لە ئێران کە لە کۆڕەوەکە چووبوونە ئەوێ و لە مەهاباد نیشتەجێ بووبوون، نەمئەتوانی سەیری بکەم لەو حاڵەدا، کە دەمبینی پیاوێکی وا قارەمان لەسەر جێگایە، خۆمم بۆ نەگیرا لەتاو گریان. ئەو چەند ڕۆژەی لایان بووم، دایکم لێم دەپاڕایەوە بۆ ئەوەی نەگریم، بەڵام نەمدەتوانی خۆم بگرم.

سەرەتا لە حیزبی (هیوا)دا کاریکردووە، لە ساڵی ١٩٥٩ باوکم بوو بە یەکێک لە بەرپرسانی ناوچە لە (پارتی دیموکراتی کوردستان) تا ساڵی ١٩٦٥ کە چووینە هەولێر وازیهێنا.

خاکپەرست و نیشتمانپەروەری وەک باوکم و هاوڕێکانی کەموێنە بوون، گورانی و شیعری نیشتمانیی زوری دەزانی و ئێمە و خوێندکارەکانی فێردەکرد.

کە منداڵبووم، هەندێکجار شانۆم دەنووسی، خۆم دەشبووم بە دەرهێنەر و لەگەڵ منداڵانی دراوسێ نمایشمان دەکرد، زۆر بە دڵفراوانییەوە لەگەڵمان دادەنیشت و هەندێکجار گورانکاریی بۆ تێدا دەکردم، زۆربەی شانۆییەکان خاکپەرستی و نیشتمانیی بوون.

حەزی بەوە نەبوو کە هەندێکجار وشەی عەرەبیم بەکاردەهێنا، دیارە بەهۆی خوێندنم لە خوێندنگەی عەرەبی، کاریگەری لەسەرم کردبوو.

لە پۆلی سێی ناوەندی لە هەولێر دەمخوێند، لە ماڵی کاک تایەر تۆفیقی هونەرمەند بووم (پورزای دایکم بوو)، بەهۆی ئەوەی ماڵی باوکم لە دەرەوە بوون، نامەیەکم بە عەرەبی بۆ باوکم نووسی، پاش ماوەیەکی زۆر وەڵامەکەیم وەرگرتەوە، بۆی نووسی بووم؛ جارێکی تر نامە بە عەرەبی بنووسی نیگەرانم دەکەیت و لێت زوویر دەبم. ئەو رستەیە زۆر دڵتەنگی کردم، وتم "چەند دەمێکە هەواڵی یەک نازانین ئەمە وەڵامی بێ". کاک تایەر وتی: "باوکت ناهەقی نییە، ئەمجارە بە کوردی بینووسە من بۆت چاک دەکەم"، ئیتر ئەوە دوانامەی عەرەبیم بوو بۆ باوکمی بنووسم. بە وردەکارییەوە گیانی نەتەوەیی لە رۆحماندا دەچاند.

چەند لەگەڵ منداڵ و کەسوکار میهرەبان بوو، ئەوەندەش لەگەڵ دایکم هێمن و لەسەرخۆ بوو، رێزی زوری هەبوو بۆی، لە کاری ناوماڵیش هاوکاریی دەکرد.

خزم و کەسوکار زور گوێڕایەڵی بوون، بێ ئەوەی لە کەسێکیان توڕەببێ یان چاوسوورکردنەوەی هەبێ، نە لە ئێمە و نە لە کەسوکار. زۆر مەبەستی بوو ماڵ رێکوپێک بێ، هەموو شتێ لە شوێنی خۆی بێ، هەندێکجار بە گاڵتەوە شتێکی ببینیایە لە شوێنی خۆی نییە دەیوت "بابچم فڕێی بدەم دیارە پێویست نییە". زۆرجار لە تەنەکەی خۆڵ شتمان دەدۆزییەوە کە فڕێیدابوو.

له روانگەی باوکمەوە هاوڕێیەتی مانایەکی زۆر بەرزی هەبوو، هاوڕێکانی باوکم وەک مام لەگەڵمان رەفتاریان دەکرد، ئەو ماوەیەی کە لەسەر جێگا بوو، بە نۆرە سەردانیان کردووە و باسی بیرەوەرییەکانیان بۆ کردووە.

هەندێ لەو هاوڕێیانەی کە زۆر نزیکبوون لێی؛ مامۆستا حەنا فەندی (حەننا ئەنتوان)، ئیسماعیل سەرهەنگ، مامۆستا جەلال حەمەد، زەکیە فەندی، مامۆستا عەبدولرەحمان ئەمین، جەمیلە ئەفەندی، کاک تاهیر عەزیز، مامۆستا حەمەئەمین مەعروف و تاهیر ئەفەندی، مەولود فەتاح، تاهیر سەعیدی گارفێنی، مەجید نورەدین، عەبدوڵڵا کاکە، سابیر ئیسماعیل، زەکی هەناری... بوون. کە لەگەڵیان هاتووچۆی خێزانیشمان هەبوو.

**یایە**

**(ئایشە گوڵ)**

کچێکی چاو سەوزی کاڵ، لووت قنج، لێو ئەستوور بووە. ئەوسا لێوی ئەستوور باو نەبووە، لێو قەیتانی نیشانەی جوانی بووە، بۆیە زۆر گوێم لەوە دەبوو دەیانوت "تەنیا عەیبی، لێویەتی". لە کۆلانە تەنگژەی سەر بە گۆڕەپانی بەفری قەندی لەدایکبووە، کچی گەورەی دایک و باوکی بووە، خوشک و برایەکی لەخۆی گەورەتری هەبووە لە دایکێکی تر. لای باوک و دایکی زۆر خۆشەویست دەبێ. چونکە ئەنکم منداڵی زۆر دەبێ و دەمرن، بۆیە نازێکی زۆر دەدەنە دایکم، لە تەمەنی منداڵیی کە لە پۆلی چواری سەرەتایی دەبێ، داواکاری دێت، هەرچەندە پێشتر باوکمی نەبینیوە لەگەڵ ئەوەی لە هەمان گەڕەکیش دەژیان، بەڵام دواتر خێزانێکی بەختەوەریان پێکهێناوە. سەرەتا هەندێ گرفتیان دەبێ بەهۆی ئەوەی دەچێتە ناو خێزانێکی ترەوە بە کولتووری جیاواز، بەڵام لەدواییدا بەهۆی نیشتەجێ بوونیان لە جێگای جیاجیا، زۆر پێکەوە دەگونجێن. پاش سێ ساڵ هاوسەرگیریی، دەچنە گۆمەشین لەبەرئەوەی باوکم لەوێ مامۆستا دەبێ و منیش هەر لەوێ لەدایکبووم، دوایی بەهۆی کاری باوکمەوە دەگوێزنەوە بۆ رانیە و کچێکی مامم و کوڕێکی مامم (حەبیبە و وریا) لەگەڵیان دەچن.

هەر لە رانیە، جۆگەیەک بە بەردەم ماڵی باوکم تێدەپەڕێ، دەگێڕنەوە هەر چاویان لێ غافڵ بکردمایە دەچوومە ناو جۆگاکە و لەناو ئاو دادەنیشتم، دایکم لەسەر ئەمە لێیداوم و منیش هانام بۆ ئەو دوو ئامۆزایەم بردووە، پێم وتوون: "هەوی یان لاوە عەیشێ کوتەوە" (هەوی حەبیبە و لاوەش وریا) بووە. لەناو من ماڵەکەیان دەگوێزنەوە بۆ شوێنێکی تر، دوایی کە گەڕانەوە بۆ کۆیە، بە تەنیا ماڵێک بە کرێ ئەگرن و چەند ماڵێکیش دەکەن تا خانووی ماڵی باپیرم دابەشدەکرێ.

ئێمە بە دایکمان دەڵێین: یایە (یایە، واتە خوشکی گەورە، لە سلێمانی دەڵێن باجی کە وشەیەکی تورکییە)، ژنێکی دڵپاک و دەست و دڵفراوان و ماڵکراوە و ئاکار سەخی بوو، پارە لە لای تەنیا بۆ خزمەتی خەڵک و هاوکاریی بووە. بیرم نییە بە تەنیا نانی خواردبێ، ئەگەر کەسی دەستنەکەوتایە نانمان لەگەڵ بخوات، خواردنی دەنارد بۆ ماڵە دراوسێ و خزمان و هەندێکجاریش دوکاندارە دراوسێکان. ئەگەر خواردنێکی خۆشی دروستبکردایە، بیری هەموو ئەو خەڵکانەی دەکەوتەوە کە حەزیان لەو خواردنە بووە.

ژنێکی مەدەنی و پێشکەوتنخواز بوو، باوەڕی بە مافی ژن و توانای ژن زۆر بوو، رقی لە خورافیاتی ناو ژنان بوو، هەڵگری بیری چەپ بوو بەئێستاشەوە. قسەی حەق و رەقە و موجامەلەی نادروست ناکات، کەسێکی خۆشبووێ بە دڵ خۆشی دەوێ و کەسێکی نەوێ پێوەی دیارە. بەرگری لە هەموو کەسێک دەکات بەتایبەت ئەگەر مافخوراو بێ جا ئیتر بیناسێ یان نەیناسێ، بۆیە زۆرجار نەمانوێراوە باسی کەس بکەین لە لای، یەکسەر بووەتە پارێزەری، ناومانناوە (محامیی بێ بەرانبەر) و تائێستاش هەر وای پێدەڵێین.

بەهۆی براکانییەوە کە هەڵگری بیروباوەڕی مارکسی دەبن، کاریگەرییان لەسەر دایکم جێدێڵن و کە مێردیش بە باوکم دەکات بەردەوام دەبێ و باوکیشم هاندەری دەبێ هەم بۆ زانیاریی گشتی و هەمیش بۆ ئەوەی بەردەوام بخوێنێتەوە. رۆحێکی گەنجانەی هەیە، هەرگیز سڵی نەکردووەتەوە لە فێربوونی زانیاریی نوێ و ئامێری نوێ و ژیانی هاوچەرخ، بە ژنێکی چەپ ناسراوە، باوەڕی بە هیچ شتێکی ناواقیعی نییە.

بەهۆی باوکم و براکانییەوە (خالید دلێر و شەهید جەعفەر)، لە سەرەتای تەمەنییەوە تێکەلاوی ژیانی سیاسی دەبێ و کاری سیاسیی ئێمەشی پەسەندکردووە و نەک ڕێگرمان نەبووە، بەڵکو هەمیشە دروشمی (ماف ئەسەنرێ نادرێ)ی هەڵگرتووە. لە خوێندن هانی داوین، دەیوت "با وەک منتان لێ نەیەت. واز لە خوێندن بێنن"، تائێستاش لە دڵی دەرناچێ کە بەهۆی شووکردن و بەخێوکردنی منداڵەوە خوێندنی تەواو نەکردووە. بەهۆی ئێمەوە تووشی دەیان دەردیسەری و ناخۆشی بووە و حەوت ساڵ لەگەڵ باوکم خۆی شاردووەتەوە و ئەم ماڵ و ئەو ماڵی کردووە، ژنێکی زۆر بوێر و چاونەترس بووە. مانای ترس نازانێ، بەردەوام لەڕێگای هاتووچۆی شاخ بووە بۆ سەردانمان، بەتایبەتی سەردانی شەهید ئازادی برام.

چەند جارێک تووشی بەسەرهاتی سەیر بووە، بەڵام بەئازایەتیی خۆی دەرباز بووە. لەو کاتانەی کە خۆی شاردووەتەوە، ڕۆژێک دەچێتە دوکانێکی ناسیاو و باوەڕپێکراو، لەوێ کە پەچەکەی هەڵدەداتەوە، (بەمەبەستی خۆشاردنەوە پەچە و عەبا بەکاردەهێنێ)، موختاری گەڕەکەکەی خۆمان دەیبینێ، سەرەتا دایکم تۆزێ دەشڵەژێ. لەدواییدا دەگەڕێتەوە و لەبەردەم دوکاندارەکەدا پێی دەڵێ "وەرە باپێت بڵێم، بەدوام بکەوی یان خەبەرم لێ بدەی بەخوا کوڕەکەم ڕۆحت دەکێشێ، لە هەر شوێنێک بی، خۆت دەزانی تازە موختارێکیان کوشتووە تۆش لەوە خراپتر لێ دەکەن". ئەویش دەڵێ "من چۆن خەبەر لە تۆ ئەدەم".

جارێکی تریش لەڕێگای سەردانی بۆ لای ئازادی برام لە دەشتی کۆیە، قاچاخچییەکە دەیباتە ماڵی جاشێک، پاش کەمێک دایکم دەزانێ کە ئەوانە جاشن، دایکم لێی دەپرسێت "ئەوە تۆ جاشیت؟" جاشەکە دەڵێ: "بەڵێ، بەڵام پەیوەندیم لەگەڵ پێشمەرگە هەیە و دڵت نەترسێ"، دایکم پێی دەڵێ: "جاش هەر جاشە، کوڕم تۆ گەنج و جوانی بۆ دەبی بە جاش ڕۆژێ وەک سەگ ئەتتۆپێنن". ئەویش دەڵێ "یا ئایشە، خوشکی شەهید جەعفەر نەبوویتایە دەمزانی چیم لێ دەکردی لەسەر ئەو قسانەت"، دایکم پێی دەڵێ "چیت لەدەستدێت بیکە، تازە من لەبەردەستتم". بەڵام لەکۆتاییدا کە دایکم دەڕوا، پێی دەڵێ "لێت تووڕە نابم، چونکە تۆ دایک و خوشکی ئەو دوو قارەمانەیت". دایکشم پەشیمان دەبێتەوە لە قسەکانی و دەگەڕێتەوە سەری ماچ دەکات و دەڵێ "دڵم گەرمە لێم ببوورە،

بەڵام حەیفە جاشیت"، دەڵێ "برۆ تا قسەی دیکەت نەکردووە"، ئیتر دەبێتە پێکەنین.

دەرمانی زۆری کۆدەکردەوە و دەیبرد بۆ ئازاد، چونکە ئازاد جگە لە کاری پێشمەرگایەتی دکتۆری پێشمەرگەش بوو. لەکاتی برینداربوونی کاک کۆسرەتدا دایکم لەناو هێزی پێشمەرگە دەبێ و ئەو دەرمانانەی کە بردبوونی هاوکار دەبن بۆ چارەسەرکردنی، بۆیە زیاتر بە گرنگی دەزانێ هەموو جارێ بە دەرمانەوە بڕوا.

جارێک لای شەهید ئازاد دەبێ کە تەیارە بۆردومانی ناوچەکە دەکات، دایکم گێڕایەوە و وتی "ئازاد، من و مەهابادی خستبووە ناو کونە تەیارە و خۆشی لەبەردەمی کونە تەیارەکە راوەستابوو، هەر زوو زوو پێمدەوت؛ کوڕم وەرە ناوەوە، بەڵام بەگوێی نەدەکردم. بۆردومانەکە زۆر سەخت بوو، ئەو رۆژە کاک کۆسرەت بریندار بوو، ئیتر ئێمە ئازادمان نەبینی، چونکە خەریکی چارەسەرکردنی کاک کۆسرەت بوو لەگەڵ دکتۆر زریان، هەر ئەو شەوە ئامێرێکی تیشک (الاشعه)یان لە رێگای رێکخستنەکانی یەکێتی لە هەولێرەوە هێنابووە سماقوڵی و پشکنینی کاک کۆسرەتیان پێکرد و بردیانەوە هەولێر، ئەو دەرمانانەی منیش بردبووم زۆر سوودی هەبوو بۆ بریندارەکان".

زۆرجار خزمان سەرزەنشتیان دەکرد کە بواری بە ئێمە داوە بچینە ناو سیاسەتەوە و قسەی ناخۆشیان پێدەوت، بەڵام هەرگیز گوێی بە قسەکانی ئەوان نەدەدا و زیاتر هانی دەداین، هەرچەندە زوو زوو دەیوت "ئاگاتان لەخۆتان بێت با چیتر جەرگم نەسووتێ".

لەکاتی شەهید بوونی ئازادا، بە تەنیا دەچێ و مۆڵەت وەردەگرێ لە خاڵی پشکنینەکان بۆ هێنانەوەی تەرمەکەی، بڕیار ئەدا نەگری لە بەرانبەر دوژمن و دەڵێن "لە یەک خاڵی پشکنین وا خۆی نیشاننەداوە کە دڵی دوژمن خۆش بکات".

بڕیار دەدات لەژیانیدا بازن لە دەست نەکات، زۆرجار دەیوت "ژن ئەگەر بزانێ بازن لەچییەوە هاتووە، وەک کەلەپچە لە دەستی ناکات".

ژیانی زۆر بە رێکی بردووەتەسەر و تائێستاش بە هەمان شێوەیە، کاژێر سێی دوای نیوەڕۆ قاوەیەک دەخواتەوە، رۆژ بوێری ناکات و لە هەمان کاتدا،

ڕۆژانی دووشەممە و پێنجشەممە ڕۆژی خۆشووشتنە و مەراسیمی خۆی هەیە، نانخواردنی بەیانی کاژێر (١١)ی بەیانییە و ڕۆژی دوو ژەم نان دەخوا، بۆیە نەیهێشتووە کێشی هەرگیز زیاد بکات.

تائێستاش خەریکی خوێندنەوەیە، هەرچەندە بەداخەوە زۆرجار دەڵێ "ئەوەی دەیخوێنمەوە بیرم نامێنێ". بەدوای هەواڵەوەیە لە تەلەفزیۆندا و بە کۆمپیوتەریش لە ڕێی سایتە کوردییەکانەوە.

دایکم دروومان و چنین و کاری قولاپ بە باشی دەزانێ و بەردەوام بەدەستیەوەیە و بێکار دانانیشێ.

ئارەزووی خوێندنەوەی هۆنراوەی زۆرە، زۆربەی جار بە دەنگی بەرز دەیانخوێنێتەوە، چێشتی دەستی زۆر خۆشە و زۆر شارەزایی لە چێشت لێناندا هەیە.

حەزی لە یاریی تاوڵە و کۆنکان بوو، باشیشی لێ دەزانین، هەرکەس دەهاتە ماڵەوە پێی دەوت "دەستێک کۆنکان ناکەیت؟" یان پێشنیازی یارییەکی شەترەنجی بۆ دەکرد. باوکم زۆرجار گاڵتەی لەگەڵ دەکرد و پێی دەوت "باشبوو پیاو نەبوویت، دەنا لە نادیی نەدەگەڕایتەوە".

زۆر شەو ئەگەر تاقەتی هەبوایە، چیرۆکی بۆ دەگێڕاینەوە، چیرۆکە کەلەپوری و ئەفسانەییەکان، هەندێکجاریش بە خەیاڵی خۆی بۆی دادەڕشتین، بۆیە هەندێکجار کە دادەبڕا، بیریدەچووەوە چۆن بوو یان چی ڕوویدابوو، ئێمەش دەمانوت ئاخر تۆ واتوت، پاشان دەگەڕایەوە سەری.

٩

له سەرەتای ساڵی ١٩٥٥ دایکم نەخۆشکەوت، تاکە دکتۆرەکەی نەخۆشخانەی شاری کۆیە، مەزەندەی نەخۆشیی سیلی لێکرد، ئەوساش ئەو نەخۆشییە وەک هەموو نەخۆشییە درمەکانی تر زۆربوو بەهۆی نەبوونی ڕێنمایی و ڤاکسین و کوتان، هەروەها هەژاری و کەمیی خۆراکی باش.

ئامێری تیشک و پشکنینی خوێن لە کۆیە نەبوو بۆ سەلماندنی ڕاستی و دروستیی مەزەندەکان. باوکم مامۆستا بوو، کەسێکی شارەزا و زانستی بوو، دەیزانی خۆپاراستن لەم نەخۆشییە چۆن چۆنی دەبێ. ئەوسا من و ئازادی برامیان هەبوو، باوکم ئیتر ئێمەی لە دایکم قەدەغەکرد، نەیهێشت چیتر لەباوەشمان بگرێ یان ماچمان بکات، واشیکرد دایکم پشوویەکی بەردەوامی هەبێ، تەنانەت لەگەڵ چێشتخانەیەک رێککەوتبوو (ئەوسا پێیاندەوت؛ لۆقەنتە) بەمەبەستی دروستکردنی ژەمی خواردنی نیوەڕوان بۆمان، زۆرجاریش باوکم ئێسقانی لای قەساب دەهێنایەوە و دەیکوتی و دەیکرد بە شۆربا و ئەیدا بە دایکم بۆ ئەوەی هێزی بەرگریی نەخۆشییەکەی زیادبکات.

لەو بیرەوەرییانەی ئەو سەردەمە، ئێوارەیەک باوکم وتی "نەرمین، دەزانی هیچ شتێ لێ بنێیت بۆ ئێوارە؟" دیاربوو دەیویست بەشداریم پێبکات، منیش وتم "بەڵێ، حەڵوا ئەزانم" هەموو هەنگاوەکانم پێوت بە هەڵەیەکی بچووکەوە، وتم "خوێی تێدەکەین". باوکم وتی "هەمووی راستبوو، بەس خوێی تێ ناکەین، وەرە بابچین بەیەکەوە دروستیبکەین"، لەگەڵ نانی ئێوارە داینا و بە دایکمی وت "ئەمە نەرمین لێیناوە"، دایکم دەستی کرد بە گریان، هەرگیز ئەو وێنەیەم بیرناچێتەوە و لە دەستخۆشیی زیاتر نەیتوانی هەستی خۆی دەرببڕێ. ئەمە وایلێکردم باوەڕێکی تەواو بەخۆم پەیدابکەم، دەچوومە ماڵی مامم کە دراوسێمان بوون، دەمویست چۆنێتی چێشت لێنانی ئاسانم فێربکەن.

جارێکیان فێریانکردم چۆن جلبرۆکە دروستبکەم، کە بریتیە لە پیاز و دۆشاوی تەماتە و هێلکە و هەرشتە، منیش دروستمکرد، بەڵام هێشتا چەقۆگرتنم نەدەزانی و نەمدەتوانی بەباشیی بەکاریبهێنم، پیازەکانم زۆر گەورە جنیبوون، بەڵام ئەوەندە دەستخۆشیم وەرگرت تەنانەت بوو بە باسی ناو خزمانیش. هەر لەوکاتەوە باوکم ئازادی برامی بردە لای ژنێک بۆ ئەوەی ئاگای لێبێت، ئەمە وایکرد من زووتر بچمە بەر خوێندن. لەدواییدا باوکم

هۆكاری نەهێشتنی بینینی دایكم لەلایەن خزمان و ڕێنەدان بە خزمەتكردنی و ئاگاداربوون لە ئێمەی بۆ باسكردم و وتی "نەمویستووە قسەیەكی ڕەق بەرانبەر دایكت بكەن و دڵی ئازار بدات"، دەمزانی لە ڕادەبەدەر دایكمی خۆشدەویست و هەستی ڕادەگرت.

كە پشووی هاوین هات، باوكم، دایكم و ئێمەی بردە بەغدا بەمەبەستی سەردانی دكتۆر دوای پشكنین، دەركەوت سنگی هەوێكی توندی كردبوو، سیل نەبوو (بە بۆچوونی من، سیلیش بووبێ بەهۆی ئەو هەموو بایەخپێدان و چاودێرییەی باوكمەوە باش بووبوو). كە دەركەوت ئەنجامی پشكنینەكە باشبوو، بەو بۆنەیەوە باوكم ئێمەی برد بۆ سێركێكی بیانی، ئەوە یەكەمجار بوو سێرك ببینم، دایكیشم دوای ئەو هەموو ماوەیە من و ئازادی برامی خستبووە سەر ڕانی و توند لە باوەشی گرتبووین، ئێمەش نەدەهاتینە خوارەوە تا سێركەكە تەواوبوو. دواییش چووینە لای وێنەگرێك لە گۆڕەپانی تەحریر، وێنەگرەكە كورد بوو و باوكم دەیناسی، وێنەی گرتین. ڕاستە ماوەیەكی ئازاربەخش بوو بەڵام ڕێڕەوی ژیانی ئێمەی بەرەو باشتر برد.

### بە منداڵی گەورە بووم!

هەندێ بیرەوەری هەن ناسڕێنەوە و ناچنە خانەی بیرچوونەوەوە، دەبن بە بەشێ لە ژیان و كاریگەریی لەسەر بۆچوون و ڕەفتاریش جێدەهێڵن. ساڵی ١٩٦٣ ڕژێمی بەغدا بڕیاری بۆمببارانی شاری كۆیەی دەركرد، خەڵكی كۆیە لە شەوێكی درەنگوەختدا شاریان چۆڵكرد، دایكیشم بڕیاریدا لەگەڵ خەڵكەكە بڕۆین و شار جێبهێڵین. باوكم نەخۆشبوو، بە نهێنیی بەرەو بەغدا بردبوویان بەمەبەستی چارەسەركردن. دایكیشم حەوت ڕۆژ بوو منداڵێكی كوڕی بووبوو و مردبوو، باری تەندروستی و دەروونیی زۆر خراپ بوو. لەگەڵ خەڵك بە تاكە ولاخێك بەرەو شاخ ڕۆیشتین و لە ئەشكەوتی دۆڵەمۆمن ماینەوە، دوای چەند ڕۆژێك دایكم زۆر پێویستی بە هەندێ كەرەستەی گرنگی ژیان هەبوو، ناچار منی بەو منداڵییە لەگەڵ هەندێ كاروانچی و خەڵكی تر ناردەوە بۆ كۆیە، بۆ ئەوەی بچمەماڵەوە ئەو پێویستییانە بهێنم.

هەر کە کەوتمەڕێ، ترس دایگرتم لە تەنیایی، لەوەی تاکە کچ و منداڵبووم لەنێویاندا. قسەم بۆ نەدەکرا، دەیان پرسیاریان لێدەکردم وەڵامم نەبوو بۆیان، رقم لە دایکم دەبووەوە چۆن دڵی هات من بە تەنیا بنێرێ، لەخۆم دەپرسی "تۆ بڵێی رقی لێم بێ یان بەهێزم و بڕوای پێمە؟"، سەدان پرسیاری بێ وەڵام، هەرچۆنێ بوو چووین و گەڕاینەوە بەرەو ئەشکەوتەکە، دیاربوو دایکم پەشیمان بووبووەوە لەوەی بە تەنیا منی بەڕێکردووە بەرەو شار. دوو خوشک و براکەمی لای خەڵک جێهێشتبوو و خۆی بە تەنیا هاتبووە سەر ڕێگا، کاتێ کە بینیم، ویستی باوەشم پێدابکات، منیش نەمهێشت، خۆم لە دەستی راپسکاند و بە مستەکۆلە وەشاندنەوە بەجێمهێشت و رۆیشتم بەرەو ئەشکەوتەکە، ئەویش بەدوامکەوت. کە گەیشتمە ناو ئەشکەوتەکە منداڵەکانم هێنایە لای خۆم، باوەشمان بەیەکدا کردبوو ئەتوت دەیان ساڵە یەکمان نەبینیووە، وام هەستدەکرد ئیتر من دەبێ ببم بە دایک بۆیان، دایکیشم لە دوورەوە دەگریا و سەیری دەکردین. دوای چەند رۆژێک بڕیاریدا ئەوێ جێبهێڵین و بە قاچاخ بڕۆین بەرەو بەغدا، دەشمزانی لەبەر منی بوو، بۆ ئەوەی بارم سووک بکات. ئەوسا کاک عومەر دەبابە بەرپرسی میحوەری کۆیە بوو، بە قاچاخ و بە لاری و بە جێبێکی سەوز بەرەو هەولێر رۆیشتین، لە ماڵی خزمێکمان دابەزین، لەوێشەوە چووین بۆ بەغدا بۆ لای باوکم. منیش رقم لە دڵدا نەمابوو، بەڵام هەستمدەکرد زۆر گەورەبووم و دەبێ زیاتر ئاگام لە هەمووان بێ.

باری ئابووریمان زۆر خراپ بوو، باوکم مووچەکەی بڕابوو، لەماڵێکدا دوو ژوورمان بە کرێ گرتبوو. کچی ماڵەکە لە کارگەیەکی گۆرەوی کاریدەکرد، رۆژێک داوام لێکرد بمبات بۆ کارگەکە بۆ ئەوەی بزانم کارم نادەنێ. خاوەن کارگەکە کە بینی من منداڵم دەستی بەسەردا هێنام و وتی "بۆ دەتەوێ کار بکەی؟" لەوەڵامدا وتم "باوکم نەخۆشە و دەیەوێ نەشتەرگەری بکات و پارەشمان نییە"، پێی وتم "دەوڵەت ناهێڵێ منداڵ لێرە کاربکەن، هەرچەندە تۆ گەورەیەکی لە بەرگی منداڵدا". ئەو قسەیە ئەوەندەی تر منی خستە ژێر باری بەرپرسیارێتی. ئەوکات دایکم پارەی ئەدامێ بچم کەرەستەی رۆژانە بکڕم و پێشیدەوتم "خۆت ئارەزووت لە چییە ئەوە بکڕە"، بیرمنایەت شتێکی منداڵانەم

بۆ خۆم کریبی، دەموت "هەر شتێک بکرم دەبێ بۆ هەموومان بێ"، دایکم هەندێکجار بەزەیی پێمدا دەهاتەوە، بەڵام من خۆم زۆر لەوە گەورەتر دەبینی کە جێی بەزەییم.

پۆلی سێی ناوەندیم دوور لەماڵەوە ساڵێکی پڕ تەنیایی بوو، هەرچەندە مامۆستا تایەر تۆفیق و حەوا خانی خێزانی و پورە عیسمەتی دایکی مامۆستا تایەر زۆر هەستی پڕ لە جوانی و خۆشەویستییان پیشان ئەدام، بەڵام بۆ کچێک لەو تەمەنەدا هێشتا دایک و باوک و خوشک و برا پێویستیی سەرەکیی ژیانن.

لە گەڕانەوەم بۆ هەولێر، هاتووچۆ ئاسان نەبوو، باوکم خێزانێکی پەیداکرد و لەگەڵ ئەوان گەڕامەوە. ئەو ساڵە زۆر کەس هاوکارم بوون، بەڕێوەبەری خوێندنگاکەم (مامۆستا لوتفیە) و مامۆستاکان بە گشتی ڕێزی تایبەتییان لێدەگرتم، ناوەناوە بەڕێوەبەرەکەم بانگی دەکردم بۆ هەواڵپرسین و پێداویستییەکانم، خوێندکارێکیش لە پۆلەکەمان بوو بەناوی پاکیزە محەمەد، بەرپرسی یەکێتی قوتابیانی کوردستان بوو، زۆر هاوکارم بوو، وەک خوشکێکی گەورە ڕەفتاری لەگەڵ دەکردم و چەند جارێک لەگەڵم دەهات بۆ بازاڕ بۆ کڕینی پێداویستییەکانی خۆم. دوو هاوڕێشم هەبوون بەناوەکانی نەسرین قادر قرگەیی و پەروینی خوشکی، هاتووچۆی ڕێگای خوێندنم لەگەڵ ئەوان بوو، باوکیان کەسێکی کوردپەروەر بوو، لەگەڵ ئەو هەموو تەنیایی و دوورییەش توانیم پۆلی سێ بە سەرکەوتوویی ببڕم.

لە کاتی پشووی نیوەی ساڵ، زۆر ئارەزووم بوو بگەڕێمەوە کۆیە بۆ سەردانی ماڵی باوکم، ئەوکات هێشتا ڕێگا ئاسایی نەبووبووەوە، دەبوایە بە ڕێگای قاچاخ بڕۆیشتمایە. کە بیرۆکەکەم بە مامۆستا تایەر تۆفیق وت، ئەو وتی "بابزانم چۆن دەبێ" لەگەڵ خاوەن لۆرییەکی هاتووچۆی نێو شارەکان قسەی کردبوو، لەگەڵی ڕۆیشتم، لۆرییەکە پڕبوو لە پیاو، من تاکە کچ بووم لەنێوانیاندا، دیسانەوە تەنیا مامەوە لەگەڵ ئەو هەموو پیاوە نەناسراوە. کچێکی (١٤) ساڵان مێشک پڕکراو لە ترس بەرانبەر بە پیاو، لە پێشی ئۆتۆمبێلەکە دوو پیاوی پیری تێدا دانیشتبوون، بۆیە بە ناچاریی منیان خستە دواوەی لۆرییەکە. وەرز زستان بوو، ڕێگای قاچاخ

قوڕاویی بوو، سەرما هەموومانی گرمۆڵە کردبوو، لۆرییەکە هەڵتەک و داتەکی پێدەکردین، ڕێگای دوو کاژێری بە نزیکەی (١٢) کاژێر بڕی. لە قوژبنێکی لۆرییەکەدا دانیشتبووم و خۆم گرمۆڵە کردبوو، بە بەتانییەکی پیسی دڕاو خۆم داپۆشیبوو، نەمدەوێرا چاو بنێمە خەو لەتاو تەنیایی و ترس لە پیاو. پیاوەکان، لەو شەوە تاریکەدا، لەگەڵ ئەو هەموو هەڵتەک و داتەکە، بەسەریەکدا لاربووبوونەوە و سەریان بەملا و بەولادا دەکەوت. هەموو ڕێگاکە، بیرم لەوە دەکردەوە ئەگەر پیاوێک لێم نزیکبێتەوە چۆن خۆم ڕزگار بکەم؟ چۆن هاوار بکەم؟ تۆ بڵێی پیاوێکی باشی تیا نەبێ؟ تۆ بڵێی بە سەلامەتیی بگەین؟ بێگومان ئەمانە بیرکردنەوەی هەموو کچێکی تەنیایە لە دۆخێکی لەو چەشنەدا.

لەنیوە شەودا لۆرییەکە لە قوڕدا چەقی، ئیتر خاوەن لۆرییەکە هەموومانی دابەزاند بۆ ئەوەی بتوانن لۆرییەکە لە قوڕ دەربهێنن، ئاگرێکیان کردەوە، نەمدەوێرا نزیک بکەومەوە، زۆر پەشیمان بوومەوە کە ئەو ڕێگایەم بڕی، هەموو چیرۆکە ترسناکەکانی منداڵیم کەوتبوونەوە یاد، تا گەورەش بووم ئەو ترسە زۆرجار دەبووە خەونیکی ناخۆش بۆم، ئێستاش کە باس لە ترس دەکەم ئەو یادەوەرییە دێتەوە بەرچاوم. هەموو ژیانم لە مردن نەترساوم، تەنیا لە ڕووداوی نەخوازراو نەترسم کە بەرۆکی مرۆڤ دەگریێ، هەربۆیەش ئەم یادەوەرییەم لە شەوی (٢٣- ٢٠١٩/٣/٢٤) نووسیووە، شەوێکی زریان و باراناوی، کەشە ساردەکەی و ترسی لافاو دیسانەوە ئەو شەوەی هێنایەوە بەرچاوم.

بۆ پۆلی چواری ئامادەیی گەرامەوە کۆیە، یەک خوێندنگای ئامادەیی کرایەوە و کوڕ و کچ تێکەڵ بوون، کچان هەموومانیان لەدواوە قەتیس کردبوو، کاتێ لەناو کوڕان دەمانخوێند. جارێک بەڕێوبەرەکە بە باوکمی وتبوو "تەنیا کچەکەی تۆ عەبا ناپۆشێ". ئەویش وتبووی "ئەمە چ داواکارییەکە، یەکەم کچەکەم لەناو کوڕان دەخوێنێ، دووەم کچ کچی من بێ چۆن عەبا ئەپۆشێ؟ سێیەم کچەکەم منداڵە چۆن داواکاریی وا دەکەی؟!".

ماوەی دوو مانگ لەو خوێندنگایە بووم، باوکم ڕاژەکەی گواستەوە بۆ هەولێر، بە ڕاپۆرتی پزیشکیی وازی لە مامۆستایەتی هێنا، لە پەروەردە بووبوو

به بەڕێوەبەری (هاتوو و ڕۆیشتوو) و منیش چوومە خوێندنگای سەلاحەدین و لە هەولێر نیشتەجێبووین وماینەوە، ئیتر نەگەڕاینەوە بۆ کۆیە.

کاتێ لە پۆلی سێی ناوەندی دەرچووم، باوکم بەهۆی باری تەندروستیی، ئارەزووی بوو بچمە خانەی مامۆستایانی سەرەتایی و منیش زۆرم پێ ناخۆش بوو، ئارەزووم وابوو زانکۆ تەواوبکەم، لەو داواکارییە دایکم زۆر هاوکارم بوو، پشتی منی گرت و چوومە ئامادەیی، باوکم وتی "باشە، بەڵام دەبێ هەوڵبدەی نمرەی پزیشکیی بەدەستبهێنیت".

له خانوویەکی بن تاقانە لە شاری کۆیە، برایەک، چاوگەش و قژڕەش، لە ١٦ی حوزەیرانی ١٩٥٣، چاوی بەدونیا هەڵهێنا، ناویاننا ئازاد. من تەمەنم سێ ساڵان بوو، یارمەتی دایکم ئەدا بۆ لانک (بێشکە) ڕاژەندن و شووشتنی پەڕۆکانی و ئامادەکردنی مەمەی شیرەکەی، لەبیرمە مەمەکەی شووشە بوو، لە باری درێژیدابوو، هەردوو سەری شووشەکە مەمەی لاستیکی پێوەبوو.

دێتە بیرم لەبەر گەرمیی ئەو هاوینە، بۆ یەکەمجار بوو پانکە بکڕین و بێتە ماڵمانەوە، پانکەکە ناوی فان بوو، هەر بەو ناوەش بانگ دەکرا (فان بێنە فان بەرە) تا چووینە هەولێر هەر مابوومان. ئەوسا فێنککەرەوە تەنیا باوەشێن بوو، بە شێوەی جوان نەخشیان لەسەر دەکرد، لێوارەکەیان بە پەڕۆ و گوڵێنکە دەڕازاندەوە، لە ماڵە گەورەکانیشدا باوەشێنێکی گەورە بە بنمیچەوە بە پەتێک دەبەسترا و رادەکێشرا بۆ فێنککردنەوەی هەموو ژوورەکە، هەندێ شوێنیش پووشیان دەخستە ناو قامیش یان تەختە و لەناو پەنجەرە دائەنرا و بە ئاو تەڕدەکرا بۆ ئەوەی هەوای فێنکی لێ بێتە ژوورەوە.

ئازاد، وەک یەکەم کوری ماڵەوە، بەهۆی نازی زۆری خزمانەوە کە تۆزێ گەورە بوو، منداڵێکی بزێوی لێدەرچوو، وەستانی نەبوو، زۆر داوای یاری و چوونە دەرەوەی دەکرد. ناوبەناو لەسەر جۆری یاریکردن شەڕمان دەکرد، ئارەزووی بوو یاریی کورانەی لەگەڵ بکەم.

لە تەمەنی چوار ساڵیدا پاسکیلیان لە بەغدا بۆ کڕی، ڕۆژ هەتا ئێوارە بەو پاسکیلە لە کۆڵان بوو، یان ماڵی مامم بە ولاخ دەیانبردە دەشتودەر. لە تەمەنی پێنج ساڵی بردیان بۆ باخچەی ساوایان، ئەوەش یەکەم باخچە بوو لە کۆیە بکرێتەوە.

زۆرجار بەیەکەوە بیری شێتانەمان بۆ دەهات، بەتایبەتی بۆ ئازاردان و رابواردن بە خەڵک، یەکێک لەو کەسانەی کە ئازارمان دەدا کارگوزارێکی نەخۆشخانەی کۆیە بوو. ڕێی هاتووچۆی لای ئێمەوە بوو، هەرچەند دەگەیشتە لای ماڵی ئێمە دەکەوتە جوێن بە دایکم و بە ئێمە و بەردێکیشی بەدەستەوەبوو، هەرچەند جوێنی دەدا دایکم لە ئێمە تووڕە دەبوو و دەیوت "دەک رووتان رەشبێ ئەم هەموو جوێنە لە پای سەری ئێوە دەخۆم". ئەگەریش ڕۆژێ بە لای ئێمەدا تێنەپەڕیایە دایکم وایدەزانی شتێکی لێ ونبووە، ئێمەش تووڕەمان دەکرد و دەمانوت "بیری جوێنەکانی دەکەی". ئیتر راوەدوی دەنایێن.

ئەو سەردەمانە مال بە سۆپای دار یان بە نەوت گەرم دەکرا، داریش زەخیرە دەکرا و هەڵدەگیرا بۆ زستان و چێشت لێنان و نانکردن و ئاو گەرمکردن، جارێکیان دارفرۆشێک بە باری کەرەوە بارێکی پێ بوو، دایکم رایگرت و ویستی لێی بکڕێ، ئازادی برام هاتە دەرەوە بە پیاوەکەی وت "مامە ئەوە چییە بە سمێڵتەوە؟" پیاوەکەش دەستی برد بۆ سمێڵی و ئازاد وتی "هەی بە سمێڵت" هێشتاش نازانین پیاوە بۆ لێمان شێت بوو کەوتە بەرد هاویشتن و جوێندان و کۆکردنەوەی دارەکان و وتی "من دار بە ئێوە نافرۆشم"، هەرچەند دایکم دەیویست هێوری بکاتەوە و دەیوت "ئەمە منداڵە"، بەلام مامەی دارفرۆش رۆیشت تا لەچاو ئاوا بوو جوێنی پێ ئەدایین، بەو هۆیەوە من لەجیاتی ئازاد لێدانم خوارد، چونکە ئازاد لەدەستی دایکم رایکرد، دایکیشم دەیوت "ئەم کەتنانە هەمووی لە ژێر سەری تۆدایە".

من خۆم یەک گوناهم هەبوو، بەیتو بالۆرەم بۆ خەڵک رێکدەخست و فێری ئازادم دەکرد، ئەویش بە خەڵکی دەوتەوە، دایکم دەیوت: "ئەمانەش خەتای تۆن".

نازەنینیشی کردبوو بە هاوکاری خۆی لە شەرە گەڕەک، وەک کوڕ رەفتاری پێ دەکرد، بۆ خوێندنیش کوڕێکی ئەهل و ئاسان نەبوو، بە زۆر وانەکانی دەخوێند، هەندێکجاریش وەک حوکمی قەرەقۆش دەیوت "دەبێ نەرمین شیعرەکان یان ئایەتی قورئان لەبەر بکات ئەوسا منیش لەبەریدەکەم". کە گەورەش بوو هەمان رەفتاری هەبوو لەگەڵمدا، ناوەناوە تووڕەی دەکردم، تەنانەت کاتژمێری لەبن سەری من دادەنا بۆ ئەوەی بۆ قوتابخانە هەڵیبستێنم.

ئەو هەموو بۆڵە بۆڵەشمان هەبوو، بەلام بێ یەکیش هەڵمان نەدەکرد، کە گەورەش بووین، بووین بە دوو هاوڕێی زۆر نزیک.

ئازاد کوڕێکی خزمدۆست و قسەخۆش و نوکتەئامێز بوو، هەروەها کوڕێکی زۆر قۆز و ئیشکەر و کوردپەروەر و رۆشنبیر و خوێندەواری لێدەرچوو.

رەفتاری زۆر لە شەهید جەعفەر دەچوو، ئەندامێکی کارای کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستان بوو، لە ساڵی ١٩٧٤ کە خوێندکاری قۆناغی دووەمی پەیمانگای پزیشکی بەشی تیشک بوو، دوو سێ مانگی مابوو دەربچێ بوو بە پێشمەرگە. کە شۆڕش هەڵوەشایەوە و گەڕانەوە، جارێکی تر لە پەیمانگا

وەریانگرتەوە و لە تاقیکردنەوە دەرچوو و لە یەکەمەکان بوو. ئەوکاتەی نەفییان کرد بۆ (عەفەک)ی سەر بە پاریزگای دیوانیە، لەوێ لە نەخۆشخانەی ئەو شارە کاریدەکرد، زۆر خۆشەویست بوو، جێگەی خۆی لەناویاندا کردبووەوە، هەندێکجار بەگاڵتەوە دەیوت "کە نامەتان نارد بنووسن (عەفەک – ئازاد) دەگاتە دەستم"، بەڵام بە راستییش وابوو.

ساڵی ١٩٧٩، دوای لێبووردنی گشتی، گەڕایەوە هەولێر لە نەخۆشخانەی (سی) کاریدەکرد، یاریدەدەری پزیشک بوو بۆ تیشک. ئەو ماوەیە ئێمە زۆربەی جار کاتی سەردانی زیندان لە بەغدا یەکترمان دەبینی.

لە ساڵی ١٩٨٢، جارێک لەگەڵ ئامۆزایەکم (عەبدوڵلا) سواری پاس دەبن، دوو جاش دێنە ناو پاسەکە و داوا دەکەن جێگایان بۆ چۆڵ بکەن و ئازادیش قبوڵی ناکات و لێیان دەبێ بە شەڕ، ئازاد دەچێ لای پۆلیس سکاڵا تۆماردەکات. دوای ئەو رووداوە ئازاد پەیوەندی بە کاک کۆسرەت رەسوڵەوە دەکات، ئەویش دەمانچەیەک و کلاشینکۆفێک و نارنجۆکێکی بۆ دەنێرێ، ئازاد لەگەڵ شێخ خالیدی هاوڕێی کە بەیەکەوە لە نەخۆشخانە کاریانکردووە، پلانی ئەوە دادەنێن کە بچنە سەر ماڵی جاشەکە. شێخ خالید ئۆتۆمبێلەکەی خۆی دەهێنێ، سەرەتا بەیەکەوە دەچنە نادی بۆ ئەوەی خەڵک بیانبینێ، دوایی دەچنە سەر ماڵی جاشەکە، ئازاد لەسەری کۆڵانەکە دائەبەزێ و دەچێتە ناو کۆڵانەکە و نارنجۆکەکە فڕێدەداتە حەوشەی ماڵەکە، ماڵە جاشەکە لە بەردەرگا دەستدەکەن بە تەقە و ئازادیش بۆ پاریزگاریی لەگیانی خۆی دەست بە تەقە دەکات و دەگەڕێتەوە لای خالید کە چاوەڕێی دەبێ و دەچنەوە نادی. دوای دوو رۆژ لە رادیۆی گەلی کوردستان وەک چالاکیی بڵاودەکرێتەوە. ئەمن، دەچنە ماڵی باوکم و بە باوکم دەڵێن "ئازاد لەو ماڵە جاشە زویربووە، بابێت ئاشتیان دەکەینەوە". ئازاد هەر کە ئەمە ئەزانێ دەڕوات و پەیوەندیی بە هێزی پێشمەرگەوە دەکات.

جارێکی تر دەچنەوە بۆ لای باوکم، باوکم دەڵێ "نازانم کوڕەکە گەورە بووە و پرسم پێناکات". پێی دەڵێن "بابێت ئاشتیان دەکەینەوە با نەچێ بۆ کاری (عصابات)".

کاتێک ئازاد دەچێتە دەرەوە پەیوەندی بە سەرکردایەتییەوە دەکات، کاک نەوشیروان دەینێرێتە کوردستانی رۆژهەلات وەک هێزی پشتیوانیی بۆ

هاوکاریی هێزەکانی پێشمەرگەی رۆژهەڵات دژ بە کۆماری ئیسلامی. دوای گەڕانەوەیان، کاک نەوشیروان بانگی دەکات و پێی دەڵێ "تیپێکمان هەیە بەناوی تیپی ٤٤ی چەکوش، برۆ بە هەر شێوەیەک بێ رێکخستنی کۆمەڵە لەناویاندا دروستبکە".

لەوێ کاک قادری خاڵۆزامان دەبینێ و ئاگاداری دەکاتەوە بۆ ئەوەی زیاتر ئاگای لەخۆی بێت. تیپی ٤٤ی چەکوش، هێزەکانی شێخ سەدرەدین، لە (١٦٠) پێشمەرگە زیاتر دەبن و زۆربەی چەکەکانیان شێخ بە توانای مادیی خۆی کڕی بووی. نزیکەی دوو ساڵ لەوێ دەمێنێتەوە و ساڵی ١٩٨٣، دەبێتە رابەر سیاسیی تیپی ٩٣ی دەشتی کۆیە. ئەوکاتە دانای ئەحمەد مەجید سەرتیپ دەبێ و دوای ئەویش کاک رەهبەری سەید برایم سەرتیپ دەبێ و دلاوەری ئەحمەد مەجید جێگری دەبێ، لەوێ دەمێنێتەوە تا کاتی ئەنفال، جگە لە کاری سیاسی کاری دکتوریش دەکات و دەیان برینداری چارەسەر کردووە.

لەکاتی گفتوگۆی ساڵی ١٩٨٤، هەرچەندە مام جەلال لە کۆبوونەوەی سورداش لە٣٠ی نیسانی ١٩٨٤، ئاگاداری کردبوونەوە کە نەچنە ناوشار، بەڵام ئازاد بە کاک رەهبەری سەید برایم دەڵێ "بابچین سەردانێکی خاڵم (خالید دلێر) بکەین بزانین بۆ ئەوەندە رەخنەی لە کۆمەڵەی رەنجدەران هەیە"، چوار کەس دەبن (رەهبەری سەید برایم، هاوڕێ جەبار، ئازاد، پشتیوانی مام هەمزەی فەرشفرۆش)، ئازاد کە رابەر سیاسیی تیپی ٩٣ی دەشتی کۆیە دەبێ، پیکابێکی دەبڵیان پێ دەبێ و ئەو دەیئاژوێ، (پێشتر لە باخی گشتیی سلێمانی تەقە لە سالار عەزیز و بەکری حاجی سەفەر کرابوو و شەهیدێکیان هەبوو بەناوی عەبدولڕەحمان)، کاتێ ئازاد و هاوڕێکانی دەگەنە تاسڵوجە، دەکەونە کەمینی جاشەکانەوە و تەنیا سێ دەمانچە و یەک کلاشینکۆفیان پێدەبێ. ئازاد ئۆتۆمبێلەکە دەئاژوێ، کاک رەهبەریش لایەوە دەبێ، لێپرسراوی مەفرەزەکە لە تەنیشت کاک رەهبەرەوە دائەنیشێ و یەکێکی تر لای هاوڕێ جەبار و پشتەوەش پردەکەن لە جاش و پێیانوتبوون: "دەتانبەینە شوێنێک (ناوی شوێنەکەم بیر نەماوە)". کە دەگەنە بەردەم نەخۆشخانەی فریاکەوتنی سلێمانی پێشمەرگەیەکی زۆری لێدەبێ، پێشمەرگەکان دەستیانکردووە بە تەقە و ئەوانیش لە ئۆتۆمبێلەکەدا دەبن، لەو شەڕەدا کە لێپرسراوی رێکخراو

(مسؤل المنظمه) دەکوژرێ، ئازادی برام و کاک پشتیوان یەکی ١١ فیشەکیان بەردەکەوێ، هەروەها کاک رەهبەر دوو فیشەک و هاورێ جەباریش فیشەکێکی بەردەکەوێ و ئیتر قوتاریان دەکەن. کاک دانای ئەحمەد مەجید لەوێ دەبێ، ئەگەر هیمەتی دکتۆرەکان نەبوایە رزگاریان نەدەبوو، هەموو نەخۆشخانە و دکتۆرەکان هەوڵی بێوچان دەدەن بۆ رزگارکردنیان. ئەو رۆژە ١٢ چەکداری جاش و حکومەت دەکوژرێن، هەرچەندە گفتوگۆ هەبوو، بەڵام وەک ئەوە وابوو شەر بەردەوامبێ، هەندێ لەو رووداوە کاک رەهبەری سەید برایم بۆی گێراومەتەوە.

هێشتا برینەکانی ئازاد بەباشیی چاک نەبووەتەوە، موفاوەزات تێکدەچێ و دەگەڕێنەوە ناو پێشمەرگە. لە نەخۆشخانەی سورداش چارەسەر دەکرێت و دەچێتەوە سەر کارەکەی خۆی وەک رابەر سیاسی.

کاک دلاوەری ئەحمەد مەجید بۆی گێرامەوە، جارێک لەگەڵ ئازاد و کاک زێوەر هەر سێکیان لە سەرکردایەتی دەبن، دەیانەوێ بگەڕێنەوە، کاک زێوەر کە شارەزای ناوچەکە دەبێ، دەڵی "با بە چیای ئاسۆسدا بگەڕێینەوە"، بەڵام بەهۆی بەفربارینی زۆرەوە رێگا دیندەکەن، بەفربارینیش بەردەوام دەبێ، ئازاد دەڵێ "دەزانن ئێستا چی خۆشە؟ حەڵوای بەشەکر گەرمت بکاتەوە" ئەوانیش دەڵێن "ئازاد جارێ با رێگا بدۆزینەوە"، دوای ماوەیەکی زۆر دەکەونەوە سەر رێگای راست و بە شەکەتی و ماندوییەکی زۆرەوە رزگاریان دەبێ. کاک دلاوەر دەیوت "لە هەموو ناخۆشییەکاندا ئازاد لە قسەی خۆش نەدەکەوت و زۆر ورە بەرزبوو".

وەک باسمکرد، شەهید ئازاد، لەپاڵ کاری سیاسی، کاری دکتۆریشی دەکرد و دەیان بریندار و نەخۆشی چارەسەر کردووە، لە کاتی برینداربوونی کاک کۆسرەتدا، لەگەڵ دکتۆر جبا و دکتۆر زێوەر لای دەبن. ئازاد، گروپی خوێنەکەی (+O) بوو، بۆیە رێژەیەکی زۆری خوێنی خۆی دەبەخشێتە کاک کۆسرەت. دواتر، زۆرجار کاک کۆسرەت بە منی دەوت "خوێنی براکەت لە جەستەمدایە".

ئازاد، لەگەڵ ئەوەی کورێکی قسەخۆش و دەم بە پێکەنین و خۆشەویست و خزمدۆست و دەست و دڵ باش بوو، باوەڕی زۆری بە کۆمەڵە هەبوو، بەردەوام دەیوت "دەبێ بیروباوەڕی کۆمەڵە باش بپارێزین، چونکە لەماڵەکانی ئێمەومانان چاوی کردووەتەوە".

شەهید ئازاد، تا کاتی ئەنفال لە دەشتی کۆیە دەبێ و خێزانەکەشی لەگەڵی دەبێ، لەبەرئەوەی ئەو ناوچانە شوێنی خێزانی تیا نامێنێ، دەیەوێ بیانباتە ئێران، لە ٨ی ئازاری ١٩٨٩، لە ڕێگا ئۆتۆمبێلەکەیان وەردەگەڕێ و خۆی و ژنەکەی شەهید دەبن و منداڵەکانی (سەنگەر و دەبان) بریندار دەبن. پێشمەرگەکان و خزمان کە ئەوسا ئەوانیش پێشمەرگە بوون دەگەنە سەر ڕووداوەکە، منداڵەکان دەبەنە نەخۆشخانە و دوای ئەوە دەیانگەڕێننەوە بۆ لای دایکم، سەنگەر تەمەنی پێنج ساڵ و دەبان حەوت ساڵ دەبن.

پاش ماوەیەک دایکم دەچێتە ناو پێشمەرگە و تەرمەکانیان بە هاوکاریی پێشمەرگە و خزمان دەهێنێتەوە بۆ کۆیە، بۆشیان نەبوو پرسە دابنێن. ئەوسا ئێمە لە سوید دەژیاین، لە کار گەڕامەوە ماڵەوە کاک نەوشیروان مستەفا لە ئێرانەوە تەلەفۆنی کرد و قسەی لەگەڵ دارۆ کرد و ڕووداوەکەی پێوت. من یەکسەر زانیم کە شتێکی زۆر خراپ ڕوویداوە و بەپەلە رامکرد تەلەفۆنەکەم لێوەرگرت و قسەم لەگەڵ کاک نەوشیروان کرد، ئەویش یەکسەر بۆی باسکردم، ئیتر بەهۆی ئەو هەواڵە ناخۆشە ئاگام لەخۆم نەما. هیچ چاوەڕێی ڕووداوێکی لەوجۆرە نەبووم، چەند ڕۆژێک پێش ئەوە نامەی ئازادم پێگەیشتبوو. کە باسی کردەوەی ئەنفالە بەدناوەکەی بۆ کردبووم و چاوەڕوانبووم لەسەر ڕۆشنایی ئەو نامەیە چاوپێکەوتنی ڕۆژنامەوانی بکەم و لەگەڵ هەندێ ڕۆژنامە قسەم کردبوو. ئەم ڕووداوە شۆکێکی زۆر گەورە بوو، لەلایەک ئازاد و ژنەکەی (مهاباد) بەیەکەوە ڕۆیشتن، لە لایەکی تر دوو منداڵی بێ باوک و دایک بەجێمابوون، هەرچەندە زۆربەی کات ئەو دوو منداڵە و مهابادیش بەتایبەت کە ئازاد پێشمەرگە بوو هەر لای دایکم بوون و خۆیانشاردبووەوە. بەڵام کە قەدەر هات گەڕانەوەی بۆ نییە.

### یەکەم ئامێری تیشک لە شاخ

لە کاتی گرتنی شارۆچکەی تەقتەق لە ١ی حوزەیرانی ١٩٨٧، لەلایەن هێزەکانی مەڵبەندی سێ، ئامێرێکی تیشک دەکەوێتە دەستی هێزەکانی پێشمەرگە. شەهید ئازاد دەچێتە دیوی ئێران و لەوێ پێداویستییەکانی ئەو ئامێرە دەهێنێ و دەگەڕێتەوە. لە سەرەتای مانگی ئاب دەچێتە لای شەهید عەبدولڕەزاق داوای دوو پێشمەرگە دەکات لەگەڵی بنێرێ بۆ ئەوەی بچن ئەو

ئامێره له تەقتەقەوه بهێنن بۆ مەڵبەندی سێ، ئەویش دوو پێشمەرگه بەناوەکانی (محەمەد حاجی و کەنعان)ی لەگەڵ دەنێرێ. کاک محەمەد حاجی بۆی گێڕامەوه و وتی «ئامێرەکەمان له سماقوڵییەوه بەرەو نازەنین به تراکتۆر برد، دوای ئەوه ڕێگای تراکتۆر نەما و دەبوایه به خاڵی پشکنینی ڕژێمدا تێپەڕین، ئەو کارەش سەرکێشییەکی زۆر گەورەی دەویست و کارێکی سەرسەختانه بوو. هاتین ئامێرەکەمان بەسەر تراکتۆرەکەوه به پوش و گیا داپۆشی و داوامان له شارەزایەک کرد لەگەڵ تراکتۆرەکه بڕوا بۆ ناوچەی زینەتێ، لەکاتێکدا به ڕێگادا دەڕۆن ورده ورده پوش و پەلاشەکەی لەسەر لادەچێ و لایەکی ئامێرەکه دەردەکەوێ، شارەزاکه که ئەمه دەبینێ یەکسەر دائەبەزێ و هەڵدێت، دەڵێ حکومەت ئەمه ببینێ یەکسەر له سێدارەمان ئەدات، بەڵام باشبوو له خاڵی پشکنینەکەی ڕژێم تێپەڕیبوون، ئەمه کردەیەکی سەرسەختانه بوو، کارێکی ئاسان نەبوو، بەڵام هیچ چارمان نەبوو، له زینەتێ به تراکتۆرەکه گەیشتینەوه و به هەمان تراکتۆر بردمانه خەتێ".

هەروەها کاک محەمەد ئەوەشی گێڕایەوه "ئەو کاتەی بەڕێگاوەبووین بۆ هێنانی ئامێرەکه، کاک ئازاد بەهۆی ئەوەی هێشتا برینداربییەکەی قاچی باش نەبووبوو، ئەو سواری وڵاخ بوو و ئێمەش پیادەبووین. له ڕێگا لێمپرسی؛ کاک ئازاد تۆ برایەکت هەیه بەناوی هاوتا؟ شەهید ئازاد جڵەوی وڵاخەکەی توندکرد و وەستا، وتی "هاوتا چۆن دەناسی؟" پێموت "برادەرمه و ئەو باسی تۆی بۆ کردووم". ئیتر دابەزی و باوەشێکی گەرمی پیاکردم، وتی "بۆنی هاوتات لێدێت". له ڕێگا ورده ورده لەگەڵمان کرایەوه و خۆی ئاسا کەوته گاڵته و نوکته و قسەی خۆش، ئەو ڕێگا زەحمەتەی لا کورتکردینەوه. منی ناونا حەمه و کەنعانیش ناوی ڕێکخستنی (هەژار) بوو، کوڕێکی تۆزێک بەخۆبوو، پێیوت "چۆن ناوت لەخۆت ناوه هەژار، هەژار دەبێ لەڕ و لاواز بێ و کێشی (٤٠-٥٠) کیلۆ بێت".

ئیتر هەرچۆنێک بێ ئامێرەکه دەگەیەننه خەتێ، ئەوسا ئامێری تیشک لەناو پێشمەرگه نەبوو، هەر برینداریک دەبوایه بۆ تیشکگرتن بچێته تاران یان به نهێنیی بۆ ناوشار، تەنانەت له کاتی برینداربوونی کاک کۆسرەت ڕەسوڵ له سماقوڵی، ڕێکخستنی ناوشار ئامێرێکی تیشکی سەفەری به نهێنیی دەهێنن

و پشکنینی کاک کۆسرەتی پێدەکەن و هەر ئەو شەوەش دەیگەڕێننەوە نەخۆشخانەی هەولێر.

شەهید ئازاد، محەمەد حاجی و کەنعان فێری تیشکگرتن دەکات و دەبنە بەرپرسی ئەو ئامێرە.

دوای ئەوەی رژێمی بەعس لە جینۆسایدی ئەنفالدا لە هەموو لایەکەوە هێرش دەکاتە سەر مەلبەندی سێ، محەمەد حاجی و سەردار عەبدولکەریم کە ئەندازیار دەبێ، بەیەکەوە ئامێرەکە پارچە پارچە دەکەن و ژمارەیان لێدەدەن بۆ ئەوەی بتوانن بیبەستنەوە، پاشان بە تراکتۆر دەیبەنە لای بلەی سەروو لەوێشەوە لەناو چەند دارە مەیتێک دایئەنێن و بە دیلەکان دەیگوێزنەوە بۆ ئەشکەوتی مەلەکان. گوێزانەوەی بە ولاخ نەدەکرا، چونکە رێگاکە یەکجار سەختە و رک بوو. لەناو ئەشکەوتی مەلەکان دەیبەستنەوە و یەکەم تیشک بۆ کاکە عەبەی رەسام دەگرن و دەکەوێتەوەکار.

کاک محەمەد گێرایەوە "جارێک رۆژنامەنووسێکی سویدی لامان بوو، پرسیی؛ ئەم ئامێردتان چۆن گەیاندووەتە ئێرە؟ منیش وتم "بە هەلیکۆپتەر". نەیپرسی چۆن، وتی "ئەها" ئیتر کردمان بە پێکەنین و وتمان "بە پشتیوانیی خوا کردوومانە".

کاتێ لە شالاوەکانی ئەنفالدا، هێرشیی دوژمن بەرەو مەلەکان دەڕوا، هێزی پێشمەرگە پاشەکشە دەکات بەرەو قەندیل، دەیانەوێ ئامێرەکە بتەقێننەوە، کاک کۆسرەت پێیان دەلێ "بیشارنەوە، ئەگەر بەردەستی دوژمنیش بکەوێ رەنگە هاولاتی سوودێکی لێوەربگرێ". کاک محەمەد و هاوڕێکانی، چالێکی دوو مەتر قوول هەلدەکەنن و ئامێرەکە دەشارنەوە و سێ پەنجەشی بەو هۆیەوە دەشکێت.

لە هاوینی سالی ٢٠١٧، کاک محەمەد فەرەج بە سەردانێک دەگەڕێتەوە ئەو ناوچەیە و سەردانی ئەشکەوتی مەلەکان دەکات بۆ شوێنی بیرەوەرییەکانی رۆژانی سەخت، لەوێ فیلمێکی ئەشیعەی قوڕاوی دەدۆزێتەوە و دەیهێنێتەوە و لەگەل خۆی دەیبات بۆ هۆلەندا و وەک ئەرشیفێکی شۆڕش پارێزراوە.

له ٢ی حوزەیرانی ١٩٥٦ له گەڕەکی بەفری قەندی شاری کۆیه چاوی به دونیا هەڵهێنا، دایکم و ژنێکی بەندکراو له ماڵی باپیرم شیریان ئەدایه، کاتێ تەمەنی گەیشته (١١) مانگ و وەختی بەسەرپێکەوتنی، لەپڕ ئازارێکی بەهێزی تووشبوو و بەردەوام دەگریا. له یەکەم پشکنین زانییان که هۆکارەکه قاچێتی و وایاندەزانی کەوتووە. بەڵام ئازارەکەی زیاتر دەبوو، ئیتر بردیان بۆ بەغدا و لەوێ دوای پشکنین زانییان که ئێسقانی قاچی تووشی سیل بووه، هەر لەوێ نەشتەرگەرییان بۆ کرد و بۆیان له گەچ گرت، بەڵام دوای ماوەیەک دیسانەوه هەڵیدایەوه و ئیتر بڕیاریان دا بیبەنه شاری کەرکوک بۆ لای ئەو دکتۆره بیانیانەی که له کۆمپانیای نەوتی کەرکوک هەبوون. لەوێ دکتۆرێکی پسپۆڕ دیسانەوه نەشتەرگەریی بۆ کرد و برینەکەی به کراوەیی بەجێهێشت، ڕۆژانه پەرستارێک دەهات دەرزییەکی لێ ئەدا و برینەکەی پاک دەکردەوه. وایلێهات دایکم و باوکم خۆیان فێری دەرزیی لێدان کرد، چونکه لەڕووی داراییەوه تەنگی پێهەڵچنی بوون ئیتر خۆیان دەرزییان له نازه ئەدا (ئەم فێربوونه وای لێهاتبوو دایکم بێبەرانبەر دەرزی له ژنانی گەڕەکیش ئەدا)، به هیمەتی دایکم و باوکم، نازەنین کەوتەوه سەر پێ، بەڵام ئەوه وایکردبوو نازێکی زۆریان ئەدایه، من و کەژاڵی خوشکم ئیشی ماڵەوەمان زۆر پێ سپێردرابوو، ئەگەر گلەییمان بکردایه دایکم دەیوت "وازی لێبهێنن"، یان دەیوت "دەخوێنێتەوه". ئیمەشی لەسەر خوێندنەوه هەڵدەستان، کاتێ گەورەش بوو هەر ئەو نازەی هەبوو.

نازه، زۆر قسەی خەیالاویی هەبوو. جارێک له کەرکوک لەگەڵ خاڵم (شەهید جەعفەر) لەسەر شەقام دەڕۆیشتین، ئێمه منداڵ بووین، نازه پرسی "سەری خوا، هێندەی ئەو مزگەوته گەورەیه؟

جارێکی تریش زۆر منداڵ بوو، وتی "بیرمه که گەوره بووم (٢٢) مێردم کردبوو و هەر دوورمانیشم دەکرد". زۆربەی پرسیارەکانی لەسەر ژیان و خودا و ئەفراندن بوو.

پۆلی یەکی سەرەتایی له خوێندنگای ئامینەی کچان و دووی سەرەتایی له خوێندنگای زانستی کوڕان لای باوکم بوو، کاتێ چووه پۆلی سێی سەرەتایی، گواستمانەوه بۆ هەولێر.

نازەنین، وەک هەر تاکێکی تری بنەماڵەکەمان زوو دەستیدایە سیاسەتکردن، لە ماڵی ئێمە ئازادیی بیروڕا هەبوو بەهۆی ئەوەی زۆربەی ماڵی ئێمە سەر بە باڵی مەکتەبی سیاسی بووین کە دوای ١١ی ئازاری ١٩٧٠، لەگەڵ باڵی بارزانیی یەکیانگرتەوە. خالم (خالید دلێر) لەگەڵ ئەو ڕێککەوتنە نەبوو، نازەنین لە ژێر کاریگەریی خالمدا چووە ناو خوێندکارانی شیوعییەکان، بەڵام دوای بۆردومانی شاری قەڵادزە لەلایەن رژێمی بەغداوە لە نیسانی ١٩٧٤ و بەهۆی نەبوونی هەڵوێستێکی ئەوتۆ لەلایەن حزبی شیوعییەوە وازی لە شیوعییەکان هێنا.

کاتێ نازەنین لە پۆلی دووی ناوەندی بوو، خاڵم (شەهید جەعفەر) لە ماڵی ئێمە دەژیا و لەگەڵ نازەنین لە یەک ژووردا بوون و وانەی ئینگلیزی و جۆری کتێبی بۆ خوێندنەوەی پێدەوت. جارێک نازە کتێبێکی (مصطفى المنفلوطي) دەخوێندەوە، شەهید جەعفەر لە من تووڕەبوو، رەخنەی لێگرتم کە بۆچی نازەنین ئەو جۆرە کتێبانە دەخوێنێتەوە، پێیوتم "بۆ دەستنیشانی بۆ ناکەی؟" منیش وەڵامم دابەوە؛ کە "ناکرێ لە ورد و بچووک چاودێریان بم".

ساڵی ١٩٧٤ بوو بە ئەندامی کارای ئەستێرەی سوور کە (کۆمەڵە) بوو و شەهید جەعفەر لە هەولێر بەرپرسی بوو، لە ساڵی ١٩٧٥ - ١٩٧٦ لە کۆلیجی پزیشکیی ڤێتەرنەری لە شاری بەسرە وەرگیرا و هەرەسی شۆڕش کاریگەریی زۆری لەسەر دانابوو، ئیتر لە شاری بەسرە چالاکیی کۆمەڵەی مارکسی لینینیی دەستپێکرد و کەوتە رێکخستنی گروپێک بۆ خۆپێگەیاندن و خوێندنەوەی کتێبە مارکسییەکان، چالاکتریش بوو لەدوای گرتنی زۆربەی برادەرانی کۆمەڵە. نازە کچێکی زۆر چاونەترسە، ئامادەیی سەرکێشیی تیایە بێ گوێدانە رادەی مەترسییەکە. کاتێ لە بەسرە بوو چووم بۆ سەردانی لە قۆناغی دووی زانکۆ، هەموو زانکۆکەیان گوێزرانەوە بۆ موسڵ، لەوێ چووە ریزەکانی کۆمەڵە و بووە ئەندامێکی کارا لەناو زانکۆ. لە ساڵی ١٩٧٩ کاتێ بەعسییەکان کەوتنە دژایەتی شیوعییەکان ئەوکات نازەنین قۆناغی پێنجی زانکۆ بوو، ئەمن چووبوونە ناو بەشەناوخۆکان. لە یەکەم قۆناغ نازەنین و بەیان بەر ئەو پشکنینە نەکەوتبوون، نازەنین نامە و کتێبە نهێنییەکانی کۆمەڵەی بە باشی شاردبووەوە. رۆژی دواتر بەتایبەتی دەچنەوە بەشەناوخۆیی بەدوای نازەنین و بەیان محەمەدی هاوڕێی کە لە قوناغی چواری کۆلێجی پزیشکی بوو، دۆلابی بەیان دەپشکنن و

بڵاوکراوەکانی کۆمەڵەیان تیدا دۆزیبووەوە و ئیتر دەیانگرن و دەیانبەنە (الأمن الخاصە)ی موسڵ، بە هەڕەشە و چاوترساندن لێکۆڵینەوەیەکی زۆریان لەگەڵ دەکەن.

بەیان وتبووی ئەو بەیاننامانەم لەناو تاکسی دۆزیوەتەوە، سەرەتا بۆ چەند کاژێرێک لەبەر هەر هۆکارێک بێ بەریاندەدەن و شەو جارێکی تر دەچنەوە بەدوایاندا، بە چاوبەستراوەیی دەیانبەنە زیندان و لە دوو ژووری جیاواز دایاندەنێن، دوای چەند کاژێرێک دێن و جارێکی تر دەیانبەنەوە بۆ لێکۆڵینەوە، ئیتر بە هەڕەشە و ئازاردان و چاوترسان دەستدەکەنەوە بە لێکۆڵینەوە، دوای پرسیار و وەڵامێکی زۆر دیسانەوە چاویان دەبەستن و دەیانبەنەوە بۆ بەشی ناوخۆیی. خوێندکارەکانی هاوڕێیان، ڕێکخستن ئاگاداردەکەنەوە، هەروەها باوکیشم ئاگادار دەکەنەوە. باوکم بەپەلە خۆی دەگەیەنێتە موسڵ و بە نازەنین دەڵێ "ئێمە چەند جارێک دەستمان سووتاوە بەو ڕژێمە نامەوێ زیندانیی بکرێیت و خواش دەزانێ چیت بەرانبەر دەکەن، تا زووە خۆت ڕزگاربکە و خۆت بشارەوە". لە ڕێگای ڕێکخستنەوە ناسنامە و جلوبەرگی تایبەت و تاکسیی باوەڕپێکراوی ڕێکخستنیان بۆ دەچێت و بەرەو هەولێر دەیانبەن ئیتر ماوەیەک لە هەولێر و ماوەیەک لە کەرکوک دەبن، ئەو برادەرە کۆمەڵانەی تری زانکۆ کە ترسی گرتیان لەسەربوو گەیشتبوونە لایان و دوایی بەنهێنیی گەیاندبوویاننە سلێمانی. ئێمە ئەوکات لەناو هێزی پێشمەرگە بووین، هەواڵی خۆشاردنەوەی نازەنین و هاوڕێکانیانمان بیست و دڵەڕاوکێیەکی زۆرمان تووشبووبوو، نەماندەزانی چارەنووسیان گەیشتۆتە کوێ. پاش چاوەڕوانییەکی زۆری پڕ لە ئازار، لە ١٦ی ئازاری ١٩٨٠ نازەنین و بەیان گەیشتنە لامان، ئەوسا ئێمە لە بارەگای مەکتەبی عەسکەریی بووین لای ملازم عومەر لە خڕی ناوزەنگ. ئیتر نازەنین و بەیان بوون بە یەکەم کچی پێشمەرگەی شۆڕشی نوێ. شەش کەس، من و دارۆ، نازەنین و بەیان، ئاواتی شێخ جەناب و ئازای شێخ ڕەئوف لە تاقە ژوورێکدا بووین، ژنان لە لایەک دەنووستین و پیاوان لەلایەکی تر، تاماوەیەک بە من و بەیان یەک لێفەمان هەبوو.

لە خڕی ناوزەنگ، نازەنین و بەیان سەرەتا بەیەکەوە چوونە خولی کادیران و دواتر هەردووکیان کەوتنە کاری پزیشکی لەگەڵ دکتۆر خدر مەعسوم،

دواتریش دکتور شادمان مەستی گەیشتە لایان، هەروەها شانەیەکی کۆمەڵەیان خستە لای نازەنین.

لە مانگی پێنج، دایکم و دایکی بەیان هاتن بۆ سەردانمان. لە مانگی حەوت و هەشتی سالی ۱۹۸۰ تیمێکی کەنالی سێی فەڕەنسی لەگەڵ ئەحمەد بامەڕنی نوێنەری یەکێتی لە فەڕەنسا، گەیشتنە ناوزەنگ و توژەڵە. ئەو کاتەی ئەو تیمە لامان بوون رژێم ئەو ناوچانەی بۆردومان دەکرد، دوای چەند رۆژێک رۆژنامەنووسەکان گەڕانەوە بۆ فەڕەنسا و ئەحمەد بامەڕنی مایەوە.

کاک ئەحمەد بامەڕنی لای کاک نەوشیروان و حەمە تۆفیق باسی دکتۆرە بێسنوورەکان دەکات. کاک نەوشیروان و حەمە تۆفیق و کاک ئەحمەد، بیر لەوە دەکەنەوە نازەنین و بەیان بنێرن بۆ فەڕەنسا بۆ خولێکی فریاگوزاریی، ئیتر ئەحمەد بامەڕنی پاش گەڕانەوەی هەوڵیان بۆ ئەدا.

لە ۲۰ی تشرینی یەکەمی ۱۹۸۰، شەڕی سەری مامەندە دەستپێکرد و دەوروبەری ناوزەنگ هەمووی گیرابوو. بڕیاری بەرگریی درا، چونکە ئەگەر سەری مامەند بگیرایە ئەوا بە ئاسانی خڕی ناوزەنگ و بارەگاکانی سەرکردایەتی هەر سێ بال (کۆمەڵە، هێڵی گشتی، سۆشیالیست) دەکەوتنە دەستی دوژمن، بۆیە هەموویان بڕیاری بەرەنگاربوونەوە ئەدەن. دوای بگرەوبەردەیەکی زۆر کەسیان رازی نەبوون نازەنین و بەیان بەشداربن لەو شەڕەدا، لەدواییدا کاک نەوشیروان بەتووڕەییەوە دەڵێ "بڕۆن بابکوژرێن"، ئیتر ئەوانیش کۆڵەپشتی دەرمان هەڵدەگرن لەگەڵ پێداویستییەکان و دوو کلاشینکۆف و دوو دەمانچە و دەچنە بەرەی شەڕ، ئەوەش دەبێتە یەکەم بەشداریی راستەوخۆی کچان لە شۆڕشی نوێ و لە شەڕی رووبەڕووبوونەوە و بەرگریی لە بەرانبەر هێزەکانی رژێم. ئیتر بە لەدەستدانی دوو پێشمەرگە (شەهید مستەفا و شەهید محەمەد خالید) و چەند بریندارێک، هێزی دوژمن تێکدەشکێ.

دوای ماوەیەک، ئەحمەد بامەڕنی ئەو خولەیان بۆ رێکدەخات کە بۆ ماوەی شەش مانگ بوو. تێچووی لەسەر ئەستۆی پزیشکانی بێسنوور بوو. نازەنین و بەیان ماوەیەک لە ئێران مانەوە و لیسە پاسیان وەرگرت و هاتن بەرەو سوریا، ئەوسا ئێمە لە سوریا بووین و دارۆ نوێنەری یەکێتی بوو لە پەیوەندییەکانی دەرەوە. بە پاسپۆرتی سوری و ڤیزەی فەڕەنسا بەرەو فەڕەنسا بەڕێکەوتن

و لەویٚ چوونە راهێنانەوە لەبواری پزیشکی و نەشتەرگەریی بچووک، چونکە هێشتا خۆیان خوێندکار بوون.

لەوێش لە کاری رێکخستن دانەبڕان، لە پاڵ راهێنانەکە، کەوتبوونە بانگەشە و پەیداکردنی پشتیوانی و کۆمەک بۆ شۆڕش. دوای ئەوەی کە شەش مانگیان تەواوکرد گەڕانەوە بەرەو سوریا، چونکە بە پاسپۆرتی سوری چووبوون، ئەوکات ئێمە و ئێران پەیوەندیمان باش نەبوو (یەکێتی و ئێران) لیسە پاسیان بۆ نەکردن بگەڕێنەوە بۆ ئێران و مانەوە. بۆ ئەوەی بە دەستبەتاڵیی نەمێننەوە، داوای خوێندنیان کرد و نازەنین لە هەمان قۆناغی خۆی "واتە پێنجی پزیشکی ڤێتەرنەری" وەرگیرا لە شاری حەما. بەیانیش لە قۆناغی چواری پزیشکیی لە دیمەشق. نازەنین خوێندنەکەی تەواوکرد و مۆڵەتی کاریان پێدا، لەو ماوەیەش خولێکی تایپکردنی وەرگرت، لە دەرکردنی شەرارە و ئینسات کاریدەکرد و لە شانەکانی رێکخستنی کۆمەڵەش بەردەوام بوو.

شانەیەکمان هەبوو (هەلکەوت عەبدوڵڵا، نەرمین عوسمان، نازەنین عوسمان، گەلاوێژ، بەیان) کە شانەی سەرەکی بووین و کاری رێکخستنمان دەکرد و لە بۆنەکان و ئاهەنگەکان هەم بەشداری و هەمیش رێکخستنیان لەئەستۆی ئێمەدا بوو.

لەماڵیشەوە بەردەوام خەریکی میوان بەرێکردن بووین بەتایبەتی کوردانی باکوور و رۆژهەڵات و باشوور، رۆژی واهەبوو سێجار چێشتمان ئامادە دەکرد بۆ میوانە یەک لەدوای یەکەکان، ئەرکی ژن جگە لە ئەرکی رێکخستن دەبوو ئەو کارانەش بکات.

لە کۆتایی ١٩٨٣ کە گفتوگۆی یەکێتی و رژێمی بەعسی عیراقی دەستیپێکرد، سوریا هۆشداریی دا بە پەیوەندییەکان و وتی "دەبێ سوریا جێبهێڵن و برۆن"، بۆیە بڕیارماندا سوریا جێبهێڵین. نازەنین دەستگیرانی ئەحمەد بامەڕنی بوو، بەیەکەوە بەرەو فەرەنسا رۆیشتن و رۆژی رۆیشتنیان، بە قەمسەڵەیەکی سەربازییەوە بوو. جلوبەرگمان بەردەوام رەنگی سەربازیی بوو، خووی شاخمان گرتبوو واماندەزانی هەر لەناو شۆڕشداین.

دیسانەوە لە فەرەنسا داوای خوێندنی کردبوو، چونکە نە زانکۆی موسڵ و نە زانکۆی حەما لە سوریا بەڵگەنامەی دەرچوونیان بۆ نەکرد تەنیا وانەکانیان بۆ

نووسی بوو، بۆیە سەرلەنوێ لە قۆناغی سێی زانکۆوە دەستیپێکردەوە، بەڵام نەوەستا تا دکتورای بەدەستهێنا، هەرچەندە ناوبەناو بەهۆی دوورکەوتنەوەی کاک ئەحمەد بامەرنی و گەڕاندنەوەی بۆ کوردستان وازی لە خوێندن دەهێنا. کچێکی کۆڵنەدەرە، زۆرجار بەگاڵتەوە پێماندەوت "دەرچوون و خانەنشینیت بەیەکەوە دەبێ".

لە فەڕەنساش جگە لە خوێندن و کاری ڕێکخستن و چالاکییە مەدەنییەکان، هاوکاری کاک ئەحمەد بامەڕنی بەرپرسی پەیوەندییەکانی دەرەوەی یەکێتیی بوو لە فەڕەنسا و بەلجیکا.

لەدوای رووخانی رژێمی سەدام، کاک ئەحمەد بامەڕنی بوو بە باڵیۆزی عیراق لە سوید، ئیتر نازەنین وەک هاوسەری دیپلۆماتێک ئەرکەکانی خۆی ئەنجام ئەدا. کە گەڕاشنەوە بۆ عیراق لە ساڵی ٢٠٠٨، ماوەیەک لەگەڵ ئەمریکییەکان و دواتریش لەگەڵ ئەنجومەنی وەبەرهێنان لە شاری بەغدا کاریدەکرد، دواتر بوو بە مامۆستای زانکۆ لە شاری کۆیە و ئێستاش لە شاری سلێمانی مامۆستای زانکۆیە. ژنێکی لە رادەبەدەر بوێرە، ئازادە لە بیر و بۆچوون و دەیان ڕێچکەی شکاندووە، جێگای شانازیی من و بنەماڵەکەیە، باوکم وتەنی "منداڵەکانم لەسەر بەردی رەقیش بێ نانی خۆیان پەیدا دەکەن" رۆحی یارمەتیی زۆرە و کەسێکی سادە و ساکارە لە هەڵسوکەوتدا، ئەوەی خاوەنیەتی تەنیا رابردووییەکی پاک و داهاتووییەکی سەربەرزانەیە، ئێمە تەنیا خوشک نین، بەڵکو دوو هاوڕێی نزیکیشین.

له ٢٦ی ئازاری ١٩٦١، له شاری کۆیه، له گەڕەکی بەفری قەندی، لەسەر دەستی پورە عیسمەت (دایکی تایەر تۆفیق) لەدایکبووە. کاتێ لەدایکبوو منداڵێکی قژ زەردی ئەسمەر بوو، دراوسێکانمان هاتن بۆ لای دایکم گاڵتەیان لەگەڵ دەکرد و پێیاندەوت "وای ئەو کچە رەشە! وەڵڵا قەت شووناکات". دایکیشم قسەکەی بەجدیی وەرگرتبوو، بەناوی سوعبەتەوە وتی "وەڵڵا بوەستن، هەموو کچی گەڕەکی پێ بە شوو دەدەم".

کەژاڵ، منداڵێکی بزێو بوو، بە نۆ مانگی بەسەرپێ کەوتبوو، قسەش درەنگ فێربوو، هەرکەس ببیینیایە بەلایەوە سەیربوو کە بەو بچووکییەوە دەڕوات. دایکم خۆی شیری کەم بوو بەو هۆیە (جاران وا باوبوو لا مەمکێکی دایکێکی منداڵ لەبەریان لە بەرانبەر هاوکاریی بۆ منداڵەکە وەردەگرت)، بۆیە کەژاڵ دایکێکی شیریی هەبوو کە هەردووکیان زۆر لەیەکەوە نزیک بوون، هەندێکجار دایکم بەتووڕەییەوە دەیهێنایەوە ماڵەوە.

کاتێک تەمەنی بوو بە سێ ساڵ گواستمانەوە بۆ هەولێر، زۆر سەرەڕۆ بوو، چاومان غافڵبکردایە بۆی دەردەچوو. جارێک لەگەڵ دایکم سەردانی قەڵاتمان کرد بۆ لای ماڵی خاڵی (خالۆژنێکی خەڵکی قەڵاتی هەولێر بوو) و ماڵیان لەناو کۆڵانەکان بوو، بۆ رۆژی دوایی کەژاڵ فرسەتی هێنابوو بۆی دەرچوو تا ماڵی خاڵی دایکم، بەو منداڵییە کە هێشتا سێ ساڵان بوو رۆیشتبووەوە هەمان جێگا. ئێمە نەماندەزانی و لەتاوا هەموومان لە کۆڵانان بە دوایدا دەگەڕاین، لە مزگەوت بانگهێشتیان بۆ کرد، جاران وا باوبوو ئەگەر منداڵێک ونبوایە لە مزگەوت بانگهێشتیان بۆ دەکرد و دەیانوت "رەحمەت لەوەی لە بابی وەی ئەگەر کچێک یان کوڕێکی لەو حاڵ و لەو رەنگە (وەسفی جلەکانیان دەکرد) ئەگەر دۆزیتانەوە بیهێننەوە بۆ مزگەوت". ئەوسا تەلەفزیۆنیش نەبوو، بۆیە دوای چەند کاژێرێک ماڵی خاڵی دایکم هەرکە گەیشتبووە لایان بە پەلە هێنابوویانەوە ماڵەوە، نەماندەوێرا یەک توز چاوی لێ غافڵبکەین.

له خوێندندا منداڵێکی سەرکەوتووبوو، هەروەها لە چالاکیی قوتابخانەکانیش لە چەندین نمایش بەشداریی لە سەمای باڵێ دەکرد. لە تەمەنی (١١) ساڵیدا لە چالاکیی قوتابخانەکاندا سەمایەکی رۆژهەڵاتیی لەسەر شانۆ پێشکەشکرد. کاتێک ئازادی برام دەگەڕێتەوە ماڵەوە، لەسەر شەقام بە تانەوە پێی دەڵێن:

«زی الهوی" گۆرانیی (ئوم کەلسوم بوو)، ئەوە وایکرد ئازاد ببێت بە ڕێگری و دەیوت "بڕواتە سەما بە بەردەباران ڕێی لێئەگرم". لەتاوا کەژاڵ نەڕۆیشتەوە بۆ سەما، بەڵام لە ئەکرۆباتیک بەشداربوو، دواییش لە پاسکیلسواریی بە یەکەمی هەولێر دەرچوو و گەیشتە هەڵبژاردەی عیراق.

کەژاڵ، کەسێکی زۆر کۆمەڵایەتی بوو، زۆر بە ئاسانی دەبوو بە هاوڕێ. تا منداڵ بوو دەبوایە هەموو ئەرکێکی من هەڵبیگرم، زۆر کەم ئەرکی لەسەر دایکم بوو تەنانەت جلوبەرگ و خوێندن و بەدواداچوونی هەمووی لەئەستۆی من بوو. زۆر زوو چووە ناو ڕێکخستنەوە، سەرەتا لەناو قوتابیان کاریدەکرد، بڵاوکراوەکانی کۆمەڵەی لە من وەردەگرت و دەیبردە ئەو شوێنانەی کە بۆمان دەستنیشاندەکرد. هەر لە منداڵییەوە چاونەترس بوو، باوکم زۆرجار بەگاڵتەوە دەیوت "هەر پرسم پێبکات بۆ شووکردنی، بەسمە".

ئەرکی ماڵەوەی زۆر هەڵدەگرت هەرکاتێ لە دەرەوە دەگەڕامەوە دەمزانی کەژاڵ خەریکی قاپشووشتنە، دەنگی دەنگرەکەی بەرزدەکردەوە و خۆشی گۆرانیی دەوت. هێشتا لە قۆناغی دواناوەندی بوو کە ئێمە بووین بە پێشمەرگە و بەجێمانهێشت، بۆیە دایکم و باوکم چاوێکیان کردبوو بە دە چاو بۆ ئەوەی کەژاڵ کاری سیاسی نەکات، هەربۆیەش زۆربەی کارەکانی لە ماڵەوە دەشاردەوە و لە ژێر فشارێکی زۆردا بوو. لەگەڵ هاوتای برام زۆربەی ئەرکی ماڵەوەیان لەسەربوو کە ئازاد و هاوتاش بوون بە پێشمەرگە، ئیتر تەنیا کەژاڵ مابووەوە. لە هەمووشمان سەرکەشتر بوو، زۆرجار مەلا بەختیار دەڵێ "لە هەمووتان بەجەرگتر و چاونەترستر بوو".

لە جوانکاریی ماڵیشدا سەرپشک بوو، ئارەزووی بوو دیکۆری ماڵەوە زوو زوو بگۆڕێ، کەلوپەلی ماڵەکەی ئێمە و لەدوای شووکردنیشی ماڵەکەی خۆی زەلالەتیان بوو بەدەستییەوە، ئامادەبوو لێکیان هەڵبووەشێنێ بۆ ئەوەی جێگاکانیان بگۆڕێ تەنانەت جارێک بە مشار کتێبخانەیەکی لەنێو قەدییەوە بڕییەوە بۆ ئەوەی بگونجێ لەگەڵ ئەو جێگایەی بۆی دانابوو.

کاتێ کەژاڵ بە دەستگیرانی موحسین دیاریی دەکرێ، کاک موحسین لەسەر کاری سیاسی دەگیرێ و (٢٠) ساڵ حوکمی بەسەردا ئەدرێ، دوایی بە لێبووردنی گشتیی بەردەبێ. ئەو ماوەیە لەگەڵ دایکم و باوکم لە شوێنی

جیا جیا خۆیان دەشاردەوە. لەو کاتەی کە هاوتاش پێشمەرگە بوو خزمەتی باوکم و دایکم و بژێوی ژیانیان لەئەستۆی کەژاڵدا بوو.

لە ٣١ی ئاب بەرەو سلیمانی هاتن و لەگەڵ ئێمە بوون و لە شوێنێکی تری ئەم کتێبە باسم لەوە کردووە کە ئەوان چوون بۆ هەندەران و لە هۆڵەندا نیشتەجێبوون، لەوێش کەوتە کار و خوێندن، خوێندنەکەی بە سەرکەوتوویی لەبواری تەکنیکی ماتماتیک تەواوکرد و لە کوردستانیش کۆلێجی کارگێڕی و ئابووری تەواوکرد و لە ساڵی ٢٠٠٧ بوو بە کونسوڵی بازرگانیی لە باڵیۆزخانەی عیراق لە ئیتالیا و ئەوەندەی پێنەچوو نەخۆشکەوت و تووشی نەخۆشیی شێرپەنجەی خوێن بوو.

## کەژاڵ و شێرپەنجە!

"تا لە مەرگ نزیک نەبیتەوە نازانیت ژیان چەند خۆشە"

ڕۆوداوی وا هەیە وەک فیشەکی وێڵ بێئاگا و لەناکاو بەرماندەکەوێ و بێدەسەڵاتین بەرانبەری، هەروەها ڕووداوەکانی ژیان جیاوازن هەیە دڵخۆشمان دەکات، هەشە ژیانمان تفتوتاڵ دەکات و بیرچوونەوەیان ئەستەمە و بێبەزەییانە وەک گاسن بەردەوام ناخمان دەکێڵێت.

ئەو ڕۆژەی چاوەڕێی وەڵامی پشکنینەکەی کەژاڵ بووم، نازانم بۆ هەستمدەکرد چاوەڕێی هەواڵێکی دڵخۆشکەر نیم، هەر زەنگێکی تەلەفۆن لێیبدایە ئەکەوتمە نزا کەژاڵ نەبێ و هیچ هەواڵێکی ناخۆش نەبیستم. ئەو چەند کاژێرە وەک دەهرێک بوو بەلامەوە، بەڵام زەنگە بێبەزەییەکە لێیدا و دەنگێک لە ڕێگای شەپۆلەکانەوە وتی "ئەنجامی پشکنینەکان زۆر خراپ بوو، دەبێ بەپەلە چارەسەری کیمیایی وەرگرم و ماوەی سێ مانگیان بۆ داناوم، ئارەزوومە بێیت بۆ لام". ئەو چرکەساتە نەمدەزانی ڕوو لەکوێ بکەم و هەستمدەکرد لەم جیهانە زەبەلاحە پڕ نەهامەتی و خەمناکە تەنیام. هەرچەندە دەنگی کەژاڵ هێمن و لەسەرخۆ بوو، ئەتوت پێم دەڵێ تووشی پەتایەک بووە. هەستێکی تێکەڵ ئەخولایەوە لە ڕۆحمدا، توبڵێی بتوانێ زاڵبێت، تۆ بڵێی دکتۆر هەڵەی نەکردبێ، یا مەرگ چاوەڕێی دەکات یاخود نا؟ هەزاران پرسیار سەرەیگرتبوو لەمێشکمدا. ئەو چرکەساتانە زۆر ئەستەمە بتوانین بە قەڵەم و کاغەز ناخمانی پێهەڵتەکێنین

و بۆ خوێنەری باسبکەین و لێمان تێبگات. زۆرن ئەوانەی چیرۆکی ژیانیان لەکاتی نەخۆشیدا گێڕاوەتەوە و باسیان لێوەکردووە، بەداخەوە منیش لەگەڵ کەسە نزیکەکانم چرکە بە چرکە ژیاوم لەکاتی نەخۆشییەکەیان. هەستم بە ئازارەکانیان و هەستەکانیان کردووە، رۆژێکی نەخۆشییەکیان بە وەرزێک لە خەم رێدەکات. بێدەنگ بیر لە ژیان و مردن دەکەنەوە، هیوا و بێهیوایی هاودەمیان بوو، بیرەوەرییەکانیان وەک رووبار دەهاتەوە بیر و باسیان لێوەدەکرد. ئەو جۆرە نەخۆشییە وەک حوکمی لەسێدارەدان وایە، هەوڵی بێوچان ئەدەی بۆ ئەوەی ئەو حوکمە قورسە لاببرێ، بەڵام هەموو چرکەساتێکیش چاوەڕێی جێبەجێبکرێ.

کەژاڵ، کچێکی وەرزشکار و پاسکیلسوار بوو، لەشێکی وەرزشیی هەبوو، لە پاسکیلسواریی گەیشتە هەڵبژاردەی عیراق، هەموو جۆرە وەرزشێکی دەکرد و نەیدەهێشت یەک کیلۆ کێشی زیادبکات، تەندروست دەژیا، ئەوەی بەبیرمدا نەدەهات ئەوەبوو ئەو جۆرە نەخۆشییە بگرێت.

ئەو کچە وەرزشکار و لەشسووکە، دوای چارەسەری کیمیایی دەبوایە دەستییبگرین بۆ ئەوەی رێبکات. ژنێک بوو بە دەنگی بەرز گۆرانیی دەوت، کەچی لەو کاتانەدا دەبوایە گوێ بخەینە لای دەمییەوە بۆ ئەوەی لێی تێبگەین. خاتوونێک بوو هەموو ئەرکی ژیانی هەڵگرتبوو و بە تەنیا جێبەجێیدەکرد، بەڵام دوای چارەسەری کیمیاوی داوای هاوکاری و یارمەتیی دەکرد. هەستم بە هەموو ئازارەکانی دەکرد، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هیوایەکی زۆری بە ژیان هەبوو، ناوبەناویش دەیوت "ژیان زۆر خۆشە، تا لە مەرگ نزیک نەبیتەوە نازانیت ژیان چەند خۆشە". قژێکی خاوی کاڵی زۆر پڕ و جوانی هەبوو، جارێک لە هۆڵەندا لەگەڵی بووم پێیانوت وەرە ریکلامێکی شامپۆمان بۆ بکە. کەچی بە چارەسەرە کیمیاییەکە قژی پێوەنەما و هەڵوەری، لەگەڵ ئەوەشدا بەیەکەوە دەگەڕاین بۆ قژێکی دەستکردی جوان، نەوەک شێوەی لای جوان نەبێ و نەخۆشیی پێوە دیاربێ.

سەدان پرسیاری لێدەکردم وەک خوشکێکی گەورە و هاوڕێیەکی نزیک، دەردەدڵ و سەرگوزشتەی خۆی بە باش و خراپەوە بۆ باسدەکردم. لە هەندێ شتی ژیانی پەشیمانبوو، لە هەندێ شتیش بەخۆشیی ئەدوا. هەندێکجار گاڵتەی

بەخۆی دەکرد و بیرەوەرییەکانی لەگەڵماڵەوە و هاوڕێکانی باسدەکرد.

جارێک وتی "بە منداڵیی من و هاوتای برام زۆر لێت ئەترساین، کە ڕێنماییەکت دەکردین لەدوای تۆ لاساییمان دەکردیتەوە". هەروەها ئەوەشی گێڕایەوە "کە ڕاژەکەت گواستەوە بۆ سلێمانی، لەگەڵ هاوتا هاوارماندەکرد بمرێ کەوچک و چەتاڵ و کلینیکس، کەچی دوای چەند ڕۆژێک بە ملکەچیی هێنامانەوە، چونکە ڕاهاتبووین". وتی "ئەو ئەتەکێتانەی تۆ بە ئێمەت وتووە، تائێستاش کە دەیانکەم تۆم دێتەوە بەرچاو".

قسە خۆشەکانی دایکمی دەگێڕایەوە؛ جارێک دایکم هەر بانگی دەکات کەژاڵ، ئەویش ناچێت بەدەمییەوە و دەڵێت: (ثانی) بە عەرەبی واتا من، ئەوەندەی دەڵێتەوە دایکم تووڕە دەبێ و دەڵێ "کچێ وەرە هەی گو بە دەمی ثانی". ئیتر لەو جۆرە یادگارییانەمان بیردەکەوتەوە، کەشێکی جیاواز و دوور لە نەخۆشیی دەرەخساند، یا گۆرانییەکی خۆشی بۆ لێئەداین.

هەرکاتێ نۆرەی چارەسەری کیمیاویی دەهات، لەگەڵ نازەنینی خوشکم و هاوتای برام و خزمان بە نۆرە لای دەماینەوە، ئەگەر لەوێش نەبوومایە ڕۆژانە چەند جارێک بە تەلەفۆن لەگەڵ یەکتر ئەدواین. نەمئەتوانی لێوەی دووربم، ئەوەندە تێکەڵ بە هەستەکانی بووبووم ئەو ڕۆژەی تەندروستیی باش نەبوایە پێش تەلەفۆنیش هەستمپێدەکرد.

لەگەڵ ئەو هەموو ئازارانەی، کچێکی ورەبەرز و خۆڕاگر بوو، لە نەخۆشخانەش هاوکاریی نەخۆشەکانی تری دەکرد و ورەی بەرزدەکردنەوە. ئەو پزیشکەی لە ئیتالیا چارەسەری دەکرد لەگەڵی بووم کە بە کەژاڵی وت "ئەگەر ڕۆژێک بیرەوەرییەکانی خۆم دەربارەی نەخۆشیی شێرپەنجە و نەخۆشەکان بنووسم، لات ڕوون بێ تۆ یەکەم چیرۆکم دەبێ لە ورەبەرزی و خۆڕاگریی و لایەنێکی پۆزەتیڤی چیرۆکەکانم دەبێ". وتیشی "تۆ ئەبێ سوپاسی کەسوکار و هاوڕێکانت بکەی کە دڵسۆزن و لاتەوەن و نەخۆشەکانیش سەرسامن پێت".

کەژاڵ، کچێکی ڕووخۆش و نوکتەئامێز بوو، دڵی بە دونیا زۆر خۆشبوو، جیاواز بوو لەماڵەوە. دەسودڵێکی زۆر باشی هەبوو، یەک دینار لەگیرفانیدا بوایە وایدەزانی ماڵی قاروونی هەیە، لە دەمی خۆی و منداڵی دەبڕییەوە و هاوکاریی

خەڵکی پێدەکرد. یارمەتیی ماڵە شەهید و پێشمەرگەی دەدا. بۆ نموونە؛ خۆی کاریدەکرد لە کێڵگەی پەلەوەر (دەواجن) بۆ بژێویی ژیانی خۆی و ماڵی باوکم کە خۆیان شاردبووەوە لە چاوی جاسوسەکانی رژێم، لەگەڵ هاورێیەکی (کنێر جەمال) یارمەتیی کرینی خانوو و بژێویی ژیانی چەند ماڵێکیان دەکرد.

پاش ئەوەی چەند جارێک چارەسەری کیمیایی وەرگرت لە نەخۆشخانەکانی ئیتاڵیا، ناوبەناو باش دەبوو، بەڵام زۆری پێنەدەچوو وەک خۆی لێدەهاتەوە، تەنانەت رێژەی شێرپەنجەکەی لەخوێنیدا ئەوەندە نزم نەدەبوو بواری چاندنی مۆخی هەبێ. کاتێ دکتۆرەکانی ئیتاڵیا رێگاچارەیان نەما و جارێکیان بۆ دوا جار وتیان "چارەیەک هەیە لە نەخۆشخانەی ڤاتیکان، بەڵام گرانە". ئەویشمان بۆ کرێ، بەڵام سوودی نەبوو. هەرچەندە چارەسەریشی لە ئیتاڵیا بێ بەرانبەر بوو بەهۆی کارەکەیەوە، بەڵام بریاریدا بگەرێتەوە بۆ هۆڵەندا کە خۆی پەناهەندە بوو لەوێ و دەیویست بچێتەوە لای دایکم و هاوتای برام بێت.

لە هۆڵەنداش کەوتنە جۆرێکی تر لە چارەسەر هەرچەند ئومێدێکی ئەوتۆی نەمابوو، بەڵام مرۆڤ لەو وڵاتانە زۆر بەرز و بەنرخە، ئەوەی بۆیاندەکرد بۆ درێژکردنەوەی ژیانی بوو. بە هەموو لایەک، بە توانای پزیشکەکان و ئازایەتی خۆی و خۆشەویستیی بۆ ژیان و خۆشەویستیی کەسوکار و هاورێکانی، توانرا تەمەنی لە سێ مانگەوە کە سەرەتا پزیشکەکان بۆیان دانابوو بۆ سێ ساڵ و نیو درێژبێتەوە.

ئەتوانم بڵیم ئەو ئازایەتی و خۆراگرییەی بەو خوشکەمەوە بینیم مەگەر لە فیلم و چیرۆکەکاندا بوونی هەبێ، لەگەڵ ئەوەشدا بەردەوام لەسەر نەخۆشییەکەی زانیاریی دەخوێندەوە و هێندەی پزیشکەکان شارەزایی پەیداکردبوو. کچێکی دەسترەنگین و هونەرمەند و هونەردۆست و خوێندەوار و رۆشنبیر بوو، چەند زمانێکی بە باشیی دەزانی بە خوێندنەوە و نووسین، جگە لە کوردی، عەرەبی و ئینگلیزی و هۆڵەندی و ئیتاڵی دەزانی، بە هەموو ئەو زمانانە کتێبی دەخوێندەوە.

لە زانکۆی هەولێر بەشی کارگێری و ئابووری تەواوکرد و لە هۆڵەنداش تەکنیکی ماتماتیکی خوێند، دوای خول بینین بوو بە کونسوڵی بازرگانیی لە باڵیۆزخانەی عیراق لە ئیتاڵیا، بۆیە چارەسەری پزیشکیی لەسەر حکومەتی

ئیتاڵیا بوو، بەهۆی بیمەی تەندروستی. کاتێ لە کوردستانیش بوو لە وەزارەتی تەندروستی کاریدەکرد، لەو کەسانە بوو زۆر بە ئاسانی دەبوو بە هاوڕێ.

کاتێ باوکم تووشی نەخۆشیی ئیفلیجیی جەستە بوو، لەگەڵ دایکم و هاوتای برام (کە ئەویش نموونەیەکی جوان و رۆحسووکی خێزانەکەمانە) خزمەتی باوکمیان دەکرد و نەیاندەهێشت لای چۆڵ بێ و ماوەی نۆ ساڵ چرکە بە چرکە زیاتر و زیاتر خزمەتیان دەکرد.

(٥٠) رۆژ پێش مەرگی. لە نەخۆشخانەی هۆڵەندا بوو، من و نازەنین و هاوتا لای بووین. دەمەوئێوارە پزیشکەی هات و پێیوت "کەژاڵ، خۆتدەزانی بە هەموومان هەوڵی زۆرماندا رزگارت بکەین لەو نەخۆشییە و تۆش ژنێکی زۆر خۆڕاگربووی و کەس و هاوڕێی زۆر باشیشت هەبوو، بەڵام بە هەر هەموومان نەمانتوانی، دەمەوێ پێتبڵێم لیژنەی پزیشکەکان هیچ ئومێدێکیان نەماوە، بۆیە دەبێ ئامێرەکانت لێبکەینەوە چیتر ئازارت نادەین". کەژاڵ زۆر بەهێمنی و ئازایانە وتی "دەزانم و هەستمپێکردووە، هەروەها منیش توانام نەماوە بەرانبەر ئەو هەموو ئازارە و پەرۆی سپیم بۆ نەخۆشییەکە هەڵکردووە، وامدەزانی من ئازاتر دەبم. نەمدەزانی چی لە رۆحیدا ئەگوزەرێ و بیر لە چی دەکاتەوە". لەبەر ئێمە هیچی پێوە دیارنەبوو، دوای پزیشکەکە و لێکردنەوەی ئامێرەکان، وتی "باجی، بوم بخەرە سەر گۆرانییەکی خۆش". گۆرانییەکی هایدەم خستە سەر، وتی "ئەوە چییە خۆ پرسە نییە بیخە سەر شتێکی تر". گەڕام بۆم خستە سەر گورانیی (شەبی عیشق)ی هایدەی گۆرانیبێژ وامزانی زۆری پێخۆشە، دوای توزێ وتی "بمخەنە سەر عەرەبانە و بابچینە دەرەوەی نەخۆشخانە جگەرەیەک بکێشین". چووینە خوارەوە هەموومان بێدەنگبووین کەسمان ورتەمان لێوە نەدەهات، هیچمان بۆ وتن نەبوو، ئازاری رۆحمان جێگەی هەموو وشەیەکی گرتبۆوە.

کە گەڕاینەوە سەرەوە. پزیشکەکە لێیپرسی؛ ئەتەوێ ئەو چەند رۆژەی ماوتە، لێرەبی یان بچیتە ماڵەوە؟ لە هەر شوێنێک بێ ئێمە ئەرکی خۆمان بەرانبەرت جێبەجێدەکەین. لەوەلامدا وتی "دەمەوێ بچمەوە لای دایکم". گەڕاینەوە بۆ لای دایکم و چرکە بەچرکە ژیانی بەرەو کۆتایی دەڕۆیشت، ئێمەش بێ دەسەڵات بەدیارییەوە.

لە شەوی سەری ساڵی ٢٠١٣، لە دەرەوە خەڵک بە بۆنەی ساڵێکی نوێ ئاهەنگی دەگێرا و ئێمەش چاوەڕێی کۆتایی ژیانی خۆشەویستێک بووین، ئەم بیرەوەرییانە تەنیا لەسەر کاغەز ئاسانە نووسینەوەی، هەرگیز ناتوانم ئەو هەستەم بە قەڵەم دەرببڕم. پێموت "کەژاڵ هەستە بابتخەمە سەر کورسییەک و سەیری ئەو هەموو (فیشەکە شێتە)یە بکە بەئاسمانەوە". تۆزێک سەیری کرد وتی "بمخەنەوە سەر جێگای خۆم". لەگەڵ ئەوەی زۆر باوەڕم بە زانست هەیە، بەڵام لەکاتی وەهادا چاوەڕێی پەرجوویەکی خودایی دەکەم، ئەو کچە باڵابەرز و ناسک و جوانە، بە لاوازی و بێهێزیی، بە هێمنیی چاوەڕێی کۆتایی بوو.

لە شەوی ٣ی کانوونی دووەمی ٢٠١٤، لەوکاتەی من خەوتبووم و نازەنینی خوشکم بەدیارییەوە بوو، هات و هەڵیساندم، بەهێمنیی وتی "هەڵسە، وابزانم کەژاڵ هەناسە نادات". ئەو هەواڵە دڵتەزێنانە لە بۆمبێکی ئەتۆمی دەچن، بەر رۆح و مێشک دەکەوێ و کاتی دەوێ تا تێدەگەین چی روودەدا. لەو چەند رۆژەی کەژاڵ لەسەر جێگابوو، خزمان و منداڵەکانم هەموویان لە سلێمانی و شارەکانی هۆڵەندا و وڵاتانی دەرەوە هاتبوونە لامان، بۆ ئەوەی بە دوادیداری کەژاڵ رابگەن.

کەژاڵ، لای هەمووان زۆر خۆشەویست بوو، بۆیە توانی بەو هەموو خۆشەویستییەوە بەرگەی ئەوەندە بگرێ. ئیتر دوای پرسەی هۆڵەندا لە کۆمیتەی یەکێتی، گەڕاینەوە بەرەو کوردستان و گۆڕستانی قشڵە، بوو بە دوامەنزڵی و بۆ هەمیشە بوو بە میوانی شەهید ئازادی برام و شەهید جەعفەری خاڵم.

دەربارەی کاری سیاسیی، کەژاڵ هەر لە سەرەتای ژیانییەوە دەستی بە چالاکیی سیاسیی کرد. زۆرجار بە نهێنیی لەناو خوێندکاران کاریدەکرد و سەرەتا لای ئێمەش باسی نەدەکرد. لەگەڵ هاوتای برام دروشمی دژ بە رژێمیان دەنووسی و شەوان یان بەیانیان زوو دەیانخستە ناو دوکان و ماڵان، دوایی پێمانزانی و ئیتر نەمانهێشت ئەو کارە ترسناکە بکەن، نەک ماڵەوەش ئاشکرا بێت. دواتر هاتە ریزەکانی کۆمەڵەی رەنجدەران و یەکێک بوو لە کادیرە هەرە چالاکە چاونەترس و ئازاکان، بەنهێنیی پەیوەندیی بەهێزی پێشمەرگەشەوە هەبوو جگە لە بەرپرسیارێتیی ناوشار. ئەوکات ئێمە لێوەی نزیک نەبووین، تەنیا هەندێکی خۆی باسی لێوە دەکرد و هەندێکیشی هاوڕێکانی و هەندێ چالاکیشی لە ریگای پێشمەرگەوە دەمانزانی.

دکتۆر فایەق محەمەد گولپی. لە بیرەوەرییەکانی بەناوی (کە لێرەوە سەیری ژیانی خۆم ئەکەم) بەرگی یەکەم (١٩٦١-١٩٨٩) لە لاپەرە ١٢٤ باس لە کەژاڵ دەکات و دەڵێ "رۆژێکیان ئاوات لەگەڵ کچێک هات بۆلام، کچەکەی پێناساندم وتی "ئەمە کەژاڵە، بەرپرسی ڕێکخستنی ئێمەیە، حەزیکرد بتبینێت و لەوبارەیەوە قسەت لەگەڵ بکات". دوای قسەکردن لەسەر باری سیاسیی کوردستان لە کۆتایی ساڵی ١٩٨١دا، جارێکی تر پەیوەندیم بە ڕێکخستنی ینک (کۆمەڵە) کردەوە، کەژاڵ خوێندکاری کۆلیجی کارگێڕی و ئابووری زانکۆی هەولێر بوو، خوشکی ئەو نازەنینەی کۆلیجی ڤێرتەرنەری بوو کە لەگەڵ بەیانی هاوڕێیدا لە دەزگای ئاسایشی موسڵ ئاشکرابوون، دەستیان لە خوێندن هەڵگرت و بوون بە پێشمەرگە. کەژاڵ، خوشکەزای شەهید جەعفەر بوو کە ساڵی ١٩٧٦ لەگەڵ شەهید شەهاب و ئەنوەر لە زینداني ئەبوغرێب لەسێدارەدران. برایەکی کەژاڵ لە نەخۆشخانەی کۆماری بوو، یاریدەدەری پزیشکیی بەشی تیشک بوو، ئەویش هاوڕێم بوو. ئەوە وای لە من کرد باوەڕ بە کەژاڵ و ئاوات بکەم کە کاری سیاسییان لەگەڵ بکەم، دواتر بۆم دەرکەوت کە کەژاڵ و ئاوات پەیوەندییان بە کەرتی ڕێکخستنی شەقڵاوە هەیە، بەرپرسی پۆلەکەیان لەناو هێزی پێشمەرگەدا کادیرە، ناوی شێخ قادرە. تا ئەو کاتەی لە هەولێر بووم، لە ڕێگای کەژاڵ و ئاواتەوە، لەگەڵ کەرتی ڕێکخستنی شەقڵاوە بەجدیی کارمدەکرد، دەرمانم بۆ پێشمەرگە دەنارد، بڵاوکراوەکانی ڕێکخستنم دەخوێندەوە، بڵاومدەکردنەوە، پڕوپاگەندەم بۆ ڕێکخستنی کوڕەک و بۆ هێزی پێشمەرگە دەکرد".

خۆشم ئاگاداربووم کە چەند جارێک کەژاڵ دەرمانی دەبرد بۆ ناو هێزی پێشمەرگە، بە نهێنیی لەگەڵ کادیرانی ناوشار و بە دەمامکەوە بەشداریی لە کۆنگرەی یەکی کۆمەڵەی ڕەنجدەران دەکات و لەوێ دارۆی ڕەوانشادی هاوسەرم دەبینێ. جارێکیش دەچێت بۆ ئەوەی ببێت بە پێشمەرگە و پەیوەندیی بە هێزی پێشمەرگەوە بکات، هەڤاڵ مەلا بەختیار ئەینێرێتەوە و پێی دەڵێ: بەسە، کەس لای دایکت و باوکت نەماوە، بڕۆرەوە کاری خۆت لەناو شار بکە و ئاگات لە دایکت و باوکت بێ.

کەژاڵ، کچێکی ئازا و ئازاد بوو، زۆر گوێی نەئەدا بە نەریتە کۆمەڵایەتییەکان و نەیدەهێشت کۆتوبەندی بکات. زۆر بوێربوو، جارێکیان بەنهێنیی دەچێتە ناو

پێشمەرگە، بە کارێکی تایبەت و نهێنیی دەچێتە لای قادری خاڵۆزام لەناو بارەگاکانی هێزی پێشمەرگە، لەوێشەوە لەگەڵ قادر و چەند پێشمەرگەیەک دەموچاو و سەری بە جامانە دەبەستێت بۆ ئەوەی کەس نەیناسێتەوە و دەچێتە سەرکردایەتی و کارەکەی ئەنجامدەدات و بەپەلە دەگەڕێتەوە دێریێ و لەوێشەوە بۆ قەلادزێ بۆ ماڵی خاڵوانم و لەوێشەوە بۆ سلێمانی. ئەندامێکی کارای ڕێکخراوی ئاڵای سوور بوو کە لە شوێنێکی تری ئەم کتێبە باسم لێوەکردووە. لە خۆپیشاندانەکانی نیسانی ١٩٨٢ی زانکۆکان، یەکێک بوو لەوانەی کە داینەمۆی ڕێکخستنی ئەو خۆپیشاندانانە بوو، بەو هۆیەوە دەستگیر دەکرێ و خەریک دەبێ لە زانکۆ دەربکرێ، بەڵام بەهۆی خزم و ناسیاوەکانمانەوە هەروەها بەهۆی برادەرانێ خالید دلێرەوە توانرا بگەڕێتەوە بۆ خوێندن.

ئەوەی راستی بێ، زۆرجار باس لە سەربازی ون دەکرێ، باس لەو کەسانە دەکرێ کە خۆنەویستانە ڕێگەیەکی راستی ژیانیان گرتووە و ئیشی تێدادەکەن و لەپێناو ئەو ڕێبازەی گرتوویانەتەبەر، لەپێناو خەڵکە رەشوڕووت و بێدەرەتانەکە، لەپێناو خاکی داگیرکراو، بۆ هەڵوەدابوون بەدوای ئازادی و لەپێناوی بانگی رەوا بەدوای کەشوفش و ناودا نەڕۆیشتوون، بەڵکو ئەوان مەبەستیان هەر خزمەتکردنی ئەو بنەمایانە بووە کە بڕوایان پێ هەبووە. لەم حاڵەشدا چ پیاو بێ چ ژن جیاوازییەک نییە. تەنیا ئەوەندە نەبێ لەم ڕێسایەدا زیاتر ژنان بەشی شێریان بەرکەوتووە، زیاتر مافی ناوهێنان و یادکردنەوەشیان خوراوە لە پیاوان، ئەوان کەمتر باسیان کراوە، هەڵبەتە ئەمەش لەبەر ئەو ژینگەی ئەو کۆمەڵگەیە بووە کە تێیدا ژیاون.

کاتێکیش لەنێو کۆمەڵگەی کوردەواریدا بەدوای نموونەی ئاوەهادا بگەڕێین، ئەوا زۆر و زەوەندن، ڕێک ،رەوشەکە کالایەکە بەقەد باڵای ناواخنی شیعرە نەمرەکەی (عەبدوڵلا پەشێو) بەناوی (سەربازی ون)، بەڵام کاتێک ئەو چەمکە وردبکەینەوە، لەواقیعدا لەسەر کەسێک بەرجەستەی بکەین و نموونەیەکی دەقاودەق بێنینەوە. ئەوا بە رای من هەر دەبێ بە هەر دە قامکمان ئاماژە بە کەسایەتییەک، بە ژنێک، بە رۆشنبیر و چاوکراوەیەکی وەک رەحمەتیی (کەژاڵ عوسمان) بدەین.

ئاخر کەسێک هەر لە گڕوگاڵی منداڵییەوە بانگی شیعرە ئاگرینەکانی شاعیرانی کۆیەی بە گوێدا درابێ، لەپاڵ هەیبەت سوڵتان و باواجی، بە ئاوازی هەمەڕەنگی سێوە و خاڵە تایەر و پاشان بە هزری رۆشنی مامۆستا (خالید دلێر)ی خاڵی پەروەردە کرابێ، سەیر نابێ دواتر ئەوەی لێدەرێ کە دەرچوو... ئیدی دواتر کە دێتە هەولێر و لەگەڵ خوێندندا هەڵدەکشێ و کۆلێجی کارگێڕی و ئابووری تەواو دەکات و لە دامێن قەڵادا دەگیرسێتەوە و خێزان بەیەکەوە دەنێ، هەردەبێ ئەو پەروەردەیە وای لێبکات وەک ئەنجامی هاوکێشەیەکی زیندوو ئەو کچە ئازا و بوێر و رۆشبنیر و چاوکراوە و نیشتمانپەروەرەی لێ دەربچێ.

هەولێر لە سەردەمی تەنگەتاوی بەعس، مەبەستم لە هەولێری هەشتاکانی سەدەی رابردووە. کاتێک خەباتی نهێنی و ڕووبەڕووبوونەوە، هەموو حیسابێکی لەسەر دەکرا، لەوبوە ژیانی مرۆڤ هەر بە موو بە مان و نەمانەوە بەندبوو، ڕێگەی

خەبات ڕێگەی مان و نەمان بوو، هەر دەبێ بیرۆکە و پەروەردەیەکی دەوڵەمەند، بە جۆش، هەستێکی پڕ، ڕاستە ڕێگایەکی باوەڕدار، نیشتمانپەروەرییەکی پاک و بێگەرد هانی ماخۆکەی بدا تا کارای بکات و لەو مەیدانەدا چالاک بێ... هەر ئەوەندەش نییە بە تەنیا، بەڵکو دەبێ هەرچی ناواخنی بوێری و ئازایەتی و نەترسان و لەخۆبووردیی و خۆبەخشیی هەبێ تێیدا ڕەنگیدابێتەوە، ئەوسا وای لە کەسەکە، هەڵگری خەسڵەتەکان کردبێ تەکان بە خۆی بدا و دەنگی نەخێری خۆی دلێرانە بەرزبکاتەوە... بێباک لەوەی لێکەوتە لەسەر ژیانی کەسەکە چی دەبێ.

بەڵێ ئەوێ ڕوژی من وەک گەواهییەکی زیندوو، هەموو ئەو ئاکارانەم لە کەژاڵ بینی، هەر ئەمانەش بوو وایلێکردین ببینە دەستەخوشک، لەوەش زیاتر هاموشۆی ماڵباتەکانمان گەرم بێ و وەک دووانەمان لێبێ، چ لای خانەوادەی ئەوان و چ هی ئێمە.

هەر بەڕاستی کاتێک مرۆڤ دێتە سەرباری گێڕانەوەی مێژوو، گێڕانەوەی ئەو سەربوردانەی ڕوژە تەنگانەکان، ئەوا گێڕانەوە و نووسینەوەیان، دەقنووسکردنیان و خستنە سەر کاغەز، هەرگیزاو هەرگیز تامی ئەو ترس و تاسە و مەراقەی ئەوێ ڕۆژێ نادەن. ئیدی منیش کاتێ باسی کەژاڵ بکەم، ئەوا لەخۆوە قورگم دەگیرێ، هیچم بۆ نانووسرێ. ئەوەی بشنووسرێ کاڵوکرچ دەردەچێ، ئاخر کوا خامە هێز و ڕۆشنایی ئەوەی تێدایە ئەو داستانەی ناوی لێدەنێم کەژاڵ بگێڕێتەوە، بۆیە دەترسم، زۆریش دەترسم، شایانی خوشکە لەدەستچووەکەم نەبێ.

لێرەدا بە حەق و ڕەوای دەزانم، دەپرسم، خۆزگە کۆڵان و شەقام و داڵانەکانی هەولێر، خۆزگە سەردەمی خۆپیشاندانەکانی خوێندکاران لە سەرەتای هەشتاکان لە هەولێر، خۆزگە چوار دەورەی قەڵا، خۆزگە ژووری زیندانی ئەمنی هەولێر، خۆزگە ڕێگەی بالیسان و هەروتەکەون و دەرگەڵە، خۆزگە تکا و دامەندادڕینی دایکەکانمان... هەزاران خۆزگە و تکای دیکە بهاتبانە زمان، قسەیان کردبا و ئەو بارە گرانەیان لەسەر شانی من لابردبا، ئەوسا خوێنەر حاڵی دەبوو ئاخۆ کەژاڵ چ کچێک، چ ژنێک بووە.

لێ گەلۆ، حەقە ئەوەش بپرسین، ئاخۆ کاتێ حاڵ و گوزشتە لە سەردەمی تەنگەتاو و جەور و ستەمی بەعس، وەها بوو ئەدی دوای ڕاپەڕین و دوای ئازادی و قەوارەی خۆیی؟!

لێرەشدا زمان لە ئاست بەیانکردن هەر لاڵە، لەبەر هاتنەکایەی هەندێ زۆرە ڕێسای دیکە دۆش دادەمێنی. ئاخر ئەدی ئەوە نییە خەونەکانی دێرین، ئاواتەکانی سەردەمی بەرێ، تاسە و مەراقەکانی ئەوێ ڕۆژێی ئاوەژووکردووەتەوە، ئاخر خۆ کوردەواری لە گۆترەوە نەیوتووە کێ کردی و کێ خواردی؟!

دوای ڕاپەڕین و دوای سەردەمی شێتانەی شەڕی براکوژی، هەندەران، دوورکەوتنەوەی ناچاری لە نیشتمان، چارەنووسی جووت خوشکەکە بوو، چارەنووسی کەژاڵەکان بوو. کاتێکیش خەبات لەسەردەمی کچایەتی بریتی بوو لە خەمی گەل و خاک، دواتر دوای ڕاپەڕین و ئازادی، سەرداریتی چاوچنۆکی و میرانی شەڕ و دەسەلات مەیدانەکەیان لەسەر خۆیان پاوانکرد، ئیدی قۆناغی دایکایەتی دێ... لەمەشدا کەژاڵ و هاوشانەکانی هەر قوربانی بوون. لە هەمووشی نەگبەتیتر هەر لە ئاوارەیی. لە غەریبایەتی بە دەردێکی غەریب سەرینایەوە و خەریکبوو بە مەرەدەی گورغەریبان بچێ.

ئەرێ بەڕاست کەژاڵ گیان خۆ ئێستا، کە ئەم چەند وشانە دەڕێژمە سەر کاغەز، نەورۆزە... تۆش دیارنیت! منیش لەماڵم... نەچوومەتەدەر... ئیدی ئەوە نییە بەیەکەوە لە نەورۆزدا یادەکانمان تێکەڵ یەک دەکەینەوە!

لێرەدا زیاتر ناڕۆم، فرمێسکی وشەکانم ڕادەگرم و لە دوای حاجی قادردا دەیڵێمەوە:

مەرگ و ژین میسلی سێبەر و تاوە
ئەوەی باقی بمێنی هەر ناوە
بەڵێ ناو.. ئەمما چ ناو؟!

## هاوتا

### "ئاشە باریخ چوو بۆ مەریخ"

هەرچەندە لە زۆر شوێنی تری ئەم کتێبە باسی هاوتای برام کردووە، بەڵام ویستومە بۆ هەر یەکێک لەو کەسانەی کە ڕۆڵی گەورەیان لەژیانمدا هەبووە، چەند لاپەڕەیەکی تایبەتیان بۆ تەرخان بکەم. باری سیاسیی ماڵەکەمان وایکردبوو هەندێکجار ماوەی دوورودرێژ لەیەکەوە دووربین و ئاگامان لە وردەکاریی ژیانی یەکتر نەبووبێ، جاری وا هەبووە دوای (١٢) ساڵ یەکترمان بینیوەتەوە،

ڕەنگە ئەو ماوەیە بۆ زۆر کەس ئاسایی بێ، بەڵام بۆ ئێمەی سەرکەش ئاسایی نەبوو کە هەموو ڕۆژێ ژیانمان دەکەوتە مەترسییەوە. هەروەها بەهۆی ئەوەی خێزانێک بووین زۆر بەیەکەوە بەسترابووین، چرکە بە چرکە دڵمان لای یەک بووە و دوورییەکان جگە لە هەستی ئیشتیاقیی، پڕبوون لە دڵەڕاوکێ و نادیاریی چارەنووس. هەربۆیە ویستوومە بۆ باسکردن و گێڕانەوەی سەرگوزشتەکان، لەگەڵیان دابنیشم و بەیەکەوە لاپەڕەکانی بیرەوەریی توێ بەتوێ هەڵبدەینەوە. هەندێکجار لە گێڕانەوەیان بە قاقا پێدەکەنین و هەندێکجاریش بە فرمێسک و هێمنییەوە دەمانگێڕایەوە.

ویستوومە ئەوانەی لەژیاندا ماون، ڕاستەوخۆ بەشداربن لە گێڕانەوەی بیرەوەرییەکاندا، بۆ ئەوەی تەنیا بۆچوونی خۆم نەبێ و هەستی خۆمی تیا زاڵ نەبێ. بۆ گێڕانەوەی بیرەوەرییەکانی ئەم بەشە، لەگەڵ هاوتای برام بەیەکەوە بە دانیشتنی دووروودرێژ لە هۆڵەندا و لای دایکم نووسیومە، لە چێشتخانە بچووکەکەی ماڵەکەی دایکم. دایکم، بە تەنیا تاقەتی دەچوو، زوو زوو دەهاتە سەرمان و دەیووت "دەبەسە وەرنە دەرەوە". جارێک دەیوت "بینووسن با بیرنەچنەوە " جارێکیش دەیوت "سوودی چییە، من ئەوا کوڕ و برا و ژیانم کرد بە قوربانیی ئەو خاک و میللەتە، جگە لە خەفەت چیم دوورییەوە".

هاوتا، تایبەتمەندییەکی زۆری لای دایکم هەیە، ئەویش جێگەی هەموومانی بۆ دایکم پڕکردووەتەوە. دەتوانم بڵێم کەم منداڵ هەیە ئەوەندە دڵسۆزبێت، ئینجا کوڕیش بێ، ڕەنگە ئەمە لە کچ ببینین، بەڵام زۆر دەگمەنە لەناو کوڕدا بیبینین. بە شاهیدیی هەموو ئەوانەی دەمانناسن، هاوتا، هەموو گیانی خۆشەویستییە، پڕە لە دڵسۆزی و خەمی هەموو کەسێکێتی، هەربۆیە لای هەمووان زۆر خۆشەویستە، کەسی وا خونەویستم زۆر کەم بینیوە، ڕەنگە بڵێن دەیەوێ بە شانوباڵی براکەی هەڵبدا، بەڵام ئەگەر ئەم چەند ڕەوشتە جوانەی باس نەکەم غەدرێکی زەمەنیی لە خۆم و لەویش و لەو جۆرە کارەکتەرە نموونەییانە دەکەم.

هاوتا، لە ٣٠ی ئابی ١٩٦٤، لە شاری کۆیە لە گەڕەکی بەفری قەندی لەسەر دەستی مریەمەی سستەر لەدایکبووە. مریەمە، سستەرێکی مەسیحی بوو، زۆربەی منداڵانی ئەو سەردەمە لەسەر دەستی ئەو لەدایکبوون. کاتێ دایکم کەوتە سەر ژان بەپەلە منی نارد بۆ لای مریەمە و هێنام بۆ لای دایکم، دایکم کاتێ هاوتا

لەسکیدا بوو خەونی بینیبوو کە کوڕێکی دەبێ و ناوی دەنێ محەمەد، بەڵام باوکم لای پەسەند نەبوو، بۆیە بڕیاریاندا دڵی هەردوولا ڕازی بکەن و ناویاننا محەمەد هاوتا. ئەوکات من تەمەنم (١٤) ساڵان بوو، بۆیە بەرپرسیاریێتی و ئاگالێبوونیم کەوتە سەرشان، هەربۆیە من هاوتا نەک تەنیا وەک برا سەیردەکەم، بەڵکو وەک کوڕێکی خۆشم دەیبینم. ئەویش زۆرجار دەڵێ دایکی دووەمم. هێشتا تەمەنی (٢٦) ڕۆژ بوو کە بەرەو شاری هەولێر گواستمانەوە، لەبەرئەوەی باوکم کارەکەی گواستەوە بۆ هەولێر. هەر لەمنداڵییەوە کوڕێکی ناسکی بێوەی بوو، زۆر پاکوخاوێن بوو، کەس بە بیجامەوە نەیدەبینی و دەبوایە هەر کە لە خەو هەڵسا جلی جوانی لەبەربکرێ. بەهۆی ئەوەی تەندروستیی باش نەبوو و لەمنداڵییەوە تووشی نەخۆشیی تەنگەنەفەسیی بووبوو و دوامنداڵیش بوو، زۆر گرنگیی پێدەدرا و جێی بایەخی هەموومان بوو بەتایبەتی من. لەمنداڵییەوە خەریکی خوێندنەوەی چیرۆک و کڕینی کتێبی چیرۆکی منداڵان و جلی جوان بووم بۆی، خۆشی دەڵێ زمانی عەرەبیم بەهۆی ئەو کتێبانە بوو (البجعة المسحورة) (سيرة كبار الموسيقيين)، لە پۆلی دووی سەرەتایی بوو هێشتاش بیری ماوە. کاتێ تەمەنی گەیشتە تەمەنی خوێندن هێشتا خانووی خۆمان نەبوو، لە هەولێر خانووییەکمان بەکرێ گرتبوو، خانووی (حاکم سابیر) لەسەر گردێک بوو لە ناوشار و نزیک بازاڕ و قەڵات بوو، خوێندنگاکەی بە تەنیشت ماڵەکەمانەوە بوو بەناوی ئەحمەدی خانی، نەدەچووە قوتابخانە تا گوێی لە زەنگ نەبوایە.

منداڵێکی پرسیارکەر بوو، هەموومانی سەرقاڵدەکرد بە وەڵامدانەوەی. کاتێ هاوتا لە پۆلی دوو بوو، کێشەیەکی هەبوو، پیتەکانی (ش، ژ)ی تێکەڵ دەکرد، بۆ نموونە؛ بە ژنی دەوت: "شن"، ئیتر ئەوە وایکرد لە پۆلی دووەمی سەرەتایی بەدووەم دەربچێ، لە ئیملا هەڵەی لەو دوو پیتە کردبوو، باوکم لێپرسی؛ باشە بۆ یەکەم نەبووی؟ لەوەلامدا وتی "ئەو کوڕەی یەکەم بوو باوکی خوێندەوارە". باوکم لێپرسی؛ چ کارەیە؟ وتی "باوکی پۆلیسە". باوکم کە مامۆستاش بوو لای هاوتا نەخوێندەوار بوو و بەلایەوە پۆلیس پلەیەکی زۆر باڵاتری هەبوو.

ئەو کاتەی هاوتا لە پۆلی دوو بوو، بارەگای پارتی دیموکراتی کوردستان لای ماڵی ئێمە بوو، لە هاوینی (١٩٧٢) ئەندامێکی پارتی بەناوی (محەمەد حاجی) بە فەرمانی بەرپرسێکی بەعس بەناوی (منعیم بادی) شەهیدکرا، لە

لای بینای دادگای هەولێر، بوو بە تەقەیەکی زۆر، زۆربەی ئەندامەکان ئەو بارەگایەیان چۆڵکرد و لە هەموو لایەکەوە تەقە بوو، خوشکی فارس باوە، خێزانی محەمەد حاجی بوو. هاوتا و کەژاڵی خوشکم ئەو دیمەنەیان بینیبوو و زۆر کاریگەریی لەسەر هاوتا بەجێهێشتبوو، ئەو رووداوە بیرەوەرییەکی تری بیرخستینەوە کە لەهەمان شوێن ئەحمەد ریشوانی لە ١٣ی کانوونی یەکەمی ١٩٦٧، بەدەستی چەکدارەکانی پارتی دیموکراتی کوردستان شەهیدکرا، ئەحمەد ریشوانی کادیرێکی پێشکەوتووی باڵی مەکتەبی سیاسی بوو، شەهید جەعفەری خاڵم ئەو رووداوەی بۆ هاوتا باسدەکرد و دوایین هۆنراوەی ئەحمەد ریشوانی کە هەفتەیەک پێش شەهیدبوونی پێشبینیکردبوو بۆی خوێندەوە، ئیتر ئەو هونراوەیەی لەبەرکردبوو و وەک خۆی دەڵێ یەکەم هۆنراوەی شۆڕشگێرییە کە لەبەریکردبوو و زوو زوو دەیوتەوە ئەویش کە دەڵێ:

مەڕێژن بۆم فرمێسکی خەم
کە سوور بووە لە خوێنی جەستەم
شەهیدی دەستی زۆردارم
بەڵام ئۆخەی کە پێشمەرگەم... هتد

لەوکاتەوە گیانی بەرگری و خۆشەویستیی بۆ پێشمەرگە و نیشتمان لەناخیدا رەگی داکوتا، ئیتر پرسیارەکانی لە فەلەک و ئاسمان و ئەستێرەوە گۆڕا بۆ رۆڵی شۆڕشگێڕەکانی جیهان و گیانی بەرگریی ئەوانەی ئەو سەردەمە باسیان لێوە دەکرا، لەوانە (گیڤارا).

ئیتر گیڤارا بوو بە سیمبولی شۆرشگێڕێتیی لەژیانیدا، هەموو زانیارییەکی لەسەر ئەو شۆڕشگێرە لابوو، ئەوکاتیش شەهید جەعفەر و خالید دلێر ئەو گیان و رۆحیەتەیان زیاتر لای پەروەردەکرد، منیش سەرچاوەکانم بۆ پەیدا دەکرد. لەهەمان کاتدا شەهید جەعفەر زوو زوو توورەشی دەکرد، بە هاوتای دەوت "شنێکت بۆ دەهێنم". واتە: ژنێکت بۆ دەهێنم بە زمانی هاوتا. لەوانە: (ئاشە باریخ) هەبوو گۆرانیبێژێکی کوردی سۆڤیەت بوو پێیاندەوت:

ئاشە باریخ چوو بۆ مەریخ
بۆ هاوتای هێنا زەرنیخ بەنیخە نیخ

هەروەها سەماکەریکیش هەبوو هەر هی سۆڤیەت بوو زۆر قەڵەوبوو، ناوی (سوسێکی سمۆ) بوو هاوتا بەوبش زۆر توورە دەبوو. ئیتر بەم شێوەیە هاوتا وەک هەمووومان زیاتریش لەناو ژینگەیەکی سیاسیی کوردپەروەری پڕ لە نهێنی و چالاکیی گەشەی کردووە، بۆیە ناکرێ بڵێین؛ هاوتا، بۆ ئەم جۆرە کەسایەتییەی لێ دەرچووە.

لێمپرسی؛ هاوتا، چۆن چوویتە ناو کۆمەڵەوە و بووی بە کادیرێکی چالاک؟ لێرەوە و لەو قۆناغەدا من کەمتر لە نزیکەوە ئاگام لێیبووە، ئیتر دەستیکرد بە گێڕانەوە: لە سەرەتای ساڵی ١٩٧٤ کە هێشتا تەمەنم نەبووبوو بە (١٠) ساڵ، شەهید جەعفەر و پیاوێکی گەنم رەنگ لە یەکێ لە ژوورەکانیماڵەوەمان خەریکی قسە و پاککردنەوە و گریسکردنی دەمانچەیەک بوون، کە چوومە ژوورەوە وتی "ئەوە برادەرێکمە ناوی عوسمانە (کە ناوی نهێنیی شەهید خاڵە شەهاب بوو)، بەڵام نابێ کەس بزانێ ئەم برادەرە لێرەیە". دوای ئەوە دەمانچەکەیان خستە ناو کوپەیەکی بچووک و لەناو باخەکەی ماڵەوەمان شاردیانەوە، (هەر ئەو دەمانچەیە بوو بەندە رادەستی شەهید عەلی ئامە خانم کرد لەگەڵ کلاشینکۆفێک)، ئیتر ئەم نهێنییەم پاراست و لای کەس نەمدرکاند هەرچەند منداڵیش بووم. دوای ئەوە لە ساڵی ١٩٧٤ کە شۆرش هەڵگیرسایەوە، ئازادی برام (شەهید ئازاد) و دارۆی زاوامان پەیوەندییان بە هێزی پێشمەرگەوە کرد، من و کەژاڵی خوشکم بە دەستکێشی خورییەوە نامەمان دەنووسی و هۆنراوەکانی مامۆستا هێمنمان دەنووسییەوە و بەیانیان زوو هێشتا دونیا رووناک نەدەبووەوە لە ژێر دەرگای دوکانەکانەوە بڵاوماندەکردنەوە، دوای ئەوەش دەچووم نانم دەکڕی. وەک دەربڕینی ئەو رۆحیەت و هەستی بەرپرسیارێتیی بەرانبەر شۆڕش ئەو جۆرە چالاکییانەمان دەکرد، هەمووشی بە نهێنی و بە دزیی ماڵەوە بووە. هەروەها بەهۆی ئەوەی ماڵەکەمان لە ناوبازاڕ و لە شەقامی خانەقا بووین، زیل و جێبی سەربازیی هێزەکانی بەعس دەهاتن بۆ شتکڕین، منیش لەگەڵ هاورێیەکم بەناوی یاسین بزمارمان لە تایەی ئوتومبێلەکانیان دەچەقاند بۆ پەنچەرکردنیان. جارێک کورێک شاگرد فیتەر بوو بەناوی سامی وتی "ئەگەر شەکر بخەیتە ناو مەکینەی ئۆتومبێل، دەسووتێ". منیش جارێک جێبێکی سەربازیم بینی، بۆنیتەکەی هەڵدابووەوە، پەکم خست و بە پەلە رامکرد لە سەربان سەیرمدەکردن کە بە زیل

رایانکێشا. هەرچەندە ئەو چالاکییانە بچووکبوون، بەڵام دەربڕینێکی ناخ و هەستی خۆمان بوو، وامانەزانی هاوکاری پێشمەرگە دەبین. ئیتر ئەو هەستی نەتەوەیی و وڵاتپەرستییەم رۆژ بەڕۆژ لا مەزنتر دەبوو، بەتایبەتی دوای شەهیدکردنی (جەعفەر و شەهاب و ئەنوەر ) ئەوەندەی تر رقمان بەرانبەر دوژمن زیاتربوو. لەکاتی شەهیدکردنی شەهید جەعفەر و هێنانەوەی تەرمەکەی بۆ شاری کۆیە، ئازادی برام داوای لە من و ئامانجی ئامۆزام کرد بچین شتێ لەسەر گۆڕەکەی بنووسین، ئێمەش بەیانییەکی زۆر زوو چووین و بە رەنگی زەیتیی لەسەر کێلەکەی نووسیمان کە شەهید جەعفەر بە دەستی دوژمن لەسێدارە دراوە و بژی پێشمەرگە و بژی کوردستان، بۆ بەیانی هەموو کەس باسیان لەوە دەکرد پێشمەرگە هاتوونەتە ناوشار و لەسەر گۆڕەکەی شتیان نووسیوە، ئێمەش نەماندەوێرا هیچ بڵێین.

بەردەوامبوو لەسەر گێڕانەوە: ساڵی ١٩٨٠، رێکخستنێک هەبوو بەناوی ئەستێرەی سوور، بەشێک بوو لە رێکخراوی کۆمەڵە، لەوێوە چوومە ناو رێکخستنەکانی کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستانەوە. لە ساڵی ١٩٨٢، ئەوسا لە پۆلی شەشی ئامادەیی بووم، لە رێگای خوێندنگا لەگەڵ برادەرێک بووم بەناوی (کەرخی سەید ئەحمەد) دەزگای ئەمنی هەولێر هاتن گرتیانین و بردیانین بۆ دەزگای ئەمن. دوای پرسیارکردن کە لێیانپرسیم؛ ناوت چییە؟ وتم: "محەمەد هاوتا"، بۆ بەیانی بانگیانکردینەوە بۆ لێکۆڵینەوە بە چاوی بەستراوەوە، لێکۆڵەرەکە دیسان پرسی وتی "ناوت چییە؟" وتم: "محەمەد هاوتا". وتی "ناوی باوکت؟" وتم "عوسمان". لەپڕ یەک زلەیان لێدام نەمزانی ئەوە دەست بوو یان خاکەناز، ئەوەندە بەهێزبوو چەناگە و پشتی سەریشمی ئاوساندبوو. وتی "(كلب ابن كلب) سەگی کوڕی سەگ بۆ دوێنێ نەتوت ناوی باوکت عوسمانە، دوێنێ وامانزانیوە خۆت ناوت محەمەدە و باوکت هاوتا". دوای هەشت رۆژ مانەوە و لێکۆڵینەوەی بەردەوام، هیچیان دەستنەکەوت لێمان و هەردووکمانیان بەردا.

دوای دەرچوونم لە پۆلی شەشی ئامادەیی، چوومە پەیمانگای تەندروستیی لە هەولێر، بۆیە ئەو بەشەم هەڵبژارد، لەبەرئەوەی پلانم هەبوو پەیوەندی بکەم بە هێزی پێشمەرگەوە و ئەوەم بەباشزانی بۆ خزمەتی پێشمەرگە، چونکە نمرەکەم ئەوەندە دەبوو لە زۆر کۆلێجی تر وەربگیرێم. یەکەم ساڵی لە پەیمانگا،

بەهۆی ئەوەی من و هەندێ هاوڕێم نەبووین بە جەیشی شەعبی، دەرکراین و نەیانهێشت ساڵەکەمان تەواوبکەین. بۆ ساڵی دوای ئەو بڕیارێک دەرچوو ئێمەیان وەرگرتەوە و ئیتر لە ساڵی ١٩٨٥، لە پەیمانگا دەرچووم، ئەو سەردەمە (پلەبەندیی پزیشکیمان) هەبوو، بۆ ماوەی ١٠ مانگ ئەو کارەم بە خۆشاردنەوەوە لەگەڵ ماڵی باوکم ئەنجامدا، لەو ماوەیەش ئێمە تیمێکی گەڕۆکی پزیشکیی بووین لە (تۆپزاوا، بنەسلاوە، دارەتوو، کەورکۆسک، باسرمە)، ئۆتۆمبێلە گەڕۆکەکەی ئێمە هەر جارەی لای یەکێکمان بوو. هاوڕێیەکمان هەبوو هەقی بەسەر سیاسەتەوە نەبوو، ئۆتۆمبێلی تیمەکە لای ئەوبوو، ئێمەش ئاگاداری ئازادی برام و مەفرەزەکانی پێشمەرگەمان کردبوو کە ئەو ئۆتۆمبێلە پڕ لە دەرمانە و شوێنەکەیمان دەستنیشانکردبوو، ئەوانیش مەفرەزەیەکیان نارد و هەوڵمدا ئەو کاتە لەوێ نەبم، ئیتر ئەو ئۆتۆمبێلە پڕ لە دەرمانەیان برد.

لە ساڵی ١٩٨٧، پەیوەندیم بە هێزی پێشمەرگەوە کرد و بووم بە پێشمەرگە و بە پزیشکی تیپی (٩٣)ی کۆیە. ئەو ماوەیەی پێشمەرگەبووم، کاری پزیشکیم دەکرد.

داوام لێکرد ئەو کاتەی کیمابارانی گۆپتەپەم بۆ باسبکات، وتی "ئەوکات پێشمەرگەبووین لە تیپی (٩٣) کە شاڵاوی ئەنفال و کیمیاباران دەستیپێکرد و کەوتنە کیمیابارانی گۆپتەپە، ئێمە لەگەڵ پێشمەرگەکان کشاینەوە و کاک جەلال جەوهەرمان لەگەڵ بوو، چووین بۆ چارەسەری بەرکەوتووەکانی کیمیایی هەرچەندە خۆشم بەرم کەوتبوو. برینداەکان ئەوەندە زۆربوون دەرزیمان پێنەما کە دەرزی (ئەترۆپین) بوو تەنانەت دەرزییەک نەما لەخۆمی بدەم. ئەو شەوە مەڵبەندی دووش گەیشتبوونە لامان بە سەرپەرشتیی (شێخ جەعفەر و قادری حاجی عەلی)، دوای دوو رۆژ هێزەکانی مەحمود سەنگاوی و ئاواتی شێخ جەنابیش رۆیشتبوون بەرەو مەڵبەندی سێ. بۆ بەیانییەکەی حکومەت جارێکی تر هێرشی دەستپێکردەوە، ئەمجارە لە هەموو لایەکەوە بوو، کاژێر (١٠) ی بەیانی بوو لە بەری گۆپتەپەوە تانکەکان گەیشتنە سەرمان و لە کاژێر (١١) ەوە دەستمانکرد بە کشانەوە بەرەو تەقتەق لەوێشەوە بۆ گۆمەشین و داربەسەر. ئەو شەوە شەوێکی ساماڵ و مانگەشەو بوو، سێبەری خۆمان دەبینی. بۆ ئەوەی بگەینە رێگای تەقتەق لە شیوەسوورمان دا، هەلیکۆپتەرمان بە سەرەوەبوو و پێش

ئێمە کەوتبوونە شەڕ لەگەڵ هێزێک لە گەرمیانییەکان و نزیکەی (١٧) شەهیدیان بەجێهێشتبوو. دوای ئەوە شەومان بەسەرداهات و گەیشتینە گوندێکی وێرانە، زۆر ماندو و برسیی بووین، کاک جەلال جەوهەر بانگی من و ئازادی کرد و وتی "نیو مریشکێکم پییە با بیخۆین". ئەوە یەکەم ژەمی خواردنی ئەو ڕۆژەمان بوو، شەو لە خانوویەکی وێرانەدا خەوتین، ئەو شەوە ئەوەندە ماندووبووم و وا خەوم لێکەوتبوو. لە خەوما چووم بۆ میزکردن، بەڵام خەبەرم نەبووبووەوە و میزەکەم بەخۆمدا کرد. کە خەبەرم بووەوە، بەو شەوە چوومە دەرەوە خۆم خستە گۆماوێک، کە گەرامەوە مامۆستا بەکر بەئاگا هات و وتی "دکتۆر ئەوە چییە؟" وتم "چووم بۆ ئەوەی دەست بەئاو بگەیەنم و کەوتمە ئاوەوە". بەپەلە لەگەڵ پێشمەرگەکان ئاگرێکیان کردەوە و وتیان "وەرە خۆت وشک بکەرەوە". نەمدەوێرا نزیک ئاگرەکە بکەومەوە بۆنی میزم لێدەهات. دوای ئەوە بۆ بەیانی چووینە گوندی (داربەسەر) لای فاروقی عەلی مەولودی (فافەلو) ماینەوە، فافەلو کوڕی شەهید عەلی مەولودە خۆشی یەکێکە لەو بریندارانەی کە زۆر بە سەختیی لە شەڕی تەقتەق برینداربووبوو، دوو ئارپیجی پێکەوتبوو، ئارپیجی دوژمن و ئارپیجییەکەی دەستی خۆشی بەسەر خۆیدا تەقیبووەوە، بەهۆی ئەو برینداربییەوە نۆ گرامی مێشکی پەڕیبوو، ماوەیەک لە (کۆما)دا مایەوە، کاتێ بەهۆش خۆی دێتەوە دەڵێت (فافەلو)، بۆیە برادەرەکان ناوبەناو بەناوی (فافەلو) بانگیان دەکرد و لەکۆتاییدا لە ئەڵمانیا چارەسەرکرا. دوو ڕۆژ لە ماڵی کاک فاروق ماینەوە و هەموو هێزەکانی تر پەڕینەوە بۆ مەڵبەندی سێ، مەفرەزەی تیپی ٩٣ و مەفرەزەکانی شێخ جەعفەر دەبوایە لەو ناوچانە بمێننەوە بۆ مەبەستی ناردنی زانیاری و هەواڵ بۆ سەرکردایەتی و مەڵبەندی سێ، دوای دوو ڕۆژ کاک کۆسرەت بروسکەی کرد و وتی "ئێوەش وەرنە لامان". تیپەکەمان کە گەیشتە مەڵبەندی سێ، لە گوندی (ئەشکەفتە) ماینەوە. دیسانەوە هێزە سەربازییەکانی بەعسی فاشی هێرشەکانیان دەستپێکردەوە بۆ ناوچەکانی لای ئێمە، ئێمەش ڕۆشتین بەرەو بەنی هەرێر و لەوێ ماینەوە.

هەموو شەڕەکانی مەڵبەند سێ، مەفرەزەیەکی حیزبی شیوعیمان لەگەڵ بوو کە نۆ کەس بوون، لە بەری هەریریش دوو مەفرەزەی جاشی لێبوو کە پەیوەندییان لەگەڵ هێزی پێشمەرگە هەبوو، هەرکات حکومەت هێزی کۆبکردایەتەوە بەرەو

لای ئێمە، ئاگاداریان دەکردینەوە. ئێمەش بە هاوەنی (١٢٠) و راجیمەی (١٢) مووشەکی تۆڵە ئەکەوتینە گیانیان. بەمە توانیمان هەموو هێرشەکانیان بێئەنجام بکەین. ئەو سێ تۆپهاوێژە خەڵکی کۆیە بوون و یەکێکیان ئامانجی ئامۆزام بوو کە لەسەر مووشەکی تۆڵە بوو، لەوێش (کۆیاتی و خۆیاتی)مان دەکرد ئەگەر بۆمان بگونجایە و لەو ماوەیەش دووجار بووم بە (رەسەدی) ئامانج بۆ مووشەکەکانی. لە دەشتی کۆیە، زانیاریمان بۆ هات کە هێزەکانی دوژمن لە تەقتەق و کۆیە و ئاغجەلەر و دوکان و کەڵکەسماق هێزێکی زۆریان کۆکردووەتەوە و دێن بەرەو لای ئێمە، هێزەکانی ئێمە و هێزەکانی مەڵبەندی دوو دابەشکران بۆ پێشگرتن لە هێرشەکان، بەڵام لە لای گۆپتەپەوە زۆر بە چڕی و بە خێرایی دەستپێکردبوو بۆ گەیشتنە دەم زێیەکە، ئێمە و تانکەکانی دوژمن تەنیا زێکەمان لەنێواندا بوو. هەروەها شوێنی ئەوان بەرزتربوو، بۆیە ئەو شوێنەی خۆمان جێهێشت و پاشەکشەمان کرد و بە شێوەسووردا رۆیشتین. شەوی پێشتریش خەڵکەکە ئاگایان لە جموجۆڵەکانی دوژمن بوو، زانیاریشیان لە مەڵبەندەکانەوە وەرگرتبوو کە هێرشەکان چۆنن و چۆن ئەنفالکراون لەبەرئەوە خەڵکەکە ناوچەکەیان بەجێدەهێشت. شەو کاژێر (١٠) مەفرەزەیەکی تیپی (٩٣)ی خۆمان بەپەلە هاتن بە ئازادی برامیان وت کەوا دوو مەفرەزەی مەڵبەندی دوو خەریکن رێ لە رەوی خەڵک دەگرن، ئیتر ئازادی برام بەپەلە مەفرەزەیەکی کۆکردەوە و منیشی لەگەڵبووم. گەیشتینە سەریان و ئازاد پێی وتن "ئێوە کێن وا رێگا لە خەڵک دەگرن؟" وتیان "سەر بە کێن" و ئازاد وتی "چۆن ئەتوانن ئەو کارەبکەن، کەس لێرە بەرپرس نییە من خۆم بەرپرسم". ئەوسا رێگایان دا بڕۆن و وەستاشین تا خەڵکەکە هەموویان رۆیشتن، بەو شێوەیە توانیمان ئەو خەڵکانە لە ئەنفال رزگار بکەین.

**هاوتا و کەرمکەی!**

**بە هاوتام وت چیرۆکی خۆت و کەرمکەتم بۆ بگێڕەوە...**

وتی "کاتی کشانەوەی هێزی پێشمەرگە بەرەو سێگرتکان و داربەسەر، ئێوارەی پێشتر لە گۆپتەپە کیمیاییم بەرکەوتبوو و لەکاتی رۆیشتن وردەوردە کاریگەریی بەسەرمەوە زیاتر دەبوو، خۆشم کۆڵەپشتی دەرمان و چەک و تاقمەکەم پێبوو،

ئیتر کە تەندروستیم بەرەو خراپیی رۆیشت، یەکەمجار کۆڵەپشتەکەیان لێوەرگرتم دواییش چەک و تاقمەکە. بەڵام هەر خراپتر دەبووم و چاوم زۆر خراپ دەیبینی. نزیک پێنجی ئێوارە بوو پێش پەڕینەوە گەیشتینە دێیەک، یەکێک لە خەڵکی گوندەکە کەرێکی رەشی بچووکی پێبوو دوو لێفە و دۆشەکێکی بەسەرەوەبوو، ئازاد داوایلێکرد، وتی "ئەو بارە بە چەند؟". وتی "بە (١٠) دینار". پێیوت "دۆشەک و لێفەکان بۆخۆت و کەرەکەمان بدەرێ (٢٥) دینارت ئەدەینێ". بەنابەدڵییەوە دایپێمان، ئیتر ئەو کەرە بوو بەهۆی رزگاربوونم، ئەو نەبوایە دەبووم بە ئەرکێکی گەورە بۆیان و دەبوایە منیش لە کۆڵبکەن. ئەو کەرە ماوەیەکی زۆر لەگەڵماندا بوو، پێیاندەوت؛ کەرەکەی دکتۆر. کاتێ لە گوندی ئەشکەوتەی دۆڵی بالیسان بووین، زۆر هاوکارمان بوو بۆ گواستنەوەی خۆراک و ئاو بۆ بەنی هەریر، چونکە تەنیا یەک هێسترمان هەبوو و دەبوایە دوو کاروان بکات، بەیانیان نانی دەبرد و ئێوارانیش چوار جلیکان ئاو. شەوێک پێشمەرگەیەکی لای مامۆستا بەکر بەناوی (عومەر ژێرسەە) هاتبووە دەرەوە بۆ میزکردن، لە ژێر چادرێکی ژێر گەورە شاخێک بینیبووی چاوێک ئەدرەوشێتەوە، وایزانیبوو گورگە، فیشەکێکی پێوەنابوو و زۆر خراپ بریندارێکردبوو، فیشەکەکە سک و سینگ و قوڵی گرتبوو. پێشمەرگەیەک بەدەم بێکەنینەوە هات وتی "دکتۆر فیشەکێکیان لە کەرەکە دا". کە چوومە دەرەوە بەهۆی فانۆسێکەوە سەیرمکرد ریخۆڵەی هاتووەتە دەرەوە، لە شوێنی فیشەکەکە لای سینگی هەناسە و خوێنی هەبوو، کەرەکە لەو کاتەدا سەیری منی دەکرد وەک ئەوە وابوو بڵێ بەهانام وەرە. پێشمەرگەیەکم لاوەبوو وتم "کۆڵەپشتی دەرمانەکەم بۆ بهێنە". وتی "دکتۆر ئەوە چی دەکەی بە هەموو تیپەکەمان ئەوەمان هەبە!؟". وتم "هەوڵدەدەم رزگاری بکەم". ئیدی لەو شوێنانەی کە ریخۆڵەی کون بووبوو بۆم دوورییەوە و فیشەکەکەم دەرهێنا و سینگیشم بۆ دوورییەوە و سنگی و سکیم بەستەوە، هەتا تەواوبووم کەرەکە نەدەجولایەوە کە تەواوبووم پێموت: "هەستە"، ئەویش هەستا و سەری جولاندەوە. ئیدی بەرەڵام کردبوو، بەیانیان پێش رۆیشتن دەهاتە سەرم لای کیسەی خەوەکەم و ئینجا دەرۆیشت، ئێوارانیش دەهاتەوە بارەگاکەمان و برینپێچەکەیم بۆ دەگۆڕی و ئالیکمان ئەدایە، ئیتر ئەو کەرە ئەوەندە ناسراوبوو (بە کەری دکتۆر ناسراو بوو) لە شوێنێک بیانبینیبا بە جیهازی (بێ سیم) ئاگاداریان دەکردمەوە کە کەرەکەم

له چێوییه یا له بالیسانه... هتد، ئیتر کەرەکە باش بوو و دواتر بوو بەهۆی گواستنەوەی پێشمەرگەیەکی بریندارمان بەناوی (عەول) و گەیاندیە ئێران.

جارێکیش وڵاخێکمان هەبوو دوو گرێ لەناو لوتی بوو، زۆر زوو هیلاک دەبوو، منیش هەستام نەشتەرگەرییەکم بۆ کرد و هەردوو گرێکەم بۆ دەرهێنا. وایلێهاتبوو خەڵکی گوندەکە ئاژەڵەکانی خۆیان دەهێنا بۆ چارەسەر، بەرپرسەکەمان ڕۆژێک وتی "هاوتا بەسە، خۆ ئێمە دکتۆری بەیتەری نین". منیش وتم "خوشکەکەم دکتۆری بەیتەرییە". ئیتر نەیوت باشە خوشکت چی حەقی بەسەر تۆوە هەیە.

**هاوتا و ڕاپەڕین**

**جاشەکانی مەلا عوزێر**

هاوتا، سەبارەت بە بەشداریکردنی لە ڕاپەڕینی ساڵی ١٩٩١، بۆی گێڕامەوە «لەکاتی ڕاپەڕین من لە هێزی بروسک بووم، موحسین بارام بەرپرس بوو لە ڕاپەرینەکەی هەولێر، بە دەمانچە و کلاشینکۆفەوە لەو هێرشبەرانە بووم کە چووینە سەر ئیستخباراتی شوعبەی پێنج و توانیمان ڕزگاری بکەین لەگەڵ ئەوەی زۆریش بەرەنگارییان دەکرد. جاشەکانی مەلا عوزێر هاوکارێکی گرنگ بوون بۆ گرتنی ئیستخباراتی شوعبەی پێنج، چونکە دوو بیکەیسییان چووبوونە سەر منارەیەکی مزگەوتی بەکر و توانییان دوو دۆشکە دوولوولەییەکەی سەربانی ئیستیخبارات پەکبخەن. دوو هۆڵی ئەرشیفیان هەبوو، یەکێکیان سووتا و هەر بۆ بەیانیی بەپەلە ئەوی ترمان هەمووی گواستەوە بۆ یەکێک لە قوتابخانەکانی (حەی عەسکەری) لە هەولێر، دوای ئەوە بەڵگەنامەکانی (ئەمنی عامە، ئەمنی سلێمانی، ئەمنی هەولێر)یشمان هێنا و لە قوتابخانەکەی (حەی عەسکەری) کۆمان کردنەوە، چەند کەسێکمان بۆمان هەبوو بچین لەناو ئەرشیفەکان بگەڕێین، بەڵگەی زۆر چاکمان دەستکەوت لەسەر باوەڕپێکراوەکانی ئەمن و ئیستیخبارات بە ناوە نهێنی و ڕاستییەکانیان، زۆر ئەرشیفی ترمان کۆکردەوە و هەر دوو سێ ڕۆژ جارێک پیکابێکمان دەنارده شەقڵاوە بۆ لای کاک نەوشیروان. ئەو بەڵگانەی کە (٣٠) تەن هی یەکێتی و دوو تەن هی سۆشیالیست بوو و بە هەلیکۆپتەر لە شەقڵاوەوە بران درا بە ئەمریکا و لە واشنتۆن ئەرشیفکرانەوە بەشێوەیەکی زانستی، نیوە زیاتری ئەوانە ئێمە ناردبوومان.

**خاڵۆزا قادر، (کاکەڕەش)**

**"هەی ترحێو خۆ ماچیشی کردم"**

بۆ ئەوەی بیرەوەرییەکان دونیایەکی روونتر بخاتە بەر دیدی خوێنەر، لەگەڵ قادر سەلاحی خاڵۆزامان، بەیەکەوە ئەم گفتوگۆیەمان ئەنجامدا.

قادر، ئەندامێکی کارای ئالای سوور بوو، لێمپرسی؛ چۆن ئەو ڕێکخراوەتان دروستکرد و کارەکانتان چی بوو؟ بۆی گێڕامەوە: لە ٨ی ئازاری ١٩٧٨، خوێندکاربووم لە ناوەندیی قەڵادزێ، خوێندنگاکەمان لە تەنیشت سەربازگەیەکی بارەگای لیوا بوو، رۆژانە بەردەوام هەلیکۆپتەرە شەڕکەرەکانی رژێم لەوێوە دەفڕین و دەنیشتنەوە بۆ شەڕی پێشمەرگە، ئەو رۆژە رۆژێکی مێژوویی بوو، یەکەم داستانی شەڕی گەورە لە شۆڕشی نوێدا هەڵگیرسا، کۆمەڵێک پێشمەرگە لە بەرانبەر سوپایەکی بەهێزی دڕندەی پڕچەک تەنانەت وا مەزندە دەکرا ژمارەی کۆپتەرەکان لە ژمارەی پێشمەرگەکان زیاتربن، بەردەوام لە ئاسمانی قەڵادزێ و دەشتێو بە دەیان (هەلیکۆپتەری باری) ئەوانەی دۆشکەکانیان لە لاتەنیشت هێنابووە دەرێ و پییاندەوتن؛ زەردەواڵەکان، گرۆهۆریان بوو. داستانی دەشتێو و شەهید سەعدی گچکە، بوون بە مێژوویەک خەڵکی ئەو شارە بیری ناچێتەوە. شار خرۆشابوو، خەڵک دەستەو دوعابوون بۆ پێشمەرگە، ئێمەی قوتابیش نەدەچووینە پۆلەکانی خوێندن و دەمانویست چاودێریی بارودۆخەکە بکەین. کە لاشەی کوژراوەکانیان دادەگرت یان هەڵیاندەگرت هێندە دڵخۆشبووین خەریکبوو گەشکە بگرین، بەتایبەتی زامی شەهید جافەر و خاڵە شەهاب و ئەنوەر هێشتا گەرمبوو. لە نهۆمی دووەمی خوێندنگاکە هەموویمان بە چاوی خۆمان دەبینی، هەموو دڵمان دەکولا، تا ئەو کاتەی کۆپتەرێکی بارهەڵگری پێکراو بە لەنگەلەنگ نیشتەوە و زیاتر لە چەند هەفتەیەک لەو گۆڕەپانەدا مایەوە و پەروانەکانیان لێکردەوە، بەداخەوە دەمەو عەسر مامۆستاکان خوێندنگاکەیان داخست و ئێمەیان رەوانەی ماڵەوە کردەوە. هەر دوای ئەوە کۆمەڵێک قارەمان کە پێموایە نۆ پێشمەرگە بوون، لەو داستانەدا شەهیدبووبوون و تەرمەکانیان هێنانەوە بۆ شارەوانی قەڵادزێ، هەرزوو خەڵکی شار بە رێوڕەسمێکی پڕشکۆ بە خاکیانسپاردن. کاتی ناشتنەکەیان کۆپتەرێک بە نزمیی نزیکبووەوە و پێش ئەوەی بگاتە سەر خەڵکەکە، کەسێک بەناوی حاجیە قەلەو (حاجی عەولای حاجی ئەحمەد) هاواریکرد؛ لە

شەرەفی ئەوە بەم تفی لیناکات، ئیتر خەڵکەکە هەموو سەریان بەرزکردەوە و تفیان گرتە کۆپتەرەکە و کۆپتەرەکە تێپەڕی. ئیتر بەڕێزەوە هەموو شەهیدەکانیان لە تەنیشت یەکەوە ناشت.

هەر دوای ئەو داستانە مەزنەی شەهید سەعدی گچکە و هاوڕێکانی، لەگەڵ چەند هاوڕێیەک لەوانە کاک شاسواری (رەوانشاد) کە ناوی (مستەفا ئیبراهیم دەرویش) بوو و شەهید حسین سوات و مامۆستا قودسی حەسەنی حاجی بابەکر برای دکتۆر خەیروڵلا، رێکخراوێکمان دروستکرد بەناوی (ئەستێرەی سوور) و دواتر ناوەکەیمان گۆڕی بۆ ئاڵای سوور. بۆ یەکەمجار و لە یەکەم چالاکیماندا بە پەمپی بۆیاخی سوور و بە دەموچاوی پێچراوەوە لەنیوەی شەودا دروشمەکانی کۆمەڵە و یەکێتیمان لەسەر هەموو دارودیوار و ناوبازاڕ و شوێنە هەستیارەکان نووسی، دروشمەکانمان (بژی یەکێتی نیشتمانی، بژی کۆمەڵەی مارکسی لینینی، بڕوخێ رژێمی فاشی) بوون. بۆ بەیانی، پیاوەکانی رژێم هاربوون و کەوتنە ناوبازاڕ هەرکەسێک پەڵەیەکی بۆیاخ بەجلەکانییەوە بوایە بە شەق و کوتەک ئەیانکردە ئۆتۆمبێلەوە و دەیانبرد. هەرزوو پەیوەندیمان بە سەرکردایەتییەوە کرد و لە کۆبوونەوەیەکدا بڕیارماندا من و شەهید حسێن جنوبی بچین بۆ سەرکردایەتی. نیوەڕۆ بوو لە ژوورێکی بە لاوە لە ماڵی کاک شێرکۆی برام کەنگر و ماستی مەڕ و کوزەڵەمان دەخوارد، دوای کۆبوونەوەکە بەڕێکەوتین بۆ دێرێ و کاک حاجیمان لەگەڵ خۆمان برد، نامە و راسپاردەکانیشمان پێبوو. لە سەرکردایەتیی کاک ملازم عومەرمان بینی، زۆر ئامۆژگاری و راسپاردەی پێداین لەگەڵ دوو دەمانچەی مکاریۆف و کۆمەڵێک بەیاننامە ونامیلکە و بڵاوکراوی ئەو سەردەمەی شۆڕش. بەرێی قاچاخ و لێڵەوار و لاچەپەکدا خۆمان گەیاندەوە ناو شار.

جێی خۆیەتی لێرەدا ئاماژە بەوە بدەم کە کاک حاجی ساڵح مامەڵا کە (ناومانئابوو حاجی دێری)، هەم خۆی و هەم ژن و منداڵەکانی لە خزمەتی ئیشوکاری رێکخستن و شۆڕش و سەرکردایەتیدا بوون، تا کۆتایی شۆڕش و ئەنفالەکانیش هەر بەردەوامبوو، تا جارێک بە هەندێ نامەی رێکخستنەوە کەوتە ناو کەمینی سوپای رژێم لە ناوچەی شیوەرز و دوای ئەشکەنجەدانێکی زۆر یەک وشەی نەدرکاند، ئەوەندەیان ئەشکەنجە دابوو تائێستاش لەکاتی قسەکردندا

زمانی باش گۆناکات، دوای زیاتر لە ساڵێک بە لێبوردنی گشتیی ئازاد بوو.

خۆشم زۆرجار نامەم بەودا ئەنارد و دووجاریش لە ماڵی باوکمەوە پارەی بۆ هێنام، حاجی لەناو خێزانەکەمان ناسراوبوو.

قادر، بەردەوامبوو لەسەر گێڕانەوەی بیرەوەرییەکان و وتی "دوایی بوومە خوێندکاری ئامادەیی پیشەسازی لە سلێمانی، ماوەیەک دەمانچەیەک و هەندێ بڵاوکراوەم لای کەژاڵی جوانەمەرگ و ئازا و بوێر بوو (کاک قادر مەبەستی کەژاڵی خوشکمە)، لە ماڵی خوالێخۆشبوو مامۆستا خالید دلێری شاعیر کە لە گەڕەکی کارێزەوشکی سلێمانی بوو، بەنهێنی و بێ ئاگاداریی کەس، کەژە خان ئەو شتانەی شاردەوە و دواتر هەرخۆشی دەستیکرد بە کاری ڕێکخستن و لەناو زانکۆ شانەیەکی ڕێکخستنی تۆکمە و چالاکی دروستکرد.

لەبیرمە چۆن ئازایانە حلوبەرگی قوتابیی زانکۆی بۆ ئامادەکردم و دەمانچەکەی خستە ناو دەفتەرێکی (١٠٠) پەڕەیی ئەستوور کە ناوەکەیمان بە کەتەر هەڵکۆڵیبوو بە قەبارەی دەمانچەکە بەمەبەستی شاردنەوەی، هەر خۆشی (کەژاڵ خان) نازناوی نهێنیی بۆ دانابووم. ڕۆژێک لە کۆبوونەوەدا لە قەڵادزێ، کاک شاسوار نامەیەکی کەژاڵی بۆ خوێندینەوە کە نازناوی (ڕەنگین) بوو، نووسیبووی؛ گارەش ئیشەکانی مەردانە جێبەجێکرد لەگەڵ هەندێ قسەی تر. هەموو کردیانە پێکەنین و من تووڕەبووم، ئیتر نازناوی کاکەڕەشیان بەملدابڕیم و لەڕاستیدا دوایی زۆر سوپاسمکرد، چونکە هەر لەمنداڵییەوە ڕقم لەناوی خۆم بوو".

کاک مەحمود باوزی (مەحمودی حەمەی حاجی برایم باوزی)، بە کۆستەرەکەی بەردەوام لەنێوان قەڵادزێ و سلێمانی لە خزمەت ڕێکخستندا بوو، سەرکێشیی زۆری ئەنجام دەدا، بەردەوام نامە و پۆست و بڵاوکراوەکان و دەمانچە و خەڵکی یاخیی لە ڕژێمی دەهێنا و دەبرد.

ئەوەشی گێڕایەوە "ڕێکخراوەکەمان هێندە چالاک و بەدیسپلین بوو بە ماوەیەکی کەم چەندین شانەی ڕێکخستنی قوتابیان و کاسبکاران و جوتیاران و هەموو چین و توێژەکانی کۆمەڵ بە دڵی پڕجۆش و خرۆشەوە پاڵیاندایە ڕێکخستن، ئەو ماوەیەی کە قادر لە سلێمانی دەبێ، سوعاد خانی خێزانی شەهید ملازم سەید کەریم لەگەڵ دایکی زۆر هاوکاریان بوون، چەندینجار شتی نهێنیی بۆ دەشارنەوە. بەرپرسەکانی ئاڵای سوور سەرەتا کاک ملازم عومەر بوو،

دوای ئەو کاک ئاسۆی شێخ نوری و ماوەیەکیش دکتۆرە نازەنین (نازەنین عوسمان) سەرپەرشتیی دەکردن.

دوای هەندێ کاری سەرکێشانە و مەترسیدار، بڕیار ئەدرێ قادر و شەهید حسێن جنوبی لەبەر سەلامەتیی ڕێکخستن بچنە دەرەوە و پەیوەندیی بە ڕیزەکانی پێشمەرگەوە بکەن.

کاک قادری خاڵۆزامان بۆیگێڕامەوە و وتی "ماوەیەک بارەگامان لە شێنێ بوو، پاییزێکی ساردبوو، بەفر لە شێنێ باریبوو، لە سەرما و لە برسا خۆم لە بەتانی وەرپێچابوو و لەناو ژووری بارەگاکە خۆم خزاندبوو. برادەرێک بانگیکردم وتی: کاک حاجی دێرێ و پیاوێکی نەناسراو هاتوون و نایەنە ژووری تۆیان دەوێت. منیش چوومە دەرەوە و بینیم کاک حاجی وەستاوە لەگەڵ کەسێک دەموچاوی خۆی بە جامانە پێچابوو، منیش چاکوچۆنی و بەخێرهاتنم کرد، کەژە خان (بە کەژاڵی خوشکمان دەوت: کەژە) بە چاوەبزانە لە ژێرەوە سەیریدەکردم، منیش نەمدەناسی تا لەپڕ وتی: "گارەش"، ئیتر بەو قسەیە رایچڵەکاندم، یەکترمان ماچکرد و وتی: "ناتوانم زۆر بمێنمەوە، وەرە لەگەڵم دەچمە سەرکردایەتیی ئیشی گرنگ و بەپەلەم هەیە". خۆم بەست و چووم لەگەڵی، کە ئیشەکانی تەواوبوو هێنامەوە، بێ وەستان چەند کەسێکم لە بارەگاوە هەڵگرت و گەیاندمەوە ناو شاری قەلادزێ. لە لێواری شار تووشی کەمینی جاش بووین و هەندێ تەقەمان لەیەکتر کرد و گەڕاینەوە بە شوێنێکی تردا خۆمان بە شاردا کرد، نزیکترین ماڵی ڕێکخستن ماڵی کاک ئاواتی مام قادر بوو و چووینە ماڵی ئەوان، کاک ئاوات هەمووومانی ماچکرد بەکەژاڵیشەوە، چونکە دەم و چاوی بە جامانە پێچرابوو بەس چاوی دیاربوو نەیزانی کێیە، کەژاڵ سەری لەبن گوێ نام وتی "هەی تڕحێو خۆ ماچیشی کردم".

بۆ سبەی کەژەخانم بەڕێکردەوە. لە هەمووی سەرنجڕاکێشتر کە ئێستاش ئەو برادەرانە دەیگێڕنەوە، ئازایەتی و بوێریی کەژاڵ بوو، کاتێ کەوتینە کەمینەکەوە هەوڵیدەدا تفەنگی من و هەقاڵەکانم وەرگرێت و تەقە لە جاشەکان بکات. کاک دڵشادی ئەحمەد ئاغا و کاک حەمەی خاڵ مەحمود و کاک دەرسیم وابزانم کاک سەلیم بەگیشمان لەگەڵ بوو، شەوی دوای ئەو ئێمەش گەڕاینەوە، بەڵام یادگاریی جوان و قسەخۆشەکانی لامان مایەوە. زوو زوو باسوخواسی ئەو سەفەرە دەهاتە گۆڕێ و لەمنیان دەپرسی: ڕەنگین (کەژاڵ) هەواڵی چییە؟ هەرزوو وایکرد هەموو

خۆشیانبوویت، بە زیرەکی و ئازایی بێوێنەی و قسەخۆشەکانی، کاریگەریی لەسەر هەمووان جێهێشت.

کەژاڵ، چەند شەویک لە گوندی دێرێ مابووەوە پێش ئەوەی بچێت بۆ سەرکردایەتی، لە مالی کاک حاجی بەهۆی کێچ و مێروو تووشی حەساسیەت بووبوو. تائێستاش مالی کاک حاجی ئەو چوونەی کەژاڵ وەکو یادگارییەکی بەنرخ و پیرۆزە لایان. وەک ئەوەی کەژاڵ ساڵانێک لەگەڵیان ژیابێ، هێندە زوو خۆی لەگەڵیان گونجاندبوو، هەموو هەڵسوکەوت و قسەخۆشەکانیان بیرماوە، هەموو جارێک وەک بیرەوەری و شانازیی ئەو رۆژگارە بۆمان دەگێرنەوە و بووبوو بە بەشێک لەوان.

من و قادریش جارێکی تر لە ناوزەنگ بەیەک گەیشتینەوە، قادر ئەوسا لە تەمەنی لاوێکی تازەهەلچوودا بوو، هەموو خێزانەکەمان بە کوڕ و کچانەوە خەریکی جموجوڵی سیاسیی بووین، مالی باوکی قادر (کاک سەلاح) بەهۆی قادرەوە تووشی نەهامەتی و ماندوبوون و دەردەسەری و ترسێکی زۆر بووبوونەوە، زۆربەی جار پۆست و بلاوکراوەکان دەگەیەنرایە مالەکەیان و لەوێوە بلاودەکرانەوە. کاتێ لە سەرکردایەتی بووین چەندجارێک کاک سەلاح خواردنی وشکەی وەک ساوار و برنج و نیسک و هەندێکجاریش حەیوانی بۆ دەناردین، هەموو جارێک کە دەینارد دەیوت "بۆ مالی شێخ دارۆ و کاک ملازم عومەر" کە هەردووکیشمان لە یەک بارەگا بووین (بارەگای عەسکەری). مالەکەیان وەک کاروانسەرای لێهاتبوو، زۆربەی خێزانەکانی پێشمەرگە بۆ ئەوێ ئەڕۆیشتن و ئەهاتن، هەروەها شێرکۆی برای قادر (خالۆزاکانی دایکم) زیاتر لە ساڵێک ئاوارەی گوندێکی سنوور دەبن. دایکم و ئێمەش شانازییان پێوەدەکەین و هەرگیز وەک مالە خالۆزا سەیرمان نەکردوون، بەڵکو وەک برا و یەکێک لە خۆمان بوون و خێزانی قادریش (پەیمان خان) ئەویش هەر خالۆزایە و ئامۆزای یەکترن لەگەل قادر، قادر دەیانجار دەکەوێتە کەمینی جاشەکان و بریندارێش دەبێ و بە پێشمەرگەیەکی زۆر ئازا بەناوبانگ بوو، لەگەڵ ئەو هەموو نەهامەتی و چالاکییە و وازهێنانی لە خوێندن بەهۆی رێکخستنەوە، ئێستا بەسەرناکرێتەوە، خەڵکیش هەیە بە بەر دەرگای بارەگایەکی بەعسدا تێپەڕیوە، بووە بە پاڵەوان.

خالید دلێر، له ٢٠ی ئابی ١٩٣٣، لەدایکبووه. بەدوای دایکمدا هاتووه، هەر له سەرەتای ژیانییەوه دەستی نووسین و شیعری هەبووه.

دەنگی زۆر خۆشبوو، له منداڵییەوه دەستیداوەته سیاسەت، وەک خۆی بۆی باسکردووین، له پاییزی ١٩٤٦. لەگەڵ مام جەلال و هەندێ خوێندکاری تر که ئەوسا له سەرەتایی بوون، ریکخراوێکی خوێندکارانی کوردیان دروستکردووه بەناوی (کۆمەڵەی پێشکەوتنی خوێندەواری) بۆ بڵاوکردنەوەی مافەکانیان و زاراوەی دیموکراتیەت لەنێوانیان و هاندانیان بۆ بەردەوامی له خوێندن.

ئەو منی زۆر خۆشدەویست و دەبوایه رۆژانه بچمه لای، فێری هۆنراوه و گۆرانیی دەکردم.

لەبیرمه که منداڵبووم، خاڵم لەپاڵ خوێندندا کرێکاریشی دەکرد له رێگای هەیبەت سوڵتان، لەماڵەوه سەفەرتاسیان بۆ ئامادە دەکرد و خواردنیان بۆ تێدەکرد تا بیباته سەر ئیش. هەموو رۆژێک پێش گەڕانەوەی دەچوومه پشتی دەرگا و پخەیەکم لێدەکرد. گوایه ئەیترسێنم، ئەویش وا خۆی نیشاندەدا که زۆر ترساوه. لێمدەپرسی خاڵه خالید سەفەرتاسەکەت چی تێدایه؟ ئەویش هەر جارەی وەڵامێکی هەبوو، دەیوت "یاپراخی هەڵوەشاوه و ترشاوی تێدایه" یان "شفتەی لچخوار"، "نۆکی نەکوڵاو" یان دەیوت "کفتەی هەڵوەشاو و باینجانی ترشاوی تێدایه"، منیش هەموویم لەبەرکردبوو.

جارێک له قشڵەی کۆیه بەندکرابوو، له سەردەمی پاشایەتی عیراق، لەوێ داوای بینینی منی کردبوو. لەناو ژووری زیندانەکه پەنجەرەیەکی بەرزی تێدابوو بەرزیانکردمەوه بۆ ئەوەی بیبینم، منیش لێمپرسی: خاڵه سەفەرتاسەکەت چی تێدایه؟ وتی "رق و کینەی بەرانبەر دوژمن تێدایه". ئەم قسەیەم هەڵگرت و له ماڵەوه به هەڵپەڕینەوه دەموتەوه، دایکم وتی "نابێ ئەوه بڵێیتەوه دەنا باوکیشت دەبەن وەک خاڵت دەیخەنه ژوورەوه". هەر ئەو رۆژانه فێربووم ژیانی ماڵی ئێمه پڕه له مەترسیی.

خاڵم هەندێ هۆنراوەی هەیه بۆ منی وتووه، یەکێکیان له زستانی ساڵی ١٩٥٤دا نووسیویەتی که ئەوکات له قوتابخانەی سانەوی له بەغدا خوێندویەتی، هۆنراوەکه بەم شێوەیەیه:

نەرمینە جوانکیلەکە، ئەی ئێسک سوک
چاو رەشی، رەنگ سپیکەلەی، دەست و پێی بچوک
لە رۆخ ئاوا، لەبن ئەو دارسێوە
یاری کردنت بونی ئاشتی پێوە
بووکی پەڕۆت، جلت کردووەتە بەری
شادی بەقلقلاتە و تاسیی سەریی
دۆشەکۆڵەی جوان و بالیفۆکە
ریز دەکەی، تاریک و پێک بێ ماڵۆکە
وا دەزانی مرۆڤ هەمووی وەک تۆیە
بۆ یەک برا، وەکو چاو و برۆیە
بەلام چونکە ئەتو بچکۆلەی ساوای
لە دڵپاکی وەک بیچوە کۆتر ئاوای
نازانی دونیا گشتی وەک تۆ نییە
ئەم باخە تەنیا باخی لیمۆ نییە
دڕک و داڵو زیندەوەری تێدایە
بۆ ئەو دەستە زیان بەخشین هیوایە
خۆ پەرستو ماکیی شەڕو ئاژاوەن
بۆ هەرچی پێی دەڵین (خراپ) سەرچاوەن
دەیانەوێ، جیهان هەر بۆ ئەوان بێ
بێ تەگەرە، وەکو ئاوی رەوانبێ
دەنا دەیکەن بە دوزەخ و کەلاوە
گوێ نادەنە ئەوە. هەرکێی لەناوە
دەک (نەرمین) (خوا)!!یە ئەو رۆژەت لێ دووربێ
جێگەت بێ مێو، رۆخ ئاو بێ، نەک تەنوور بێ
تاکو چەپڵەت، ئاوازی دەم پێکەنین
نەگۆڕێن بۆ: شینو هاوارو گرین.

هۆنراوەیەکی تریش کاتی هەرەتی لاویتیم بوو، لە پۆلی چواری ئامادەیی بووم، ئاوێنەیەکی گەورە لە ڕاڕەوی ماڵەکەدا بوو، دەهاتم و دەڕۆیشتم

سەیرێکی خۆمم دەکرد، وەک هەموو کچێکی تازەلاو خۆت لا جوانە، خاڵیشم ئەمەی بینیبوو، بۆیە دەڵێ:

لەگەڵ ئاوێنەدا...

ئاوێنەکەم گێلۆکەیە
ئەڵێی نازانێ من کچم
ئەو لەبەردەم من لانەچێ!!
چۆن من لەبەر ئەو لابچم؟!
خۆ سەعاتیش ماڵی رمێ
هەر وەک بڵێی باڵی هەیە
چەند لەبەردەمی ئەوەستم
لام وایە ئێستا و تازەیە!!
وردە هەلێکم دەستکەوێ
رائەکەم ئەچمە بەردەمی
نامەوێ گومانم هەبێ
بۆ نارێکی یا بۆ کەمی!!
سەیری هەموو لەشم ئەکەم
پشتی سەرو پشتی ملم
بەرو پشت و هەردوو تەنیشت
تائەگاتە قاچ و قولم!!
ئەبێ هەموو جێگایەکم
وەک گەرەکمە، رێکو پێک بێ
بۆ مەستکردنی لاوەکەم
هەر دیتنێکم، سەد پێک بێ!!
نازانم من وا جوانم
یا خەڵک ریایی ئەکەن؟
هێندە جوانیم هەڵدەدەن
عەقڵم لەخۆبایی ئەکەن!!

زوو زوو بەدەم قاقاوە پێی دەوتمەوە، سەرەتا تۆزێ تووڕە دەبووم، بەڵام دوایی راهاتبووم لەگەڵی.

هەموو هاوینێک دەچوومە کەرکوک و لە ماڵی خاڵم شەهید جەعفەر و پورە زێبام دەمامەوە، لە پۆلی چواری سەرەتایی بووم، مام جەلال لە ماڵی ئەوان خۆی شاردبووەوە و لەوێ یەکەمجارم بوو ببینم، زۆرجار لە گفتوگۆدا دەنگیان بەرزدەکردەوە و تووڕەدەبوون و دوایی ئاشت دەبوونەوە.

بەردەوام، بە بیروباوەڕی مارکسیەت و باوەڕبوون بە هێز و بازووی کرێکار و پاڵە و رەنجدەران گۆشی دەکردین، جار جار گلەیی لێدەکردم و دەیوت "تۆ وەک کەسێکی بۆرژوا بیردەکەیتەوە". لەگەڵ ئەوەشدا زۆر باوەڕی پێم هەبوو، هەندێکجاریش دەیوت "تۆ لە مەتبەخ زیرەکی" و تووڕەی دەکردم، بەڵام دەیوت "سلێق بدە دەستی نەرمین (١٠) چێشتت بۆ لێدەنێ". بەم قسانە منی تووڕە دەکرد و بەقاقا وازیدەهێنا.

دانیشتنەکانی شەوانمان بەیەکەوە چێژێکی تایبەتیان هەبوو، گۆرانیمان دەوت یان سروودی فێردەکردین، بەتایبەتی سروود و گۆرانییەکانی خۆی و تایەر تۆفیق (ئەویش کوڕی پوری دایکمە).

خاڵم، خاوەنی (٣٠) گۆرانی و سروودە، لە هەمووشیان گرنگتر سروودی (پێشمەرگەین بەهەڵمەتین) کە جاران کەس نەبوو نەیڵێتەوە، خۆم لە دەیان ئاهەنگ وەک کۆرس لەگەڵی بەشداریم کردووە.

زۆر توندبوو لە دەربڕینی راکانی و گفتوگۆی زۆرمان دەبوو، بەتایبەتی کە من بووم بە ئەندامی کۆمەڵە و خەتی ماویەتیمان هەڵبژارد، ئەو ماویەتی بە لادان لە مارکسیەت لەقەڵەم ئەدا.

زۆری لێوەی فێربووین و لە هەمووی گرنگتر خۆڕاگری بوو بەرانبەر بە دوژمن.

چوار جار گیراوە لە سەرەتای پەنجاکان و لە ئەیلولی ١٩٦١ لە نوگرەسەلمان و لە ساڵی ١٩٦٣ بە لێبوردنی گشتیی ئازادبوو. پێش ئەوەش لە بەندیخانەی (تسن) لە کەرکوک گیرابوو، لەوێ من لەگەڵ دایکم سەردانمکرد، بەدایکمیان وت "بە خالید بڵێ با ئەوەندە جنێو عەبدولکەریم قاسم نەدا". لەوێش جلی خۆی سووتاندووە بۆ ئاگری نەورۆز. لە ساڵی ١٩٧٧ لە سلێمانی لە هەواڵگریی

سەربازیی (استخباراتی عسکری) گیراوە، لە هەموو ئەو زیندانانەدا نموونەی خۆڕاگریی بووە بەرانبەر بە دوژمن.

خاوەنی (٢٠) کتێب و کوراسە بە زمانی کوردی و کتێبێکیشی بە زمانی عەرەبی هەیە بەناوی (کیف الحقت کوردستان الجنوبیة بالدولة العراقیة). کتێبەکانی ئەداینێ و لەدواییدا لەسەر ناوەڕۆکی کتێبەکە وتوویژی لەگەڵ دەکردین.

ئەوکاتەی ئەندام بوو لە لیژنە پێنج قۆڵییەکەی دەرکردنی رۆژنامەی نور، هانی ئەدام بۆ ئەوەی شت بنووسم یان،ئەو شتانەی کە لەسەر ژن دەنووسرێ سەیریان بکەم و هەڵیان بسەنگێنم.

ئەوکاتەی ئەندامی لیژنەی مەرکەزی بوو لە بەغدا، خێزانداربوو، خاڵۆژنە قومریم ژنێکی زۆر میهرەبان بوو، هەموو هەینییەک دەبوایە لای ئەوان بم، ئەوکات من خوێندکاربووم لە زانکۆ، دەکەوتینە باسی سیاسەت و ئەدەب، هەوڵیدەدا لە سیاسەت و چالاکیی دوورنەکەومەوە، بەڵام وازینەدەهێنا لەوەی من بۆرژوایانە بیردەکەمەوە ئیتر تووڕە نەدەبووم، منیشی فێرە عینادی کردبوو.

کولتووری گۆڕینەوەی بیرورا، بووەتە کولتووری ماڵی ئێمە و بەردەوامە و پێشبڕکێیە لەوەی کێ زۆرترین زانیاریی لابێ.

لە ساڵی ١٩٩٤، گروپێکیان دروستکرد بەناوی (لیژنەی چەپەکانی کوردستان) و هانیدام بچمە ناو ئەو گروپە. بەڵام نەچووم.

لە پێشمەرگایەتیشدا کەسێکی خاوەن دیسپلین و ئازابوو، ئەم ئازایەتییە لە پەروەردەکردنی شەهید جەعفەردا رەنگیدابووەوە، ئێمەشیان فێرکردبوو سەرشۆڕیی بۆ دوژمن و پارە سەرشۆڕییە بۆ ژیانی کۆیلایەتی.

ئەم جۆرە پەروەردەیە وایکردبوو لە هەموو خێزان و عەشیرەتی ئێمەدا نە بەعسییەک هەبوو نە جاشێک و هەرکەسێک زیندانیی کرابێ لە ئێمە، نیشانەی خۆڕاگریی بووە، گوێمان نەداوەتە ترس، ترسنۆکیی عەیبە بووە لامان.

باوەڕی بە مافی ژن هەبوو. هانی ئەداین ئابووریمان سەربەخۆبێ بۆ ئەوەی پیاو منەتی بەخێوکردنمان بەسەردا نەکات و کۆیلەمان بکات لەماڵەوە، یارمەتی ئەداین، لای ئاسایی بوو قاپو قاچاخ و جلی خۆی بشوات.

لەگەڵ ئەو هەموو ناسکی و ئەدەبە، هۆنراوەکانی لە پەروەردەکردندا رەق بوون، بۆیە هەندێکجار لامان قورس دەبوو. پەیوەندیی لەگەڵ باوکم لەسەر بنەمای رێزگرتن و هاورییەتی، لە رادەبەدەر خۆشبوو.

لە ٣١ی ئابی ١٩٩٦، هاتە سلێمانی، لەگەڵ پاڵەی کوڕی لە ماڵی ئێمە مایەوە و بەیەکەوە دەژیاین، جەڵتەیەکی بچووک لێیدا و چوو بۆ دەرەوە بۆ چارەسەر، بەداخەوە ئەو جەڵتەیە وردە وردە بەرەو خراپیی برد.

هەموو ئاواتی کوردستانێکی سەربەخۆ و دیموکرات بوو، خاوەنی هیچ نەبوو، نە پارە و نە زەوی، تاکە سەرمایەی؛ ئەدەب و هۆنراوە و سروود و گۆرانییەکانی و خۆڕاگری و ئازایەتی بوو.

بەداخەوە لە ساڵی 1997 جەڵتەیەکی بچووک لێیدا و وردە وردە بەرەو لاوازیی برد و لە ئەنجامدا لە 2011/12/16 لە شاری سلێمانی کۆچی دواییکرد.

لە ژوورێکی گڵی بچووکی پشت هەیوان (کوشکوکە) پەنجەرەیەکی شێوە تاقی بچووکی پڕ لە کتێب لەسەر کۆڵانە تەنگژەی گەڕەکی بەفری قەندی، قەرەوێڵەیەکی تەنیا و ئاوێنەیەکی دیوار و عەلاگەیەکی جلهەڵواسین، قارەمانێکی چاو پیرۆزەیی دەم بەخەندە، گوفتار شیرین و هونەرمەند و داهێنەر و زیرەک دەژیا. ئەو ژوورە ژوورەکەی شەهید جەعفەر بوو. ڕۆژانە سەرم لێئەدا، هەرچەندە ناوبەناو شەڕی بچووکمان دەکرد و دەڕۆیشتم و جێمدەهێشت. بەڵام زوو دەگەڕامەوە بۆ لای، ئارەزووی بوو دەهریم بکات، زوو زوو بە قسە و ئازاردانی منداڵانە تووڕەی دەکردم. یاریی گوڵبەهاری لەگەڵ دەکردم (یارییەکی تاوڵەی منداڵانەیە) جارێک ئەوەندەم پێوت "خاڵە با گوڵبەهارێک بکەین" تاقەتی چوو و وتی "وەرە با گوڵبەهاری ڕاستیت فێربکەم". پیلی گرتم و خستمیە ناو حەوزی ئاوی حەوشەی ماڵی باپیرم، نەشیهێشت بڕۆمەوە تا وشکبوومەوە. بەو تەڕبوونە بەخراپیی نەخۆشکەوتم. لە سزای ئەوە ماڵەوە پێیانوت "دەبێ نەرمین بۆ چارەسەر ببەیتە بەغدا" جارێکی تریش لێی تووڕەبووم و ڕۆیشتم، زۆری بانگکردم نەڕۆم، بەردێکی هاویشت بەرمکەوت و قاچم شکا، دوای ئەوە ئیتر وازی لەئازاردانم هێنا. لەگەڵ ئەو هەموو وردە شەڕانەشدا، بەبێ خاڵم هەڵم نەدەکرد، هاوڕێ و مامۆستا بوو بۆم، زۆر شتی ژیانم و فێربوونم بۆ ئەو دەگەڕێتەوە.

شانبەشانی باوکم، فێری خوێندنەوەی کتێب و هۆنراوەی دەکردم، فێریکردم چۆن چێژ لە گۆرانی و مۆسیقا ببینم و جۆرەکانی بناسمەوە، فێری هەڵپەڕکێی جۆراوجۆری کردم، بەشداریی پێدەکردم لە نمایشی شانۆدا، بەتایبەتی شانۆکانی نەورۆز. جارێکیش لە شانۆیەکی گەڕۆکدا بەشداریی پێکردم، بەسەر شاراندا دەگەڕاین، لەو شانۆییەدا من منداڵی کاوەی ئاسنگەر بووم. ئەکتەرێکی تریش سەلاحی ئامۆزام بوو، ئەویش لاوێکی زۆر چالاکبوو. هەروەها لە ئۆپەرێتێکی منداڵاندا بەناوی (کەژ و کەژاڵێ) ڕۆڵی سەرەکیم بینی.

لە زۆر بواردا لێهاتوو بوو، وەک نووسینی پەیامەکانی شۆڕش و بەرگریی بۆ تۆقاندنی دوژمن و داگیرکەران لەسەر دیوارەکانی کۆیەی شاری شارستانیەت

و مێژوو، که ئەوکات کارەکانی زۆر گەورەتربوون له تەمەنی وەها لاوێک که له قوناغەکانی ئامادەیی خوێندندا بوو. رەنگە خەونی هونەرمەندێکی لاو باسکردن بێ له عەشق و جوانییەکانی ژیان، بەڵام بۆ ئەو کە رۆڵەی میللەتێکی ستەملێکراو بوو، مەحکوم بوو بەوەی هونەرەکەی بخاتە خزمەت گیانی بەرگریکردن لە نیشتمان. هەربۆیە دیوارەکانی کردبووە تابلۆی هونەرەکەی و رەنگەکانی بۆ دروشمەکانی بەرگری و شۆرش تێکەڵ دەکرد، لەسەر دیوارە پۆلایین و تۆقێنەرەکانی دوژمن هونەرێکی نوێی دەنەخشاند. منی لەسەری کۆلانەکان ئەوەستاند بۆ ئەوەی ئاگاداری بکەم نەوەک یەکێک له پیاوەکانی دوژمن بیبینێت، بۆ ئەوەی کەس نەزانێ ئەو نووسینانە کاری ئەون.

شەهید جەعفەر ماوەیەک له کەرکوک ژیا، خاڵم (خالید دلێر)، پورە زیبام و شەهید جەعفەری بردە کەرکوک، بەهۆی ئەوەی نەنکم کۆچی دوایی کردبوو و باپیرم ژنی هێنابووەوە، خۆشی له کۆمپانیای نەوتی کەرکوک کاریدەکرد. شەهید جەعفەر بەهۆی ئەو ژیانەی له کەرکوک زۆر چاوکراوەتر بوو، لەوێش زمانی عەرەبی و تورکی و ئاشووریی بەباشیی فێربووبوو، لاوێکی زیرەک بوو بەتایبەت بۆ فێربوونی زمان.

حەزی له گۆرانییەکانی ئوم کەلسوم و عەبدولوەهاب بوو، منیش حەزم له گۆرانییەکانی عەبدولحەلیم حافز بوو، زوو زوو گاڵتەی پێدەکردم، جیاوازیی تەمەن وایکردبوو کە دوو جۆر له هونەر کارمان تێبکات، بەڵام بە گوێگرتنی زۆر، وایلێکردم رۆژ بە رۆژ بچمە سەر دینی ئەو. رێنیشاندەرم بوو له هەڵبژاردنی جۆری کتێب و دوای خوێندنەوەش لێپرسینەوەی هەبوو کە چی لێوە فێربووم.

دوای ئەوەی خوێندنی ئامادەیی، بەشی ئەدەبیی، تەواوکرد له ١٩٦٤ له شاری کۆیە، له کۆلێجی کارگێری و ئابووری زانکۆی بەغدا وەرگیرا، بەڵام وازی له خوێندن هێنا و پەیوەندیی کرد بە ریزەکانی هێزی پێشمەرگەوە.

له یەکێک له شەرەکاندا گوللەی هاوەن کەوتبووە نزیک سەنگەرەکەیان و بووە هۆی درانی پەردەی گوێی، دواتر بەهۆی هەوکردنی برینەکەی بە نهێنیی هێنایانە هەولێر بۆ چارەسەرکردن. ئەوسا ئێمە له هەولێر دەژیاین، من له پۆلی چوارەمی ئامادەیی بووم، ئەو هاتنەی بووە هۆی هاندان و خۆشەویستیم

بۆ شۆڕش و پەیوەندیکردنم بە ڕێکخستنەوە. لە باوەڕبوونی ڕاستەقینەی بە مافی ژن و بەشداریی ژنەوە، ئەو گەڕانەوەیەی منی کرد بە کەسێکی سیاسی و چالاکوان. دوای چارەسەرکردنی، بەنهێنی گەڕایەوە بۆ ناو هێزەکانی پێشمەرگە.

خاڵم تۆزێ شانێکی دابەزیبوو، لێمپرسی: بۆ واشانت خواربووە؟ وتی "هی هەڵگرتنی چەک و هەگبەیە، بەردەوام بە لایەک هەڵمانگرتووە"، بە دەستی چەپیش دەینووسی و هەموو کارێکی بە چەپە بوو. پێموت "بووی بە چەپی شانخوار"، دیاربوو پێی ناخۆش بوو وتی "لەبەر خاتری جەنابت نە تفەنگ دادەنێم و نە ئەتوانم ڕاستەیشم بەکاربهێنم"، نەمدەزانی ئەو قسەیەم بۆ کرد، زۆر پەشیمان بووبوومەوە و تائیستاش لەدڵم دەرناچێ.

کە گەڕایەوە بۆ ناو پێشمەرگە دوای ماوەیەک شەهید جەعفەر لەگەڵ مامۆستا برایم و خاڵم (خالید دلێر) و هاوەڵەکانیان چوون بۆ ئێران، لەوێش فارسییەکی باش فێربووبوو.

لە ساڵی ١٩٦٦ دوای هاتنەوەیان لە ئێران، لە بەغدا نیشتەجێبوو، لە ساڵی ١٩٦٧ لە زانکۆی موستەنسریە لە بەشی زمانی ئینگلیزی -ئێواران دەیخوێند، بە ڕۆژیش لە کێڵگەی پەلەوەر (دەواجن) کاریدەکرد بۆ پەیداکردنی بژێویی ژیانی. منیش هەر هەمان ساڵ لە زانکۆ وەرگیرام، ئیتر جارێکی تر و لە قۆناغێکی تری تەمەنم بووین بە نزیکترین هاوڕێ، منیش ئیتر قۆناغی منداڵیم نەبوو. زۆربەی کات بەیەکەوە بووین. لە کاتی تاقیکردنەوەی سەری ساڵان بەیەکەوە لە کتێبخانەی گشتی دەمانخوێند، بەیەکەوە دەچووین خواردنمان دەخوارد و سەردانی شوێنە گەشتیارییەکانمان دەکرد. جارێک منی بردە ڕێستورانتێک بۆ خواردنی تشریب، من بە کەوچک و چەتاڵ نانم دەخوارد وتی "هەی نەزان، تشریب بەدەست دەخورێ، چون لەزەتی لێدەبێت!" دەستی گرتم و خستیە ناو تشریبەکە و بوو بە پێکەنین. ئیتر منیش ئەو شەرمەم نەما.

هەندێ بەسەرهاتی خۆشی ناو پێشمەرگایەتی بۆ دەگێڕاینەوە، بۆ من و ئازاد و نازەنین و هاوتا، هاوتای برام وەک منداڵێک پرسیاری زۆری لێدەکرد و سەرسامبوو بە پێشمەرگە و شۆڕشگێڕەکانی جیهانی سەردەم، زۆر گیڤارای

خۆشدەویست واتە (گیڤاریست بوو بەو منداڵییە) لەو بیرەوەرییانەی خالم، جارێک هاوتا لێیپرسی: لە پێشمەرگایەتی چی زۆر جوان بوو لات؟ خالم گێڕایەوە و وتی "کاتی پێشمەرگەکان هەموومان لەناو ئەشکەوت دەبووین و هەریەکە جگەرەیەکی پێدەکرد، ئیتر لەو تاریکییە رووناکیی سوتووی جگەرەکە لەگەڵ قومی جگەرە ئەدرەوشایەوە و کزدەبوو جوانییەکی سەرنجڕاکێشی هەبوو". لە گێڕانەوەی بیرەوەرییەکی تردا، وتی "جارێک پێشمەرگەیەکی سەرکێشمان چەککرد و دانیشتبووین گۆرانیمان بۆ دەوت (داینێ دە داینێ ئەو کلاشینکۆفە، موبارەکت بێ ئەو دارینۆفە) ئەوەندەیتر دەهریمان دەکرد"، ئەو گۆرانییە بووبوو بە ویردی سەرزمانی ئێمەش.

بەسەرهاتێکی تریشی گێڕایەوە "جارێک لە لادێیەک ئاشێکی ئاوی لێبوو، ئاشەکە خراپبووبوو دەبوایە بۆ خۆمان چاکیبکەینەوە، ئەوەی خراپبووبوو سەرچاوەی ئاوەکە بوو، ئێمەش پێشمەرگەیەکمان بەستەوە بە گوریسێک و رەوانەی خوارەوەمان کرد و پێمانوت "هەرکاتێ هەستت بە ترس کرد پەتەکە راکێشە دەرتدەهێنین"، دوای تۆزێک کەوتە پەتڕاکێشان، ئێمەش وتمان "هیچ نییە ئەترسێ گوێمان نەدایە، چەند جارێک پەتەکەی بەتوندیی رادەکێشا هەر گوێمان نەدایە تا هاواری لێ هەستا و وتی کورە رامکێشن هەی وا لە دایکی کورد و کوردستانیش بکەم، ئێمەش زانیمان دیارە شتێکی خراپە و رامانکێشا، کە هێنامانە دەرەوە بەو ماوە کورتە هەموو گیانی سووربووبووەوە و دوای تۆزێ هەموو گیانی ئاوسا، ئەوەندە مێشوولەی لێبوبوو بە هەزاران پێوەیاندابوو، بەپەلە گەیاندمانە ئێران بۆ چارەسەرکردن، وەختبوو ببێ بە قوربانیی ئاشی ئاوەکە.

لەو وەختانەدا کە لە زانکۆ بووین، گروپێک دروستبوو بەناوی (کۆمەڵەی مارکسی لینینی کوردستان – بیری ماو تسی تۆنگ) پاشان لە کۆبوونەوەی کۆمەڵەدا لە ١٨ی تشرینی دووەمی ١٩٧٨، ناوەکەی بوو بە (کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستان). کۆمەڵە، کۆکەرەوەی گەنجی خوێنگەرمی پێشکەوتوو بوو.

شەهید جەعفەر، بە بیروباوەڕ چەپ بوو، سەرەتا هێشتا لە کۆکردنەوەی چەپەکاندا بوو پێش دامەزراندن، لە هۆڵی خولد کە ئێستا دەکەوێتە ناوچەی

سەوز لە بەغدا، لەخۆئامادەکردن بۆ نەورۆزی ساڵی ١٩٦٩، خاڵم هات و پێی وتم "خەریکی دروستکردنی گروپێکی مارکسی لینینین، ئەگەر ئامادەیت و نهێنی دەپارێزی و بەرگەی ساردوگەرمیی دەگریت، ئەوا پێت دەڵێم چییە و بۆتی باسدەکەم، دەبێ بەڵێنم بدەیتێ نهێنییەکان بپارێزی و بەبێ گەڕانەوە بۆ ئێمە نابێ هیچ هەنگاوێک بنێی"، منیش بەڵێنەکەم دا و بڕیارمدا بچمە ریزەکانی کۆمەڵە و منیان خستە خانەی پێگەیاندنی کادیران. یەکەم کۆبوونەوەم لە ماڵی فەرەیدون عەبدولقادر بوو، دوایی منیان خستە ئەو شانانەی کە لە ماڵی محەمەد چینی بوون (بۆیە پێیاندەوت چینی، چونکە زمانی چینی فێربووبوو) ماوەیەکیش لە لای کاک محەمەد سابیر بووم. ئەوسا (تاقانە بووم) تاقە کچ بووم لەناو ئەو شانانەدا.

بەو جۆرە چوومە قوڵایی شانە نهێنییەکان، ئەوکات من جلی کورتم لەبەردەکرد وەک (مۆدەی باوی ئەو سەردەمە)، خاڵم رۆژێک پێی وتم: "ئیتر دەبێ جلەکانت درێژبکەیتەوە، بۆ ئەندامی کۆمەڵە ناشێ جلی وا کورت لەبەربکات"، منیش داوای مۆڵەتی چەند رۆژێکم لێکردن بۆ ئەوەی تەگبیری حاڵی خۆم بکەم و ئیتر جێبەجێمکرد.

لە بۆنەکانی زانکۆ و کوردا گۆرانیی دەوت، بەتایبەتی گۆرانییەکانی تایەر تۆفیق و خالید دلێر.

ئەوکاتەی لە زانکۆ بووین دارۆم ناسی و یەکەم کەس کە پێموت شەهید جەعفەر بوو، هەستمکرد پێی ناخۆشە، وەک هەموو گەنجێکی ئەم وڵاتە هێشتا کاریگەریی کۆمەڵی باوکسالاریی لەسەر ماوە، گفتوگۆیەکی دووردرێژمان کرد، پاش چەند رۆژێک هات و وتی "من رازیم بەمەرجێ یەک نەبینن تا خوێندن تەواو نەکەی". لام قورسبوو. بەڵام تاڕادەیەک بەقسەم کرد. کێشەی من لەوەدابوو نەمدەتوانی راستیی بە خاڵم نەڵێم.

شەهید جەعفەر گەنجێکی زۆر جوان بوو، قسەخۆش و خۆش مەشرەب بوو، زوو دەبوو بە هاوڕێی خەڵک، زۆربەی هاوڕێکانمان هاوبەشبوون.

نزیکیی لەمنەوە بەهۆی ئەوەوە بوو کە جیاوازی تەمەنمان تەنیا هەشت ساڵ بوو، زۆریش دایکمی خۆشدەویست، هەردووکمان بەیەکەوە لە هەمان هەفتە هاوسەرگیریمان کرد.

پاش ئەوەی لە ئازاری ١٩٧٤، دارۆ بوو بە پێشمەرگە، من لە سلێمانییەوە گەڕامەوە بۆ هەولێر. لای شانەکانی شەهید جەعفەر دەستمکرد بە کار و هەندێ ماڵی تازەی پێناساندم، رام لەسەر هەندێکیان باش نەبوو، بەلامەوە نهێنیپارێز نەبوون. ماڵی شەهید جەعفەر وەکرێکی زۆربەی کۆبوونەوەکان بوو، خێزانەکەشی قانعە خان زۆر هاوکاری بوو، شەهید شەهابیش کە هاتە هەولێر ماوەیەک لە ماڵی خاڵم بوو.

ناوی نهێنیی خالە شەهاب (عوسمان) بوو، دوای ماوەیەک هاتە ماڵی باوکم، منیش لەوێ دەژیام، رۆژانە کادیرەکانی کۆمەڵە دەهاتن و دەڕۆیشتن و کۆبوونەوەی نهێنییان دەکرد. زۆرجار بانگی منیشیان دەکرد لەگەڵیانبم و راوبۆچوونیان دەپرسیم، جارێک داواملێکردن کە نەچمە کۆبوونەوەکان بۆ ئەوەی کەمترین خەلک بناسم، خاڵیشم و کاکە شەهابیش وتیان "وا مەڵێ ئێمە زۆر باوەڕمان پێتە، بۆیە وەرە و دانیشە". هەندێکجاریش نامەیان پێدا دەناردمە کەرکوک بۆ ماڵی کاک فەرەیدون عەبدولقادر.

پاش ئاشکرابوونی ناوی هەندێ لە ئەندامانی کۆمەڵە، خاڵم هاتە ماڵەوە و منی بردە ژوورێکی تەنیا و بۆی باسکردم، وتی "بڕیارم داوە بچم بۆ لای کاکە شەهاب و بزانین چی بڕیارێک بدەین، پێویستم بە بەڵگەنامەیەکی ترە بەناوێکی ترەوە". منی ناردە لای یەکێک لە قاسیدەکان بۆ دروستکردنی ناسنامەیەک، ئەیتوانی بیکات، بەڵام دیاربوو ئەترسا، وتی "ناتوانم بیکەم" گەڕامەوە پێموت، بێ تووڕەبوون وتی "ناهەقی ناگرم"، بە منیشی وت "ئاگات لەخۆت بێت، چونکە زۆربەی کادیرەکان تۆ دەناسن و جارێ لای هیچ کەس باسی مەکە". چووم تاکسییەکم بۆ گرت و رۆیشیت. دواتر زانیمان گەیشتوونەتە ئێران، بەڵام ئیتر هەواڵیانمان نەزانی تا رۆژێک پاکیزە خانی خێزانی کاک فەرەیدون عەبدولقادر هات وتی "برادەران هەموویان گیراون و تەسلیم بە رژێمی عیراق کراونەتەوە و بردوویانن بۆ سلێمانی".

منیش یەکسەر رۆیشتم بەرەو سلێمانی و چوومە ماڵی کاک رەئوفی حاجی فەرەج کە مێردی پورە خەجاوم بوو، لەوێ کاک ئەمیری کوڕی زۆر

هاوکارم بوو و هەوڵیدا بچین لە ئەمن بیانبینین یان هیچ نەبێ دڵنیابین کە ئەوان لە گرتووخانەن. هەندێ شتمان برد و زۆر هەوڵماندا نەیانهێشت بچینە ژوورەوە، بەڵام شتەکانیان لێوەرگرتین و بردیانە ژوورەوە، وتم "چۆن بزانم گەیشتووەتە دەستیان". چوونە ژوورەوە و هاتنە دەرەوە وتیان "خاڵت دەڵێ ڕێباز هەر وەک خۆی زۆر دەگریا و هاوڕێی گەورە بووە"، ئیتر زانیمان ئەوانن لە ژوورەوەن. ئەو شتانەی بۆمان بردن بەتانی بوو کە لەگەڵ خاتوو کافیە سلێمان پارەمان کۆکردەوە و کڕیمان، هەروەها (٢٥) دیناریشمان کۆکردەوە ئەوەشمان بۆ بردن لەگەڵ هەندێ پێداویستیی پیاوانە و جلوبەرگ. کە بردیانن بۆ بەغدا جارێکی تر بەدوایاندا ڕۆیشتم، لەگەڵ زێبای پورم هەوڵی زۆرماندا بۆ ئەوەی چاومان پێیانبکەوێ بەتایبەتی لە ڕێگای کاک ڕەفیق پشدەری کە زۆر هاوکارم بوو بۆ بینینی دارۆ، لە ئەمنی عامە (بەشی دوو جارێک) توانیم دارو ببینم لەبەر چاوی ئەفسەرێکی عەرەب و دەبوایە بە عەرەبیی قسە بکەین. لەوێ هەواڵی خاڵم و کاکە شەهابم پرسی و وتی "لامانن" ئەمە بووە هۆی ئازاردانێکی زۆری دارۆ، چونکە لە پرسیارەکانی ئەمن نەیوتبوو من جەعفەر دەناسم و خزممە.

کە لێکۆڵینەوە تەواوبوو، هەموو برادەرانی کۆمەڵەیان لە ئەمنی بەغداوە گواستەوە بۆ گرتووخانەی فزەیلیە وەک (تسفیرات) پێش دادگاییکردن. لەوێ سەردانیان ئاسانبوو، هەموو ڕۆژانی تایبەت بە سەردان نەماندەپەڕاند و سەردانمان دەکردن. لەوێ هەموویان باسی ئازار و ئەشکەنجەکانی ئەمنیان بۆ دەکردین، شەهید جەعفەر هەر دە نینۆکی قاچیان دەرهێنابوو، جارێک تازە نینۆکی سەر دەردەهێنێتەوە دیسانەوە دەریانهێنابووەوە. خۆڕاگرییان لە زیندانەکانی بەعسدا بوو بە داستانێکی بێ وێنە لە مێژووی کوردا.

بۆ من سێ کەسی لێ بوو جگە لە هاوڕێکانی تری کۆمەڵە (دارۆ، شەهید جەعفەر، شەهید شەهاب)، دروشمی (کەم ژیان و کەڵ ژیان)یان داهێنا. زۆربەی هەڤاڵەکانی زیندان شاهیدی خۆڕاگریی شەهید جەعفەرن، بەم هەموو ئەشکەنجەدانەشەوە لە قسەی خۆش نەکەوتبوو، تەنانەت دوژمنەکانیشی سەرسام بووبوون پێی. نەیتوانی زیندان وەک دواوێستگەی ژیان و بەرگریی

سەیربکات، بەرلەوەی بچێتە بەر پەتی سێدارە، لەناو زیندانیش وایکرد لە خزمەتکردنی ولات و داهاتووەکەی بەردەوام بێت و خولی فێربوونی زمانی ئینگلیزیی لەناو زینداندا کردبووەوە کە ئەتوانین ئەمە وەک بەشێکی تری گیانی بەرگریی شەهید جەعفەر سەیری بکەین.

لەوکاتەی کە لە فزەیلیە بوون لە یەکێ لە سەردانەکاندا نامەیەکی پێچراوەی نوشتەئاسای دا بە باوکم، وتی "کاک عوسمان ئەم نامەیە لای خۆت هەڵگرە بۆ دواڕۆژ، خۆت کە زانیت بارودۆخەکە باشە ئەوسا بیکەرەوە، خۆشت بڕیار دەدەی بیدەیتە کێ". باوکم وەک ئەمانەتێکی زۆر بەنرخ هەڵیگرتبوو، بێ کردنەوەی لەناو سەرینی لۆکە شاردبوویەوە. بەداخەوە ناوەڕۆکی ئەو نامەیە بۆ هەتاهەتا بەنهێنیی مایەوە، چونکە بەهۆی خۆشاردنەوەی باوک و دایکم و ئێمەش پێشمەرگە بووین، لەدوای بردنی کەلوپەلەکانی ماڵی باوکم ئەو سەرینە دیارنەما و نامەکەش وەک هەموو شتە گرنگەکانی ژیانمان ونبوو.

پاش دادگاییکردنیان، شەهید شەهاب و شەهید جەعفەر و شەهید ئەنوەر بە لەسێدارەدان و ئەوانی تریش بە شەش ساڵ بەندکردن سزادران. پاشان گواستنیاننەوە بۆ گرتووخانەی ئەبوغرێب لە بەغدا و دابەشیانکردن بەپێی بڕیاری دادگا، هەر سێ شەهیدە قارەمانەکەیان بردە ئەو بەشەی کە تایبەت بوو بەو کەسانەی بڕیاری لەسێدارەدانیان بۆ دەردەچوو، لەبەرئەوە هەموو سەردانێکم بۆ زیندان دەبوو من سەردانی دوو بەش بکەم، هەندێ لای خاڵم و کاکە شەهاب دابنیشم و هەندێکیش بچم سەردانی دارۆ بکەم کە لە بەشی سزا قورسەکان (الاحكام الثقيلة) بوو.

ئەوکاتەی خاڵم و کاکە شەهاب و شەهید ئەنوەر چاوەڕێی لەسێدارەدان بوون، من و پورە زیبام سەرمانکرد بە هەموو شوێنێکدا کە تروسکایی لێوەبێ، بۆ کەمکردنەوەی حوکمەکەیان.

چووینە لای جێگری سەرۆک کۆمار (تەها محێدین) وتی "دەسەڵاتم نییە". چووین بۆ لای (خەیروڵڵا تولفتاح) کە خاڵی سەدام حسێن بوو، چووین بۆ لای (جۆرج حەبەش)ی سەرۆکی بەرەی میللیی رزگارکردنی فەلەستین (الجبهة الشعبية لتحرير فلسطين) و نامەیەکیشی بۆ سەدام حسێن نووسی و پورم

بەتەنیا چاوپێکەوتنی لەگەڵ سەدام حسێن کرد، داواکاریی سەدام ئەوەبوو وتی "ئەگەر ئەوان نامەیەک بنووسن پەشیمانیی خۆیان و دڵسۆزییان بۆ رژێمی بەعس پیشانبدەن، ئەوسا حوکمەکەیان کەمدەکەینەوە". دوای ئەوە چووین سەردانی خالم و کاکە شەهابمان کرد و راسپاردەکەمان پێ وتن، وەڵامی هەردووکیان زۆر توندبوو، خالم بە منی وت "حەزدەکەی خاڵێکت هەبێت هەتا ماوی سەرت پێی شۆڕبێ یان خاڵێکت هەبێت سەرت پێی بڵندبێ؟ لە هەموو کەسێ چاوەڕوانی ئەم قسەیە بووم، بەڵام لە تۆ نا!". هەروەها هەڕەشەیان کرد و وتیان "نابێ ئیتر بچێ بۆ لای هیچ کەس و وازبهێنن". خالم بەگاڵتەوە وتی "من کە هاتمە دونیا، بە خواستی دایک و باوکم بوو، بۆیە مردن خۆم هەڵیدەبژێرم".

بە هیچ جۆرێ سەری بەرزیان بۆ دوژمن نەوی نەکرد، بەڵکو لە بەشی لەسێدارەدان پەلەیان بوو کەی ئەو کارە نامرۆڤانەیە ئەنجامدەدەن، بۆ ئەوەی دەستی هاوڕێکانیان لە شاخ واڵابکەن بۆ چالاکیی چەکداری. هەرواش دەرچوو، لەپاش لەسێدارەدانیان گڕوتینی شۆڕش زیاتر کڵپەی سەند، ئەو قارەمانانە بوونە سەرقافڵە و نموونەی شەهیدەکان و بەرزکردنەوەی ورەی زیندانییەکان و دروشمی (کەم ژیان و کەل ژیان)یان ورەی کادیرانی لە هەموو زیندانەکاندا بەرزتر دەکردەوە.

لەو کاتانەی کە لە ژوورەکانی بەشی لەسێدارەدان سەردانیانم دەکرد، جوتێ پێڵاویان بۆ دروستکردبووم لە بەغدا لای کەسێکی حیزبی شیوعی، پاژنەی پێڵاوەکە لەناوەوە بەتاڵ بوو ئەمتوانی نامە ببەمە ژووری زیندان و بەپێچەوانەشەوە، جارێکیان هۆنراوەیەکی شەهید جەعفەرم هێنایە دەرەوە کە بە زمانی عەرەبیی نووسیبووی، وتی "بیدە بە رێکخراوی بەرەی میللیی رزگاریی فەلەستین بۆ ئەوەی لە گۆڤارەکەیان بڵاویبکەنەوە". بەداخەوە هەرچەندە وێنەیەکیم لێ نووسیبووەوە، بەڵام وەک هەموو بیرەوەرییەکانی ترم ئەویش فەوتا و ئێستاش لەیادم نەماوە، ناوەڕۆکەکەی باسی خۆشەویستیی وڵات و خاک و خەڵک بوو

تەنیا یەک کۆپلەی هۆنراوەیەکی عەرەبیی خاڵم لەبیرە لەوکاتەی کە مامۆستا بوو، ئەویش دەڵێ:

سنلتقی سنلتقی فی جنه الخورنق
بعد بزوخ الشفق
او فی السماو الازرق
سنلتقی یاحیاتی
بعد فیراق الیم
فمرحبا بالتلاقی
ووداعا للجحیم.

قۆناغی زانکۆ لە قۆناغە هەرە گرنگەکانی ژیانی خوێندکارە، لە یەکەم هەنگاوەوە هاوکار دەبێ بۆ پێگەیاندنی کەسایەتیی تاک لە هەموو رووییەکەوە. ئەتوانم بڵێم ئەو قۆناغە بۆ منیش کاریگەربووە لە دارشتنی کارەکتەری من و کردنم بە کەسێکی کۆمەلایەتیی خۆنەویست و هەڵبژاردنی سیاسەت بۆ رێچکەی ژیانم. هەروەها هەلبژاردنی کەسایەتییەک کە بوو بە هاورێی هەمیشەیی خۆشی و ناخۆشیی ژیانم و هاورێی رۆژانی سەخت و تەخت، کەسایەتییەک کە بۆ یەک چرکە پەشیمان نەبووم لە هەڵبژاردنی، ئەویش دارۆی خۆشەویست و هاوسەرم بوو. هەروەها هەڵبژاردنی هاورێ و کەسایەتیی دیکەش کە کاریگەرییان هەبووە لە ورد و درشتی وێستگەکانی ژیانم.

هەروەک ئێستا، لە سەردەمی منیشدا چوونە ناو حەرەمی زانکۆ، خەونی گەنجان بوو. ئەو خوێندکارانەی لە دواقۆناغی ئامادەیی دەچوون بۆ زانکۆ بە پەنجەی دەست دەژمێردران. لە هەموو پارێزگای هەولێر تەنیا حەوت کچ بوون (نەسرین محەمەد تاهیر، نەرمین عوسمان حەسەن، پەریخان عوسمان ئەحمەد، نەزاهەت شاکر محەمەد قازی، نازەنین محەمەد حەمید میران، وەفیبە مەحمود حسێن، نەسرین عەبدولقادر ئەحمەد). ساڵی ١٩٦٨ بەرەو زانکۆ رۆیشتین، نمرەکەم لەسەر ئاستی کچان دووەم بوو، نەسرین تاهیر ئەتروشی کە تائێستاش هاورێی هەمیشەییمە، بە پلەی یەکەم دەرچوو، ئەو لە کۆلێجی پزیشکیی وەرگیرا و منیش لە کۆلیجی دەرمانسازی.

دوای ماوەیەک لە وەرگرتنم. ماڵی باوکم پەشیمان بوونەوە لەوەی من لە موسڵ و لە کۆلێجی دەرمانسازی بەردەوامبم، ئەوەش بەهۆی کاریگەریی خالید دلێر لەسەر باوک و دایکم و ناهەمواریی باری سیاسیی ئەو شارە، ئیتر کەوتنە فشار لەسەرم بۆ وازهێنان لەو بەشە و دابەزین بۆ کۆلێجێکی تر لە زانکۆی بەغدا. دایکم لەگەڵم هات بۆ موسڵ، سەرەتا راگری کۆلێجەکە رازی نەدەبوو و دەیوت "ئێوە زولم لەو کچە دەکەن"، بەتایبەتی کە دەیبینی من دەگریم ئەوەندەی تر پشتی دەگرتم، بەلام لە ژێر فشاری دایکمدا مامەڵەکەمی راکێشایەوە و دایەوە پێم، لەوسەریشەوە خاڵم (خالید دلێر) وەرگرتنی لە کۆلێجی پەروەردەی زانکۆی بەغدا بۆ ئەنجامدابووم.

بەداخەوە، ئەوە لە دڵی باوکم دەرنەئەچوو کاتێ لەسەر جێگا نەخۆشبوو، لەکۆتایی ژیانیدا چەند جارێک داوای لێبوردنی لێکردم کە ئەوەیان بەرانبەرم کردووە. هەموو جارێک پێمدەوت "کاکە تۆ نازانی خێر لەچیدایە، کێ دەڵێ ئەوە خێر نەبووە بۆ من و وێنەکێشانی ژیانی من؟". هەتا جارێک لەبەردەم ئارامی کوڕم وتبیەوە. ئارام وتی "ئەگەر دایکم لە موسڵ بوایە کێ دەڵێ ئێستا من هەبووم لەژیاندا؟". ئیتر بەزەردەخەنەیەکەوە سەیری ئارامی کرد و وتی "راستدەکەی".

ئەوکاتە خالم ئەندامی مەکتەبی سیاسی پارتی دیموکراتی کوردستان (باڵی مەکتەبی سیاسی بوو) ئاسانتر کارەکانم بەڕێوەدەچوو بەهۆی دەسەڵاتی ئەوسا، خۆشم وەکو هەموو کچێکی ئەو سەردەمە بۆم نەبوو لە قسەی ماڵەوە دەربچم و بەرەنگاری بڕیارەکانیان ببمەوە. بۆ جێبەجێکردنی کارەکانم لە بەغدا چوومە ماڵی مامۆستا برایم ئەحمەد، دیاربوو مامۆستا برایم بە خالمی وتبوو کە بچمە ماڵی ئەوان. خالم (خالید دلێر) و مامۆستا برایم زۆر نزیکبوون، خالم خۆشەویستیی تایبەتی هەبوو بۆی و زۆر سەرسامبوو پێی.

لە ماڵی مامۆستا برایم هاوڕێیەتی من و هێرۆخان و شاناز خان و ناسینم بۆ ئەوانی تر پەیدابوو. نەنکی هێرۆ خان، دایکی گەلاوێژ خان (حاجی سەلمە)، خاتوونێکی زۆر دڵفراوان و کۆمەڵایەتی و دڵسۆزبوو، پەیوەندییەکی قوڵم لەگەڵیدا هەبوو، تا کۆتاڕۆژی ژیانی خۆشەویستی و ڕێزێکی تایبەتی هەبوو لام، هەستمدەکرد ئەتوانێ دایکی هەموو کچێک بێ، هەستمدەکرد دڵێکی ئەوەندە گەورەی هەیە جێگای رقی تیا نەماوە، تا سەر ئێسقان لەخۆبوردوو بوو. (حاجی، گۆری پڕ نوور بێ) نموونەی دایک بوو. خوشکی مامۆستا هەمزە عەبدوڵلا بوو، بویە خۆشی لە سیاسەتدا ورد و لێزان بوو. تا لە زانکۆش بووم زوو زوو سەردانیانم دەکرد بەتایبەتی لە کاتی پشوو و کاتی کۆبوونەوەی قوتابیانی کوردستان کە زۆرجار ماڵەکەی مامۆستا برایم شوێنی زۆربەی کۆبوونەوەکان بوو. سەرەتا ماڵیان لە شەقامی فەلەستین بوو.

دوای وەرگرتنم لە کۆلێجی پەروەردە، لە بەشی ناوخۆییش وەرگیرام کە لە گەڕەکی وەزیریەی نزیک کۆلێج بوو، شەش خوێندکاری بەشی جیاواز لە ژوورێکدا بووین.

کۆلێجی پەروەردەی بەغدا، شوێنگرەوەی کۆلێجی (دار المعلمين العالية) بوو کە لە ساڵی ١٩٣٢ دامەزرابوو، لەبەرئەوە کتێبخانەیەکی گەورەی پڕ لە سەرچاوەی هەبوو کە پاشماوەی هەمان کۆلێج بوو و پێیاندەوت؛ کتێبخانەی گشتیی کۆلێج. خوێندکار لە هەموو کۆلێجەکانی تریشەوە بۆی دەهاتن، بە ناسنامەی کۆلێج بۆی دەڕۆیشتین، شوێنێکی گرنگ بوو بۆ من بۆ خوێندن، ڕۆژانە دوای دەوامی کۆلێج دەچوومە ئەو کتێبخانەیە و تا وانەکانم تەواونەکردایە نەدەگەڕامەوە بەشی ناوخۆیی، چونکە لەبەر قەرەباڵغیی بەشی ناوخۆیی، کۆششکردن و خوێندنەوە ئاسان نەبوو بۆ من.

هەندێ پەیڕەو هەبوون لەناو کتێبخانە، لەوانە؛ کتێب وەرگرتن بە پڕکردنەوەی فۆڕم بوو، لەکاتی خۆی نەمانبردایەتەوە پارەیان لێوەردەگرتین، دەبوایە هێمنیی بپارێزین. یەکێک قسەیەکی بکردایە زیاتر لە دە خوێندکاری ناو کتێبخانەکە دەیانوت "وسسسس". وەک ئاماژەیەکی تکاکردن بۆ بێدەنگی، لەسەر دیوارەکە تابلۆیەکی هۆنراوە بە زمانی عەرەبی هەڵواسرابوو، نووسرابوو:

ئەگەر لە گەرمای هاوین بێزاری
لە سەرمای زستان بێتاقەتی و
سەرسامی بەهاری
وەرە بابتبەم بۆ فێربوونی زانست

مانەوە لە بەشی ناوخۆیی بێبەرانبەر بوو، بۆ خواردنیش فۆڕمێکیان پڕدەکردەوە و چەند پسوولەیەکی خواردنی بە نرخی جیاجیا پێوەبوو، چەند خواردنگەیەکیان بۆ دەستنیشانکردبووین و لەو شوێنانە ئەمانتوانی بە نرخی هەرزان خواردن بخۆین. مانگانە یەکجار بۆمان هەبوو ئەو پسووڵانە وەربگرین، چەند دوکانێکی تایبەت بە کەلوپەلی ڕۆژانەش لە نزیک بەشە ناوخۆییەکان بوون. لەناو زانکۆش کافتریای لێبوو، هەم چایی و قاوە و شیر و هەمیش خواردنیان هەبوو، کافتریای کچان جیاوازبوو.

بەشی ناوخۆیی لە دوای کاتژمێر حەوتی ئێوارە دادەخرا، ئەگەر پێشوەخت مۆڵەتمان وەرنەگرتایە بۆمان نەبوو بچینە ژوورەوە. زۆر داخراوبوو،

کەسی زۆر نزیک نەبوایە بۆی نەبوو بێتە ناو بەشەکە، لەناو بەشەکەش ئەو کەسانەی نزیکیشبوون و سەردانیان دەکرد ئەگەر پیاو بوایە دەبوو لە ژووری بەرێوەبەر و بەرپرسی بەشە ناوخۆییەکە دابنیشتایە. ئەوەندە نزیکبووین بە چەند خولەکێک دەگەیشتینە کۆلێج.

ئەو سەردەمە، بە سەردەمی ئاڵتوونیی زانکۆکان دائەنرێ، ئاستی خوێندن زۆر بەرزبوو، بەپێی راپۆرتەکانی یونسکۆ، زانکۆکانی عیراق کە ئەوسا زانکۆی بەغدا و موسڵ و بەسرە هەبوون لە زانکۆ باشەکان بوون لەسەر ئاستی جیهان، سەدان خوێندکاریٚ وڵاتە عەرەبییەکانمان لەگەڵ بوون، بەتایبەتی (لوبنانی، مەغریبی، کوەیتی، فەلەستینی و ئوردنی و بەحرێنی) هەندێ خوێندکاری بیانییشمان لەگەڵبوون. خوێندن بە زمانی عەرەبی و ئینگلیزی بوو، مادە زانستییەکان هەمووی بە زمانی ئینگلیزی بوون، مادە پەروەردەیی و دەروونییەکانیش بە زمانی عەرەبی. مامۆستاکان زۆربەیان بیانیی بوون، بەشێکیشیان لە هیندستان و میسرەوە هاتبوون.

پێشێلکردنی یاسای زانکۆی بەغدا قەدەغە بوو بەتایبەتی پێش هاتنی حیزبی بەعس بۆ سەر دەسەلات. هەر لادانێک سزای خۆی هەبوو، کۆلێجەکان پڕبوون لە چالاکیی جۆراوجور، مانگانە بڕی حەوت دینار و نیویان بە قەرز ئەداینێ و لە کاتی دامەزراندندا راستەوخۆ پێنج دیناریان لە مووچەکەت دەبڕی.

یەکەم ساڵی کولیج گشتیی بوو، واتە هەموو زانستەکانمان دەخوێند و لەدوای دەرچوون بەپێی نمرە و ئارەزوو بەشەکەمان هەڵدەبژارد. من سەرەتا ئارەزووی بەشی فیزیام هەبوو، بەڵام بەهۆی ئەوەی نمرەی تەواوم هەبوو لە ماتماتیک هەموو لیژنەی چاوپێکەوتنەکە هانیاندام بچمە بەشی ماتماتیک، باوکیشم چونکە خوی ماتماتیکی دەوتەوە ئەویش پێی خۆشبوو، ئیتر بووم بە خوێندکاری بەشی ماتماتیک.

لە یەکەم ساڵی زانکۆم، لە کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٦٨، خۆپیشاندانی کۆلێجەکان دەستیپێکرد بەتایبەتی کۆلێجی پەروەردە، راگری کۆلێج (د.مەحمود غەنناوی) بوو، دروشمی خۆپیشاندەران چاکسازی و چاککردنی گوزەرانی خوێندکاران بوو، دژی حکومەت بوو. دوای چەند رۆژێک لە خۆپیشاندان و نەبوونی خوێندن، هێزێکی زۆر پەلاماری کۆلێجیان دا و کەوتنە تەقەکردن لە

خوێندکاران، چەند کەسێکیان بریندارکرد، هەندێکیش لە ترسی گرتن لە بەشە ناوخۆییەکان حەشار درا، بەلام هەندێک کەوتنە بەردەستی حکومەت. وەزیری رۆشنبیری (د.مالک دوهان) بوو، لە دژی ئەو تەقەکردن و شکاندنی حەرەمی زانکۆ و چوونی هێز بۆ ناو خوێندکاران و ناو زانکۆ، دەستی لەکارکێشایەوە. ئێمە وەک یەکێتی قوتابیانی کوردستان بەشداری ئەو خۆپیشاندانە بووین و لەگەڵ خوێندکارە عەرەبەکان دروشمەکانمان دەوتەوە. سەرۆکی زانکۆی بەغدا (د.عەبدولعەزیز ئەلدوری) بوو، سەردانی کۆلێجی کرد بۆ هێورکردنەوەی دۆخەکە.

عەبدولڕەحمان عارف سەرۆک کۆمار بوو، ئەو خۆپیشاندانانە وردە وردە دەسەڵاتی لاوازتر دەکرد و لایەنە ئۆپۆزسیۆنەکانی لەناو خەڵک بەهێزتر دەکرد، تا کودەتاکەی ١٧ی تەمووزی ١٩٦٨، دەسەڵات لای ئەو بوو. ئەو کودەتایەیان ناونابوو کودەتای سپی یان شۆڕشی سپی، بێ خوێنڕشتن بە چەند ئۆتۆمبیلێک چوونە سەر کۆشکی کۆماری. حکومەتێکیشیان بە سەرۆکایەتی (عەبدولڕەزاق نایف و عەبدولڕەحمان داود) پێکهێنا و لە ٣٠ی تەمووزی ١٩٦٨، حیزبی بەعس بە ئاسانی (عەبدولڕەحمان عارف)یان لابرد و (ئەحمەد حەسەن بەکر) بوو بە سەرۆک کۆمار و (سەدام حسێن) بوو بە جێگری. ئیتر لەو رۆژەوە حزبی بەعسی عەرەبی سۆسیالیست دەسەڵاتی گرتەدەست. راستە بێ خوێنڕشتن هاتن، بەڵام خوێناویترین و درندەترین رژێم بوو لە مێژووی عیراقدا.

سەرەڕای ئەوە زانکۆی بەغدا هەروەک زانکۆیەکی باوەڕپێکراوی جیهان بەردەوامبوو، زۆربەی سیاسەتمەدارەکانی عیراق و کوردیش خوێندکاری ئەو سەردەمە بوون، بەشێکیان ئائێستاش چالاکن، بە خوێندکاری زانکۆی بەغدایان دەوت؛ خوێندکاری زانست و زانیاری (طالب العلم و المعرفة).

کە باس لە بیرەوەرییەکانی زانکۆ دەکەین، ئەوەی یەکەمجار بیرماندەکەوێتەوە جگە لە خوێندن، خۆشییەکان و هاوڕێکانن. خۆشییەکان، سەیران و گەشتە گشتی و تایبەتییەکانە. ئێمە وەک خوێندکاری کورد ساڵانە دوو بۆ سێ گەشت یان سەیرانی گشتیمان دەکرد، یەکێکیان بۆ یەکترناسین بوو کە خوێندکاری ساڵی یەکەم دەهاتن، دووەمیان نەورۆز بوو، سێیەمیشیان لە بەهاردا قوتابیان سەیرانێکی تریان رێکدەخست.

هەرکە پاسەکانی گەشتیاری دەهاتن، خۆشییەکان دەستیانپێدەکرد. سەر پاس دەکەوتین و بە راکردن شوێن دەگیرا، هەبوو لای پەنجەرەوە، هەبوو لای شۆفێرەوە بۆ دونیادیتن و هەشبوو بۆ گۆرانیوتن و چەپڵە و کەیف دواوەی داگیر دەکرد. لە یەکەم ساتی بەرێکەوتنەوە گۆرانیی دەستیپێدەکرد تا دەگەیشتینە جێگای مەبەست گۆرانیی نەمابوو نەیڵێین. جارێکیان ئەوەندەمان گۆرانی وتبوو کەوتینە گۆرانیی (یەک سەر لەسەر سەرینێ) و بۆی رۆیشتن تا سەدان سەر لەسەر سەرینێ و نەماندەبڕیەوە. خوێندکارە قسەخۆشەکانیش نوکتە و قسەی خۆشیان دەگێڕایەوە، هەشبوو لاسایی مامۆستا و خوێندکارەکانی دەکردەوە. هەر گۆرانیی کوردی نەبوو، گۆرانیی عەرەبیشمان دەوت لەبەر ئەو دۆستە نزیکە عەرەبانەی لەگەڵماندا هاتبوون. هەروەها سەیرانی کۆلێجیشمان هەبوو، ئەوانیش لەساڵێکدا چەندجارێک سەیران و گەشتیان سازدەکرد. ئەو ناوچانەی کە بۆی دەڕۆیشتین: حەبانیە، دەریاچەی رەزازە و سەرسار، سەلمان پاک، بابل و باخچە هەڵواسراوەکان و شوێنەوارەکانی، (ملویە سامراء)، سەدر قەنات، سەدی هندیە و...هتد. هەموو شتی جوان و سادەبوون. خۆمان خواردنمان دەبرد و بەشداریی یەکتریمان دەکرد و دەبوو بە هەڵپەڕکێ و گۆرانی و فوتبۆڵ بۆ کوڕان و ریشە بۆ کچان. زۆربەی کاتیش بەرنامەی داڕێژراو هەبوو، دەنگخۆشەکان و موزیکژەنەکانی زانکۆکان بەشداردەبوون. زۆرجار ئەوانەی لە زانکۆش دەرچووبوون دەگەڕانەوە بۆ ئەو گەشتانە و لەگەڵمان دەبوون. کە دەچووین بۆ سەلمان پاک لەنێوان گۆرانییەکان هەزاران جار دەمانوت (الی ما یزور سلمان، عمره خسارة) ئەوەی سەردانی سەلمان نەکات تەمەنی بەهەدەر چووە. ناوچەیەکی مێژوویی سەوز و گەشتوگوزاری بوو.

لە سەیرانی نەورۆز، زۆر لە خێزانە کوردەکانی بەغدا لەگەڵمان بوون بەتایبەتی ئەو خێزانانەی کە سەر بە باڵی مەکتەبی سیاسی بوون.

تیمێک ئامادەکراین بۆ بەشداریی لە نەورۆزی ساڵی ١٩٦٩، تیمێک بووین لە ١٠ کوڕ و ١٠ کچ پێکهاتبووین، ماوەی مانگ و نیوێک مەشقیان پێکردین بۆ نمایشکردنی حەوت تابلۆی هەڵپەڕکێ. سەرەتا لە بینای (تیپی رەشید) لە بەغدا مەشقمان دەکرد، دوایی ئیمەیان بردە هۆڵی خولد، هونەرمەند قادر کوردی راهێنەرمان بوو، لەو کەسانەی کە بەشداربووین: نەرمین عوسمان، چیمەن

عەباس، نازدار ئیسماعیل، سەرگوڵ غەریب. دکتۆرە شوکریە رەسوڵ، سەمیعە، رووناک عەلی، مەهدیە، گوڵزار، سیروان نوری، هۆشمەند هەورامی، رۆستەم محێدین، بورهان، ئەفراسیاب و شێرزاد تالەبانی...هتد. (بە داوای لێبوردنەوە ناوی چەند کەسێکم بیرنەماوە). نمایشەکە لە ٣ی نیسانی ١٩٦٩ پێشکەشکرا، کاتێ خەریکی مەشقبووین، لە هەموو لایەکەوە بەرپرسان سەردانیان دەکردین. چەند رۆژێک پێش ئاهەنگەکە کاک کەمال موفتی هات بۆ لامان، کچان و کوڕانی جیاکردەوە، بە ئێمەی وت "پێش ئاهەنگەکە برۆنە سالۆن و خۆتان جوانبکەن و ئارایشتبکەن". بە کوڕانیشی وت "ئێوەش قژ بتاشن ئەوسا سەروجامانە ببەستن".

لە بەهاری ساڵی 1970بە یەخت سەیرانێکمان بۆ دوورگەی "ام الخنازیر" کرد بەهۆی ئەوەی کەوا تازە بەیاننامەی 11ی ئاداری 1970 خوێندرابووەوە و بەهەل زانرا کە قوتابیانی باڵی مەکتەبی سیاسی بانگهێشتی چەند کەسێکی قوتابیانی باڵی مەلا مستەفا بکەن لەوانە عادل موراد کە ئەوسا لێپرسراوی یەکێتی قوتابیانی کوردستانی باڵی مەلاییەکان بوو لەگەڵ حسێن سنجاری و چەند کەسێکی دیکەیش.

لەو سەیرانەدا گوێمان لە دەنگی تەقە بوو، کاتێک پرسیمان وتیان سەدام حسێن بەمەبەستی راوکردن هاتووەتە ئەو دەوروبەرە، هەروەک عەلی مەردانیش وەکو گۆرانیبێژ لەو سەیرانەماندا بەشدار بوو.

لە بیرەوەرییەکانی تری ئەو سەردەمە، لە رۆژانی پشوو چەند هاوڕێیەک بەیەکەوە دەچووینە سینەما یان بازار، سینەماکان هەریەکە و لە شوێنێک بوو لە (باب الشرقي، شارع السعدون، شارع الرشيد و... هتد). وەک سینەمای (ئەتڵەس، نەسر، بابل ، سندیباد، خیام، غەرناتە، سەمیرامیس و... هتد) هەندێ لەو سینەمایانە بە پێوەری جیهانیی ئەو سەردەمە دروستکرابوون. بلیتی سینەما بە ١٠٠ فلس بوو، لۆچ بە ٦٤٠ فلس بوو، چوار کەسی دەگرت، چلییش هەبوو کە بەشی خوارەوە بوو، بە ٤٠ فلس بوو، چلی وەک نموونەش بۆ کەرەستەی هەرزان بەکاردەهات. لەبەر دەرگای سینەماکان لەفە و ساردی و گەنمەشامی و چەرەسات دەفرۆشران. هەندێ فیلم تائێستاش لەبیرمە و زۆریشیانم بیرچووەتەوە، لەوانەی لەبیرەوەریمدا ماون، دوو فیلمی هیچکۆکم

بینی کە بوونە هۆی ئەوەی ئارەزووی خوێندنەوەی نووسینەکانی بکەم، لەو فیلمانە هیتشکۆکم (The Birds)، ریبیکا (The God Father) هەروەها فیلمی (Gone with the wind) و جیمس بۆند. فیلمی عەرەبییش ئەوانەی بیرمن (ثلاث رجال و نساء)ی سوعاد حوسنی، (بین قصرین)ی نەجیب مەحفوز و (الی أستاذي مع أطیب التمنیات)ی سدنی بواتیێ و زۆر فیلمی تر کە چەند بیری خۆم دەگوشم بیرمناکەونەوە.

پیاسەی شەقامی رەشید (شارع الرشید) و شەقامی رووبار (شارع النهر) کە پێیاندەوت؛ شەقامی کچان (شارع البنات یان شارع العرسان)، شەقامی کچان یەکێک بوو لە بازارە جوانەکان، پڕبوو لە جلوبەرگ و قوماش و جانتا و پێڵاو و خشڵ و ئالتوون و ئێکسسوارات و بۆن و ماکیاژ. بازاڕێک بوو بۆ پێداویستییەکانی ژنان و بووک، هەموو شتێکی لێ دەستدەکەوت، کچان بەتایبەتی خۆیان جواندەکرد و لەو بازارە بەدوای دوامۆدێلی جلوبەرگدا دەگەڕان. کوڕانیش خۆیان ڕێکوپێک دەکرد و دەهاتن بۆ سەیرکردنی کچان و ناوبەناویش قسەیەکی جوانیان بۆ کچان فڕێدەدا. لەنزیکییەوە بازاڕی مس (سوق الصفافیر) و تابلۆفرۆشەکان و شۆڕجە هەبوون. بە پێ لە شەقامی کچانەوە بۆی دەڕۆیشتین، لە بەشی ناوخۆییشەوە بۆ ئەو شوێنانە بە تاکسی یان بە پاسی سوری دوو نهۆمی دەڕۆیشتین، تازە نەفەراتیش پەیدابووبوو، ئەویش شێوازێکی تری گواستنەوە بوو.

هەندێکجار بەتایبەتی کە پارەمان بۆ دەهات، لە چێشتخانەیەکی خۆش یان بۆ خواردنێکی خۆش یەکتریمان داوەتدەکرد. لەو چێشتخانانەی کە بۆی دەڕۆیشتین (جندول) کولێرە بەقیمەی دەفرۆشت لای (جندی مجهول) بوو، عەلی شیش لە گۆڕەپانی نەسر بوو برژاوی دەفرۆشت، (مطعم المطاعم)، (مطعم کبە السرای)، لە هەمووشیان خۆشتر کە بیرەوەریی لای من زۆرە (عش الذهبی) کە بۆ یەکەمجار دارۆ منی لەوێ داوەتکرد. هەروەها دەیان چێشتخانەی بچووک هەبوون لە کەرخ و ئەعزەمیە و کازمیە و کەڕادە، کورسییان لەسەر شەقامەکان دانابوو، برژاو و کوبە و چلفرای و خواردنی تریان دەفرۆشت. ماسی برژاویش لە ڕۆخی رووباری دیجلە لە ئەبو نەواس دەفرۆشرا. دەیان چێشتخانەی لێبوو، لە هەمووشیان زیاتر کە بۆی دەڕۆیشتین (ئەبو یونان) بوو، نەفەری بە ١٠٠ فلس بوو (بۆ ئێمە کەم نەبوو)،

ئەوسا خواردنی وەک شاورمە و هەمبەرگری دەفرۆشت و فڕنی سەمونەکەشی لای خۆیەوە بوو. هەروەها چێشتخانەی عەمۆ ئەلیاس لە شەقامی ڕەشید بوو، چێشتخانەی تاجیران لە نزیک (باب الشرجي) بوو. زۆرجاریش لە عەرەبانەکان لەفەیەکی هێلکەمان دەخوارد، بەتایبەتی کە پارە کەم دەبووەوە، هەندێکجار نان و ساردیمان دەخوارد. کاتی خوێندنیش لە بەشی ناوخۆیی خواردنمان دروستدەکرد و هەموو جۆرە خواردنێکمان دەکرد. زۆربەی کات من و نازدار سمایلی هاوڕێم بەیەکەوە دەژیاین لە بەشی ناوخۆیی. هەردووکمان بەسەلیقەبووین و خواردنمان دروستدەکرد و بەیەکەوە جلیشمان دەدووریێ بۆ خۆمان. زەخیرەشمان لە ماڵی خۆمانەوە دەهێنا و تەڕەشمان لە نزیک بەشی ناوخۆیی دەکڕی. خواردنی قووتوو زۆر کەمبوو و زۆرکەمیش خەڵکی بەکاریدەهێنا.

هەندێکجار دارۆ و شەهید ئارام دەهاتن بە دواما بۆ بەشی ناوخۆیی و لەدواییدا دەچووین بۆ چێشتخانەیەک نانمان دەخوارد. هەندێکجاریش خاڵم (شەهید جەعفەر) کە ئەویش خوێندکاری بەشی زمانی ئینگلیزی بوو لە زانکۆی موستەنسریە، دەهات و بەیەکەوە دەچووینە دەرەوە. ناوبەناویش لە ڕۆژانی هەینی دەچوومە ماڵی خاڵم (خالید دلێر) و لەوێ دەمامەوە. ئیتر بەو شێوەیە ژیانی ڕۆژانەمان بە تێروتەسەلیی بەڕێوەدەچوو.

ئەو قۆناغە، بە قۆناغە خۆشەکانی ژیانی خۆمی ئەژمار دەکەم. ئەو سەردەمانە، سەردەمی زێڕین بوون (زۆرجار دەڵێم؛ خەڵکی عیراق تاکە مرۆڤن بۆ رابردوو زیاتر دەگرین وەک بۆ ئێستا و داهاتوو)، ئەمە هەر بۆچوونی من نییە و زۆربەی هاوڕێکانی ئەوکاتم داخ بۆ جوانیی ئەو سەردەمانە دەخۆن. ئیتر بەو شێوەیە ژیانی ڕۆژانەی زانکۆمان بە خوێندن و خوێندنەوە و چالاکی و سیاسەت و خۆشییەکان بەڕێدەکرد و ناوبەناویش دەچووینە خولی پێگەیاندنی کادیری مارکسی لینینی، پاش دەیان خول و تاقیکردنەوە دەبوویتە ئەندام و هەندێکجاریش سەردانی باڵیۆزخانەی چینمان دەکرد بۆ هێنانی سەرچاوەی مادیەت. لەوێ ڕێزی تایبەتیان لێدەگرتین، چونکە دەیانزانی ئێمە گروپێکی ماوین، ئەو سەردانانەم تەنیا لەگەڵ هاوڕێیانی کۆمەڵە بوو. ئەوانە و جگە لە هەموو چالاکیە سیاسییەکانم کە نامەوێ لێرە دووبارەیانبکەمەوە و لە وێستگەی دیکەی ئەم کتێبەدا باسمکردوون.

ئەم بەشەی بیرەوەرییەکانم تەنیا بۆ ژیانی ئاساییم تەرخانکردووە، کە خۆم و بەشێکی زۆر لە هاورێکانم هاوبەشین لەو بیرەوەرییانەدا، هاورێم زۆر بوون لە زانکۆ، هاورێکانم (بەداوای لێبووردنەوە لە هەندێکیان کە بەهۆی دابران ناوم نەبردوون) ئەمانەبوون: هێرۆ ئیبراهیم ئەحمەد، شەهید ئارام (شاسوار جەلال)، رەزاق فەیلی، شەهید شازاد صائیب و سەرگوڵی هاوسەری، د.نازدار ئیسماعیل و د.شێرزاد، جوانەمەرگ هۆشمەند هەورامی، بوشرا ئەلحەکیم کە خەڵکی کەربەلا بوو، ئێستا وەک کچی دایکم ئاگای لە دایکمە و لە هۆڵەندا نیشتەجێیە و بەبیروباوەڕ شیوعی بوو، کافیە سلێمان، پەخشان زەنگەنە، مەعسومە، رووپاک، چیمەن عەباس، جەمیلە، نەجات، فەرەیدون عەبدولقادر و پاکیزە خانی هاوسەری، د.محەمەد سابیر، مامۆستا سیروان نوری، ئەشرەف تاڵەبانی، کاک ئەرسەلان بایز و پەخشان حەفید، پرشنگ مەمەند، شەماڵ جەمال رەشید، ئەمیر قەساب، نەریمان، پەروین عەبدوڵلا ناسراو بە (پەری عەبدوڵلا) و سوعاد ساڵح، بەکر حسێن، حەمە قەراغی و سازگار، موعەزەز مەحمود و شیرین جەمال، رووناک عەلی، شوکریە رەسول، نەسرین عەبدولقادر، گێلاس عەلی، گوڵاڵە نوری، سەبریە عارف، خەرمان مەستی، رۆستەم محێدین، نەرمین خالید، سەربەست بامەڕنی، تەیب بەرواری، فازیل ئەحمەد، شەهید عەزیز و...هتد.

جلوبەرگی کچانی ئەو سەردەمە، مۆدەی قۆڵ کورت و مینی جۆب و مایکرۆجۆب بوو. ئەو مۆدێلانە لەسەرووی ئەژنۆوە بوون، هەرچەند ئەوسا زۆر ئاسایی بوو، بەلام ئێستا کە سەیری وێنەکانی خۆم دەکەم دەڵێم چۆن رووماں هاتووە ئەو جلە کورتانەمان لەبەرکردووە. رەنگاورەنگ و رەنگی زەق زۆر بەکاردەهات و هەندێکجار جلەکان گوڵ گوڵی بوون و زۆربەیجار لای بەرگدروو ئامادە دەکران و کەمتر بە ئامادەکراوی دەکڕدران. گۆڤارێک هەبوو تایبەت بە مودێلی جل، پێیاندەوت؛ بوردە، زۆربەی جلەکان لەو گۆڤارانە و گۆڤاری لای بەرگدرووەکە هەڵدەبژێردرا و هەندێکجاریش خۆمان دەماندووری و جاریش هەبوو لە دوکاندار دەمانکڕی کە لە دەرەوە هاتبوون. لە سەرەتای حەفتاکاندا بەدلە و شارلستۆن مۆدەی هاتبوو بۆ کچان، مۆدەی جلی شەستەکان و حەفتاکان تائێستاش بەناوبانگترە لەچاو ساڵەکانی دواتر.

قژیش بۆ کچان یان خاو و درێژ یان لوول و بوکلات و کاری مۆدە بوو.

ئارایشتگای خۆجوانکردن زۆر نەبوو، لەو ئارایشتگایانەی کە ئەو سەردەمە باوبوون، ئارایشتگای (تۆکالۆن، جابی لوبنانی و مالک و... هتد) بوون. بۆ کوڕانیش مۆدی خەنافس و های لایف هەبوو، زوڵفیان درێژ دەکردەوە و هەروەها تاڕادەیەک قژیشیان درێژ دەکردەوە. پانتۆڵی شارلستۆنیش بۆ کوڕان هەبوو، بەڵام زیاتر جلی ئاسایی لەبەردەکرا. بۆ زانکۆش، جلوبەرگی تایبەتی نەبوو و هەموو جلێک ئاسایی بوو.

لە سەرەتای شەستەکاندا هەندێ لە گەنجانی جیهان دژی ڕژێمەکان و نەریتە باوەکان و دژی شەڕ و ئاژاوە، بزووتنەوەیەکیان بەناوی (هیپی) دروستکرد. سەرەتا لە ویلایەتە یەکگرتووەکان پەیدابوو، بزووتنەوەیەکی ڕۆشنبیریی کۆمەڵایەتیی بوو و لە زانکۆکان دروستبووبوون. ئەوەندەی پێنەچوو بوو بە بزووتنەوەیەکی سەرتاسەریی جیهانی و لەناو گەنجانی کەنەدا و بەریتانیادا جەماوەریان پەیداکردبوو لە زۆربەی وڵاتان بەشێکی باش لە گەنجان هەڵگری ئەو بۆچوونە بوون. ئەو گروپە بەناوبانگبوون بە جلوبەرگ و شێوازی ژیانیان، جیاوازیی جێندەری لەنێوانیان نەمابوو و دۆستی ژینگەبوون، زۆربەیان شێوازی جلیان وەک بوزییەکان وابوو، ژیانێکی سادەیان هەڵبژاردبوو. ئەو بزووتنەوەیە کاریگەریی لەسەر گەنجانی ناو زانکۆکانی عیراق و بەتایبەتی زانکۆکانی بەغدا جێهێشتبوو، بووبووە بابەتی باسکردنی نێوان گەنجان، پێش بوونم بە کۆمەڵە زۆر سەرسامبووم پێیان و داکۆکیم لە بۆچوونەکانیان دەکرد. هەندێکجار دارۆ بە منداڵەکانی دەوت «من نەبوومایە دایکتان دەبوو بە هیپی». هەرچەند نەدەبووم بە هیپی، بەڵام دژایەتی شەڕ بەتایبەتی شەڕی ڤێتنام و سادەیی ژیانیان و یەکسانیی نێوان کچ و کوڕ، زۆر گەنجی ئەو سەردەمەی سەرسام کردبوو.

دەرچووانی پۆلی چواری ماتماتیک ٩٤ قوتابی بووین، لەو ٩٤ خوێندکارە ١٩ کچ بووین و منیش بە پلەی باشە دەرچووم و لە (١٠) یەکەمەکان بووم، هەندێ لە مامۆستاکانی پۆلی چوارمان، (د.سەعید تەها سەلیم ئەلغورابی و سوها ئەلسەدر و د.عەتوانی، خاتوو نوری، زەوبەعی) بوون.

دامەزراندن یەکسەر دوای دەرچوونی زانکۆ بوو، مانگی حەوت دەرئەچووین و مانگی نۆ دامەزرابووین.

**کۆنگرەی قوتابیانی عیراق**

لە سەرەتای ساڵی ١٩٧٠، کۆنگرەیەکی هاوبەشی یەکێتی قوتابیانی کوردستان باڵی مەکتەبی سیاسی و یەکێتی قوتابیانی عیراق سەر بە پارتی بەعسی عیراق بە بەشداریی هەندێ ڕێکخراوی قوتابیانی تر لە هۆڵی خولد بەڕێوەچوو.

هۆڵی خولد، لە حەفتاکان یەکێ لەڕووە جوان و شارستانییەکانی شاری بەغدا بوو، هەرچی کونگرە و فیستیڤاڵ و ئاهەنگی یەکترناسینی خوێندکاران و بۆنەی گرنگ هەبوو لەو هۆڵە بەڕێوەدەچوو. هیچ بەربەستێک نەبوو بۆ گەیشتن پێی، بە پاسێکی سووری دوو نهۆمیی ژمارە (١٥) لە گۆڕەپانی نەسرەوە بەرەو کەرادە و لەوێشەوە بەرەو هۆڵەکە دەرۆیشتین. خۆم لە چەند بۆنەیەکدا لەو هۆڵە چالاکیم ئەنجامداوە ئەمە جگە لە راهێنان و بەشداریم لە هەڵپەرکێی یادی نەورۆز، هەروەها یەکێ لە ئەندامانی کۆرسی سرووودەکانی خالید دلێر بووم هەر لەو هۆڵە، دواجاریش لەو کۆنگرەیە بوو کە ئێستا باسیدەکەم. ئەو هۆڵە، لە ساڵی ١٩٧٩ بەدناوکرا کاتێ کۆنگرەی رژێمی بەعس بە سەرپەرشتیی سەدام حسێن لە سیناریۆی کودەتای محەمەد عایش دەستپێکرد بۆ لەناوبردنی هەموو ئەو کەسانەی کە هەستیدەکرد رێگردەبن لەبەردەمیان و هەر لەو هۆڵە بڕیاری کوشتنی زۆرێک لە کادیرە پێشکەوتووەکانی بەعسی دەرکرد. دوای رووخاندنی رژێمی سەدام، ئەو هۆڵە کەوتە ناوچەی سەوز (المنطقة الخضراء) ئەوکاتانەی وەزیر بووم لە بەغدا بەرێکەوت ماڵەکەم کە کەوتە تەنیشت ئەو هۆڵە، هەرچەندە چاککرایەوە، بەڵام جوانی و هەستی جارانی پێنەدەبەخشیم و تەنیا وەک زیندانییەک دەهاتە بەرچاوم.

بەشداربووانی کونگرە ئەوەندەی من و شەماڵ جەمال و بەکر قەسابی هاورێم بیرماندێتەوە. لە قوتابیانی کوردستان باڵی مەکتەبی سیاسی بە ئەندامان و میوانەکانەوە کە هەر کۆلێج و زانکۆیە نوێنەری خۆی هەبوو، بەم شێوەیە بوو:

کۆلێجی پەروەردە: شێرزاد تاڵەبانی، نەژاد عوسمان.

کۆلێجی ئاداب :ئەحمەد حەمە سالح (ئەحمەد دەبابە)، عوسمان خەزنەیی.

کۆلێجی پزیشکی: فازیل تەیب، ئازاد نەجمەدین.

کۆلێجی تەکنەلۆژیا :بەکر حسین، ئەحمەد محەمەد ئابڵاخی.

زانستە سیاسییەکان: فازیلی مەلا مەحمود، فەهمی ئەنوەر عومەر (فەهمی قەرەداغی).

کارگێڕی و ئابووری: شاسوار جەلال (شەهید ئارام)، ئەمیر بەکر قەساب.

لە سلێمانییەوە: شەوبۆ جەمال، پرشنگ خەفاف، فەوزیە و کەسانی تریش کە ئێستا بیرمان نەمابوو.

بەشی یاسا: حەمە قەرەداغی.

زانکۆی موستەنسریە :سەربەست بامەڕنی.

کۆلێجی کشتوکاڵ: دارۆی شیخ نوری، ئەنیس شاکر.

لە بەشداربووانی تر (نەرمین عوسمان، شەماڵ جەمال، پرشنگ مەمەند، شازاد صائیب، حەمە جوجە، تەیب بەرواری، عەزیز مەحمود، حەمە سابیر).

لەلایەن یەکێتی قوتابیانی عیراقەوە (الاتحاد الوطني لطلبة العراق) بەرپرسەکانیانمان لە یادە، لەوانە (کەریم موللا، محەمەد دەبدەب، سەڵاح سەرمەد، فوئاد کەریم) ئەمانە بەرپرسانی یەکێتیی قوتابیانی نەتەوەیی عیراق بوون.

کەریم موللا، لە سەردەمی رژێمی سەدام حسێن بوو بە وەزیری لاوان و دواتریش وەزیری پیشەسازیی. هەروەها سەرۆکی لیژنەی ئۆلۆمپیی عیراقیش بوو.

محەمەد دەبدەبیش ئەندامی پارتی بەعسی سۆسیالیست بوو، لەو کەسانە بوو کە لەگەڵ پیلانگێڕییەکەی محەمەد عایش ناوی هاتبوو، بەڵام سەدام حسێن پێی وتبوو "من تۆ دەناسم کەسێکی دڵسۆزی، بڕۆ لێبوردنم بۆ دەرکردی". دەڵێن تا کۆتایی ژیانی هەر بە ترسەوە ژیا.

رۆژی یەکەمی کۆنگرە، تەنیا بۆ وتارخوێندنەوە بوو، هەموو ئەو یەکێتی قوتابیانەی بەشداربوون، وتاریان هەبوو. هەرچی یەکێتیی قوتابیانی وڵاتە عەرەبییەکانیش کە لە عیراق نکەیان هەبوو بەشداربوون لە کۆنگرە یان میوان بوون. بۆ رۆژی دووەم، لیژنەی کاریان پێکهێنا کە هەشت نۆ لیژنەبوون، لە هەر لیژنەیەک ئەندامێک یان دووانی ئێمەی تیا بەشداربوو. نزیکەی (٣٠ - ٤٠) کورد بەشداربوون لەناو کۆنگرە. لە رۆژی سێیەمدا، راپۆرتی لیژنەکان و

کۆنگرە خوێندرانەوە و لە راپۆرتی کۆتایی کۆنگرەدا کەریم موللا دەستیکرد بە خوێندنەوە و باسی کەرکوکی کرد و بە ناوچەیەکی عەرەبیی لەقەڵەمی دا، بەکر حسێن و سەربەست بامەڕنی هەڵسان وەڵامیان دایەوە و جەختیان لەسەر کوردستانیبوونی کەرکوک کردەوە. پێشتر ئێمە دەمانزانی کە بڕگەیەکی لەو جۆرەی تێدایە، بەکر حسێن و هەندێ برادەری تر سەردانی مەکتەبی سیاسییان کردبوو کە دەبێ هەڵوێستیان چی بێ و لە وەڵامدا وتبوویان "خۆتان بڕیار بدەن". کاک کەمال محێدین وتبووی "خۆتان ئازادن"، هەربۆیە بڕیارياندا هەموو کوردەکان لە رۆژی سێیەمدا لە لایەک دابنیشین، ئیتر بەیەکەوە کەوتینە هوتافکێشان و دەنگە دەنگ و بڕیاری بایکۆتی کۆنگرە درا، شەرعییەتیان بە کۆنگرە نەدا و هەموو بە یەکەوە هاتینە دەرەوە و لایەکی هۆڵەکەمان چۆڵکرد. لەوە دەچوو ئەوە بە دەستی ئەنقەست بێ کە دۆستایەتی ئێمەیان بەلاوە گرنگ نەمابوو، لە ژێرەوە لەگەڵ پارتی دیموکراتی کوردستان لە گفتوگۆ و رێککەوتندابوون، چونکە ئەوەندەی پێنەچوو بەیانی ١١ی ئازاری ١٩٧٠ دەرچوو، کە زۆربەی برادەرانی ئێمە لەو رێککەوتنە ژێربەژێرە ئاگادار نەبوون و بۆ هەندێک کتووپڕبوو.

دوای ڕێککەوتنی ١١ی ئازاری ١٩٧٠ و هەڵوەشاندنەوەی باڵی مەکتەبی سیاسیی پارتی دیموکراتی کوردستان (کە لەو سەردەمە ناویان لەخۆیان نابوو شۆڕشگێڕان) و بە جەلالیی ناسراوبوون، ئەو کەسانەی لەناو ئەو پارتە بە چەپ و هەڵگری بیروباوەڕی مارکسیەت - ئەندێشەی ماوی ناسراوبوون و هەندێ لەو کەسانەش کە ڕازی نەبوون بچنە ناو پارتی دیموکراتی کوردستانەوە (باوەڕیان وابوو کە پارتی دیموکراتی کوردستان ناتوانێ بمانگەیەنێتە ئامانجە نەتەوایەتی و چینایەتییەکان)، کەوتنە بیرکردنەوە بۆ دروستکردنی ڕێکخراوێکی جێگرەوە، ئەویش سەرەتا بە ڕێکخراوی مارکسی-لینینی - ئەندێشە ماوی ناسراو بوو.

ئەو گروپە مارکسیانە، لەدوای ١٩٦٨ بەرەو هەڵکشان ڕۆیشتن لەڕووی ژمارەوە، جگە لە شەپۆلە جیهانییەکە کە هەموو دونیای گرتبووەوە، هەندێ هۆکاری ئیقلیمی و ناوخۆیی هەبوون کە کاریگەرییان لەسەر زۆربوونی ژمارەی ئەو کەسانە کردبوو. لەوانە :

یەکەم: کاریگەریی سازمانی ئینقیلابی ئێران (گروپێکی مارکسی لینی - ماوی بوون و لە حیزبی تودەی ئێران جیابووبوونەوە) گروپێک لەوانە تازە لە چین گەڕابوونەوە، ڕوویان لە کوردستان کرد و هاتنە لای باڵی مەکتەبی سیاسی و سەرەتا لە بەکرەجۆ بوون، لەوانە: خەسرەوی سەفائی (دکتۆر قوباد)، ئیسماعیل فەزائی، سەفا، دکتۆر جەلال (کۆرشی لاشایی)، ئیبراهیم (عەلی سادقی). ئەوانە ڕۆژانە کۆڕ و کۆبوونەوە و سیمینارییان بۆ کەسانی ناو ئەو باڵە دەگێڕا. لەوکاتەی ئەوان لە بەکرەجۆ بوون، یەکێتی قوتابیانی کوردستان سەر بە باڵی مەکتەبی سیاسیی کۆنفرانسێکیان لە بەکرەجۆ ئەنجامدا، بەداوای لێبوردنەوە لە بەشی زۆری بەشداربووان، بە خۆم و هاوڕێیانم شەماڵ جەمال و ئەمیر قەساب لە نزیکەی (٨٠) کەس لە بەشداربووان، ئەم ناوانەمان بیرماوە: دارۆی شێخ نوری، شاسوار جەلال (شەهید ئارام)، فازیلی مەلا مەحمود، شازاد صائیب، شەماڵ جەمال، فازل تەیب، حسێن تەیب، ئەمیر قەساب، بەکر حسێن، حەمە ئەمین (پۆلا)، سالار عەزیز، حەمە قەراغی، سەربەست بامەڕنی، حەمە جوجە، تەنیا دوو ژنیش لە سلێمانییەوە بەشداربوون، درەخشانی حەمەی فەرەجەفەندی و پەخشانی حەمەی فەرەجەفەندی، زۆربەی بەشداربووەکانی تر لە سلێمانییەوە بوون.

لەو ماوەیەی کۆنفرانسەکەدا، بەشداربووان زۆربەیان بە شەوانیش لە بەکرەجۆ دەمانەوە، شەو لەگەڵ برادەرانی سازمانی ئینقلاب کۆدەبوونەوە و باس لەو رەوتە دەکرا. دوای ئەوە هەستدەکرا کە کاریگەرییەکی باشیان بەجێهێشتبوو لەسەر ئەو خەڵکە، هەموو شەوێکیش پێش خەوتن سروودی ئینتەرناسیۆناڵی جیهانییان دەوتەوە. وەک بۆیان گێرامەوە؛ بۆ نیوەڕۆیەک هەموو ئەندامانی کۆنفرانسەکەیان بە تشریبی بامیێ داوەتکردووە.

دوای بەکرەجۆ، هەر ئەو برادەرانەی سازمانی ئینقلاب، شووقەیەکیان لە یەکەم کۆڵانی گەڕەکی بەتاوین دوای گۆڕەپانی (گیران) نزیک شەقامی (نضال) بەرانبەر بە کەنیسەی ئەرمەن بەکرێ گرتبوو. ئەوانەی لەوێبوون هەندێکیان ناسراوبوون وەک: خەسرەوی سەفائی (دکتۆر قوباد)، ئیسماعیل فەزائی، سەفا، ئەوانەی لە ئەوروپاش دەهاتنەوە هەر لەو شوقەیە دەمانەوە، من خۆم خەسرەوی سەفائیم لە ماڵی شەهید شەهاب بینی.

خەسرەوی سەفائی ناسراو بە دکتۆر قوباد، لە ٢ی نیسانی ١٩٣٥ لە شاری خویی ئێران چاوی بەدونیا هەڵهێناوە، لە تاران خوێندویەتی و لە تافی لاوێتییەوە دەستیداوەتە چالاکی. سەرەتا لە لاوانی پارتی تودەی ئێران کاریکردووە، دوایی لەگەڵ هەندێ لە هاوڕێکانی لە ساڵی ١٩٦٤ لە حیزبی تودە جیادەبنەوە و سازمانی ئینقلابی – تودە دروستدەکەن. لە ساڵی ١٩٦٨ – ١٩٧٠ دێتە کوردستان و ماوەیەکیش لە شاری بەغدا دەمێنێتەوە. پەیوەندیی لەگەڵ کادیرەکانی مارکسیزم و لینینیزمی ناو باڵی مەکتەبی سیاسیی زۆر پتەوبوو، زۆر دۆستی مام جەلال و شەهید شەهاب بوو. من خۆم لە ساڵی ١٩٦٩ لە ماڵی شەهید شەهاب بینیم. پیاوێکی بەتوانا و رووخۆش و نوکتەئامێز بوو. تا جیابوونەوەی باڵی عیراقی، لە عیراق مایەوە. لە ٤ی ئایاری ١٩٧٦، ئیتلاعاتی ئێران دەیگرن کە ماوەیەک بوو بەدوایدا عەوداڵ بوون. بەشێوەیەکی نامرۆڤانە و دڕندانە دوو رۆژی بەردەوام ئەشکەنجەیان دا، لە ٦ی ئایاری ١٩٧٦، لەژێر ئەشکەنجەدا گیانی پاکی لەدەست دا و چووە ریزی شەهیدە نەمرەکان. (مام جەلال لە خۆشەویستیی ئەو پیاوە قارەمانە، کوڕەکەی ناودەنێ قوباد).

بەداخەوە، دکتۆر جەلال (کۆرشی لاشایی) بەپێچەوانەی دکتۆر قوباد، لەبەردەم ئەشکەنجەی ساواک خۆی ڕانەگرت. دکتۆر کۆرشی لاشایی، لە ساڵی ١٩٣٦ لە لنگرودی باکووری ئێران لەدایکبووە، لە ساڵی ٢٠٠٢ بە نەخۆشیی شێرپەنجە کۆچی دواییکرد. پزیشک بوو، لە رابەرایەتی حیزبی تودەی ئێران

بوو، بەڵام دواتر لەگەڵ هەندێ هاوڕێی خوێندکارانی ئەوروپا لە حیزبی تودە جیابوونەوە و سازمانی ئینقیلابی حیزبی تودەیان ڕاگەیاند. کاتێک شۆڕشی کوردستان لە ڕۆژهەڵات لە ساڵەکانی ١٩٦٧ و ١٩٦٨ بە ڕابەرایەتی شەریفزادە و مەلا ئاوارە و موعین دەستپێکردووە، لاشایی هاتووەتە کوردستان و دواییش هاتە کوردستانی باشوور و لە بەکرەجۆ بوو، ماوەیەکیش لە بەغدا مایەوە. دوای ئەوە چووە ئەوروپا و لە ساڵی ١٩٧٠ گەڕایەوە بۆ ئێران، دوای ماوەیەک دەستگیر دەکرێ و دەچێتە بەرەی دوژمن و دژی بزووتنەوەی چەپەکان دەبێتە پیاوی شای ئێران و لەسەر تەلەفریون و دەڵێ؛ هەر جۆرە بزووتنەوەیەک دژی شاهەنشاهی ئێران بێت، بێسوودە. هەموو بەڵگە و دۆکیۆمێنتەکانی ڕادەستی ساواک کرد و هەموو لایەک بە خیانەتکار لەقەڵەمیان ئەدا.

دووەم: گۆڤاری ڕزگاری، یەکێکی ترە لە هۆکارەکان، کاک نەوشیروان مستەفا خاوەن ئیمتیاز و کاک شازاد صائیب سەرنووسەری بوو، بابەتەکانیان دەربارەی مارکسیزم - لینینیزم - ئەندێشەی ماو تسی تۆنگ و کوردایەتی و چینایەتی بوو. ئەو گۆڤارە، یەکێکبوو لە بەرهەمەکانی ڕۆشنبیرانی شۆڕشگێری پێشکەوتووی ئەو سەردەمە، وەکو پێناسەی ئەو گۆڤارە دەکرێ و دەوترێ؛ ڕزگاری، بڵاوکراوەیەکی بیروباوەڕی جەنگاوەرانی بزووتنەوەی کوردایەتییە، لەپێناو نەهێشتنی ئازاردانی نەتەوایەتی و چەوساندنەوەی چینایەتیدا. ڕزگاری، گۆڤاری کرێکاران و جوتیاران و ڕۆشنبیرانی شۆڕشگێڕە. ڕزگاری، مەشخەڵی بیروباوەڕی سۆسیالیستییە. ڕزگاری، گۆڤاری تێکۆشەرانی ڕێگای ڕزگاری و دیموکراسی و سۆسیالیزمە.

ئەو سەردەمە، گۆڤار و بڵاوکراوەکان کاریگەریی زۆری لەسەر خوێنەر جێدەهێشت و دەبووە بابەتی گفتوگۆ و بە سەرچاوە ئەژمار دەکرا، هەربۆیە ئەو گۆڤارە کاریگەریی لەسەر بیرکردنەوە و بەچەپکردنی گەنجێکی زۆری ناو باڵی مەکتەبی سیاسیی هەبوو.

(١٥) ژمارەی لێدەرچوو، هەندێ لەو کەسانەی کە بابەتیان تێدا دەنووسی و بە چەپ ناسراوبوون: نەوشیروان مستەفا، شازاد صائیب، فوئاد قەرەداغی، فەهمی قەرەداغی، حەمە ئەمین (پۆلا)، فازیلی مەلا مەحمود (نەبەز)، جەلالی میرزا کەریم، باوکی دڵسۆز (ناوی خوازراو)، بەکر حسێن هەندێکجار بەناوی جەمال شارباژێڕی، شاکر فەتاح... هتد. هەندێکجاریش بابەتی کۆمەڵایەتی

و هونەریی تێدا بڵاودەکرایەوە. زۆرێکی تر لە نووسەران و رووناکبیران و شاعیران جگە لە بڵاوکراوەی خۆیان، بابەتیان لە زمانی بیانییەوە وەردەگێڕا و بڵاویاندەکردەوە. هەروەها دکتۆر ئیبراهیم کە ناوی راستەقینەی (عەلی سادق) بوو، بە فارسیی بابەتی دەنووسی و کاک نەوشیروان مستەفا وەریدەگێڕا بۆ کوردی.

سێیەم: هۆکارێکی تر کە کاریگەریی هەبوو، ئەو خولەی مام جەلال بوو کە لە ناوەراستی ١٩٦٩ لە بەغدا بۆ کۆمەڵێک گەنجی ناو باڵی مەکتەبی سیاسیی کردەوە، بەندە (نەرمین عوسمان)، یەکێک بووم لە بەشداربووان. لەو خولەدا، مام جەلال زۆر بابەتی گرنگی ورووژاند، یەکێک لەوانە؛ کتێبەکەی خۆی بوو (الجبهة الوطنية المتحدة). هەروەها لەسەر بزووتنەوەی رزگاریخوازی کوردستان و بیروباوەڕی مارکسیزم و لینینیزم و ئەندێشەی ماوی بوو، باسی لە تاقیکردنەوەکانی سیاسەتی ماو تسی تونگ (سکرتێری حیزبی شیوعی چین) دەکرد لە وڵاتی چین و مام سەرسامبوو بە ئەزموونی چین. هەروەها باسی ئەزموونی یەکێتی سۆڤیەت تا سەردەمی ستالینی دەکرد. لەو تەوەرانەی زۆر جەختی لەسەر دەکردەوە؛ شۆڕشی رۆشنبیریی چین بوو کە لە ساڵی ١٩٦٦ دەستپێکردبوو. هەروەها شۆڕشی لە لادێوە بەرەو شار.

مام، هانی دەداین بۆ خوێندنەوە و هەڵبژاردنی جۆری کتێبەکان، وەک کتێبەکانی: ماو، هوشی مینە (دامەزرێنەری حیزبی شیوعی ڤێتنام)، غەسان کەنەفانی (ئەندامی مەکتەبی سیاسیی بەرەی میللیی رزگارکردنی فەلەستین- الجبهة الشعبية لتحرير فلسطين)، مونیر شەفیق کە ئەوکات کەسێکی چەپ بوو، بیرەوەرییەکانی جۆرج حەبەش و نایف حەواتمە و ئەو خولە چەند هەفتەیەکی خایاند. هەفتەی یەک رۆژ بوو، لە بارەگای مەکتەبی سیاسی (پارتی شۆڕشگێڕان) باڵی مەکتەبی سیاسی پارتی دیموکراتی کوردستان لە شەقامی فەلەستین و هەندێکجاریش لە نووسینگەی پارێزەرایەتی کەمال محێدین لە شەقامی موتەنەبی بەڕێوەدەچوو. لەو کەسانەی کە بەشداری ئەو خولە بوون، ئەوەندەی بە من و کاک شەماڵ جەمال و نەریمان مەحمود کە هەرسێکمان بەشداربووین و بیرماندێتەوە، ئەم بەڕێزانە بوون: دارۆ شێخ نوری، شاسوار جەلال (شەهید ئارام)، نەرمین عوسمان، شەماڵ جەمال رەشید، نەریمان

مەحمود، عەزیز مەحمود، یاسین ئەنوەر، ئازاد نەجمەدین، فازیل تەیب، فازیلی مەلا مەحمود، حسێن تەیب، دکتۆر جەمیل عەلی، بەکر حسێن، شەهید ئەحمەد ئابلاخی، شوکر زەنگەنە، حەمید بلباس، رۆستەم محێدین، ئەمیر بەکر قەساب، مەجید، ئەحمەد شاکەلی، دلێر سدیق، سامی شۆرش، ئەرسەلان بایز، فەهمی قەرەداغی، دکتۆر حەمە جەزا، ئەحمەد حەمە سالح (ئەحمەد دەبابە)، حەمە جوجە، تەیب بەرواری، سەربەست بامەرنی، ئەنیس شاکر، فازیل قەزاز، حەمە قەرەداغی، جەمیل رەنجبەر، جەمیل عیسا، دلشاد...هتد. (رەنگە کەسانی تری لێبووبێ و بیرمان چووبێتەوە)، ناوبەناو هەندێ کچیش دەهاتن، بەڵام بەردەوام نەبوون.

لەکاتی خولەکەدا، سەردانی بالیوزخانە و ناوەندی رۆشنبیریی چینمان کرد و لەوێ هەندێ لە کتێبەکانی ماو تسی تۆنگ و مارکس و ئەنگلسیان داینێ، نمایشێکی بالێیان پێشکەشکرد و داوەتی نانی نیوەڕۆیان کردین. هەروەها سەردانی ناوەندی رۆشنبیریی کوریای باکوورمان کرد و لەوێ هەندێ کتێبی کیم ئیل سۆنگ (سکرتێری حیزبی کرێکارانی شیوعی کۆریا)مان وەرگرت. هەندێکیشیان جارێک سەردانی سەنتەری رۆشنبیریی سۆڤیەتیان کرد.

شەهید شەهاب، یەکێک لە کتێبەکانی کیم ئیل سۆنگی بۆ سەر زمانی کوردی وەرگێڕا. هەروەها شەهید ئارام و کاک حیلمی عەلی شەریفیش هەندێک کتێبی تریان وەرگێڕا و کتێبەکەی ماو تسی تۆنگیش (چەپکێک لە وتەکانی ماو تسی تۆنگ - مقتطعات من أقوال ماو تسی تونغ) مامۆستا برایم و کاک نەوشیروان وەریانگێڕا بۆ سەر زمانی کوردی. پاش ئەو خولە، رەوتی ماویەت زۆر باسدەکرا و کادیرە چەپەکانیش بەرەو هەڵکشان رۆیشتن و ژمارەیان زیاتر بوو.

چوارەم: کردنەوەی (کتێبخانەی بیری نوێ) کە لە شەقامی سەعدون (شارع السعدون) بەرانبەر ئوتێل میریدیان بوو، ئەم کتێبخانەیە بەناوی دارۆی شێخ نوریەوە بوو و شەهید شەهاب سەرپەرشتیی دەکرد. کاریگەریی راستەوخۆی هەبوو بۆ پەیداکردنی سەرچاوەکانی خۆپەروەردەکردن بە بیری مارکسیزم و لینینیزم و ماویەت و کۆبوونەوەی ئەو برادەرانەی کە هەڵگری ئەو بیرە بوون، دوانیوەڕوان زۆر قەرەباڵغ دەبوو.

لەو کتێبخانەیە، کتێبەکانی مارکس و ئەنگلس و لینین و ماو تسی تۆنگ و نووسەرە مارکسییەکان دەفرۆشرا و دەستدەکەوتن، زۆرجار برادەر هەبوون کتێبەکانیان دەبرد و دوای خوێندنەوەی دەیانگەڕاندەوە، چونکە مەبەست لەو کتێبخانەیە قازانج و پارە نەبوو. بۆ چاوبەستی حکومەت، هەندێ پەڕاو و کەلوپەلی نووسین و قوتابخانەی تێدا دەفرۆشرا. هاوکاریی دارایی بەڕێوەچوونی ئەو کتێبخانەیە، زۆربەی لەلایەن مام جەلال و شەهید شەهاب و دارۆوە دابینکرا.

جارێکیان بڕی (٣٠) دیناریان لە نازەنین خانی خێزانی کاکە شەهاب بەقەرز وەرگرت بۆ کتێبخانەکە و نەیاندایەوە، مام جەلال دەچێتە ماڵی کاکە شەهاب و نازەنین خان شکاتیان لێ دەکات و مامیش پێیاندەڵێ؛ بیدەنەوە من ئەتاندەمەوە. نە مام ئەیانداتەوە و نە ئەوانیش ئەیدەنەوە بە نازەنین خان.

لە ساڵی ١٩٧٣ کە ماڵمان پێکهێنا لە سلێمانی، لە هەر کتێبە و نموونەیەک لە ماڵەکەماندا هەبوو. بۆ سەرچاوەی کتێبەکانی ماو تسی تۆنگ و وەرگرتنی کتێب، دارۆ سەردانی سەنتەری رۆشنبیریی چینی دەکرد، باڵیۆزخانەی چین زۆر بایەخیان بەو رەوتە ئەدا کە هەڵگری ئەو بیروبۆچوونانە بوون.

لای کتێبخانەکە، دارتاشێک هەبوو کەلوپەلی ناوماڵی دروستدەکرد، کاتێ ئێمە (من و دارۆ) کەوتینە ماڵ دروستکردن دوای ساڵێک زیاتر لە هاوسەرگیری، ئەو دارتاشە ناوماڵەکەی بۆ کردین و تەنیا پارەی کەلوپەلەکانی لێوەرگرتینەوە، لە ژووری نووستنەکەدا سێ شوێنی نهێنیی بۆ شاردنەوەی کتێب و بڵاوکراوە نهێنییەکان بۆ دروستکردین.

زۆربەی برادەرانی کۆمەڵە و چەپەکان سەردانی ئەو کتێبخانەیەیان دەکرد، بووبوو بە شوێنی کۆبوونەوە و یەکترناسین. کە دارۆ بوو بە پێشمەرگە لە ساڵی ١٩٧٤، کتێبخانەکە مۆریان (الشمع الأحمر) لێدا و داخرا. خۆی ئەوەی بۆ گێڕامەوە کە لە ١٩٧٥ دەستگیرکرا، لەکاتی لێکۆڵینەوە لە ئەمنی سلێمانی و بەغداش پرسیاریان دەربارەی ئەو کتێبخانەیە لێکردووە.

پێنجەم: هەر لەو ماوەیەدا لە گەڕەکی وەزیریە لە شاری بەغدا، روشدی عەلی شەریف خولێکی رۆشنبیریی کردەوە، بە هەمان شێوە ئەم خولەش هەفتەی یەک رۆژ بوو و ماوەی چەند مانگێکی خایاند. خولەکە وەک کۆڕ وابوو، بابەتەکانی دەربارەی رەوتی چەپ بوو. سەرەتا رەوانشاد روشدی

عەلی شەریف کە کەسێکی زۆر شارەزا و زۆریش رۆشنبیربوو و دەمێکیش نەبوو لە ئەوروپا گەڕابووەوە. هەرجارە بابەتێکی باسدەکرد و دواتریش دەبوو بە گفتوگۆ، کۆڕەکان کراوەبوون و هەرکەس بیویستایە ئەیتوانی بەشداربێ، کاتی دەستپێکردن دیاربوو، بەلام کۆتاییەکەی دیاری نەدەکرا بەهۆی گفتوگۆکانەوە.

لەکۆتاییدا پرسیارێک دێتە ئاراوە، بەهانەکان چی بوون کە ماویەت زاڵبوو بەسەر بۆچوونەکانی ناو ئەو گروپە مارکسییانەدا؟ لە زۆربەی دانیشتنە بێ بەرنامە و بە بەرنامەکان باسی لێوەدەکرا، لەوانە چەند بەڵگە و هۆکارێکیان دەهێنایە پێشەوە:

١ . واقیعی حاڵی کوردستان هاوشێوەی واقیعی حاڵی چین بوو، هەردوولا ناوچەیەکی نیمچە دەرەبەگایەتی و نیمچە داگیرکراوبوون.

٢ . هەردوو ناوچەکە لە هەمان رووەوە دواکەوتووبوون، هەم لەڕووی ئابووری و هەمیش لەڕووی کولتووری و رۆشنبیرییەوە.

٣ . هەردوولا لە ولاتانی جیهانی سێیەم ئەژماردەکران.

٤ . ئەزموونی گواستنەوەی شۆڕش لە لادێوە بەرەو شاخ و لەوێشەوە بەرەو شار کە لە چین تاقیکرابووەوە، بۆ کوردستان گونجاوتر و لەبارتربوو لەڕووی جێبەجێکردنەوە.

٥ . پێنەگەیشتنی پرۆلیتاریا (چینی کرێکار) لەناو شار و کەمیی ژمارەیان و نەبوونی پرۆلیتاریای راستەقینەی شۆڕشگێڕ لە کوردستان، وایکردبوو کە ئەزموونی چین پەسەندتربوو بۆ کوردستان، هەروەها پەیڕەوکردنی رژێمی کۆلخۆزات (هەرەوەزی کشتوکاڵی) و رۆڵی لە بونیادنانی ولاتێکی سۆسیالیست و دەیان تاقیکردنەوەی تر گونجاو و لەباربوون بۆ لای ئێمە.

ئەمانە و هەندێ هۆکاری شکستی ولاتانی تر لە جۆری ئەزموونی مارکسیەت وایکرد رێکخراوی مارکسی لینینی، ئەندێشەی ماوی پەیڕەوبکەن.

بەو شێوەیە لە چەند لایەکەوە کەسانی گۆشکراو بە بیروباوەڕی مارکسی لینینی - ئەندێشەی ماوی پەیدابووبوون و پەروەردەکرابوون، بەلام پەرشوبلاوبوون و بووبوون بە سێ رەوت. شەهید شەهاب و هاوڕێکانی رێچکەیان شکاند و بیریان لەوە کردەوە کە ئەمانە دەبێ کۆبکرێنەوە، سەرەتا

سەردانی مام جەلالیان کرد و مامیش پەسەندی کرد. وەک دەستپێک هەندێ بازنەی رۆشنبیریی دروستکرا و بە هەموو لایەک ئەو کەسانەیان کۆدەکردەوە کە هەستیان دەکرد دەتوانن لەو بازنانەدا کاربکەن بە نهێنییەکی زۆرەوە. سەرەتا ناوی (شانە) نەبوو، بەڵکو پێیاندەوت (حەلقەی سەقافی) ئەڵقەی رۆشنبیریی. هەڵبژاردنی کەسەکان مەرجدار بوو، لەسەرووی هەموویانەوە هەڵگری بیروباوەری مارکسی لینینی بێ و رەوشت بەرز بێ، لەناو خەڵکدا خۆشەویست بێ و نهێنی پارێز بێ، لەگەڵ رژێم یان دەزگایەکی سیخوڕیی کاری نەکردبێ و ئامادەیی هەموو ئەگەرە مەترسیدارەکانی هەبێ.

هەندێ لەو برادەرانەی کە بە مارکسیی ناسرابوون و لەناو باڵی مەکتەبی سیاسیی بوون، ئامادەنەبوون لەگەڵ ئەو گروپە کاربکەن. هەیانبوو ماوەیەتیان بە لادان دائەنا لە مارکسیەت، یەکێک لەوانە خالید دڵێری ئەندامی مەکتەبی سیاسیی باڵی مەکتەبی سیاسیی بوو، خۆم چەند جارێک تووشی گفتوگۆبووم لەگەڵیدا لەوبارەیەوە، سەرەتا تاڕادەیەک کاریگەریی بەسەر شەهید جەعفەریشەوە هەبوو. هەندێکیش لەو مارکسییانە ئەو کارەیان بە کارێکی مەترسیدار دائەنا، هەشیانبوو چوونە ناو پارتی دیموکراتی کوردستانەوە، هەندێکیش دانیشتن و وازیان لە سیاسەت هێنا. بۆ منیش، بەهۆی کاریگەریی خولەکان و شەهید جەعفەر و دارۆی شێخ نورییەوە هەروەها وەک بنەماڵەش ناسراوبووین بە چەپ، کارێکی ئەستەم نەبوو چوونم بۆ ناو ئەو گروپانە و بە ئاسانی چوومە ئەڵقە رۆشنبیرییەکانەوە.

یەکەم کۆبوونەوە وەک دەستپێکی ئەو رێکخراوە مارکسییە، لە ماڵی کاک فەرەیدون عەبدولقادر کرا بە ئامادەبوونی پێنج کەس (شەهید شەهاب، فەرەیدون عەبدولقادر، فازیلی مەلا مەحمود، دلێر سدیق و فوئاد قەرەداغی). کاک فوئاد قەرەداغی بۆی گێرامەوە، وتی "لە وتووێژی یەکەم کۆبوونەوەدا باسی پەیوەندیی ئەو گروپە و گروپی (کاک نەوشیروان مستەفا، مەحمودی مەلا عیزەت و حەمە چاوشین) و ئامادەبوونیان بۆ بەشداریکردن لەو کارەدا کرا، خۆمان بڕیارماندا دەستبەکاربین و کارەکانیشمان دابەشکرد. هەروەها منیان راسپارد بۆ نووسینی بەرنامە و پەیڕەوی ناوخۆ و ئامادەکردنی بۆ کۆبوونەوەی دواتر و یەک هەفتەیان بۆ دانام. لە کۆبوونەوەی دواتردا مام جەلالیش بەشداریکرد و دەبوایە هەشت کەس بین، بەڵام دوانمان (کاک رەفعەتی مەلا و کاک بەکر حسێن) ئامادەنەبوون".
وەک کاک فەرەیدون عەبدولقادر لە بیرەوەرییەکانی خۆیدا باسیکردووە؛ یەکەم

کۆبوونەوە کە لە ماڵی ئەوان بوود. لە ١٠ی حوزەیرانی ١٩٧٠ بوو، بۆیە ئەو ڕۆژە کراوە بە ڕۆژی دامەزراندنی کۆمەڵە.

کۆمەڵە، ئەوسا ناوی (کۆمەڵەی مارکسی لینینی کوردستان- عیراق) بوو، دوای جیابوونەوەی ئەوانەی بە عیراقچییەکان ناودەبران (-عیراق) داش عیراقیان لێکردەوە.

وەک باسمکرد، سەرەتا ئەڵقە ڕۆشنبیرییەکان هەبوون و بوون بە ئەندام کارێکی ئاسان نەبوو، دەبوایە دەیان کتێبمان بخوێندایەتەوە و دەیان پلەمان ببڕیایە و پابەندی دیسپلینەکانی ئەو ڕێکخراوە بووینایە. بۆ نموونە ئەو سەردەمە مۆدەی جلی کورت بوو، منیش جلەکانم کورت بوون و خاڵم (شەهید جەعفەر) پێیوتم "دەبێ جلەکانت درێژبکەیتەوە"، ئەو ڕێنماییەش لە بیرتەسکییەوە نەبوو، بەڵکو دەبوایە نموونە بووینایە و گرنگیی بە رووکەش کەم بکەینەوە و بایەخ بەخۆپەروەردەکردن بدەین.

سەرەتا جگە لە خوێندنەوەی سەرچاوەکانی مارکسیەت و ماویەت و گفتوگۆکردن دەربارەیان، بابەتی تری هەستیار دەهاتە پێشەوە و دەبووە باسی ناو کۆبوونەوەکان و دەربڕی ڕاکانمان، لەو بابەتە گرنگانە؛ پرسی کوردستانیەت یان عیراقیەتی کومەڵە بوو، هەردوو بۆچوون بابەتی گەرمی کۆبوونەوەکان بوون، ئایا ئەو ڕیکخراوە عیراقی بێت یان کوردستانی؟ هەندێ برادەر هەبوون عیراقیانە بیریان دەکردەوە، هەندێکیان دوای ١٤ مانگ و لە سەرەتای ئابی ١٩٧١، لە ریزەکانی ئەو ڕێکخراوە دەرچوون کە ژمارەیان (١٧) کادیری پێشکەوتوو و چالاک بوون و ڕێکخراوێکی تازەیان بەناوی (کۆمەڵەی مارکسی لینینی شیوعی) ڕاگەیاند و کاک فوئاد قەرەداغییان بە سکرتێر هەڵبژارد و کاک ئەشرەف تاڵەبانی و سلێمان عومەر بوون بە ئەڵقەی ناوەند و کۆمەڵێ کادیری تریان لەگەڵ بوو کە زۆربەشیان لە دەستەی دامەزرێنەر بوون. ئەو کادیرانە ئەمانەبوون: فوئاد قەرەداغی، فازیلی مەلا محمود، ئەشرەف تاڵەبانی، محەمەد وشیار بەرزنجی، عەبدولڕەحمان حاجی سدیق قەرەداغی (بە گۆران ناسرابوو)، سەروەری حەسەن سێوسێنانی، پرشنگ مەمەند، عەبدوڵڵا موعتەسەم دەباغ، ئەمیری عەلی ناجی، زاهیر شێخ باهیر (مەردۆخی)، شیروان شێخ نوری، حەسەن حەمەخان ئەمین، سلێمان عومەر (ئەبو ئازاد)، شەماڵ جەمال، سامی شۆڕش) ئەو گروپە لە قیادەی مەرکەزییەوە نزیکبوون و پاش دەرچوونیان لە کۆمەڵە وتووێژیان لەگەڵ

قیادەی مەرکەزی کرد. بەڵام قیادەی مەرکەزی مەرجەکانی مارکسیەتیان قبوڵ نەکرد، ئەوانیش نەچوونە ناویان تەنیا فازیلی مەلا محمود و سامی شۆڕش نەبێ. بەشێک لەو ناوانەم لە کاک ئەشرەف تاڵەبانی و کاک شەماڵ جەمال وەرگرتووە و بەشێکیشیان خۆم ئەمناسین. ئەوانەی وەک گروپی کوردستانیی مانەوە. بەردەوامییان دا بە کار و چالاکییەکانیان و نەوەستان لە پەیوەندیکردن و چوونە ناو خەڵکەوە.

یەکێکی تر لەو بابەتانەی گرنگی و بایەخی زۆری پێئەدرا ئەوەبوو؛ ئایا حیزبی بەعس بە دوژمنی پلەیەک دائەنرێ یان دەرەبەگ و سەرمایەدارەکان؟ دوای چەندین گفتوگۆ و کۆبوونەوە، بڕیاردرا کە حیزبی بەعس بە دوژمنی پلەیەک ئەژماربکرێ و ئەو رایە سەرکەوت.

سەرەتای پەیوەندیم بە کۆمەڵەوە لە ئەڵقە رۆشنبیرییەکانی بەغدا بووم، کۆبوونەوەکان لە چەند شوێنێک بوون، وەک ماڵی فەرەیدون عەبدولقادر، محەمەد چینی، لای کاک حەمە سابیر، یان لای پرشنگ مەمەند بوو کە ئەویش ژوورێکی گرتبوو و لە بەشی ناوخۆیی نیشتەجێ نەبوو. کە دامەزرام لە شاری سلێمانی ساڵی ١٩٧٢ کاک ئاوات عەبدولغەفور بەرپرسم بوو، هەر لە سلێمانی خۆشم بووم بە بەرپرسی دوو شانە کە هەموویان پیاوبوون.

لە ساڵی ١٩٧٤ پاش ئەوەی دارۆ بوو بە پێشمەرگە، راژەی خۆم گواستەوە بۆ هەولێر و لەوێ سەرەتا جەعفەر عەبدولواحیدی خاڵم بەرپرسم بوو و دواییش کاک حەمەی میرزا سەعید، بەڵام لەسەر داوای خۆم لەو شانەیە نەمام و گەڕامەوە بۆ لای شەهید جەعفەر. ئەو سەردەمە شەهید جەعفەر بەرپرسی کۆمەڵە بوو لە هەولێر. زۆربەی کۆبوونەوەکان یان لە ماڵی شەهید جەعفەر یان لە ماڵی محەمەدی حەمە سەعید بوو. ئیتر باوکم هەستیکرد کە منیش لە رێکخراوەکەی شەهید جەعفەر کاردەکەم، رۆژێک هات و پێیوتم "تۆ ئازادی چی دەکەی، بەڵام دەبێ زۆر ئاگاتان لە خۆتان بێ، زۆر بە نهێنیی کاربکەن، دوژمن زۆر دڕندەیە" ئەو قسەیە دڵخۆشی کردم بەوەی کە ئیتر نهێنیم لای باوکم نەماوە و ئەمتوانی هەندێ لەو کۆبوونەوانە لە ماڵی باوکم بکەم.

لە ساڵی ١٩٧٦ جارێکی تر راژەی خۆم گواستەوە بۆ سلێمانی و دارۆ هەر لەو ساڵەدا و لە کۆتایی مانگی هەشتدا گیرا، ئیتر ئیبراهیم جەلال بوو بە بەرپرسم.

دوای گرتنی زۆربەی برادەرانی کۆمەڵە و گرتنی دارۆ و سەرکردایەتی، دیسانەوە خۆم گواستەوە بۆ هەولێر. ڕێکخستنەکانی کۆمەڵە شپرزەیی پێوە دیاربوو و یەکمان نەئەدۆزییەوە بەهۆی نهێنیی زۆر و ئاگادارنەبوونمان لەکاری یەکتری و هەندێکجاریش یەکترمان نەئەناسی، ڕەنگە من زیاتر کەسەکانم دەناسی بەهۆی ئەوەی زۆربەی کۆبوونەوەکان لە ماڵی ئێمە یان لە ماڵی شەهید جەعفەر بوو. لەگەڵ شەهید ئازادی برام و نازەنینی خوشکم کە ئەوانیش ئەندامی کۆمەڵە بوون، کەوتینە خۆمان و هەندێ خەڵکمان دۆزییەوە و هەندێ شانەمان دروستکردەوە و پەیوەندییمان بە سلێمانییەوە کردەوە، دوای لەسێدارەدانی ئەو سێ قارەمانە، خەڵک و برادەران دەهاتن هەم بۆ پرسە و سەرەخۆشی و هەم بۆ دووپاتکردنەوەی بەردەوامی و سووربوون لەسەر ڕێبازەکە، ئیتر کەسانێکمان ناسی کە پێشتر بەهۆی نهێنیی ڕێکخستنەوە نەماندەناسین، پەیوەندییمان بەوانیشەوە کرد و ئەوانیش پەیوەندییان پێوەکردینەوە و زیاتر کۆبووینەوە. دوای ئەوە هەرێمەکان دروستبوون و ئەوانیش لای خۆیانەوە پەیوەندییان بەو برادەرانەوە کردەوە و جارێکی تر ریزەکانی کۆمەڵە بە شێوازێکی تر ڕێکخرایەوە و کەوتینەوە جموجوڵ.

لەو ماوەیەی کە زۆربەی برادەرانی سەرکردایەتی لەناو زیندان بوون، هەندێکجار نامە یان ڕاسپاردەیان پێدا دەناردینە دەرەوە بۆ لای کۆمیتەی هەرێمەکان، زۆرجاریش لەگەڵ پاکیزە خانی خێزانی کاک فەرەیدون عەبدولقادر نامەکانمان بەنهێنیی ئەهێنایە دەرەوە، دارۆ و کاک فەرەیدون کاری دەستیی ناو زیندانیان دروستدەکرد وەک زەنگیانە و کاری هەویر و نامەکانیان لەناو ئەو کەلوپەلانەدا دەشاردەوە وەک ئەوە وابوو بۆ جوانیی کرابێ، ئێمەش دەمانهێنایە دەرەوە و دەماننارد بۆ برادەران. هەر لەو ماوەیەدا من هەندێ چەکم لابوو (کلاشینکۆف و دەمانچە)، لەدوای هەرەسی شۆڕشی ١٩٧٥ شەهید شەهاب و دارۆ و شەهید ئازادی برام و شێخ نیهادی برای دارۆ چەکەکانیان بەجێنەهێشتبوو و هێنابوویانەوە لەگەڵ خۆیان، ئێمەش بەشێکمان لە سلێمانی لە ماڵی شێخ جەناب، لە پشت هەیوان لە ژووری دارۆ، لە ژێر زەوی و لەناو گریس شاردبووەوە و هەندێکیشمان لە هەولێر لەناو باخی ماڵی باوکم شاردبووەوە بە هەمان شێوە. کە بڕیاری هەڵگیرساندنەوەی شۆڕش لەلایەن کۆمەڵەوە درا، ئەوانەی هەولێرم تەسلیم بە شەهید عەلی ئامەخان کرد، چەکەکانی سلێمانیشم

تەسلیمی گۆران حسێن شاڵی کرد و دەمانچەیەکیشم تەسلیم بە مەلا بەختیار کرد کە ئەوکاتە لە سلێمانی بەنهێنیی بەرپرسی ڕێکخستن بوو.

تا پەیوەندیم بە ریزەکانی پێشمەرگەوە لە تشرینی دووەمی ١٩٧٩، بەنهێنی و چالاکتریش کارماندەکرد، خۆشم بۆ نەدەگیرا لە پۆلەکان قسەم بۆ خوێندکارەکانم دەکرد و هەوڵم ئەدا گیان و بیری نەتەوایەتی و بەرگرییان بەهێزبکەم. لەسەر ئەو قسانە چەندجارێک سیخوڕەکانی ڕژێم ڕاپۆرتیان لێدابووم و چەندجارێک بانگیان کردم بۆ ئەمن بۆ لێکۆڵینەوە و پرسیارکردن، بەڵام شتێکی ئەوتۆیان لانەبوو جگە لە قسە نەبێ، تا دواجار لە تشرینی دووەمی ١٩٧٩ هاتن بەدوامدا و لە قوتابخانە بە ئۆتۆمبێلی ئەمن بردمیانە ئەمن و ئەوجارە کەوتنە هەڕەشە و چاوترساندن و لە هەموو جارێک زیاتر هێشتمیانەوە، لەگەڵ مامۆستا ژیان برابووین کە ئەویش سەر بە حیزبی شیوعیی بوو، ئەو سەردەمە کەوتبوونە گرتنی شوعییەکان. ئەوجارە هەستم دەکرد ئیتر ڕزگاربوونم لەدەستیان ئەستەمە، بەڵام کە شەو داهات هەردووکمانیان بەردا، ماوەیەکیش بوو مام جەلال نامەی بۆ دارو دەنارد بۆ مەبەستی پەیوەندیکردن بە هێزی پێشمەرگەوە، ئیتر هەر هەمان ئێوارە دەرچووین و نەگەڕاینەوە بەردەستی دوژمن. کار و چالاکییەکانمان وەک ئەندامی کۆمەڵە لە شاخ و سوریا و دەرەوە جۆرێکی تر بوو، لە شوێنێکی تری کتێبەکە باسم لێوەکردووە.

دەربارەی پرسی ژن لەناو کۆمەڵە، هەرچەندە کۆمەڵە کۆمەڵەیەکی مارکسی لینینی بوو و دەبوایە ڕێژەی ژن ڕێژەیەکی بەرچاوبێ، بەڵام ژمارەمان زۆر کەمتربوو لەچاو پیاوان. هەندێ هۆکار هەبوون بۆ ئەوە، لەوانە؛ ئەو سەردەمە کاری ژن لەسیاسەتدا زۆر باو نەبوو و ئامادەیی ژنانیش کەمتربوو لەچاو ئەم سەردەمە. تاقیکردنەوەیەکی ئەوتۆ نەبوو لە بەشداریی ژنان، ترس و نهێنیی ڕێکخراوەکە وایکردبوو کەمتر ژنان بێنە پێشەوە لە ترسی گرتن و خۆشاردنەوە، خۆشاردنەوەش کارێکی ئاسان نەبوو، کەس لە ماڵی خۆی قبوڵی نەبووین، من خۆم دووجار سووکە دەرکردنێ دەرکراوم لە ماڵان (لە شوێنێکی تری کتێبەکە باسم لێوەکردووە).

هەروەها بەهۆی نهێنیی زۆرەوە و ترس لەوەی ژنەکان نەتوانن ئامادەبن بۆ پاراستنی ئەو نهێنییە قورسانە، بەشێک لە پیاوەکان کە کادیری پێشکەوتووبوون، بەڵام خێزانەکانیان لە ڕێکخستندا نەبوون و ئامادەش نەبوون پێیان بڵێن.

بەبۆچوونی خۆشم دەڵێم راستە هەندێ لەوانە هەڵگری بیروباوەڕی مارکسی بوون، بەڵام هێشتا لەژێر کاریگەریی عەقڵیەتی کۆمەڵگەدا بوون، ترسی گرتنیش ترسێکی گەورەبوو، نەوەک لەژێر ئەشکەنجەدا نەتوانن خۆڕاگربن و هەروەها ترسیان هەبوو نەوەک دەستدرێژیی بکرێتە سەریان کە ئەوەش وەک حەیاچوونێک وابوو بۆ کەسوکاری هەرچەندە لەسەر پرسی نەتەوایەتی و بیروباوەڕیش بێ. نموونەشم باوکم، بەو هەموو پێشکەوتووییەی خۆی کە هەموو ئازادییەکی دابوو پێمان، بەلام کاتێ نازەنینی خوشکم لە زانکۆی موسڵ گیرا و ئەو رۆژەی بەریاندا، باوکم گەیشتبووە لای و پێی وتبوو واز لە زانکۆ بهێنە با نەکەویتەوە بەردەستیان. باوکم ئامادەبوو نازەنین واز لە پێنج ساڵی زانکۆ بهێنێ، بەڵام گرنگ ئەوەبە نەگیرێتەوە. هەمووشیان لە درندەیی رژێم ئەترسان کە ئامادەبوون هەموو جۆرە ئەشکەنجەیەک و رێگایەک بەکاربهێنن بە مەرجێ دانپیانان وەربگرن.

یەکێک لەو بابەتانەی کە چەند جارێک لە کۆبوونەوەکان باسماندەکرد ئەوەبوو؛ ئایا پێویست دەکات بەشێکمان هەبێ بۆ ژنان؟ زۆربەی بۆچوونەکان ئەوەبوون کە لە قۆناغی رزگاریی نەتەوایەتیی پێویست بەوە ناکات لەو جۆرە جیاکارییە هەبێ، دەبێ هەموو بەیەکەوە کاربکەین.

بابەتێکی تری ناو کۆبوونەوەکان ئەوەبوو؛ ئایا بزووتنەوەی رزگاریی نەتەوایەتی، بزووتنەوەیەکی شۆڕشگێڕییە؟ کە ئەویش کێشەیەکی تیۆری و سیاسی بوو، ئەمانە جگە لە تیۆرییەکانی مارکس و ئەنگلس و لینین و چینایەتی و ناکۆکییەکان و دەیان بابەتی تری سەردەمیانە، بابەتی گفتوگۆی کۆبوونەوەکان بوون.

لەسەر بۆچوونی سەرکردایەتی و کادیرە پێشکەوتووەکان تێبینییەکم بەدیدەکرد، هەبوون زیاتر مارکسی بوون و کەمتر بە لای ماویەتدا دەڕۆیشتن و هەشبوون دەیانویست ماویەت رەوتی کۆمەڵە بێت و زیاتر جەختیان لەسەر دەکردەوە، جەعفەر عەبدولواحید و شاسوار جەلال زیاتر جەختیان لەسەر مارکسیەت دەکردەوە و کەمتر وتەکانی ماوی-یان بەکاردەهێنا.

## یەکێتیی ئافرەتانی کوردستانی عیراق

لەدوای بەیانی ١١ی ئازاری ١٩٧٠ و بڕیاری یەکگرتنەوەی باڵی مەکتەبی سیاسیی پارتی دیموکراتی کوردستان لەگەڵ پارتی دیموکراتی کوردستان، لە ساڵی ١٩٧١، یەکێتیی ئافرەتانی کوردستانی عیراق بڕیاری بەستنی کۆنگرەی دووەمی خۆی دا.

بەڕێز مام جەلال داوای لە هەندێ ژنی سەر بە باڵی مەکتەب سیاسیی کرد خۆیان کاندید بکەن بۆ سکرتاریەت کە هەردوو باڵ بەشداربوون لەو کۆنگرەیەدا، ئەوکات من خوێندکاری پۆلی چواری زانکۆ بووم و یەکێک بووم لەو کەسانەی داوام لێکرا خۆم کاندیدبکەم.

کۆنگرە دوو ڕۆژی خایاند، ئەوانەی لە باڵی مەکتەبی سیاسیی بەشداربووین:

بەغدا: هێرۆ ئیبراهیم ئەحمەد، نەرمین عوسمان، پرشنگ مەمەند، توبا خان.

سلێمانی: درەخشان حەفید، بەهیە مەعروف، ئەنجوم زوهدی.

هەولێر: ویداد خالس و هەندێک خانم و خوشکی تر بەشداربوون کە بەداخەوە ناوەکانیانم بیرنەماوە.

زەکیە ئیسماعیل، بە دەنگی زۆرینە بوو بە سەرۆکی یەکێتی ئافرەتان. منیش بچووکترین ئەندامی سکرتاریەت بووم.

کۆنگرەی دووەمی یەکێتیی ئافرەتانی کوردستان، لە ١٧- ١٨ی نیسانی ١٩٧١ لە بارەگای یەکێتیی لاوانی دیموکراتی کوردستان لە بەغدا بەسترا، بە ئامادەبوونی ژمارەیەکی بەرچاو لە خوشکان لە هەموو پارێزگاکان و بە چاودێریی دادوەر شەهاب شەبیب، دادوەری دادگای بەرایی بەغدا - بەشی ڕەسافە، هەروەها ئامادەبوونی بەڕێز یەدوڵلا کەریم سەرۆکی یەکێتی لاوانی دیموکراتی کوردستان.

دوای وتەکانی زەکیە ئیسماعیل حەقی، ڕاپۆرتێکی دوورودرێژ لەسەر چۆنێتیی بەڕێوەبردنی یەکێتیی ئافرەتان لەڕووی کارگێڕی و دارایی و چالاکییەکان پێشکەشکرا. هەروەها فەخریە سەعدوڵلا (ئەمینداری سندوقی ئەنجومەن)، ڕاپۆرتی دارایی پێشکەشکرد. دوای کاری لیژنەکان، هەڵبژاردن دەستیپێکرد بە چاودێریی دادوەر و ئەم ناوانەی خوارەوە دەرچوون و بوون بە ئەندامی سکرتاریەت: زەکیە ئیسماعیل حەقی، حەسیبە قەزاز، فەوزیە موراد، سوهام ئیبراهیم، پەیمان مەعروف، فەخریە سەعدوڵلا، زەهرە موراد، فەخریە

حەیدەر، عەفیفە جاسم، فائیزە نەسروڵڵا، سورەیا محەمەد، گەلاوێژ ساڵح فەتاح، هێرۆ ئیبراهیم ئەحمەد، پرشنگ محەمەد مەمەند، نەرمین عوسمان.

یەدەگەکانیش: عەتیە ئەحمەد. جیهان مەعروف.

(ناوەکان، لە ژمارە ٧١٢ی دووشەممە ١٩ی نیسانی ١٩٧١ی رۆژنامەی تأخی وەرگیراون).

لە ٣ی ئایاری ١٩٧١ ئەنجومەنی باڵای یەکێتیی ئافرەتانی کوردستان یەکەم کۆبوونەوەی خۆی ئەنجامدا و بەرپرسیارێتییەکان لەنێوان ئەندامانی سکرتاریەت (ئەنجومەنی ناوەند) بە هەڵبژاردن دابەشکرا و ئەنجامی هەڵبژاردنەکە بەم شێوەیە بوو:

١ . زەکیە ئیسماعیل حەقی. سەرۆکی ئەنجومەنی باڵای بەڕێوەبردن (سەرۆک).

٢ . سورەیا محەمەد، جێگری سەرۆک.

٣ . نەرمین عوسمان، سکرتێری گشتی.

٤ . سوهام ئیبراهیم قیناس. ئەمینداری دارایی.

هەر لەو کۆبوونەوەیەدا بریار درا داواکاریی کردنەوەی بارەگا لە پارێزگاکان پێشکەش بە حکومەت بکرێ و بارەگاکانی یەکێتیی ئافرەتان بکرێنەوە.

دوای ئەوە لە شاری بەغدا بارەگایەکمان بەکرێ گرت، زەکیە ئیسماعیل و من و پرشنگ مەمەند و هەندی کەسی تر، چووین بۆ سەیرکردنی بارەگاکە، خانووەکە باڵەخانەیەکی دوو نهومی فرەژوور بوو، دەوترا؛ ئەو خانووە هی جولەکەکانی شاری بەغدا بووە پێش ئاوارەبوونیان بۆ ئیسرائیل. زەکیە خان رۆژانە لەوێ ئامادە دەبوو، ئیمەش دوای دەوامی زانکۆ سەردانمان دەکردن و ئەو ئەرکەی پێیان بسپاردینایە ئەنجاممان ئەدا و کادیریشمان پەیداکرد بۆ ئەوەی بێنە ریزەکانی یەکێتیی ئافرەتانەوە.

جارێکیان داوایان لێکردم وەک شاندی ئافرەتان لەگەڵیان بڕۆم بۆ سەردانی سەدام حسێن، ئەوسا جێگری سەرۆکی ئەنجومەنی باڵای شۆڕش بوو کە لە ٩ی تشرینی دووەمی ١٩٦٩، بە فەرمی ببوو بە جێگر. وتیشیان "با نەرمین گوڵەکە پێشکەشبکات"، منیش نەمدەویست ئەو کارە ئەنجامبدەم، بە فێڵێک خۆم لە کارەکە دوورخستەوە و چووم بۆ شاری کەربەلا بۆ ماڵی کچێکی هاوڕێم کە ناوی (بوشرا ئەلحەکیم) بوو.

زەکیە ئیسماعیل حەقی، ژنێکی بەتوانا و لێهاتووە لە هەموو ڕوویەکەوە، لە خێزانێکی کوردپەروەری فەیلییەکانی بەغدایە، دەستەی دامەزرێنەری یەکێتی ئافرەتان بوو، لەسەر ئاستی عیراق و وڵاتە عەرەبییەکانیش یەکەم قازیی ژن بوو، لە ساڵی ١٩٧٠ بە هەڵبژاردن بوو بە ئەندامی لیژنەی مەرکەزیی پارتی دیموکراتی کوردستان و تاکە ژنیش بووە. خاتوو زەکیە، زۆرجار بۆی باسدەکردم کە بەهۆی مام جەلالەوە هاتووەتە ناو پارتییەوە ئەو سەردەمەی دوو باڵ نەبوو، مامیش زۆر ڕێزی لێدەگرت و بە کاکە زەکیە بانگی دەکرد. لەدوای پرۆسەی ئازادیی عیراق و لەنێوان (٢٠٠٥-٢٠١٠) بوو بە ئەندامی ئەنجومەنی نیشتمانیی عیراق و لەدواییشدا بوو بە ئەندامی ئەنجومەنی نوێنەرانی عیراق. زۆرجار پێی دەوتم "ئەرمین من مامۆستای تۆم". لەڕاستیشدا زۆر شتی باشی لێوە فێربووم. هەرچەند زۆربەی کات بۆچوونەکانمان جیاوازبوون و هەندێکجاریش لە دوو بەرەی دژ بەیەکتر کارمان کردووە، بەڵام لە کوردایەتی و مافی مرۆڤ و مافی ژناندا زۆر یەکبووین، بۆیە ناهەقیی دەکەم ئەگەر یەک تۆزقاڵ لەتوانای ئەو ژنە لێهاتووە کەم بکەمەوە.

لەدوای دەرچوونم لە زانکۆ و گەڕانەوەم بۆ هەولێر بۆ ماڵی باوکم، ئیتر لە هەولێر سەردانی بارەگای یەکێتیی ئافرەتانم دەکرد، بارەگاکە لە گەڕەکی تەیراوە بوو نزیک خوێندنگای سەلاحەدین، لەهەمان کاتدا ئەندامی کارای کۆمەڵەی مارکسی لینینی بووم، سەیرمدەکرد بۆچوونەکانمان زۆر جیاوازن. ئەندامەکانی یەکێتی ئافرەتان لە هەولێر، زۆر حیزبیانە بیریاندەکردەوە و ئەو دووفاقییە بۆ من ئەستەم بوو، بۆیە داوام لە کۆمەڵەی مارکسی لینینی کرد کە واز لە سکرتێریی یەکێتی ئافرەتان بهێنم، بەلایانەوە پەسەند نەبوو و وتیان "کەسمان بۆ نابرێتەوە ناو سکرتاریەت"، بەڵام من بڕیاری خۆمم دابوو. ئیتر نامەیەکم دا بە سەرۆکی ئەنجومەنی باڵای ئافرەتان و لە سکرتێر و سکرتاریەت دەستم لەکارکێشایەوە، هەر لەو سەردەمەشدا فەرمانی دامەزراندنم لە سلێمانی وەک مامۆستا دەرچوو و کردم بە بیانوو بە یەکجاریی وازمهێنا، بەشداریشم نەکرد لە کۆنگرەی سێیەم لە ساڵی ١٩٧٢ کە لە هاوینەهەواری سەلاحەدین بەسترا.

له کانوونی یەکەمی ١٩٧٤ دارۆ و شەهید ئازادی برام کە پێشمەرگە بوون، هاتبوونە پێنجوێن و ناردیان بەدوامدا بۆ سەردانیان، منیش بڕیارمدا بچم. رەحمەخانی براژنی دارو کە زۆر خۆشەویست و خاوەن ڕێزی تایبەت بوو لای هەمووان، هات لەگەڵمدا، هەم بۆ ئەوەی بە تەنیا نەبم و هەمیش بۆ سەردانیان.

بەمەبەستی دەرنەکەوتنم لە خاڵەکانی پشکنینی رژێم، جلی کوردیی ژنانی گوندنشین و عەبایەکیشم پۆشیبوو و ڕۆیشتین. سەرەتا بە ڕێگای ئاسایی لەناو پاسێکدابووین، لە یەکێ لە خاڵەکانی پشکنین، پۆلیسێکی عەرەب سەرکەوت و بە چاوێکی گوماناوی سەیری هەمووانی دەکرد و داوای ناسنامەی لێکردین، لەناو هەمووان منی هەڵسان وتی "گومی" هەڵسە، منیش شڵەژام و هیچم نەوت، رەحمەخان وەلامیدایەوە بە عەرەبییەکی شڵەژاوەوە وتی "هەسە عەروسە روح لادێ". دەیویست بڵێ؛ تازەبووکە، دەیبەم بۆ لادێ. هەرچۆنێ بوو پۆلیسەکە وازی لێهێناین و هێشتی بڕوین. پاش ئەوەی لە بازگەکە رزگارمان بوو، رەحمەخان دەیوت "دە بڵێ عەرەبی نازانی، ئەها چۆن رزگارم کردی!". دوای تۆزێ لەسەر شەقامێک دابەزین، کەسێکمان لەگەڵ هاتبوو وەک ڕێنیشاندەر، ڕۆیشتین بەرەو لاڕێیەکی قوڕاوی و بارانیش بە شەستە دەباری، لەوێ تراکتۆرێک چاوەڕێبوو، پشتەکەی عەرەبانەیەکی پێوەبوو پڕیکردبوو لە خەڵک و ئێمەش سواری عەرەبانەکە بووین، بەناو کێڵگەیەکی قوڕاویدا دەڕۆیشت، تایەکەی تۆپەقوڕی فڕێدەدا بەسەرماندا، منیش عەباکەم بەسەر خۆمدا دابوو، کەوتمە پێکەنین وتم "ئای نەرمین سواری پیکاب نابی". رەحمەخان وتی "ئەوە چی دەڵێی کەی وەختی پێکەنینە، ئەمە حاڵە ئێمەی تیاین؟". دوایی بۆم گێڕایەوە؛ کاتێ کە لە زانکۆبووم لە بەغدا لە بەشی ناوخۆیی دەژیام، دونیا زۆر گەرمبوو، ماڵی خاڵم (خالید دلێر) ئەوسا لە بەغدا بوون و وتیان "پانکەیەک بەرە"، وتم "باشە چۆن بیبەم؟". وتیان "بە پیکاب"، (پیکابێکیان هەبوو) منیش وتم "لەڕووم نایە بە پیکاب بڕۆم"، خاڵیشم وەک کەسێکی مارکسی و چەپێکی توند، سادەیی ژیانی زۆر لا گرنگبوو، ئیتر ئەمەی لێکردم بە قسە و زوو زوو دەیوت "نەرمین سواری پیکاب نابێ". لەسەر تراکتۆرەکە بیرمکەوتەوە کە زەمانە و سیاسەت چۆن هەموو ژیانت سەربەرەوژێر دەکات و قبوڵیشی دەکەیت.

بەخۆشحاڵییەوە گەیشتینە نزیک پێنجوێن، دارۆ بە جێبێکی سەوزی عەسکەرییەوە لەسەر رێگا چاوەڕێمانبوو، ئەو ناوە مۆنجەی دەهات لە پێشمەرگە، هەستێکی یەکجار خۆشی پێبەخشیبووم کە بەداخەوە ئەو شۆڕشە گەورەیە بە هەرەس کۆتاییهات بە پیلانی دوژمنانی نەتەوەکەمان.

کە گەیشتینە پێنجوێن چووینەماڵێک، لەوێ شەهید شەهاب و شێخ نیهادی برای دارۆ و شەهید ئازادی برامی لێبوو و چاوەڕوانیان دەکردین، وەک پیشەی هەمیشەییان باسی گیانی بەرگری و هێزی لەبن نەهاتووی پێشمەرگەیان بۆ کردین، لە ژوورێک بووین بەحاڵ جێگەمان بووبووەوە، لەلایەکی ژوورەکە داری سۆپا هەڵچنرابوو، رادیۆیەک و تەسجیلێکی بچووکی لێبوو، کاسێتی گوگوشیان بۆ لێداین، ئەوسا تازە باوی هاتبوو، ئەو هەموو ورەبەرزییەی پێشمەرگە بە کونفەیەکونێک هەرەسیهێنا.

# کاکە شەهاب
# (شەهید شەهاب)

”نەکەی رۆژێ لە رۆژان دڵی نەرمین زویر بکەی“

بیرەوەرییەکانم لەگەڵ کاکە شەهاب زۆر زۆرە، چونکە یەکێکە لەو کەسانەی بە مامۆستا و برای گەورە و هاوڕێی خەباتی خۆمی دەزانم بۆ هەمیشە. ناسینی کاکە شەهاب لە زانکۆوە دەستیپێکرد، کاتێ من و دارۆ یەکترمان ناسی، کاکە شەهاب وتی "حەزدەکەم بێن سەریماڵەوە بدەن و لە نزیکەوە بماننناسی". لە بەغدا دەژیان و ماڵیان لە (بغداد جدیدة) بوو، ئیتر لەو ڕۆژەوە وەک برایەکی گەورە و مامۆستایەک سەیرم دەکرد. کەسێک بوو خاوەنی کاریزمایەکی بەهێز بوو، بە یەک دانیشتن نەتدەتوانی ڕێزی تایبەتی لێنەگریت، لەدواییشدا بۆم دەرکەوت ورد و درشتی خێزانەکە بە چاوێکی گەورە سەیریدەکەن. بۆ دارۆش هەم براگەورە بوو، هەمیش وەک باوک سەیریدەکرد و دەیوت "کاکە شەهاب جێگای باوکی بۆ پڕکردوومەتەوە"، چونکە دارۆ لە تەمەنی منداڵی، باوکی (شێخ نوری شێخ ساڵح) کۆچی دوایی دەکات.

کاکە شەهاب، ئەرکی داواکردنی منی بۆ دارۆ خستبووە ئەستۆ و بەیەکەوە لەگەڵ بەڕێز مام جەلال و عومەر دەبابە و براکانی دارۆ (شێخ جەناب، شێخ نیهاد) و ئامۆزاکانی (ماڵی شەهید ئارام) هاتن بۆ هەولێر بۆ لای باوکم بۆ ئەو مەبەستە، زۆریش هاوڕێ بوون لەگەڵ شەهید جەعفەر، بۆیە تێکەڵییەکە زۆر زوو دروستبوو. دوای ماوەیەکی کورت کاکە شەهاب ڕۆیشت بەرەو سوریا و لوبنان، ئیتر لێمان دوورکەوتەوە، بەڵام بە نامەی نهێنیی ئاگامان لەیەک بوو، کە شەهید جەعفەریش چوو بۆ سەردانی، هەموو هەواڵێکی ورد و درشتی بۆ هێنابووەوە. کاتێ کە لە لوبنان بوو، زانیی منداڵمان دەبێ وای مەزەندە کردبوو کچمان دەبێ و جلی منداڵی کچانەی بۆ کڕیبووین، کە زانی کوڕە، وەڵامی نارد و وتی "ناوی بنێن هاوڕێ".

لە کانوونی یەکەمی ١٩٧٣ پاش ئەوەی شەهاب شێخ نوری لە سوریا گەڕابووەوە، ماوەیەک بەنهێنی لە ماڵی شاسوار جەلال لە بەغدا و ماڵی فەرەیدون عەبدولقادر و چەند ماڵێکی تر لە کەرکوک و ناوچەکانی تر مابووەوە، دواتر هاتە سلێمانی بۆ ماڵی ئێمە و بە نهێنیی لەگەڵ هاوڕێکانی تردا کاری کۆمەڵەیان دەکرد. هاوڕێی کوڕم تەمەنی نەگەیشتبووە سێ مانگ،

ئەوسا مۆڵەتی دایکایەتی تەنیا ٤٠ ڕۆژ بوو، دەبوایە من بچم بۆ کارەکەم، ژنێکیش دەهات ئەو ماوەیە ئاگای لە هاوڕێ دەبوو، کاتێ کە کاکە شەهاب گەیشت، مۆڵەتمان دا بە ژنەکە (ناوی سەیدە بوو) چەند ڕۆژێک لای کاکە شەهاب و هاوڕێکانی ترمان جێماندەهێشت، بەڵام ئەوانیش نەیاندەزانی وەک پێویست بەخێوی بکەن. بۆیە داوام لە دایکم کرد هات بردی بۆ ماڵی خۆیان لە هەولێر. بۆ من وەک تازەدایکێک زۆر ئەستەم بوو، شیری خۆشمی دەخوارد، هەندێکجار بۆ ئەوەی کاکە شەهاب و برادەرەکانی هەست نەکەن، بە تەنیا لە ژوورەکەی خۆم دەگریام، هەروەها مووچەکەیان بەتەواوی لێوەردەگرتم بۆ کۆمەڵە، تەنیا بەشێکی کەمیان بۆ بەجێدەهێشتم، زۆر بەدڵفراوانییەوە ئەو کارەمدەکرد، زۆربەی برادەران ئەوە حاڵیان بوو، بەشێکی بژێویی ژیانی خۆیان بۆ کۆمەڵە تەرخانکردبوو ئەگەر کەمیش بوایە. ئەو هاوڕێیانەی کە دەهاتن، بەشێکیان زۆربەی کات لەوێبوون، لەوانە: شەهید ئارام، کاک فەرەیدون عەبدولقادر و خێزانەکەی (پاکیزە خان)، کاک سالار عەزیز، ئاسۆی شێخ نوری، نەریمان مەحمود، زۆرجار میوان لە هەولێر و لە کەرکوک و شارەکانی تریشەوە دەهاتن، هەندێکجار نەمدەبینین و نەدەچووم بۆ لایان، هەندێکیشیانم ئەوسا نەدەناسی و بۆشمان نەبوو پرسیار بکەین.

ماوەیەک کاکە شەهاب کەسە نزیکەکانی خۆشی نەدەبینی جگە لە کاکە جەنابی برای، شەوی سەری ساڵ بوو، بە کاکە شەهابمان وت "با بنێرین بەدوای نازەنین خانی خێزانت و سۆزان و سۆراندا". دیاربوو زۆر بیری دەکردن، یەکسەر ڕازی بوو، وتیشی "با ڕەحمەخانیش بێ". داوایکرد بەهێمنیی بچم و پێیان بڵێم. دیداری ئەو شەوەم لەیادناچێ، سۆران لەباوەشی نەدەهاتە خوارەوە و زوو زوو دەستیدەهێنا بە ریشی کاکە شەهابدا، ئەم جۆرە ژیانە تەنیا کەسانی خاوەن باوەڕ ئەتوانن بەرگەی بگرن.

پاش ماوەیەک کاکە شەهاب بەرەو کەرکوک ڕۆیشت، ماوەیەک لەوێ مایەوە، دوای ئەوە من لە هەولێر بینیمەوە و چووبوو بۆ ماڵی شەهید جەعفەر، دوای ئەوە هەر بەنهێنیی هاتە ماڵی باوکم. ئەوسا بەناوی خاڵە عوسمان کاریدەکرد. تەنانەت خێزانەکەی خاڵم (قانعە خان) نەیدەزانی کێیە،

نهێنییەکان ئەوەندە پارێزراوبوون کەس مافی درکاندنی نەبوو.

جارێک ئامۆزایەکم (وریا) هاتە ماڵی باوکم، بینی کاکە شەهاب دەستی لەسەر شانمە و بەیەکەوە لە حەوشە پیاسە دەکەین بە باوکمی وتبوو "تۆ چۆن قبوڵ دەکەی پیاوێکی بێگانە بەو جۆرە لەگەڵ نەرمین هەڵسوکەوت بکات". باوکیشم وتبووی "وەک برای وایە، تۆ حەقت نەبێ"، ئێستاش کاک وریا دەیگێڕێتەوە.

لە هەولێر ئەوانەی کە دەهاتن و من دەمبینین؛ کاک ئەرسەلان بایز و کاک فەرەیدون عەبدولقادر، حەمەی میرزا سەعید، عەلی ئامەخان، کاک ئیبراهیم، حەمید بڵباس... هتد. هەندێکجار بەنامەیەکی نهێنییەوە دەیانناردم بۆ شارەکانی تر و هەندێکجاریش قانعە خانی خێزانی شەهید جەعفەرم لەگەڵ بوو.

کاکە شەهاب بە هەموو وردەکارییەکەوە باوەڕی بە مارکسیەت هەبوو، باوەڕی بە بۆچوونی ژن هەبوو. زۆرجار لەو ماڵانەی کە دەمایەوە دەیویست ژنی ئەو ماڵە بەشداریی پێبکات لە بۆچوونەکان و رایان وەربگرێ. زۆر بێ ئەرک بوو، هاوکاریی دەکردین لە کاری ناوماڵ، زۆربەی جار جلەکانی خۆی دەشوشت، چاخۆر بوو و زۆربەی جار خۆی چای لێدەنا، نەیدەویست ئەرکمان زیادبکات.

کاکە شەهاب، چونکە کەسێکی چاخۆر و جگەرەکێش بوو، دایکم سەماوەری چاکەی لای خۆی دانابوو بۆ ئەوەی بێ چا نەبێ، قسەخۆشەکانی باپیرم (باوکی دایکم)ی زۆر پێ خۆشبوو، ئەیدووان بۆ ئەوەی رووداوێکی خۆشی بۆ باسبکات. کاکە شەهاب، زۆر رێزی لێدەگرتم، بە دارۆی وتبوو "نەکەی رۆژێ لە رۆژان دڵی نەرمین زویر بکەی".

ئیتر دوای ئەوە جارێکی تر لە پێنجوێن لە ساڵی ١٩٧٤ چووم و سەرملێدان کاتێ کە پێشمەرگەبوون لەوێ. دواتریش لە گرتووخانەی فزەیلیە و گرتووخانەی ئەبوغرێب.

دارۆ شێخ نوری شێخ ساڵح شێخ غەنی، لە ٢٨ی ئەیلولی ١٩٤٦، لە شاری سلێمانی، لە گەڕەکی سەرگۆل، لە ماڵە خنجیلانەکەی فاتمە محێدینی پوری، لەسەر دەستی خاتوو فەلەک، چاوی بە دونیا هەڵهێناوە.

شێخ نوری باوکی، شاعیرێکی رۆشنبیر و منەوەری سەردەمەکەی بوو، کەسێکی بەئاگا و وشیار و خاوەن راوبۆچوونی تایبەتی خۆی بووە، نووسین و هۆنراوە و وتارە سیاسییەکانی لە رۆژنامەکانی (رۆژی کوردستان و بانگی کوردستان و ژیان)، شایەتحاڵی ئەو راستییەن. بیرکردنەوەی کوردستانیی بووە، رقی لە داگیرکەر و ئینگلیز بووە و بە هیچ شێوەیەک متمانەی پێیان نەبووە. بەدەر لە هۆنراوە و وێژە و سیاسەت، دەنگخۆش و هونەرمەندیش بووە، دووربووە لە رەوتی شێخایەتی، هەرچەندە خۆی بە رەچەڵەک و بنەماڵە شێخ بوون.

دارۆ، سەرەتای ژیانی لەو ژینگەیە دەستپێکردووە، لە ژینگەی سیاسەت و هۆنراوە و وێژە و هونەر گەشەی کردووە. جگە لە باوکی، بێخودی شاعیر و ئەدیبیش کە خاڵی باوکی بووە، ئەویش تاڕادەیەک کاریگەریی بەسەریانەوە هەبووە. جگە لە کاریگەریی پیاوانی بنەماڵەکەیان، دایکی (زەکیە محێدینە فەندی) و پورەکانی کە خوێندەوارییی لەو سەردەمەدا دەگمەن بووە، محێدینە فەندی کە بەڕێوەبەری گومرگ دەبێ لە شاری بەسرە، کچەکانی دەخاتە بەر خوێندنی خوێندنگایەکی تورکی و بە زمانی عەرەبی و تورکی دەخوێنن. فاتمە خانی پوری دارۆ، یەکەم بەڕێوەبەری خوێندنگای کچان بووە دوای زەهرە خانی مستەفا یامولکی و لەگەڵ ماڵی شێخ نوری بەیەکەوەبوون. هەروەها پورەکەی تری کە ناوی بەهیجە خان بوو، ئەویش هەر مامۆستا بوو کە لەو سەردەمەدا نەک مامۆستای ژن، بەڵکو ژنی خوێندەواریش زۆر دەگمەن بوو. بەگشتیی، ئەوانە راستەوخۆ جێ پەنجەکانیان لەسەر پەروەردە و رەوشت بەرزی و رۆح پاکی و هەست ناسکیی دارۆ جێهێشتبوو.

ژوورە تایبەتەکەی باوکی و مێز و کورسی و کتێب و پێنووس و دەفتەرەکانی لە ژووری سێدەری ماڵەکەیان، وێنایەکی جوانی لا دروستکردبوو. هەروەها ئامێزی گەرم و نازی زۆر و خۆشەویستیی بێسنووری خوشک و براکانی، هەستناسک و پڕوەفایان کردبوو. بە هەموویان نەیانهێشتبوو بێنازیی بێباوکی

پێوە دیاربێ، براگەورەکانی، شێخ جەناب و شەهید شەهاب و شێخ نیهاد، ڕۆڵی گەورە و باوکیان بۆ بینیبوو. خوشکەکانیشی (گەلاوێژ و پرشنگ) بە جوانیی ڕۆڵی دایکیان بۆ گێڕابوو. بە گەورە و پڕمتمانە سەیریاندەکرد، بۆیە هەر بە گەورەیی مایەوە.

لە سەرەتای منداڵییەوە چووەتە ناو کاری ڕێکخراوەیی و لە ساڵی ١٩٦٠، لەگەڵ برادەرەکانی کاک بەکر حسێن و فەرەیدون عەبدولقادر و چەند کەسێکی تر بە دەستنووس گۆڤاریان دەرکردووە، لەو گۆڤارانە؛ هاوار و ئاوات و دواتریش هەست. بەهۆی کاکە شەهابەوە هەر زوو دەچێتە نێو کایەی سیاسی.

لە تەمەنی (١٢) ساڵیدا باوکی (شێخ نوری شێخ ساڵح) کۆچی دوایی دەکات کە تەمەنێکی هەستیار بووە بۆ دارۆ و کاردانەوەی دەروونیی خراپی بەسەرەوە جێدەهێڵێ، بەڵام بەهۆی خوشک و براکانییەوە توانیویەتی بەسەر ئەو تەنگژەیەدا زاڵبێ.

دوای دەرچوونی لە ئامادەیی، دەچێتە زانکۆی بەغدا و لە کۆلێجی کشتوکاڵ وەردەگیرێ، هەر لەو ساڵەشەوە (١٩٦٧-١٩٧٠) دەبێتە ئەندامی سکرتاریەتی یەکێتی قوتابیانی کوردستان. دواتریش لە کۆنگرەی یەکێتیی لاوانی کوردستان هەڵدەبژێردرێت بۆ ئەندامی سکرتاریەت، بەڵام لە کۆنگرەی یەکگرتنەوەی هەردوو باڵی یەکێتیی لاوان هەڤاڵانی پارتی دیموکراتی کوردستان/ باڵی مەلایی ڕێگەیان لە خۆهەڵبژاردنەوەیان گرت بەبیانووی ئەوەی برای شەهابی شێخ نورین-ن. هەر لەو کۆنگرەشدا بڕیاریاندا پەیوەندی بە هێزی پێشمەرگەی کوردستانەوە بکەن.

لە هاوینی ساڵی ١٩٧٠دا یەکێتیی قوتابیانی سەر بە باڵی مەکتەبی سیاسی لە شاری بەغدا کۆنفرانسێکیان سازکرد بەمەبەستی خۆئامادەکردن بۆ یەکگرتنەوەی هەردوو باڵی یەکێتییەکە، کۆنفرانسەکە سێ ڕۆژی خایاند و ئەم کەسانە وەکو ئەندامی سکرتاریەت هەڵبژێردران "بەکر حسێن، دارۆی شێخ نوری، شاسوار جەلال، سالار عەزیز، عەزیز مەحمود، ئازاد نەجمەدین و فازیل تەیب و چەند هاوڕێیەکی دیکەش"، دواتریش ئەم ئەندامانەی سکرتاریەت بەمەبەستی یەکگرتنەوەی هەردوو باڵەکە پەیوەندییان بە باڵی مەلایی یەکێتی قوتابیانەوە کرد. لە سەرەتای دروستبوونی کۆمەڵە، ئەندامێکی کارای گرووپی

ماركسی لینینی بوو، ئەتوانم بڵێم لە دەستەی دامەزرێنەری کۆمەڵە بوو، بەڵام کاکە شەهاب دەیوت "نابێ دوو برا لە پۆستی بەرپرسیارێتیدا بن". لە ساڵی (١٩٧٠)وە بوو بە خاوەنی کتێبخانەی بیری نوێ و لەگەڵ شەهید شەهاب سەرپەرشتییان دەکرد، لەڕووی داراییشەوە مام جەلال و خۆیان بەڕێوەیاندەبرد (لە بەشێکی پێشتری ئەم کتێبەکەدا بە وردی باسمکردووە).

لە ساڵی ١٩٧١ بڕوانامەی ئەندازیاری کشتوکاڵی بەدەستهێنا و سەرەتا لە شاری حیللە دامەزرا، دوای چەند مانگێک راژەکەی گواستەوە بۆ شاری بەغدا کە مەبەست لێی چاودێریی کتێبخانەکە و راپەڕاندنی کاروباری رێکخستنەکانی کۆمەڵە بوو.

لە ٦ی تشرینی دووەمی١٩٧٢ هاوسەرگیریمان کرد، ماڵمان نەبوو، من لە سلێمانی بووم و دارۆش بەهۆی کۆمەڵەوە لە بەغدا بوو. لە ناوەڕاستی ساڵی ١٩٧٣ دارۆ وەکو نوێنەری یەکێتیی لاوانی کوردستان بەشداری لە کۆنگرەی لاوانی سۆسیال دیموکراتی جیهانی لە ئەڵمانیای رۆژهەلات کرد. لە تەمووزی ١٩٧٣، ماڵمان دروستکرد و خۆی گواستەوە بۆ سلێمانی، لە ئایاری ١٩٧٤ بوو بە پێشمەرگە و دوای ئاشبەتاڵ و تێکچوونی شۆڕش گەڕایەوە. ئەوەندەی پێنەچوو و لە ئابی ١٩٧٥، لە کارگەی جگەرەی سلێمانی لەلایەن رژێمی بەعسی فاشییەوە دەستگیرکرا و شەش ساڵ حکوم درا. لەوکاتەی کە لە زیندان بوو، جگە لە بەندکردنەکەی دەیان خەمی گەورەی تووشبوو، شەهیدکردنی کاکە شەهاب و شەهیدکردنی ئامۆزا و هاوڕێی نزیکی (شەهید ئارام) و مام و ئامۆزای و دەیان خەمی تر وایلێکردبوو رۆژ بەڕۆژ تاڵەکانی سەری سپی دەبوو، کاتێ لە ١٩٧٩ لەگەڵ هەڤاڵەکانی بە لێبووردنی گشتیی ئازادکرا، نیوە زیاتری قژی سپی بووبوو. لە تشرینی دووەمی ١٩٧٩، بەیەکەوە پەیوەندیمانکرد بە هێزی پێشمەرگەوە، لە ئابی ١٩٨٠، بوو بە نوێنەری یەکێتی لە پەیوەندییەکانی دەرەوە لە سوریا.

لە ساڵی ١٩٩٢، بوو بە ئەندامی یەدەگی سەرکردایەتی و دواتریش بە سەرکردایەتی و ئەندامی مەکتەبی سیاسی. لە ساڵی ١٩٩٣، بوو بە وەزیری دارایی لە کابینەی دووەم بە سەرۆکایەتی کۆسرەت رەسوڵ و لەدوای ٣١ی ئاب و گەڕانەوە بۆ سلێمانی، یەکێک بوو لەوانەی بە هەوڵێکی زۆر توانییان

حکومەت دابمەزرێنینەوە و بووەوە بە وەزیری دارایی، لە ساڵی ١٩٩٨، بۆ ماوەی دوو ساڵ جێگری سەرۆک وەزیران بوو لە کابینەی کاک کۆسرەت.

لە ساڵی ١٩٩٣، لە هەولێر، مافی دەرکردنی گۆڤاری (ڕوانگەی جیهان)ی بەدەستهێنا کە خۆی وەک سەرنووسەر و فەرید ئەسەسەرد وەک جێگری سەرنووسەر ئەرکی دەرکردنی گۆڤارەکەیان لەئەستۆدابوو، کەسێکی ورد و دووربین بوو، زۆربەی کارەکانی ستراتیژیی بوون، بڕوای بە خەرجکردنی پارە بە بێهودە و بێسوود نەبوو، هەربۆیە زۆرجار برادەرەکانی ڕەخنەیان لێدەگرت و پێیاندەوت؛ ڕەزیلە، بەڵام وەک کەسایەتیی خۆی هەرگیز ڕەزیلیی نەدەکرد، دەستودڵێکی فراوان و باشی هەبوو. هاوڕێمان بوو لە ماڵەوە، زۆر نوکتەئامێز و قسەخۆش بوو، لەجێگای خۆی قسەی خۆشی بۆ دەهات. خەمی کەسوکار و هاوڕێکانی بە کوڵ هەڵدەگرت، هەرگیز ڕۆژێک لێم نەبیست لۆمە یان تۆمەتێک بخاتە سەر کەسێک. خاوەنی سەدان پڕۆژەی جوانە کە ناکرێ لێرە باس لەو هەموو پڕۆژانەی بکەم، زۆر ئیداریی بوو، لەو کەسانە نەبوو بڵێ ناتوانم یان نایزانم یان ناکرێ. ڕەنگە بڵێن هاوسەرێتی، بۆیە ئەوەندە پێیدا هەڵدەدات، بەڵام زۆر لەوە زیاتر دەهێنێ و واهەستدەکەم لە باسکردنیدا زوڵمم لێکردووە. هونەرمەند و هونەردۆست بوو، دەستی وێنەکێشانی هەبوو، ئارەزووی وێنەکێشان و وێنەگرتن بوو لە ماڵەوە، لە سەرەتای دروستکردنی ماڵەکەمان، ئامێری شووشتنەوەی فیلمی کڕی و خۆی بەشێوەی هونەریی فیلمەکانی دەشوشتەوە. هزرێکی بازرگانی و کشتوکاڵیی هەبوو، خەونەکانی زۆربوون. لەکۆتاییدا ئەوەندە ئەڵێم کەم ژیا و کەڵ ژیا و لەنێو خەم ژیا، یەک بەدوای یەک مەرگی برا و کەسە نزیکەکانی بینی.

بەهۆی سیاسەت و دەربەدەری و بەندکردنەوە، کەم بەیەکەوە ژیاین، بەڵام ئەتوانم بڵێم هاوسەرێکی کەموێنە بوو.

### چۆن دارۆم ناسی؟

لە ساڵی ١٩٦٩ کاتێ خوێندکاربووم لە زانکۆی بەغدا، خۆمان ئامادە دەکرد بۆ ئاهەنگی نەورۆز، کوڕ و کچە خوێندکارەکانی سەر بە باڵی مەکتەبی سیاسیی، تیپێکمان هەبوو بۆ هەڵپەڕکێ، مامۆستا قادر مەشقی پێدەکردین،

دەیان جۆر هەڵپەڕکێی جیاجیای فێرکردبووین و من سەرچۆپیی هەڵپەڕکێکانم دەگرت.

هەروەها لەگەڵ خالید دلێر وەک کۆرس مەشقمان دەکرد بۆ وتنی سروودی نەورۆز:

سالێکی تریش واهاتەوە
ڕۆژی نەورۆزی کورد هەلاتەوە...
هەروەها سروودی پێشمەرگە:
پێشمەرگەی بەهەڵمەتین
پاڵەوانی میللەتین...

لە دوورەوە کوڕێکی خەپان زۆر سەیری دەکردم، یەکێک بوو لە سەرپەرشتیارانی ئاهەنگەکە. دوایی زانیم ئەندامی سکرتاریەتی یەکێتی قوتابیانی کوردستان بوو، مەشقکردنەکە لە هۆڵەکانی (هۆلی خولد) بوو لە بەغدا، لە هەرکوێ بوومایە دەمبینی و بە وردیی سەیری هەڵسوکەوت و هاتووچۆی دەکردم، منیش لە کچێکی هاوڕێم (چیمەن عەباس ساحێبقڕان)م پرسی کە خەڵکی سلێمانی بوو، وتم "ئەو کوڕە کێیە؟". ئەویش ورد و درشتی زانیاریی دامێ کە کوڕی کێیە و لەکوێ دەخوێنێ.

هێشتا ئاهەنگ دەستپێنەکردبوو، دارۆ هات بۆلام، وتی "حەزدەکەم کاتێکم بدەیتێ هەندێ قسەت لەگەڵ بکەم". کە یەکمان بینی هەستی خۆی بۆ دەربڕیم. سەرەتا وەڵامم نەدایەوە و وتم "جارێ کاتی نییە". ئەویش وەک کەسێکی ڕۆشنبیر وتی "کات بۆ تۆ و باش بیری لێبکەرەوە". دوای ئاهەنگەکە لەگەڵ شەهید فازیلی مەلا مەحمود هاتن بۆ زانکۆ و هاتنە بەشەکەی ئێمە (بەشی ماتماتیک) و کەوتینە وتووێژی سیاسی و هیچی تر باسنەکرا، بەڵام هەستمکرد بۆ بینینی من هاتبوو. دووەمجار لەگەڵ شەهید ئارام هات و دوای تۆزێ شەهید ئارام وتی "دارۆ ئامۆزامە، حەزدەکەم گوێی بۆ بگری". (ئەوسا شەهید ئارامم دەناسی) ئیتر شەهید ئارام بەجێیهێشتین، دیسان پرسیی؛ وەڵامت چی بوو؟ پێموت "پرسیاری زۆرم لەسەر کردوویت، هەرچی بینیوومە مەدحی کردوی،

بەڵام من دوو مەرجم هەیە، یەکەمیان؛ من هیچ شتێک لە کەسوکاری خۆم ناشارمەوە بەتایبەتی خاڵم (شەهید جەعفەر) و پێیاندەڵێم. دووەم مەرجیشم؛ هەستناکەی تۆزێ قەڵەوی، حەزدەکەم خۆت لاواز بکەی هەرچەندە ئەوەش دەکەوێتە سەرخۆت". وتی "باشە".

منیش بە شەهید جەعفەرم وت، ئەوکات ئەویش لە زانکۆی موستەنسریە لە بەشی زمانی ئینگلیزی دەیخوێند. کە پێموت، سەیرمکرد پێی ناخۆشە هەرچەندە لە زۆر بواردا ئازادیی زۆرم هەبوو، بەڵام دیاربوو لای قورس بوو، یەکسەر وتی "تۆ جارێ منداڵی، راستی و دروستیی خۆت باش نازانی و با لە زانکۆ دەربچی، ئەگەر ئەو کورە نیەتی باشبێ ئەوا ئەوەستێ". منیش ئەوەم بە دارو وتەوە، وتی "باشە من خەڵک دەنێرم بۆ لای کاک خالید دلێر بۆ ئەوەی نیەت باشیێ منیان بۆ دەرکەوێ". ئەوسا ئەویشماڵیان لە بەغدا بوو و ئەندامی مەکتەبی سیاسیی باڵی مەکتەبی سیاسی بوو. بۆ ئەو مەبەستە دکتۆر کەمال خۆشناوی ناردبوو کە زۆر هاورێی خاڵم بوو، خاڵیشم وتبووی "با ئەو داواکارییە دوابخات تا دوای دەرچوونیان لە زانکۆ، هەردووکیان جارێ خوێندکارن". ئەو ماوەیە لەژێر فشارێکی زۆردا بووم، رۆژانە شەهید جەعفەر دەهاتە لام و دەیپرسی؛ دارۆم بینی یان نا؟ لەراستیدا منیش بەڵێنم دابوو کە درۆیان لەگەڵ نەکەم، بۆیە راستییەکانم پێدەوت و دەشمویست رایانبێنم.

بۆ مەرجی دووەمیشم، ساڵی دواتر کە گەراینەوە بۆ بەغدا و هەردووکمان پۆلی سێی کۆلیج بووین، هات بۆ لام و لەدوورەوە نەمناسییەوە ئەوەندە خۆی لاوازکردبوو، لەو هاوینەدا (٢٥) کیلۆ کێشی خۆی دابەزاندبوو، ئیتر بۆمدەرکەوت کە منی زۆر خۆشدەوێ و بریارمدا ئیتر گوێنەدەمە ئەو هەموو فشارەی خاڵم. لە هاویندا خاڵم (خالید دلێر) بە باوکمی وتبوو، باوکیشم وەک باوکێکی رۆشنبیر کە هەرگیز ئەو هەڵوێستەیم بیرناچێتەوە، وتبووی "دیارە ئەو کورە ئەوەندە دەهێنێ نەرمین بریاری وابدا، چونکە من باوەرم بە نەرمین هەیە". ئەو هەڵوێستەی باوکم تۆزێ فشاری خاڵەکانمی کەمکردبووەوە. کە هەردووکمان لە زانکۆ دەرچووین، ئەمجارەیان لە رێگای مام جەلالەوە کاک عومەر دەبابە و شەهید شەهاب و شێخ جەناب و شێخ نیهاد و ئامۆزاکانی (ماڵی شەهید ئارام) بەیەکەوە هاتنە هەولێر و داواکەیان تازەکردەوە. باوکم

ڕەزامەندیی دەربڕی و ئیتر ڕۆژی دواتر قازییان هێنا و مارەکردن ئەنجامدرا و لە حەوشەی ماڵی باوکم شەوەکەی کردیان بە ئاهەنگ، مامۆستا تایەر تۆفیق لەگەڵ خاڵەکانم کردیان بە ئاهەنگ. ئێمە وەک دوو کەسی کۆمەڵەی مارکسی لینینی، باوەڕمان بە ئاهەنگی گەورە نەبوو، باوکم و دایکیشم ڕێزیان لە بۆچوونەکەی ئێمە گرت. گەورەیی باوکم لەوەدا بوو کاتێ پرسیبوویان بۆ نیشانەکردن چیتان دەوێ، باوکم وتبووی "من کچم نافرۆشم ئەگەر بیفرۆشم بە گەنجینەی دونیای نادەم، بۆیە تەنیا کچەکەم بەختەوەر بکات ئەمە داواکاریی منە و هیچی تر".

لە ٦ی تشرینی دووەمی ١٩٧٢، هاوسەرگیریمان کرد. ئەوسا هەردووکمان دامەزرابووین من لە سلێمانی بووم، دارۆش لە بەغدا، هەردووکمان چووینە ماڵی باوکم لە هەولێر و لەوێوە چووین بۆ بەغدا. بەهۆی دەروێشیمان بۆ کۆمەڵە، نە ئاهەنگمان گێڕا و نە جلی بووکێنیم لەبەرکرد، پێمان شەرم بوو ئەو کولتوورە بۆرژوایانە ئەنجامبدەین. سەرەتا ماڵیشمان نەبوو، یەکەم ماڵمان لە ئابی ١٩٧٣ لە سلێمانی دامەزراند و لە ئازاری ١٩٧٤ بەهۆی پێشمەرگایەتییەوە تێکچوو، تەنیا هەشت مانگ ماڵمان هەبوو.

پیاوێکی هەست ناسک و ڕۆحشیرین بوو، ناوبەناو هۆنراوەی بۆ دەنووسیم و هەندێکجاریش هونراوەکانی نزار قەبانی بۆ دەنووسیم، نامەکانی پڕ لە هەستی ناسک بوون کاتێ کە دووربووینایە لە یەک.

بەهۆی بەندکردنی دارۆ و پێشمەرگایەتییەوە، زۆربەی کات لە یەک دوو بووین و ژیانێکی ناجێگیرمان هەبوو، لەگەڵ ئەو هەموو دوورییەمان لەیەکتری، ڕۆژ بە ڕۆژ پەیوەندیمان پتەوتر دەبوو، چونکە خۆم لەسەر هەمان ڕێباز بووم، بەو هەموو نەهامەتییەوە، بیرم نییە ڕۆژێک بۆڵەیەکم کردبێ، ئەویش زۆر ڕێزی منی لابوو. خۆشەویستییەکەمان لەسەر بنەمای ڕێز و ئازادیی دامەزرابوو، بۆیە ڕۆژ بە ڕۆژ پەیوەندییمان پتەوتر دەبوو.

### ساتەوەختی گرتنی دارۆ

پاش ئەوەی حکومەتی فاشستی بەعس بڕیاری گرتنی بەشێک لە هاوڕێیانی کۆمەڵەی مارکسی لینینی دەرکرد، بەهۆی ئاشکرابوونی ناوی هەندێکیان

(شەهید شەهاب، شەهید جەعفەر، فەرەیدون عەبدولقادر، عومەری سەید عەلی، عەلی بچکۆل) توانییان دەربچن و بەرەو ئێران رۆیشتن، دوای مانگێکیش (ئەرسەلان بایز و ئاوات عەبدولغەفور) دوابەدوای ئەوان بەرەو ئێران رۆیشتن. ئەوکات من لە هەولێر بووم، داوای گواستنەوەی راژەکەم کردبوو بۆ سلێمانی. دوای هەرەسی شۆرشی ئەیلول، دارۆ گەڕابووەوە لە پێشمەرگایەتی و لە کارگەی جگەرەی سلێمانی وەک توێژەر کاریدەکرد (توێژینەوەی لەسەر توتنی ڤێرجینی دەکرد).

بڕیاری گواستنەوەی راژەکەم دەرچووبوو، خەریکی ماڵ کۆکردنەوە بووم. باوکم هاتە ماڵەوە، بەهێمنیی لامەوە دانیشت و تۆزێ رەنگ و دەنگی وەک خۆی نەبوو، منیش پرسیم: خێرە؟ کەوتە یارمەتیدانم بۆ کۆکردنەوەی کەلوپەلەکان و لەمیانەی قسەکانیدا وتی "لە سلێمانییەوە تەلەفۆنیان بۆ کردووم، ئەڵێن دارۆش تووشی نەخۆشییەکەی کاکە شەهاب بووە، پێم باشە بچین بۆ سلێمانی بابزانین چی هەیە". لە قسەکانی باوکم واتێگەیشتم کە دارۆش رۆیشتووە، ئێوارەوەخت گەیشتینە سلێمانی، لەوێ و لە ماڵی شێخ حەسیب تێگەیشتم کە دارۆ دەرنەچووە، بەڵکو گیراوە، ئاسایش و سیخوڕەکانی بەعس چوونەتە کارگە و گرتوویانە. ئێستا گێڕانەوەی ئەو بەسەرهاتانە ئاسانە، بەڵام ئەوکات راچڵەکینێکی زۆر قورس و ئەستەم بوو. وەک کادیرێکی کۆمەڵە، دەبوایە خۆڕاگر و بەهێز خۆم دەرخەم، بەڵام لەناخەوە هەستمدەکرد هەموو دەرگاکانم بەسەردا داخراون. لەلایەکەوە کادیرەکانمان یەک لەدوای یەک یان دەڕۆن یان دەگیرێن، هەندێکیشیان خۆیان لە ناوشار شاردبووەوە و نەمدەزانی نۆبەی منیش دێت. لەگەڵ ئەو هەموو دڵەڕاوکێ و سەرلێشێوانەشدا، دەبوایە بەهێز دەربکەوم.

بەبیرمدا هات پەیوەندیی بە کاک شازاد صائیبەوە بکەم، ئەو کەسێکی وریا و خاوەن ئەزموونێکی باش بوو، دۆستی زۆری لە سلێمانی هەبوو و هاوڕێی نزیکی من و دارۆش بوو، من و کاک شازاد ماوەیەک لە یەک شانەی کۆمەڵەبووین. بۆ ئەوەی لە نزیکەوە بزانم چی دەگوزەرێ، داوام لە کاک شازاد کرد هەرچۆنێکبێ چاوپێکەوتنێکم لەگەڵ دارۆ بۆ جێبەجێبکات. لە دوای دوو رۆژ کاک شازاد (یادی بەخێر) هەوڵەکەی سەریگرت و بەیەکەوە چووین

سەردانی دارۆمان کرد لە بەندیخانەی سلێمانی. کاتێ بینیمان، وتی "تائێستا تەنیا پرسیاری کتێبخانەی بیری نوێیاین لێکردووم".

(مكتبة الفكر الجديد) کتێبخانەیەکی کۆمەڵە بوو، مۆڵەتەکەی لەسەر ناوی دارۆ بوو و کتێبی مارکسی لینینی و ماو تسی تۆنگی دەفرۆشت و زۆربەی برادەران لەوێ چاویان بەیەک دەکەوت. وتیشی "لەوەدەچێ خاوەنی کتێبخانەکە سکاڵای کردبێ، هیچی تریان لێ نەپرسیووم، تۆش سەر لە خۆت تێکمەدە و وەرە لە سلێمانی دەستبەکاربە، رەنگە زوو بەرببم". دوای دوو رۆژ گواستیانەوە بۆ بەغدا بۆ (ئەمنی عامە) ئاسایشی گشتی بەشی دوو، ئیتر زانیمان دارۆش بەهۆی کۆمەڵەوە گیراوە.

لە ٢٨ی ئەیلولی ١٩٧٥ بەهۆی کاک رەفیق پشدەرییەوە توانیم خۆم بگەیەنمە دارۆ لە ئەمنی عامە و ئیتر بەتەواوی تێگەیشتم لە هۆکاری گرتنەکەی و تێیگەیاندم کە لەژێر ئەشکەنجەدایە، بە هەر جۆرێک بوو قاچی پیشاندام، هەمووی ئاسەواری ئەشکەنجە و لێدانبوو. لەو دانیشتنەدا دەبوایە بە عەرەبی و لەبەرچاوی بەرێوەبەری زیندانەکە بدوێین.

دواتر لە گرتووخانەی فزەیلیە بۆی باسکردم، وتی "لەو شوێنەی تۆ سەردانتکردم، بە زنجیرێک بەستبوومیانەوە بە قەراخی پێپلیکانەکەوە، هەرکەس سەرکەوتایە یان دابەزیایە شەقێکیان لێئەدام و بەردەوامیش شریتێکیان بۆ لێئەدام کە گریانی منداڵێک و هاواری ژنێک بوو، بۆ شووشتنەوەی مێشک. هەستمکرد دەستم دەلەرزێ، ترسام لەوەی کاریکردبێتە سەرم و توند دەستی خۆمم گەست تا خوێنی لیهات". ئاسەوارەکەی تا چەند ساڵێکیش مابوو، ئەمانە و چەندین جۆری تری ئەشکەنجەدانیان لەگەڵ تاقیکردبووەوە.

کە کاکە شەهاب و خالە جەعفەریان بردە بەندیخانەی بەغدا، جارێکی تر هەر لە رێگای کاک رەفیق پشدەرییەوە توانیم دارۆ ببینم و تێگەیشتم کە ئەوانیش گەیشتوونەتە لایان. دوای ماوەیەک هەموو برادەران گوێزرانەوە بۆ بەندیخانەی فزەیلیە و لەوێ ئەمانتوانی بە ئاشکرا بیانبینین، تا کاتی دەرچوونی بڕیاری دادگا، وەک (تسفيرات) گواستنەوە لەوێبوون.

لە ١١ی تەمووزی ١٩٧٦ لەلایەن دادگایەکی رووکەشەوە حوکمەکەیان دەرچوو، دوای ئەوە گوێزرانەوە بۆ بەندیخانەی ئەبوغرێب. سەرەتا بەمەبەستی

ئامادەکردنیان بۆ دابەشکردن، لەگەڵ زیندانییەکانی تر تێکەڵبوون لە هۆڵی پێشوازی، بەڵام لەدواییدا هەموو سزادراوە سیاسییەکانیان بە تەنیا لە هۆڵێک دانا و برادەران کەوتنەوە لای یەک و دارۆ لەگەڵ کەمال عەلی لە یەک ژووری ناو هۆڵەکە بوون.

(٢٣) کەس بوون، سێ کەسیان (شەهید شەهاب، شەهید جەعفەر، شەهید ئەنوەر) بڕیاری سێدارەیان بۆ دەرچووبوو، ئەوانەی تریش بە شەش ساڵ زیندانیی حوکمدرابوون کە ئەمانە بوون: دارۆ شێخ نوری، فەرەیدون عەبدولقادر، ئەرسەلان بایز، عەلی محەمەد قادر (عەلی بچکۆل)، عومەری سەید عەلی، ئاوات عەبدولغەفور، جەبار فەرمان، سەعدون یەدوڵڵا شەفی (سەعدون فەیلی)، فاروق ئەحمەد، عوسمان ئەحمەد نەسروڵلا (عوسمانی نانەوا)، محەمەدی میرزا سەعید، سەلام محەمەد برزۆ، ئەنوەر حەسەن، ئاسۆ شێخ نوری، حاکم ئیبراهیم حەسەن، محەمەدی میرزا سەعید (کاکە حەمە)، عەلی حەمە مراد (وەستا عەلی)، عەبدوڵلا رەشید، حسێن رەزا، خزر عەبدولڕەحمان (دارۆ ناوینابوو سەوزە) و کەمال عەلی.

لە ١٨ی ئابی ١٩٧٩ ئەو برادەرانە بە لێبوردنی گشتیی ئازادکران، ئەو چوار ساڵەی کە لە زیندان بوون، مانگی جارێک یان دووجار سەردانی زیندانم دەکرد و هەموو جارێک دەبوایە مۆڵەتی رۆژێک یان دوو رۆژ لە خوێندنگاکەم وەربگرم. ئەوکاتەی لە سلێمانی بووم بەڕێوەبەرەکەمان مامۆستا کوزیدە قەفتان بوو، ئەم مامۆستایانە لەکاتی سەردانەکانم لەجێگای من دەچوونە وانەکانم: (کافیە سلیمان، ئەختەری قازی، هەتاو، ئەختەر نەجمەدین). ئەوکاتەی لە هەولێریش بووم. بەڕێوەبەرەکەم (مامۆستا شەرقیە) و مامۆستاکان زۆر باشبوون و هاوکارم بوون و نەک رێگەیان لێنەدەگرتم، بەڵکو لەجیاتی من دەچوونە وانەکەم بۆ ئەوەی کەس هەستنەکات.

هەموو جارێک کە دەچووین، خواردن و جگەرە و جلوبەرگ و پێداویستیمان لەگەڵ خۆمان دەبرد، زۆربەیجار لەگەڵ هەندێ خێزانی زیندانییەکان بەیەکەوە دەڕۆیشتین، جاری واش هەبوو بە تەنیا من و هاوڕێی کورم بووین، هەندێکجار لای خزمان دائەبەزین و زۆربەیجاریش لە ئوتێل دەماینەوە. رۆژی چاوپێکەوتن

له گەراجی (عەلاوی الحله) بە نەفەرات دەڕۆیشتین بەرەو ئەبوغریب، ماوەیەک لەبەر دەرگای زیندان دەماینەوە تاوەکو دەرگا دەکرایەوە و پاش پشکنین ڕێگایان پێئەدایـن بچینە ژوورەوە. زۆربەیجار لەگەڵ خێزانی شەهید جەمیل (سوعاد خان) یان پاکیزەخانی خێزانی کاک فەرەیدون عەبدولقادر دەبووین و لەو ژنانەی کە پەیوەندیی زۆرم لەگەڵدا پەیداکردبوو و وەک دایکێک بۆ هەمووما وابوو، دایکی کاک سەعدون فەیلی بوو. بە سەدان ژن و پیاو بەیەکەوە لەبەر ئەو دەرگایە دەماینەوە، کەسوکاری من و دارۆ زۆربەیجار دەهاتن بەتایبەت ئەو ماوەیەی شێخ نیهادی برای ماڵەکەیان لە فەلوجە بوو. هەروەها کاک روشدی عەزیزی ئامۆزای دارۆ و کاک ئەکرەم کە خێزانەکەی ئامۆزای بوو، ماڵیان لە بەغدا بوو. شەهید ئازادی برام لە شاری عەفەکەوە دەهات و دەیان برادەر و خزم و کەس، لە ڕۆژی چاوپێکەوتن لە دەوریان کۆدەبووینەوە، زۆربەی برادەرەکانی چەند جارێک سەردانیان دەکرد، خزمانیش بەردەوام لە سلێمانی و هەولێرەوە دەچوون بۆ لایان.

### هاوڕێ

### لە سەروەختی زیندانیی باوکیدا

لە یەکێک لە سەردانەکانمان بۆ دیدەنی زیندانییەکان، دەرمانمان پێبوو بۆ دارۆ، لە خاڵی پشکنینەکە لێیان وەرگرتین بۆ پشکنین و نەیاندایەوە. کە دەرچووین، پۆلیسەکان دایانەوە دەستمان و وتیان "با کوڕەکەت بیباتە ژوورەوە، تۆ بۆت نییە بچی" هاوڕێ ڕۆیشت و زۆری نەخایاند بە ڕاکردن گەڕایەوە بۆ لام و بە قوڵپی گریانەوە خۆی فڕێدایە باوەشم، بەپەرۆشبووم بزانم چی بووە، بەدەم گریان و چاوی پڕ لە نائومێدی و بە دەنگێکی منداڵانەی پاک و ستەملێکراو کە کەمجار مرۆڤ بەرگەی ئازارەکەی دەگرێ، وتی "باوکم گوناح بوو لە مەڕ دەچوو، نەچووم بۆلای"، دەرمانەکەی بەدەستەوە بوو.

دوای هەموو سەردانێک زیندانییەکانیان بە دانیشتنەوە سەرژمێر دەکردەوە، ئێمەشیان لە دەرەوە دەهێشتەوە، ئەگەر تەواوبوونایە ئێمەشیان بەڕێدەکرد. هاوڕێ، بە ڕوانینی منداڵیی خۆی، هەستی بە لاوازی و بێدەسەڵاتیی باوکی کردبوو، ئەوەی بینیبووی بە شایستەی باوکی نەدەزانی.

له یەکێک لە سەردانەکانی ترماندا بۆ ئەبوغرێب، تووشی ڕووداوێکی بێ مەبەست بووم. کاتێ سەردانمان بۆ لای زیندانییەکان، خواردن و جگەرە و جلوبەرگ و پێویستییەکانمان بۆ دەبردن، لەو سەردانەدا کێکم کردبوو، کاتێ لە ئوتێل بووین لە ڕۆژنامەیەکی (طریق الشعب)ی حیزبی شیوعیم پێچابوو کە ئەوسا ڕێگاپێدراو بوو، لە خاڵی پشکنینەکە ڕۆژنامەکەیان برد و ئێمەیان ڕاگرت و نەیانهێشت لەگەڵ خەڵکەکە بچینە سەردانیان، ڕاپێچیان کردین (من و هاوڕێ) بۆ لای بەڕێوەبەری ئاسایشی زیندان، دووربوو و لە دەرەوەی هۆڵەکان بوو، لەوێ ئێمەیان هێشتەوە بۆ لێکۆڵینەوە، سێ کەس هاتن و کەوتنە پرسیار، وایاندەزانی بە مەبەست ئەو کارەمکردووە، دیاربوو هاوڕێ هەم زۆر ئەترسا لەوەی ئێمەش بەندبکەن و هەمیش دەیزانی ناهێڵن دارۆ ببینین، زۆر دەگریا و بە قسەی خۆش بۆم ژێر نەدەکرایەوە، لەو حاڵەدا دەستم بەرزکردەوە بۆی و گریانەکەی وەستا، هەرگیز ئەوەی بەخۆیەوە نەبینیبوو کە من بۆ لێدان دەستی بۆ بەرزبکەمەوە. دوای بگرەوبەردەیەکی زۆر ئێمەیان ئازادکرد، بەڵام نەیانهێشت سەردانیان بکەین.

دارۆش لەناو زیندان لە ئێمە خراپتری بەسەرهاتبوو، چونکە پێیانوتبوو؛ ئێمەیان گلداوەتەوە. لە نزیکترین سەردان کە چووم، باسی ئازارەکانی خۆی بۆ کردم و نەیدەزانی چیمان بەسەرهاتووە، دەیان خەیاڵی ناخۆشی بۆ هاتبوو، بۆ کەسێکی زیندانیی ئەو ڕۆژانە، مردنێکە بۆ خۆی. منیش بەرانبەر بە هاوڕێ هەستم بە ئازار دەکرد بۆ ئەو حاڵەتە، یەکەمجار و دواجارم بوو، بەڵام هەرگیز لەدڵم دەرناچێ.

یەکێکی تر لە بیرەوەرییەکان، ڕۆژی لەدایکبوونی هاوڕێ، هەمان ڕۆژ و هەمان مانگە لەگەڵ دارۆ. لە ٢٨ی ئەیلولی ١٩٧٨، زۆربەی کەسوکار بەهۆی هاوڕێوە لە ماڵی ئێمە کۆبوونەوە، هاوڕێ باوکی زۆر خۆشدەویست و دەیوت "باوکمم لە دایکم خۆشتردەوێ". زۆرجار خەونی بە ئازادکردنی باوکییەوە دەبینی، ڕۆژێک سەیری فیلمێکی ڕوسیمان دەکرد، منداڵێک لەسەر گردێک دانیشتبوو چاوەڕێی باوکی بوو بە شەمەندەفەر بگەڕێتەوە کە لە زیندان ئازادکرابوو، وتی "دایە ئەوە بەڕاستی بەربووە یان وەک من خەوی بینیووە؟". دەمزانی دووریی باوکی چەند ئازاری ئەدا. لە ڕۆژی لەدایکبوونەکەیدا پاش

تۆزێ هاوڕێ دیارنەما و هەموومان بەدوایدا دەگەڕاین، لەکۆتاییدا دۆزیمانەوە و چووبووە سەربانی نهۆمی دووەمی ماڵی باوکم. لێمانپرسی؛ بۆ چوویتە ئەو بەرزاییە؟ وتی "لەسەر میزەلانەکەم نامەم بۆ خوا نارد، بۆم نووسی؛ ئەگەر تۆ هەی، بۆ باوکم لە زیندان بەرنادەی؟". فرمێسکەکانیشی بەسەر رووومەتەکانییەوە بوو، ئیتر هەموومانی هێنایە گریان.

پاشان خۆشم بڕیارمدا تۆزێ دووربیخەمەوە لە چەقی خەمەکان و سەردانی دوای ئەوە بۆ زیندان، بە بۆنەی ڕۆژی لەدایکبوونییەوە، دارۆ عەرەبانەیەکی کاوبۆییانەی عەسابەکانی تێکساسی لە هەویر بۆ دروستکردبوو، کارێکی زۆر هونەریی بوو. هەرچەندە ئەو ڕووداوە لەچاو ڕووداوەکانی تردا بچووکە، بەڵام جێگایەکی گەورەی لەبیرەوەرییەکانم داگیرکردووە. ئیتر هەر جارێک کە دەچووینە لای دارۆ، شکاتێکی لێدەکردم، جارێک دەیوت "دایکم لە ڕێگا برنج و فاسۆلیای بۆ نەکڕیوم". جارێک دەیوت "دایکم لە رقی من قژی بڕیووە". ئیتر شتێکی هەر ئەدۆزییەوە گلەییەک بکات و پیشانی بدا باوکی پشتی دەگرێ، بەڵام کە باوکی ئازادکرا، زۆری پێناخۆش بوو ئێمە لە ژوورێکین و لای پەسەندنەبوو، پێیوت "باوکە ژوورەکەی من زۆرخۆشە، بۆخۆت بڕۆ لەوێ بنوو!".

### هاوڕێ
### لە باخچەی ساوایان

دوای سێ ساڵ زیندانیی دارۆ، هاوڕێ تەمەنی باخچەی ساوایانی هاتبوو، ئێمەش لە هەولێر لە ماڵی باوکم دەژیاین. هاوڕێ ناسنامەی نەبوو، دەبوایە بۆی دەربکەم. بۆ ئەو مەبەستە دەبوو بڕیاری باوکیشی وەربگرن، بۆیە لە هەولێرەوە دادوەرێکم برد بۆ ئەبوغرێب، چووین بۆ زیندان و لەوێ دادوەرەکە ڕەزامەندیی دارۆیان وەرگرت و ناسنامەم بۆ دەرکرد. بردمە یەکێک لە باخچەکانی نزیک ماڵی خۆمان، بەڵام بە تاکسی دەمانارد. جارێک چاودێرێکی پەروەردەیی دەچێت بۆ سەردانیان، هەندێ منداڵ هەڵدەستێنێ و پرسیاریان لێدەکات، هاوڕێ یەکێک لەو منداڵانە دەبێ، لێی دەپرسن؛ ناوت چییە و کوڕی کێی و خەڵکی کوێی و باوکت چ کارەیە؟ ئەویش وەڵامی هەمووی ئەداتەوە و

دەڵێ "باوکم زیندانی سیاسییە و لە ئەبوغرێبە". چاودێرەکە دەڵێ "نابێ بڵێی باوکم زیندانی سیاسییە، بڵێ لێرە نییە". هاوڕێ دەڵێ "ئاخر نامەوێ درۆبکەم دوایی دایکم لێم زویر دەبێ". زۆری لێدەکەن هەر بە قسەیان ناکات. ئیتر نامەیەکیان دابووە دەستی، لەنامەکەدا داوای منیان کردبوو، منیش رۆژی دواتر چووم، وتیان "ئێمە نامانەوێ کوڕەکەت لێرەبێ، دەبێ بیگوێزیتەوە". هاوڕێ خۆی زۆر حەزی بە چوونە باخچەی ساوایان نەدەکرد، کە هاتینەوە وتی "خوایە من چیبکەم؟ خوا ئەو هەموو شەممەیەی دروستکردووە و تەنیا یەک هەینی، مامۆستاش دەڵێ درۆبکە، واباشترنییە لە ماڵەوەبم و پارەی تاکسیش نەدەین؟".

باوکیشم پێیوت "خەم مەخۆ من بۆتدەکەم بە دوو هەینی، ئیتر دووشەممان هەینی دووەمە، خوشم دەتگەیەنمە باخچە". ئیتر گواستمانەوە بۆ باخچەیەکی تر و هەموو رۆژ باوکم یان دایکم دەیانگەیاند.

# لەسێدارەدانی
# سێ قارەمانی کۆمەڵە

(کەم ژیان و کەڵ ژیان)

پاش ئاشکرابوونی رێکخستن و شانە نهێنییەکانی کۆمەڵە و رۆیشتنی (شەهابی شێخ نوری، مامۆستا جەعفەر عەبدولواحید، فەرەیدون عەبدولقادر، عەلی بچکۆل، عومەری سەید عەلی) دوای مانگێکیش (ئەرسەلان بایز و ئاوات عەبدولغەفور) بۆ ئێران، لەدیوی ئێران سیخورەکان هەواڵیان لێدەدەن و لەدێی (چەنپاراو) لەلایەن رژێمی شای ئێرانەوە دەستگیرکران و بران بۆ بەندیخانەی (سەقز) لە ئێران. پاشان بە رێککەوتن لەگەڵ رژێمی عیراق ئاڵوگۆڕیان لەگەڵ دە ئەفسەری ئێرانی پێکرا کە لەلایەن عیراقەوە گیرابوون.

لە ١ی کانوونی دووەمی ١٩٧٦، گەیەنرانە بەندیخانەی پێنجوێن و لەلایەن پاکیزە خانی خێزانی کاک فەرەیدونەوە ئەو هەواڵەمان پێگەیشت. دوای چەند رۆژێک هێنایاننە گرتووخانەی ئەمنی سلێمانی، لەوێیشەوە پاش دوو رۆژ بردیانن بۆ بەغدا و لە (ئەمنی عامە - بەشی دوو) خرانە ژێر ئەشکەنجەدانێکی زۆر. ئەوان نموونەی خۆراگریی بوون، کاکە شەهاب و شەهید جەعفەر زۆربەی بەرپرسیارێتییەکەیان خستبووە سەر شانی خۆیان بۆ ئەوەی سزای سەر برادەرەکانیان کەم بکەنەوە و خۆیان بکەنە قوربانیی هەڤاڵەکانیان و ببنە نموونە بۆ کادیری سەرکردایەتی. دوای گواستنەوەیان بۆ گرتووخانەی فزەیلیە، لە دادگاییەکی رووکەشدا بڕیاری لەسێدارەدان بۆ ئەو سێ قارەمانە (شەهاب شێخ نوری، جەعفەر عەبدولواحید، ئەنوەر زۆراب) درا و گواستیاننەوە بۆ ئەبوغرێب بۆ بەشی سزدراوانی لەسێدارەدان.

لە ١٩ی تشرینی دووەمی ١٩٧٦ ئەو هەواڵە دڵتەزێنەیان بە ئێمە راگەیاند کە لە ٢١ی تشرینی دووەمی ١٩٧٦ فەرمانی لەسێدارەدانەکەیان جێبەجێ دەکرێ. بەپێی یاسای عیراقی، دەکرا لە رۆژی لەسێدارەداندا زیندانییەکان ببینین، (هەرچەندە لەدوای ئەوە زۆربەیان بەبێ ئاگاداریی کەسوکار لەسێدارە دەدران) زۆربەی کەسوکار رووومانکردە بەغدا، من پێش ئەوان لە بەغدا بووم و لە ماڵی پورە زیبای خوشکی دایکم بووم. ئەو خزمانەی هاتبوون، دابەشبووبوون بەسەر ماڵی شێخ نیهاد (برای دارۆ) و کاک روشدی و کاک ئەکرەم (ئامۆزاکانی دارۆ) و ماڵی پورە زیبام. گێڕانەوەی ئەو ساتانە ئەستەمە و بە نووسین ناتوانری گوزارشتی لێبکرێت، هەستی رق بەرانبەر بە دوژمن و دواماڵئاوایی لە خۆشەویستان و شەهیدکردنیان بە دەستی

دوژمنێکی درندە، خوراگریی بۆ ئەوەی دڵی دوژمن خۆشنەکەین و مەترسیی ئاشکرابوونی خانە خامۆشەکان و بەرپەرچدانەوەی میللەت و هەزاران بیرکردنەوەی تر.

ساتەکانی ئەو دوو رۆژە، وەک دە ساڵ خەم و پەژارە قورس بوون، بۆیە ئەو وشانە لە فەرهەنگی کوردیدا نادۆزمەوە کە هەستەکانمی پێ دەربڕم. جگە لەوەی لەتاو حەسرەتی شاردنەوەی خەمەکان، قوڵێکم لەکارکەوت و تا مەچەکم شینبووەوە. چەند جارێک بورامەوە و لەهۆش خۆچووم، منیش بووم بە خەمێک بۆ کەسوکار و نەیانهێشت لەگەڵیان برۆم و لەماڵەوە جێیانهێشتم، خۆشم زۆر لام ئەستەمبوو بچم بۆ دوادیدار، بۆیە زۆرم نەکرد برۆم. لەوێ خاڵم پرسیبووی کوا نەرمین و گلەیی کردبوو، وتبووی "وامدەزانی نەرمین زۆر لەوە بەهێزترە". بەڵام مرۆڤ هەر مرۆڤە با سیاسییەکی بەهێزیش بێ.

ئەوەی کە بۆیان باسکردم و گێڕایانەوە لەو دوادیدارەی ئەو قارەمانانە، لە ئەفسانە و چیرۆکی پاڵەوانەکانیشدا کەم و دەگمەنن.

هەردوو دەستیان کەلەپچە کرابوو و جلی سپییان لەبەرکردبوون، خاڵم هەندێ پێشنیازی بۆ دایکم کردبوو، دواییش بە تورکی لەگەڵ خێزانەکەی قسەی کردبوو، پێیانوتبوو "بۆ بە تورکی قسەدەکەی؟". وتبووی "تورکییەکەم دەمەزەرد دەکەمەوە" کاکە شەهاب هەندێ وەسێتی بۆ نازە خانی خێزانی کردبوو، خاڵیشم وتبووی "کاکە شەهاب تۆ وەسێت بۆ منداڵەکان دەکەی منیش بیر لەوە دەکەمەوە قانعە لەدوای خۆم شوو بە کێ بکاتەوە، چەند دەکەم کەسێک نادۆزمەوە لە ئاست میهرەبانیی قانعەدا بێ"، بۆتە پێکەنین و قسەی خۆش و نوکتە گێڕانەوە و نەیانهێشتووە لە دوادیدار بچێ.

شەهید جەعفەر بە خاڵم (خالید دلێر)ی وتبوو "کاکە خەریکبوو ببم بە شاعیرێکی باش، بەڵام جەلادەکان و ئەو رژێمە بۆگەنە نەیانهێشت لەوە زیاتر بژیم و بەرهەمم زیاتربێ".

دوای ئەو دیدارە هەندێ برادەری زیندان داوای بینینیان دەکەن (کاک فەرەیدون عەبدولقادر، عومەری سەید عەلی، دارۆی شێخ نوری) لەوێ دارۆ زۆر بێتاقەت دەبێ و شەهید جەعفەر دەڵێ "ئەو دووانە، ژن و مێرد چیتانە؟ زۆر لەوە بە پاڵەوانترم دەزانین، یەکێکتان نایەت و تۆش بێتاقەتی و ورە

بەردەدەی". دارۆ لەوێ زانیبووی کە من نەچووبووم، بەڵام لەدواییدا بە قسەی خۆش و ڕێنماییکردنیان باشتر دەبن، پێیاندەڵێن: پشتی یەک بەرنەدەن.
خاڵم دەیەوێ بچێتە دەستشۆر و داوا لەو برادەرانە دەکات کە بەنی شەرواڵەکەی بۆ بکەنەوە و دەڵێ "با لە دواساتەکانی ژیاندا حەیام نەچێ"، و دەبێ بەپێکەنین. دوای ئەوەی ئەو برادەرانە دەڕۆن، دەیانبەن بەرەو پەتی سێدارە و بە سروودی:

ئازادی خواین کوردین ئێمە
شورای پۆڵا و بەردین ئێمە
زنجیری سەد بەندیخانە
یەک زەرە کارمان تێ ناکات
تەرکی ڕێگامان پێ ناکات
پشتی جوتیاری زەبوونین
ئاڵای بەرزی چوونیەک بوونین

بە هوتاف بەرەو پەتی سێدارە ڕێدەکەن، وەک ئاهەنگێکی لەسێدارەدان بە سەربڵندی و بە دروشمی؛ کەم ژیان و کەڵ ژیان دەڕۆن و لەوێش کاکە شەهاب دەڵێ "بە تەمەن لە هەمووتان گەورەترم و دەبێ پێش هەمووتان لەسێدارە بدرێم".
بە شاهیدیی جەلادەکان، ئەو بەتانە قارەمانی وایان نەدیبوو.
ڕۆژی دواتر تەرمەکانیان داینەوە، هەرسێکیانمان بەرەو کوردستان هێنایەوە، خاڵم (خالید دلێر) بریاری دا وتی "من ئۆتۆمبێلی تەرمەکەی جەعفەر لێدەخوڕم"، بۆ ورەی خەڵک بوو. پێش کەرکوک هەموویان دابەزین بۆ خواحافیزی لە تەرمەکەی شەهید ئەنوەر، بە هەلهەلە و سروودی ئەی شەهید بەڕێمانکرد و ئێمەش بەرەو کۆیە دەرچووین و تەرمی شەهید شەهابیش بەرەو سلێمانی. لەدوای کەرکوک سەیرمانکرد بە سەدان ئۆتۆمبێل لەمبەر و ئەوبەری ڕێگا وەستاون بۆ پێشوازی بە هوتاف و سروودەوە، ترس لای کەس نەمابوو، هەر دەڕۆیشتین و دەیان ئۆتۆمبێلی تر وەستابوون

و به هەزاران ئۆتۆمبێل لەگەڵ تەرمەکان دەڕۆیشتن. کە گەیشتینە ناو شاری کۆیە، لەمبەر و ئەوبەری شەقام بە هەزاران خەڵک وەستابوون و هوتافیان دەکێشا و گوڵباران دەکراین، لە هەموو لایەکەوە خەڵک هاتبوون، شار رەش دەچووەوە. کاتێک لە کۆیە تەرمەکەی شەهید جەعفەریان برد بۆ مزگەوت بۆ شۆردن، لەوێ بینیوویان کە هەردوو چاوە سەوزەکانیان دەرهێنابوو، ئەوەندەیتر خەڵک وروژان، بە هەلهەلە و هوتافی مردن و سەرشۆڕیی بۆ دوژمن و سەربەرزیی بۆ شەهیدان و سروودی ئەی شەهیدان، بەرەو گۆڕستانی قشڵە (کەکۆن) برديـان. ئێمەش وەک ژنانی رێکخستن، بە سروودی ئازادی خوا و ئەی شەهیدان بەشداربووین و زۆربەشمان گوڵێکی سوورمان لەبەرۆک دابوو. ئەم کەرنەڤاڵی شەهیدانە دواکەرنەڤاڵ بوو، ئیتر رژێم تەرمی شەهیدەکانی نەئەدایەوە، ئەگەر بیشیدایەوە قەدەغەی کردبوو تەنانەت پرسەش بگیرێ.

دوای دوو رۆژ هەندێکمان چووین بۆ سلێمانی بۆ پرسەکەی کاکە شەهاب و دواییش چووین بۆ کەرکوک بۆ ماڵی شەهید ئەنوەر. لە سلێمانیش بە هەمان گرۆتینی کەرنەڤاڵی شەهید جەعفەر، بۆ شەهید شەهابیش کرابوو. ئەوەی خەڵک لەو چەند رۆژە کردیان داستانی بەرگری و چاونەترسی بوو بەرانبەر بە دوژمن. کەم ژیان و کەڵ ژیان بوو بە دروشم و کوچە و کۆڵانی لێ پڕکرابوو. دروشمەکان دژی رژێم لەسەر دیوارەکان دەنووسران، بە شەو دەیاننووسی و بە رۆژ ئەمنەکانی رژێم دەیانکوژاندنەوە.

### ئازادبوونی دارۆ و هاوڕێیانی کۆمەڵە

لە ناوەڕاستی مانگی تەمووزی ١٩٧٩، سەدام حسێن و دارودەستەکەی، لەژێر فشار و هەڕەشە، فەرمانیان بە ئەحمەد حەسەن بەکری سەرۆک کۆماری ئەو سەردەمە کرد دەست لەکاربکێشێتەوە. نامەیەکی ئامادەکراویان خستبووە بەردەستی بۆ ئەوەی دەستلەکارکێشانەوەی خۆی واژوو بکات و بەیانێکشیان بۆ ئامادەکردبوو کە لەسەر تەلەفزیۆنی بەغدا هەر هەمان ئێوارە دەستلەکارکێشانەوەی خۆی بە هاوڵاتیانی عیراق رابگەیەنێت، ئەوەبوو کاژێر ٨ی ئێوارە دەستلەکارکێشانەوەی خۆی راگەیاند.

له ١٧ی تەممووزی ١٩٧٩ سەدام حسێن بەیانێکی دوورودرێژی لەسەر رادیۆ و تەلەفزیۆنی بەغدا خوێندەوە کە بەرنامەی حوکمڕانیی خۆی تێدا باسکردبوو، واتا کودەتایەکی سپی بوو. بەیانەکەی پڕبوو لە قسەی رازاوە و بەرنامەی جوان و قسەی زلی بێ ناوەڕۆک. ئیتر هەر ئەو رۆژە بە فەرمی بوو بە (سەرۆک کۆمار، سەرۆک وەزیران، سەرۆکی ئەنجومەنی بالای شۆڕش، بەرپرسی گشتیی هێزە چەکدارەکان، ئەمین سڕی قیادەی قطری). ئەو هەواڵە لێکەوتەی جیاواز و راوبۆچوونی جیاوازی بەدوای خۆیدا هێنابوو، هەرچەند پێشتریش ئەحمەد حەسەن بەکر کەسێکی کارتۆنی و لاواز بوو و هەموو دەسەلاتەکان لەژێر دەستی سەدام حسێن بوو.

یەکەم هەینی دوای ١٧ی تەمووز و دەستبەکاربوونی سەدام، سەردانی زیندانمان کرد و لەوێ دەنگۆی لێبوردنی گشتی هەبوو، هەرکەس بۆچوونی تایبەتی خۆی هەبوو. هەرچەند بە وەرگرتنی دەسەلات، یەکسەر کوشتوبڕێکی زۆری کرد و دژەکانی بەشێکی لەسەر کار لابردن و هەندێکیشی لەسێدارەدان، بەلام هەندێ بڕیاری جیاوازی دەکرد بۆ دەرخستنی نیەتپاکیی بەرانبەر بە هاولاتیان.

لەو بڕیارانە و بەپێی بڕیاری ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش (قرار مجلس قیادة الثورة) ژمارە (١٠٧٦)، لێبوردنی گشتی دەرکرد بۆ هەموو ئەو زیندانییانەی کە لە دادگای تایبەت و دادگای شۆڕش سزادرابوون، تەنانەت ئەوانەش کە سزای لەسێدارەدرانیان بەسەردا درابوو، ئازاد بکرێن. لە ١٦ی ئابی ١٩٧٩، ئەو بڕیارە بوو بە یاسای لێبوردنی گشتی و لە نۆ مادە پێکهاتبوو. دوابەدوای ئەو لێبوردنە، لێبوردنێکی تریشی بۆ ئەو سەرباز و مەدەنیانەی کە رایانکردبوو بۆ دەرەوەی عیراق دەرکرد.

دوو رۆژ پێش ئازادکردنیان، بەڕێوەبەری دیوانی سەرۆکایەتی کۆمار، زیندانییەکانی کۆکردبووەوە و وتبووی: بڕیاری ئازادکردنتان هەیە بە مەرجێ پاکانە بنووسن کە پەشیمانن. چل هاوڕێیی کۆمەلە لەنێو زیندانییەکاندا بوون و بڕیاریان دابوو کاری وا نەکەن، هەروەها هەندێ لە زیندانیانی شیعەکانیش. ئیتر هەر چل هاوڕێکەی کۆمەلە جیاکرابوونەوە و ئەوانی تریش کەوتبوونە هاواری خۆشی. ئەوانەی کە نامەی پەشیمانییان نووسیبوو، بۆ رۆژی دواتر جارێکی تر دیوانی سەرۆکایەتی گەڕابوونەوە لایان و پێیانوتبوون "بنووسن ئیتر سیاسەت

ناکەین". ئەوان ئەمەیان بە لاوە ئاسایی بوو، چونکە زۆربەیان تەمای پەیوەندییان بە هێزەکانی پێشمەرگەوە هەبوو.

پێش ئازادکردنیان لەناکاو لە مایکرۆفۆنەوە بانگی سەعدون فەیلی دەکەن. کە دەچێت، پێی دەڵێن؛ ناوت سەعدون یەدوڵلا (شەفی)یە یان (شەقی). ئەویش دەڵێ "شەفی". کاتێ دەگەڕێتەوە هەموو برادەران چاوەڕێدەکەن هەواڵێکی خۆشی پێبێ، بەڵام تەنیا گرەوێک بووە لەنێوان دوو ئەفسەر. ڕۆژی دواتر بڕیاری ئازادکردنیان دەرچوو. یەکێ(٥٠) دیناری سویسریشیان پێدابوون بەمەبەستی خەرجیی گەڕانەوەیان.

لە ١٦ی ئابی ١٩٧٩ کە دەکەوتە پێنجشەممە، کەسوکاری زیندانییەکان هەموومان لە بەرانبەر زیندانی ئەبوغرێب وەستابووین و لەدیوی شەقامی بەرانبەر بە زیندانەکە. بە پۆلیس بەردەمیان گرتبووین بۆ ئەوەی نزیک زیندانەکە نەبینەوە، لەبەردەم زیندانیش دەیان کۆستەر و ئۆتۆمبێل و لۆری ئامادەبوون بۆ گواستنەوەیان. دوای چاوەڕوانییەک کە لەو ساتانەدا کات ماڵی ڕمێ هەر ناڕوات، دەرگای زیندان کرایەوە و زیندانییەکانیان بە ئۆتۆمبێلەکان گواستەوە بۆ لای ئێمە، پێش هاتنە خوارەوە لە ئۆتۆمبێلەکان، هەلهەلە لێدان و هاواری خۆشیی ئاسمانی پڕکردبوو. دوای چەند ئۆتۆمبێلێک بینیمان دارۆ لە کۆستەرێک هاتە خوارەوە و چاوی بۆ ئێمە دەگێڕا، بانگمانکرد و ئێمەی بینی و گەیشتە لامان. بەتەمابوون بیانبەنە گۆڕەپانی تەحریر و لەوێ سەعدون شاکر قسەیان بۆ بکات، بەڵام زۆربەیان خۆیان دزییەوە و نەچوون. بینینی ئازای شێخ ڕەئوف (ئامۆزای دارۆ، کە هەر پێشماندەوت؛ ئازای ئامۆزا وەک نازناو) دڵخۆشتری کردین، چونکە هەواڵی گرتنیمان هەبوو، بەڵام نەماندەزانی چی بەسەرهاتووە و هەندێ هەواڵیش هەبوو کە لەژێر ئەشکەنجەدا نەمابێ، دارۆش هەر ئەو ڕۆژە بینیبووی.

ئازا، لە ٢٥ی ئایاری ١٩٧٩ لە گوندی گۆمەزەرد لە قەرەداغ، کادیری کۆمەڵە بوو، کاتێ خەریکی کاری ڕێکخستن بووە، سوپا و جاش گەمارۆی گوندەکەیان دابوو و دەستگیریان کردبوو. دادگا سزای لەسێدارەدانی بەسەردا دابوو، بەڵام بەهۆی بچووکیی تەمەنییەوە سزاکەی گۆڕیبوو بە بەندکردنی هەتاهەتایی. هەر لەو ڕۆژەی دەیبەنە ئەبوغرێب، لێبوردنی گشتیی دەردەچێ و برادەران پێیاندەوت "پێ و قەدەمی تۆ خێری پێوەبووە".

زۆرجار بە ئازامان دەوت تۆ لە زیادە ماوی. دووجار بریندار بووە، جارێک لە مەفرەزەی ناوشار لە ئایاری ١٩٧٨ فیشەک بەر لای راستی سنگی دەکەوێ و لە پشتی دەردەچێ، لە ناوشار حەشاردرابوو لە ماڵی مونیرە، نەزیرە حارس و دڵشاد مەریوانی رۆژانە دەچن بۆ چارەسەرکردنی. جارێکی تریش نارنجۆکێک بەر قاچی دەکەوێ و نینۆکە گەورەکەی تووشی گانگرین دەبێ و لە ئەڵمانیا چارەسەر دەکرێ.

ئاواتی شێخ جەنابیش (برازای دارۆ)، سزای لەسێدارەدانی بەسەردا درابوو و لە زیندانی موسڵ بوو. ئاوات، لە شانەدەری لەگەڵ براکانی شەهید سیروان بریندار دەبن و لەماڵێکدا خۆیان دەشارنەوە و تەنیا دوو دەمانچەیان پێدەبێ، سیخوڕەکانی رژێمی بەعس هەواڵیان لێئەدەن و هێزی سەربازیی رژێم پەلاماری ماڵەکە ئەدەن و ئەیانگرن. دوای ئەشکەنجەدانێکی زۆر، لە ئازایەتی و بوێریی ناو زیندان لەسەر رێبازەکەی کاکە شەهاب دەبن و سزای لەسێدارەدانیان بەسەردا ئەدەن.

ئاوات و ئازا، دوو پێشمەرگەی ئازا و ئەندامی کارای کۆمەڵەی رەنجدەران بوون لە سەرەتای لاوێتییان کە ئەتوانم بڵێم هێشتا هەر منداڵ بوون، هەموو تەمەنیان لەناو رێکخستن و پێشمەرگایەتی و زیندان و برینداریی بەڕێکرد.

دوای ئەوەی کە دارۆ و ئازا ئازادبوون، لە بەغدا چووینە ماڵی کاک ئەکرەم و نەسرین خانی ئامۆزا و پورزای دارۆ. جێی خۆیەتی ئاماژە بەوە بدەم؛ ئەو خانەوادەیە زۆر لەگەڵماندا هیلاکبوون ئەو ماوەیەی دارۆ لە زیندان بوو، هەموو سەردانێکی زیندان سەردانی دارۆیان دەکرد و دەچوونە ئەبوغرێب. زۆربەی جاریش کە من دەچووم بۆ ئەبوغرێب، لە ماڵی ئەوان ئەمامەوە و جار دوای جاریش زیاتر رێزیان لێدەگرتین. کاک ئەکرەم، ئەفسەری خانەنشین بوو، یەکێک بوو لەو ئەفسەرانەی کە سەرپەرشتیی پاسەوانەکانی عەبدولکەریم قاسمی سەرۆک کۆماری عیراقی دەکرد. دوای ئەوەی حیزبی بەعسی فاشی لە شوباتی ١٩٦٣ کودەتا خوێناوییەکەی ئەنجام دا، بە سەرپەرشتیی سەدام حسێن و نازم گەزار، ماکینەی مردنی لە (قصر النهاية) خستەکار و کەوتە گرتن و کوشتن و ئەشکەنجەدانی هەموو ئەو ئەفسەرانەی کە لە عەبدولکەریم قاسمەوە نزیکبوون. کاک ئەکرەم دەبرێتە ناو شەمەندەفەری مردن (ئەو شەمەندەفەرەی کە ناوبانگی

بە شەمەندەفەری مردن دەرکرد) لەوێ ئەفسەرێکی هاوڕێی دەیناسێتەوە و ڕزگاری دەبێ. دوای ئەوە خانەنشین دەکرێ و هەرگیز نەیانخستەوە سەر کارەکەی. کەسێکی کوردپەروەر و دڵسۆز و دەروونپاکە، زۆر خزمەتی ئێمە و خزم و کەسوکاری دەکرد کاتێ کە دارۆ و کاکە شەهاب و خاڵە جەعفەر لە زیندان بوون.

دوای دوو ڕۆژ مانەوە لە بەغدا، گەڕاینەوە سلێمانی و لە ماڵی شێخ جەناب دابەزین، هەرچی دۆست و ناسیاو و برادەر و کەسوکار هەیە هاتبوون بۆ لای دارۆ، ئەوەندە قەرەباڵغبووین بۆ نووستن بەسەر ماڵاندا دابەشبووین و ئێمە چووینە ماڵی عومەر فەتاح و کافیە خان.

هەموومان چاوەڕێی بەربوونی ئاواتمان دەکرد و دڵەڕاوکێ گرتبووینی، ئەو چەند ڕۆژە بە ساڵێک ڕۆیشت، ئیتر لە ٢٢ی ئابی ١٩٧٩، بە چەند کۆستەرێک بەرەو شاری موسڵ بەڕێکەوتین و لەوێ لە ئوتێل ماینەوە. بۆ ڕۆژی دوایی ٢٣ی ئابی ١٩٧٩، چووینە بەردەم زیندانی شاری موسڵ، دوای چاوەڕوانییەکی زۆر دەرگای زیندان کرایەوە و ئاوات و برادەرەکانی دەرکەوتن، کەلەپچەکەیان لەدەست کردنەوە و ئاگامان لێبوو داوایان لێدەکردن هوتاف بکێشن بە (بژی سەدام و حیزبی بەعس)، بەڵام نەیانوت و گوێشیان بەو داوایە نەدا تا ئەوەی گەڕاندیاننەوە ناو زیندان و هەر نەیانوت، بەڵام دواتر ئازادیان کردن و یەکسەر گەڕاینەوە سلێمانی. لە سلێمانیش چووینە سەر گۆڕی کاکە شەهاب و ماڵی شەهید ئارام و سەردانی گۆڕی خاڵە جەعفەریشمان کرد لە کۆیە.

ئەو ڕۆژانە خۆشییەکان زۆربوون، بەڵام تامی ئازاریان گرتبوو.

پاش ئازادبوونی دارۆ و هاوڕێکانی بە لێبوردنی گشتی، لە ساڵی ١٩٧٩ لە هەولێر نیشتەجێ بووین. ئەمجارەیان لەژێر فشاری دایکم لە هەولێر ماینەوە، دەیوت "سلێمانیتان پێوەنایە دەبێ لە هەولێر بژین". من و دارۆش هەستماندەکرد مەبەستی ئێمە نەبوو، بەڵکو ماوەیەک هاوڕێی کوڕمی بەخێوکردبوو حەزی نەدەکرد لیی دوورکەوێتەوە و زۆری خۆشدەویست، بۆیە ئێمەش خواستەکەیمان هێنابەدی. نەیزانی ئەمجارە هەولێر خراپتر دەبێت، ئیتر دەڕۆین و بەو زووانە ناگەڕێینەوە نە بۆ هەولێر و نە بۆ سلێمانی.

ئەوکاتە کەمەی کە لە هەولێر ماینەوە، نزیک ماڵی باوکم خانوویەکمان بە کرێ دەستکەوت و ماڵمان پێکهێنایەوە. دارۆ لەناو زیندان دارتاشیی فێربووبوو، هەندێ کەلوپەلی دارتاشیمان کڕی و بەیەکەوە زۆر شتی ماڵەکەمان دروستکرد، ئەو وەستا و من شاگرد، بەڵام بەعس نەیهێشت پشوو بدەین دوای ئەو هەموو ئازار و دوورییە بە ئاسوودەیی بژین. فشاری زۆری خستبووە سەرمان، کەم کات هەبوو سیخوڕێکی بەدوامانەوە نەبێ، ئەگەر رۆژێک کەس بەدوامەوە نەبوایە، دەکەوتمە شک لەوەی لە دەوام چاوەڕێم دەکەن. زۆرجار بەبێ هۆ راپێچیان دەکردم بەرەو ئەمن و ئیستخبارات (ئاسایش و هەواڵگری) بۆ لێکۆڵینەوە، شکیان دەکرد بەنهێنیی کاری سیاسیی دەکەم.

لە کۆتایی کانوونی دووەمی ١٩٧٩، ئەوسا مامۆستای وانەبێژی ئامادەیی کوردستانی کوڕان بووم لە هەولێر، ئەمن هاتن بەدوامدا لەگەڵ مامۆستایەکی تر بەناوی (مامۆستا ژیان) راپێچیانکردین بەرەو ئیستخباراتی هەولێر، ئەو رۆژە لە هەموو جارێک توندتربوون و هەڕەشەی زیاتریان دەکرد، دوای پرسیار و وەڵامێکی زۆر، تا ئێوارە ئێمەیان هێشتەوە، هیچمان نە من و نە ژیان بەتەمای بەربوون نەبووین.

هەواڵی گرتنەکەمان لە رێگای مامۆستاکانەوە گەیشتبووە ماڵەوە، مامۆستا قاسم کە مامۆستای فیزیا بوو، تا ئێوارە لە نزیک ئیستخبارات دانیشتبوو بۆ ئەوەی بزانێ چیمان بەسەردیت.

کاتێ گەیشتمە ماڵەوە زۆربەی خزمان لە ماڵی باوکم کۆبووبوونەوە و وایاندانابوو کە ئەوجارە بەربوونم ئاسان نییە، هەریەکە قسەیەکی دەکرد، دارۆ منی بردە لایەکەوە وتی "هەر ئێستا دەچینە ماڵی خۆمان و لەم شارە نامێنین".

ماوەیەک بوو، بەڕێز مام جەلال نامەی بۆ دارۆ دەنووسی بۆ پەیوەندیکردنی بە هێزی پێشمەرگەوە. لە زۆربەی نامەکاندا جەختی لە بوونی مەترسیی لەسەر ژیانی دارۆ دەکردەوە. ئیتر دارۆ وتی "تازە ژیانی ئێمە لە هیچ شارێکی ئەم وڵاتەدا نەماوە و دەبێ بڕۆین". بەپەلە هەندێ شتی زۆر پێویستمان کۆکردەوە و چووینەوە لای باوکم و بانگمانکردە دەرەوە و بڕیارەکەمان پێوت، وتمان "دەمانەوێ هاوڕێی کوڕم لای ئێوە جێبهێڵین و بە دایکیشم نەڵێی تا دەردەچین". باوکم دەستیکرد بە گریان و قسەی بۆ نەدەکرا و باوەشیکرد بە هەردووکماندا و ئەوەندەی وت "نەترسم نەتانبینمەوە". بە دایکیشم وت "دەچینە بەغدا بۆ ئەوەی چەند رۆژێک لە چاوی ئیستخبارات دووربین". هیچ کات ئەو وێنەیەی باوکم لەبەرچاو لاناچێ، ئەگەر عیشقی وڵات و بیروباوەڕ لولت نەدا بەرەو لای خۆی، چۆن مرۆڤ ئەتوانێ منداڵێک و باوکێکی چاو بەفرمێسک و دایکێکی جەرگسووتاوی بر شەهیدکراو جێبهێڵێ و دڵی بێت دڵیان بڕەنجێنێ؟ ئەم پرسیارانەم سەدان جار لەخۆم کردووە، بۆ دەبێ عەشقی وڵات لەسەرووی هەموو عەشق و خۆشەویستییەکانەوە بێت؟

هەر هەمان شەو ڕۆیشتین بەرەو سلێمانی، چووینە ماڵی شێخ جەنابی برای دارۆ، لەوێ پەیوەندیمان کرد بە شانە نهێنییەکانی کۆمەڵەوە، ئەوانیش هەموو کارێکیان بۆ ریکخستین، شێخ جەنابیش بە دارۆی وت "رووناکی کچیشم لەژێر فشاری بەعس و سیخوڕەکاندایە، دەبێ ئەویش بڕوات". ئیتر من و رووناکیان بەهۆی قاچاخچییەوە بە رێگای قاچاخ بەڕێکرد و دارۆش لە رێگای مەفرەزەکانی پێشمەرگەوە.

رەحمە خانی دایکی رووناک، بردینی بۆ قەڵادزێ بۆ ماڵی باوکی قادر ئاغا و لەوێ دابەزین. شەو دوو دەست جلی کوردی پیاوانیان بۆ هێناین، لەبەرمانکرد و قاچاخچییەکان هاتن بەدواماندا، پاش ماوەیەک رۆیشتین بەپێ، گەیشتینە لای وڵاخەکان و بەریکەوتین. دونیا زۆر ساردبوو، بەفر دونیای سپیکردبوو و رەشیی لە هیچ شوێنێک نەدەبینرا، هەرچەندە شەوبوو، بەڵام سپێتیی بەفرەکە وەک چرا رێگای رووناک کردبووەوە. وڵاخەکان بە لەسەرخۆیی و بەبێ دەنگ دەتوت مەشقپێکراون و ئەوانیش گیانی پێشمەرگە دەپارێزن دەڕۆیشتین بەرەو دونیایەکی کشومات و بێدەنگ، بەفرەکەش ئەوەندەی تر کپیکردبوو. بەهۆی

ئەوەی یەکەمجارمان بوو بە ولاخ رێبکەین، زۆر هیلاکبووبووین، داوامانکرد تۆزێ بە پێ برۆین، ئێمەیان دابەزاند و خۆیان رۆیشتن. قاچاخچییەکان زۆر دوورکەوتنەوە، لەبەر زۆریی بەفر، قاچمان بەدواماندا نەدەهات و نەماندەتوانی رێبکەین، پێلاوەکانیشمان بۆ ناو بەفر نەدەگونجا. خەریکبوو لەچاو دەرچن، تا لەتواناماندا بوو بە دەنگی بەرز بانگی قاچاخچییەکانمان دەکرد، ئەوانیش بەخوێنساردییەکەوە گەرانەوە لامان، وتیان "نازانن نابێ بە دەنگی بەرز قسەبکەن، ئێرە پڕە لە رەبایەی حکومەت، ولاخەکان لەئێوە هێمنترن"، ئیتر رۆیشتین.

دوانیوەڕۆی رۆژی دواتر گەیشتینە دیوی کوردستانی رۆژهەلات، ئێمەیان بردە ماڵێک لە گوندێکی سەر چیایەکی بەرز، ماڵەکان بەسەر یەکەوە چنرابوون. ماڵەکە تەنیا یەک ژوور بوو و سۆپایەکی داری تێدابوو، شوێنی خواردن دروستکردنیش هەر هەمان ژووربوو، بەڵام ژوورەکەیان بۆنی پاکیی لێدەهات و ژنی ماڵەکە لە دەرەوە سەوزەی لەناو تەنەکەی رۆندا چاندبوو.

دەستشۆریان نەبوو. چەند سەیرمکرد چاوم پێی نەکەوت، لە ژنی ماڵەکەم پرسی، وتی "دەبێ بچیتە خوارەوە بۆ سەر چەمەکە". چەند سەیری ئەو چوونە خوارەوەیەم دەکرد بەو هیلاکییەوە، لەرزم لێدەهات، بەڵام تەنگاویی تەنگی پێهەڵچنیبووین و لەگەڵ رووناک چووینە خوارەوە و لە رێگا بە خۆمان پێدەکەنین.

هەر ئێوارە داهات، خەڵکی گوند لێمان کۆبوونەوە، زۆر سەیر لێیان دەڕوانین، هێشتا پێشمەرگەی ژنیان نەبینیبوو. زۆر پرسیاریان لێدەکردین، ژنێک پرسی؛ خوشکێ ئێوە رەدوکەوتوون؟ (بەدوای پیاوکەوتوون) رووناک وەڵامیدایەوە و وتی "ئەرێ وەڵلا، ئەگەرنا خواگرتبوونی بێین بۆ ئێرە".

ئەو شەوە، لەگەڵ ژن و پیاوەکەی و بێشکەیەکیش لە هەمان ژوور بووین. بەو هیلاکییە تا بەیانی لەتاو کێچ و ئەسپێ خەو نەچووە چاومان، لەتاوا جووڵەمان لە خۆمان بڕیبوو.

بەیانیی قاچاخچییەکان ئێمەیان هەڵگرت و بەڕێکەوتینەوە بەرەو شاخە بەرزەکان، نەماندەوێرا سەیری خوارەوە بکەین لە ترسی بەرزیی شاخەکان و سەختیی رێگاکە. ولاخەکەی رووناک باش نەبوو لەوە دەچوو ناڵەکەی

دەمێکبێ نەگۆڕدرابێ. زوو زوو هەڵدەخلیسکا، رووناکیش هاواریدەکرد؛ مامەی کەرەکە، کەرەکەت زۆر خراپە. ئەویش بەخوێنساردییەوە وتی "خوشکم، کەر نییە ولاخە". وەک ئەوە وابوو بە خاوەن مارسیدس بڵێی لاداکەت. رووناکیان بە پشتێنێک بە پشتی ولاخەکەوە بەستەوە، لە چوونە خوارەوەیەکدا ولاخەکە هەڵخلیسکا و کەوت و راستبووەوە، بەڵام رووناک قاچی لەسەرەوە و سەری لە خوارەوە بوو، ئیتر من هاوارم لێهەستا و ئەمجارە من وتم "مامەی کەر فریاکەوە". قاچاخچییەکە زۆر لێمان توورەبوو دیاربوو پشووی نەمابوو بەدەستمانەوە، وتی "کە دەرەقەتی شاخ نایەن، بۆ هاتوون". هەرچۆنێکبێ گەیشتینە بێوران و پشوویەکمان دا و بەرێکەوتینەوە، لەدوای بێورانەوە بۆ یەکەمجار پێشمەرگەمان بینی، یەک لەوانە مامۆستا موحسین بوو.

زوو زوو دەمانپرسی؛ زۆرمان ماوە؟ قاچاخچییەکە دەیوت: "ئەها ئەوە گەیشتین". ئەو ئەهایە سێ رۆژی خایاند.

سەرەڕای هیلاکی و ماندوبوونێکی زۆر، رانەکانمان هەمووی بووبووە برین و لاشمان شەرم بوو باسیبکەین. ژنبوون کارێکی ئاسان نییە و نەبووە بۆ ئەو کۆمەڵگایانەی وەک ئێمەن، بەتایبەتی ئەگەر بتەوێ رێچکەشکێن بیت.

گەیشتینە ناوزەنگ و بارەگاکانی سەرکردایەتی و مەکتەبی سیاسی، دوای ماوەیەکی کەم، واراهاتین دەتوت شارمان هەر نەبینیووە! دوای مانگێکیش، دارۆ لە رێگای مەفرەزەکانی شەهید جەمالی عەلی باپیرەوە گەیشتە ناوزەنگ.

هەندێ بەسەرهات هەن، کاتێک باسی لێوە دەکەین، لەوە دەچێ دەرهێنەرێکی سینەمایی، بۆ جوانکاریی هونەریی لە فیلمەکەیدا دایڕشتبێ.

لە تشرینی دووەمی ١٩٧٩، پاش ماندوبوونێکی زۆر گەیشتینە ناوزەنگ و بارەگاکانی سەرکردایەتی، کاک عومەری سەید عەلی وتی "جارێ وەرنە لای ئێمە پشووبدەن تا جێگایەکتان بۆ پەیدا دەکەین".

ئێمەیان بردە بارەگای مەلا بەختیار، هەندێ برادەری تری لێبوو، ئێمە کاتێ مەلا بەختیار بەرپرسی بەشێک لە رێکخستن بوو لە ناوشاری سلێمانی دەمانناسی و ماوەیەکیش لە ماڵی شێخ جەناب بوو. لەو برادەرانەی تری ژوورەکەش ناسیاوی زۆرمان هەبوون (کاک عومەری سەید عەلی، ئەرسەلان بایز، سالار عەزیز و...هتد) یەک دووانێکمان نەدەناسین، لەنێوانیاندا کوڕێکی گەنجی لێبوو ناوی ئازاد بوو، نەمبینیبوو. پاش نانخواردن و پشوو، بەبۆنەی گەیشتنی ئێمەوە دەستیانکرد بە وتنی گۆرانی و سروود، هەندێ لە سروودەکان یەکەمجار بوو گوێم لێیانبێ. هەروەها پایز پایزی کاک سالاریش.

کاک ئازاد دەستیکرد بە سروود وتن، دەنگیم زۆر لا ئاشنابوو، لێمپرسی؛ من و تۆ یەکمان نەبینیووە؟ وتی "نەخێر". پرسیم؛ ئەی هیچ گۆرانیت نەوتووە؟ بەپێکەنینەوە وتی "نەخێر" وتم "دەنگت نامۆ نییە بەلامەوە و گوێم لێبووە، بۆیە ئەوەندە دەپرسم". دوای چەند بڕگەیەک بیرمکەوتەوە دەنگی لە هاوڕێیەکم دەچێ کە بەداخەوە زۆر بە گەنجیی بە رووداوی ئۆتۆمبێل کۆچی دوایی کرد. ئیتر پێموت دەنگی لە کێ دەچێ، ئەویش وتی "ئەوە برام بوو"، شێوەیان کەم لێکدەچوو، بەڵام چاوت دانخستایە جیاوازیت نەدەکرد لەشێوازی گۆرانی و دەنگیان، هەردووکیشیان گیتارژەنێکی بەتوانابوون. لەدواییدا منیش بووم بە کۆرس لەگەڵ کاک ئازاد لە ئاهەنگ و بۆنەکاندا، لەو سروودانە، سروودی:

رێی خەباتمان چەندە سەخت و دووربێ
با چواردەورمان کڵپەی ئاگربێ
لەم رێیە پیرۆزە هەرگیز لانادەین
ئێمەین بۆ مردنیش ئامادەین
بۆ دونیایەکی نوێ بۆ هەژاران
بۆ دانانی کۆمەڵگەی یەکسان

رەگی زۆرداری لە ریشە دەردێنین
تۆوی ئازادیی گەلمان دەچێنین
بە رابەریی چینی کرێکاران
ئەڕۆین ئەبڕین ڕێگای تێکۆشان
ئاڵای سووری شوڕشمان هەڵئەکەین
هەر بە رۆژی سەرکەوتن دەگەین

خۆم پێشتر هەندێ لەو سروودانەم دەزانی، لەوکاتەی کە کاکە شەهاب لە ماڵی ئێمە خۆی شاردبووەوە، کاک سالار عەزیز دەیوتن، هەروەها سروودی لاوانی ئینتەرناسیۆنال و هەندێ سروودی تریش.

بە بەرگی پێشمەرگایەتییەوە لـەدوای ئـازاد هەورامییەوە وەستابووم، یەکەمجار منی گەراندەوە بۆ سەردەمی زانکۆ، ئەوکاتەی کە کۆرس بووم بۆ هۆشمەندی (برای شەهید ئازاد) بەخۆی و گیتارەکەی لە ئاهەنگەکانی نەورۆز و یەکترناسین لە بەغدا. دوو مێژوو بە دوو بەرگی جیاواز بە هەمان گیانی پڕ لە حەماسەتی کوردایەتی و لەخۆبووردەیی، یادیان بەخێر ئەو دوو قارەمانە هونەرمەندەی هاوریی رۆژانی سەختی خەبات.

شەو درەنگ ئێمەیان بردە ماڵی مام جەلال، هێرۆ خان وتبووی "بابێن بۆ لای من". ژوورەکە بە قوڕ و بەرد دروستکرابوو، بنمیچەکەی دارەڕا بوو، بە نایلۆنی ئێرانیی داپۆشرابوو بەمەبەستی خۆپاراستن لە خۆڵ و مشک و مێروو، لەنێوان نایلۆن و دیوارەکەدا مشک تەراتێنی دەکرد و نەدەترسان، هێشتا رانەهاتبووم کە مشکەکانم دەبینی چاوی خۆمم لەسەر لادەبردن. زەوییەکەی بە کومبارێکی سوور داپۆشرابوو، سۆپایەکی دار لە دامێنی خـوارەوە بوو، هەندێ سەرین و بەتانی لە قوژبنێکی ژوورەکـەدا هەڵچنرابوون، دۆشەکم نەبینی، لەدواییدا بۆمدەرکەوت نووستن لەسەر دۆشەک نییە.

خواخوام بوو سەرینێک بێنم لەسەی دابنیشم، بەهۆی سواریی وڵاخەوە، رانمان هەمووی بووبووە برین و رووومان نەدەهات باسیبکەین.

له یەکەم شەوەوە، لای مام حەلال بووین، سەرەتا تا ماوەیەک شەوانە خەوم لێنەدەکەوت، بەهۆی رانەهاتنم لەگەڵ بوونی مشک لەهەمان ژووردا، سەیرم لێدەهات هێرۆ خان زۆر لای ئاسایی بوو، بەڕاستیی هەموو شتێک لەژیاندا راهاتن و خۆگونجاندنە. بەیانیان درەنگ خەبەرم دەبووەوە، پێشمەرگەیەک لای مام جەلال بوو ناوی (نەریمان) بوو، رقی لە میوانی بەردەوامی مام بوو، بەهۆی خۆشەویستیی زوری بۆ مام و هێرۆخان، حەزی نەدەکرد کەس پشوویان لێ تێکبدا.

نزیک سەری ساڵ بوو، مام جەلال لە سەربانی ژوورە قوڕەکە پیاسەی دەکرد. بانگیکردم و وتی "نەرمین وەرە دارۆ گەیشت". دارۆ لەگەڵ جەمالی عەلی باپیر و مەفرەزەکەی بوون. بەپەلە مام جەلال هاتە خوارەوە و باوەشێکی گەرمی بە دارۆدا کرد و هێنایە ژوورەکەی خۆی، زۆربەی برادەران هاتن. مام جەلال لەتاو گریان نەیئەتوانی لەگەڵ دارۆ قسەبکات، زۆر بیری کاکە شەهابی دەکرد، هەر دەیویست قسەبکات و دەستیدەکردەوە بە قوڵپی گریان، ئیتر هەمووومانی بەگریان هێنا.

مام، بە دارۆی دەوت (دارو خەپە)، هەرچەندە ئەوکاتە لاوازبووبوو پاش ئەو ماوە دوورودرێژەی زیندان، خەپەیی نەمابوو، بەڵام هەر بە دارۆ خەپە ناوی دەبرد. ئیتر لە بارەگای مام جەلالماینەوە، ئەو پێشمەرگەیە (کاک نەریمان) ناوی لە من و دارۆ نابوو کور و کچەکەی دکتۆرە ناسکە، هەم بەهۆی نازی زۆری مام جەلال بۆمان و هەمیش بەهۆی ئەوەی درەنگ هەڵدەستاین. ئیتر خوالێخۆشبوو ئەحەی دادی شکاتی لێکرد و مام جەلال لێی تووڕەبوو دەریکرد، بەڵام دوایی دارۆ نەیهێشت و هێنایەوە، بە مامی وت "مامە گیان، ئەوە رق نییە لە ئێمە، بەڵکو ئەمە خۆشەویستییە بۆ جەنابت". (ئێمە هەر زۆر دەمێک بوو مام جەلالمان بە مامە گیان بانگدەکرد).

هێرۆ خان، وەک پیشەی هەمیشەیی، ناو ژوورە قوڕەکەی رێکخستبوو. بەو کەرەستانەی کە لەبەردەستدا هەبوون، ژیانی بۆ خۆی ئەگونجاند. حەمامێکی کردبوو لایەکی سەرشۆر بوو لاکەی تری ئاودەست بوو، ئاوی لە کانییەکەی سەرەوە راکێشابوو بۆ ناو حەمامەکە. هەندێ تەپڵەکی جگەرەی لە دار دروستکردبوو، ئەوسا هەرسێکمان هێرۆ خان و رووناک و من جگەرەمان

دەکێشا و تەنیا ئەو سێ ژنە بووین لە ناوزەنگ. مام جەلال مانگانە بەنهێنیی (یەک دینار و نیوی) ئەدا بە من و رووناک ئەیوت "جگەرەی پێ بکڕن".

ئیتر دوای ماوەیەک مانەوە لە ژوورەکەی مام و هێرۆ خان، ژوورێکیان لە مەکتەبی عەسکەریی لای ملازم عومەر داینێ، ملازم عومەر ژوورەکەی خۆی دا بە ئێمە و خۆی دەچووە لای پێشمەرگەکان دەخەوت. پاش چەند رۆژێک ئاواتی شێخ جەناب و ئازای شێخ رەئوفیش هاتن، لە مانگی پێنجیش نازەنینی خوشکم و بەیان گەیشتنە ناوزەنگ، ئیتر ئێمە (دارۆ، ئاوات، ئازا، رووناک، نازەنین، بەیان، من) هەمووومان هەر لەو ژوورەبووین.

چێشتلێنان هەر لە تەنیشت بارەگاکەوە بوو، هەر بارەگایەک خۆی خواردنی بۆ خۆی دەکرد ئێمە و مەکتەبی عەسکەری، خواردنمان بۆ خۆمان لێدەنا، زۆربەی کات قبولیی سووربوو، بێ پێخۆر و بێ گۆشت، تەنیا برنج و نان. ناومان لە قبولیی سوور نابوو قبولّیی رەنگاورەنگ (ملون)، دۆشاوی تەماتەکە باش تێکەڵ نەدەبوو، لایەکی سوور و لایەکی پرتەقاڵی و لایەکی سپی.

وەک قاوەخورێک، ملازم عومەر قاوەی بۆ پەیدا دەکردم و خۆشی دەهات لای من دەیخواردەوە، زۆرجاریش میوانی قاوەی بۆ دەهێنام.

ئازاد هەورامی، لە شەوی سەری ساڵی (١٩٨٠)، دەمانچەیەکی دایە دەستم و فیشەکێکی گردارم تەقاند، ئەوە یەکەم تەقە بوو کە کردم. دوای ئەوە لەگەڵ نازەنین و بەیان، ملازم عومەر فێری نیشانەشکاندنی کردین، ئیتر فێری چەک بەکارهێنان بووین.

هێرۆ خان، جورێک جلی پێشمەرگایەتی داهێنا، بێ پشتێن بوو، تایبەت بوو بۆ ژنان جیاواز لە هی پیاو. مامە قالەی بەرگدروو بۆی ئەدوورین، منیش بەهۆی ئەوەی دروومانم دەزانی، هەندێ گۆڕانکاریی ترم تیاکرد، ئیتر ئەو جلە بوو بە باو.

لە زستاندا هیچ تەڕەیەک دەستنەدەکەوت، تەنیا خواردنی وشکە هەبوو، ئەویش زۆربەیجار برنج و پەتاتە بوو.

سەرەتا کە تازە گەیشتبووین، لە بارەگاکانی تر داوەتیان دەکردین، جارێک لای مامە جەماڵ داوەتبووین و قەلی بۆ سەربڕیبووین، لەدوای نانخواردن وتی "ئەوە یەکەمجارە قەل بمێنێتەوە".

ئەو ماوەیە، چەند خولێکی کادیرانیان کردەوە و بەشداریمان تێدا کردن، ئەوانەی کە وانەکانیان دەوتەوە، مام جەلال و ئەرسەلان بایز و حەمەتۆفیق بوون.

دکتۆر خدر و دکتۆر شادومانیش، خولی تەندروستی و خۆپارارستن لە چەکی فسفۆڕ و فریاکەوتنی سەرەتاییان پێ دەوتین. نازەنین و بەیان، بەهۆی ئەوەی هەردووکیان لە زانکۆی موسڵ لە بەشی پزیشکیی بوون (نازەنین لە قۆناغی پێنجی کولێجی پزیشکی ڤێتەرنەری بوو، بەیان لە قۆناغی چواری کۆلێجی پزیشکیی گشتی بوو، کە گیران و دوای ئەوە دەرچوون) لەگەڵ دکتۆر خدر و دکتۆر نەریمان لە نەخۆشخانەکە کاریاندەکرد.

ئیتر لەگەڵ ژیانی شاخدا خۆمان گونجاند و کەوتینە سەردانی ناوچەکانی دەوروبەر و سەردانی ژنانی گوندەکان.

رۆژێک من و نازەنین و بەیان بەیەکەوە دەڕۆیشتین بەرەو گوندی شێنێ، مام جەلال لە سەربانە قورەکە بوو، وتی "ها کچان، دەچن بۆ کوێ؟". وتمان "مامە، سەر لە ژنان و هەندێ ماڵی شێنێ ئەدەین و هەوڵدەدەین هەندێ رێنمایی تەندروستییان پێبدەین و خۆشمان لێیان نزیکبکەینەوە". وتی "نەچن باسی مارکسیەت و ئیمپریالیەتیان بۆ بکەن، دەبێ بەشێوەیەکی سادە، لە مانگا بەخێوکردن و شتی سادە بدوێن و بە زمانی سادە قسەبکەن".

جارێک لەگەڵ مەلا بەختیار و پێشمەرگەیەکی زۆر، بە ولاخ بەرەو رۆژهەڵاتی کوردستان دەرۆیشتین، لە رێگا بەفر دونیای سپیکردبوو، زۆر سەرمام بوو، هەستمدەکرد قاچم خەریکە دەیبەستێ. بە دارۆم وت "قاچم سڕبووە". وتی "هیچ نییە، بیجوولێنەوە هی سەرمایە". وردە وردە هەستمکرد قاچم پێوەنەماوە و هەستم پێ نەدەکردن، هاوارمکرد. مەلا بەختیار زانی بارودۆخم زۆر خراپە، وتی "خێرا ئەو قافڵەیە بوەستێنن". ئیتر هێنامیانە خوارەوە، نەمئەتوانی بەپێوە بوەستم، قاچم دەستی بە شین بوونەوە دەکرد و هەستی تیا نەمابوو. هەندێ وتیان "با ئاگر بکەینەوە". مەلا بەختیار وتی "خراپە" ئیتر هەندێ پێشمەرگە بەتانی و ناوی قەمسەڵەیان بەسەر قاچمدا دا و ورد ورد بە دەست گەرمیان کردەوە، دوای ماوەیەک قاچم گەرمیی تێهاتەوە. سواری ولاخ بووینەوە و نزیک گوندێکی بێوران چووینە ماڵێک،

مەلا بەختیار وتی "بەڵکو تۆزێ گەرممان ببێتەوە"، لەبەر منی بوو، بەڵام ماڵەکە نەیانهێشت بچینە ژوورەوە. ئێستاش مەلا بەختیار پێم دەڵێ؛ تۆ قەرزاری منی، من نەبوومایە نەدەژیای یان بێ قاچ دەبووی.

دواتر کە دونیا خۆشی کرد، ئیتر هاتووچۆمان بەپێ بوو، وڵاخمان بەکارنەدەهێنا ئەگەر ڕێگاکە چەند ڕۆژێکیش بوایە.

بە پێ، زوو زوو سەردانی بارەگاکانی حیزبی شیوعیمان دەکرد، لەوێ خوشکە فریشتە و پەخشان زەنگەنەمان دەبینی لەگەڵ برادەرانی تر. هەندێکجار پێشمەرگەی ڕۆژهەلاتیش دەهاتن و ژنیان لەگەڵ بوو، دوای ماوەیەک کۆمەڵێک ژنی تریش گەیشتنە ناوزەنگ، لەوانە (پەخشان حەفید خێزانی کاک ئەرسەلان، پرشنگ خێزانی ئاوات، پاکیزە خان خێزانی کاک فەرەیدون، دڵگیر خێزانی سالار عەزیز، شوعلە خێزانی کاک نەوشیروان). پێشتریش مەلیحەی لێبوو، هەروەها مریەم خانی خێزانی دکتۆر عەلی، ئەوان لە گوندی توژەڵە بوون، خێزانی شێخ عەلیش لە نزیک ناوزەنگ بوون، ئیتر ژمارەمان زۆر بوو. مانگی هەنگوینیی ئەو برادەرانە، هەر لەژێر چادر و ئەو خانووە قوڕانەدا بوو، جلی بووکێنییش، شەروالیکی پێشمەرگە بوو.

هەموو شتێک لەناو پێشمەرگایەتیی دەبوو بە نوکتە و قسەی خۆش، یەکێ لەو کەسانەی کە زۆر قسەخۆش بوو، ملازم عومەر بوو، هەم زۆر ڕێزی لێدەگرتین و هەمیش زوو زوو هەواڵی دەپرسین و کۆڕی گەرمدەکرد بە نوکتە و بەسەرهاتەکان.

کۆڕی مامە جەمالیش، هەرچەندە دەیوت "رقم لە مامۆستاشە، بەڵام من تۆم لێ دەرکردووە". شەهید جەمالی عەلی باپیر هەم زۆر هاوڕێ بووین و هەمیش نوکتە و قسەی خۆشی زۆربوو، حەزم لە کۆڕی دەکرد، زوو زوو دەچوو بۆ جەولە و دەگەڕایەوە.

هەندێ لە قسە خۆشەکانی شەهید جەمالی عەلی باپیر "مامۆستایەکمان هەبوو زۆر خڕ و قەڵەو بوو، ڕۆژێ دەستێکی خستە ناو قەدی و دەستەکەی تری بەرزکردەوە و وتی "لە چی دەچم؟"، هەموومان وتمان"لە قۆری".

جارێکیش، کەسێک خۆی ساغ نەدەکردەوە لەسەر باری سیاسیی، کۆمەڵەیە یان هێڵی گشتی. وتی "مامۆستایەکمان هەبوو وانەی وەرزشی پێ دەوتین،

رۆژێک خوێندکارێک بازی زانه (قفزة زانا) دەکات و لە ناوەڕاستدا دارەکەی دەچەقێ و لەسەرەوە دەمیێ. مامۆستاکەش هاوار دەکات؛ سەگباب خۆت ساغبکەوە".

ئیتر ئەو قسەیەمان بەو کەسانە دەوت کە خۆی بە هیچ لایەکدا ساغ نەدەکردەوە، وەک وشەی نهێنیی لێهاتبوو، دەمانوت "قەفزە زانە دەکات".

من و شەهید جەمال، ئەلبومێکی وێنەی بچووکمان هەبوو، بەداخەوە بردیان و نەماندۆزییەوە.

لەگەڵ د.کەمال خۆشناو و دکتۆر خدر، گروپی پێ رابواردن و دروستکردنی ئاژاوە بووین، منیشیان خستبووە ناو گروپەکەوە، دوایی بە فەرمانی مام جەلال هەڵوەشایەوە. رۆژێک د.کەمال خۆشناو بەرانبەر ئاوێنە وەستابوو بەخۆی رادەبوارد، چونکە قەدەغەکرابووین (بەخۆی دەوت دکتۆر تەماتە)، دکتۆرای هەبوو لەکشتوکاڵدا.

ئیشێکی ئەوتۆ نەبوو ژن بیکات، هەرچەندە چەند جارێک داوامانکرد جگە لە کۆبوونەوە و خولی کادیران. ئەرکمان پێ بسپێرن، تەنیا ئەوانەی دکتۆر بوون کاریان هەبوو، هەندێکجار هەستم دەکرد ئەرکین بەسەریانەوە، لەدواییدا داوای حەرەسیاتمان کرد وەک پیاوەکان، ئەو ئەرکەیان دا پێمان.

ژیان زۆر سادە و ساکار بوو، بەهاران و هاوینان ژیان ئاسانتربوو، گۆڕانکاریی دەکەوتە جۆری خواردنیش، یەکەمجار بوو لە بەهاردا (گیای مەندوک) ببینم و خۆمان بیکەین بە خواردن. فێری کەنگر کردن و تۆڵەکە و گیابرژاوی ئەو ناوچەیەش بووبووین.

هاوین، دوپشک و مار زۆر دەبوون، جارێک دوپشکێک دای بە من و بەیانەوە، بەڵام زۆر ئازاری نەداین، چونکە سەرەتای بەهار بوو، بەڵام لە هاوینی ١٩٨٠ دوپشکێکی رەش دای بە دارۆوە، زۆر هیلاکی کرد و نزیک مردن بووەوە، بەتایبەتی دوای ئەوەی دەرزیەکیان لێدا کە هەستیاریی پێی هەبوو.

نانکردن بۆ بارەگاکانی ئیمە، زۆربەی پورە کەسکی دەیکرد (کاتێ کە بووم بە وەزیری پەروەردە، گوندی شێنێ داوای خوێندنگایەکیان لە مام جەلال کردبوو، ئەویش نامەیەکی بۆ ناردم، نووسیبووی: دەک نانی پورە کەسکی بتگرێ بۆ مەکتەبیان بۆ دروستناکەی؟).

قاچاخچییەکان خواردنی ئێرانییان دەهێنا بۆ دۆڵی ناوزەنگ و دوکانیان دانابوو، بەڵام لەبەر بێ پارەیی، زۆرکەم ئەمانتوانی شت بکڕین. ئەوەی لەتواناماندا هەبوو بیکڕین، پەنیری کرافت و جگەرە بوو، هەندێکجاریش مرەبای قوتوو بوو.

لە حوزەیرانی ١٩٨٠، دایکم هاوڕێی هێنا بۆ لامان بۆ ناوزەنگ، بە جلی شارییەوە هێنابووی. کە بینی هەموومان جلی پێشمەرگەمان لەبەردایە، بەلایەوە قورس بوو جلی شاریی لەبەردا بێ، ئیتر خۆی لە ژوورەوە قەتیسکرد تا مامە قالەی بەرگدروو دوو دەست جلی کوردیی بۆ کرد. هاوڕێکانمان هەموویان سەردانیان دەکرد کە وەک تاکە منداڵ لەو سەردەمە لەنێو پێشمەرگەدا بوو، هەموویان زۆریان ئەدوواند، بەتایبەتی کاک نەوشیروان. ئەوسا حسێن شنگالییش لە شاخ بوو، زوو زوو سەردانی هاوڕێی دەکرد و لەوە دەچوو خەفەتی بۆ بخوا کە لەناو منداڵان دوورە، رۆژێک هات و وتی "هاوڕێ هۆنراوەیەکم بۆ داناوی کە گەڕایتەوە ناو منداڵان بۆیان بڵێ". هۆنراوەکە ئەمەی خوارەوە بوو

کاتێ دێم ماڵێ کاتێ دێم ماڵێ

هەموو دێن بۆ لام هەموو دێن بۆ لام

گوڵی سوری شاخ گوڵی سوری شاخان

دێنم بۆتان دێنم بۆتان

ئیتر هەموومان لەبەرمانکردبوو، هەر حسێن شنگالیمان ببینیایە پێمان دەوتەوە و رقمان هەڵدەستاند، ئەویش دەیوت "ئێ بۆ منداڵ، هۆنراوە هەر دەبێ وا سادەبێ، قابیلە هۆنراوەی نالی بۆ بڵێم!".

سەرەتا هاوری هەموو شتەکانی بەلاوە نامۆ بوو، لە بەکارهێنانی دەستشۆر و خۆشووشتن، بەلام وردە وردە راهاتبوو. جارێک بارەگاکەمان (بارەگای عەسکەری) ئەوەندەیان نیسک و پەڵپینە بۆ لێنابووین خەریکبوو گەدەمان دەربێ، کاک عومەر چەند فەردەیەک پەڵپینەی وشک و نیسکی بۆ هاتبوو، ئێمەی کوشت بەو چێشتە. دروشمێکمان نووسی؛ بمرێ نیسک و پەڵپینە و بە هاوڕێدا ناردمانە خوارەوە، ئیتر لەبەر هاوڕێ دوو ژەمیان کرد بە پەتاتە. مام جەلال زۆرجار خواردنی قوتووی ئەنارد، ئەیوت "ئەوە بۆ هاوڕێیە، ئێوە لێی نەخۆن".

کاتێ لە توژەڵە بووین. لەناو چادر ئەژیاین، لە نزیک چادرەکەمان کانییەکی بچووک لەژێر داربەڕوویەکی گەورە ئەهاتە دەرەوە، ئەو کانیاوەمان وا داڕشت بەمەبەستی پاککردنەوەی ئاوەکەی و شیاندنی بۆ بەکارهێنان، حەوزێکمان لە بەردەمیدا دروستکرد. لەو کانیاوەدا هەندێ زیندەوەری زۆر تازەم بینی، زیندەوەرێک هەبوو زۆر شێوەی لە تیمساح دەچوو (لەشێوەی مارمێلکەیەکی گەورە) و ڕەنگاوڕەنگ بوو، زۆرم پرسی، کەس ناوی نەدەزانی، وردە ماسی بچووکی دەخوارد. دارکونکەرەیەکی سەر سوری باڵ ڕەش و سپی لێبوو و بەیانیان بە دەنگی کونکردنی دارەکە بەئاگای دەهێنایین، زۆر بەخێرایی و ریتمێکی تایبەت دەیویست لانەیەک بۆ خۆی دروستبکات.

لەبەر هاوڕێ، بێچووە سەگێکیان بۆ هێنایین و ناومان لێنا (لایکە) بەناوی (ئەو سەگەی کە ناردیان بۆ سەر مانگ). ئەو سەگە خوویەکی سەیری هەبوو، شەوان سەری دەخستە ناو پێڵاوێک و دەخەوت. بووبووە جێی قسە، گوایە گلاوە وماڵمان نوێژیی نییە، دوای ئەوەی لە مانگی ئابدا چووین بۆ سوریا، ئەو سەگەمان لای نازەنینی خوشکم و بەیان جێهێشت، دوای ماوەیەک بیستمان پێشمەرگەکان کوشتبوویان.

جارێک جاڵجاڵۆکەیەکی ڕەشی قەبارە گەورە هاتە چادرەکەمان، منیش کوشتم (ئەو جاڵجاڵۆکەیە لە قالۆنچە ڕەشتر و گەورەتربوو و قاچەکانی درێژ و ورگ ئەستوور بوو) ئەوەندەی پێنەچوو دەیان جاڵجاڵۆکەی لەو شێوەیە ڕوویانکردە هەمان شوێن، ئیتر ترساین و بانگی پێشمەرگەکانی ترم کرد، وتیان "نابێ بیکوژی، ئەوانی تر بۆنی دەکەن و دێنە شوێنەکە، دەبێ بە شتێک هەڵیبگری و فڕێیبدەی". شەوێکیان، دارۆ لە چادرەکە چووە دەرەوە کە گەڕایەوە دەرگای چادرەکەی داخست، هاواری لێهەڵسا وتی "ئەوە شوێنی دەرزییە لێتداوە؟" کە سەیرمکرد دوپشکێکی ڕەشی گەورە بە چادرەکەوەیە و داوێتی بە ملی دارۆ دا. هاوڕێ نووستبوو منیش پێش هەموو شتێک چووم پەلاماری هاوڕێم دا هەڵمگرت، لەدواییدا دارۆ گلەیی لێدەکردم و دەیوت "خەمی کوڕەکەت بووە و ئاگات لە حاڵی من نەبووە". چادرەکەی نازەنین و بەیان لە خوار ئێمەوە بوو، بەپەلە ڕامکرد بۆ لایان تا بگەنە فریای دارۆ، ئەوانیش دەرزیی دژەژەهری دووپشکیان لابوو و هاتن دەرزییەکەیان لێدا، تومەز دارۆ

بەو دەرزییە هەستیاریی هەیە، وردە وردە فشاری خوێنی دابەزی و لەهۆش خۆی چوو، بەپەلە نازەنین و بەیان رایانکرد بۆ ئەو نەخۆشخانەیەی کاریان لێدەکرد و دکتۆر خدریان بەپەلە هێنا، ئیتر وردە وردە هۆشی هاتەوە بەرخۆی و بەرەو باشتر رۆیشت، نازەنین دەڵی هەرگیز ئەوەندە نەترساوم. ئەمە وایکرد هەموو شەوێک پێش نووستن، ناو چادرەکە دەگەڕام بەدوای ئەو زیندەوەرانەدا.

لە وەرزی هاویندا ئەو جۆرە زیندەوارانە زۆرن، هەر لە هەمان مانگ، مارێک چووبووە ناو شەروالەکەی خەباتی شێخ جەناب، کاک رەزاق فەیلی ئەیوت "لە دوپشک زیاتر ئەترسم وەک لە دوژمن". کە گەڕایەوە بۆ ئێران، دارۆ یەکێک لەو دوپشکانەی کوشت و خستیە شووشەیەکەوە و بە دیاری بۆ رەزاقی نارد. کە لە ئێران سەرمان لێدا، دوپشکەکەی لەسەر تاق دانابوو.

دەمەو ئێوارەیەک، دەنگی غاری رەوێک ئەسپی کێوی، هەموومانی هێنایە دەرەوە. ئەو وێنەیە، بەلای منەوە زۆر تازەبوو، کۆمەڵێک ئەسپی رەنگ جیاواز بەیەکەوە بوون. دیاربوو بەیەکەوە دەژیان، لەکوێوە هاتبوون؟ نەمانئەزانی. وێنەیەکی زۆر سەرنجڕاکێش و جوان بوو، ئومێدەواربووم کامێرەیەکم هەبوایە ئەو وێنەیەم تۆماربکردایە.

چەندین شتی جوان و دیاردەی سەیر و سەرنجڕاکێش، تەنیا لە خەیاڵ و بیرەوەریدا ماونەتەوە، نەمتوانیوە بە وێنەی کامێرەیەک بیانهێڵمەوە. بە رای من، بینینی ژن بۆ دیاردە سروشتییەکان، زۆر جیاوازن لە پیاو. ئەوەی بەلای ئێمەوە جوان بوون، لای ئەوان سادە و ساکار بوو. دەربڕینی هەست، بەلایانەوە قورس و شەرم بوو، بۆیە گرنگە هەردوو بۆچوون تێکەڵ بکرێت و ببێتە بۆچوونێکی راست. ئەمەش دەبێت لە هەموو کارێکدا رەنگبداتەوە، روانگە و دیدی ژن لەگەڵ روانگە و دیدی پیاو، خوێندنەوەی ژن لەگەڵ خوێندنەوەی پیاو تێکەڵبن، ئەوسا راستر و دروستتر دەبن.

لە لای بارەگاکەی خۆمان حەمامێکمان دروستکرد، تەنیا بۆ ژن بوو. خۆمان بە نایلۆن دامانپۆشیبوو، نایلۆنێکی سووری ئەستووری ئێرانیمان لەسەر زەوییەکە داخستبوو بە تەباخێکی نەوتی بچووکی رەنگ سەوز، ئاومان گەرمدەکرد.

لە سەرەتای کانوونی دووەمی ١٩٨٠، مەلا بەختیار داوای رووناکی شێخ جەنابی لە مام جەلال کرد و مامیش لە دارۆی داواکرد، ئیتر رازیبوون و بڕیار بوو لە ١٨ی کانوونی دووەمی ١٩٨٠ شووبکات. بردمانە حەمامەکە بەزۆر، لەکاتی خۆشووشتندا تەباخ گڕی تێبەربووبوو و دووکەڵی رەش حەمامەکەی داپۆشیبوو. کە رووناک هاتە دەرەوە، تەنانەت کونە لوتیشی پڕبووبوو لەسیانی رەش، ئیتر ئەوەندە پێکەنین، وتی "شووی پێشمەرگە دەبێ وابێ بە جلی پێشمەرگەوە و بە کونەلوتی رەشـەوە". بەمە ژیانی هاوسەرگیریی دەستپێکرد.

مام جەلال رووناکی زۆر خۆشدەویست، وتی "بچن بۆ تاران". بە ئێمەشی وت "ئێوەش بچن مانگی هەنگوینی تازەبکەنەوە". بۆ ئەو مەبەستە چووینە مەهاباد و لەوێوە چووینە تاران و بۆ چەند رۆژێک لەوێ ماینەوە.

جارێکی تریش مام جەلال دارۆ و کاک رەزاق فەیلی و منی نارد بۆ تاران بۆ کڕینی پارچەی ئێستگەکە. لە تاران دونیا بەستبووی و زۆر ساردبوو. رۆژێـک دەگەڕایـن بـەدوای چێشتخانەیەک بۆ ئـەوەی نـان بخۆین، ئەو وەختە دەمێک نەبوو حکومەتی شای ئێران رووخابوو، دونیایان پڕکردبوو لە دروشـمـی دژی ئەمریکا و ئیمپریالیەت، لە یەکێک لەدروشمەکاندا نووسرابوو (بر علیه) و لەسەری پیتی (ع) کونێک کرابوو، منیش ئەوسا فارسیم نەدەزانی وتم "ئەرەوەڵڵا ئەمە ریکلامی چێشتخانەیەکی (برغلیة) واتە ساوار". ئیتر ئەوەندەیان گاڵتەپێکردم و پێم پێدەکەنین، بەگاڵتەوە هەرچییان ببینیایە دەیانوت: ئەوەش چێشتخانەیەکی (برغلیة). ئەوەندەی پێنەچوو لەو بەستەڵەکە رەزاق فەیلی کەوت، کاسکێتەکەی سەری فڕی، منیش پێکەنیم وتم "خوای منە". دارۆش چوو کاسکێتەکەی هەڵبگرێتەوە، ئیتر رەزاق لێمان تووڕەبوو. دوای دوو رۆژ ئینجا ئاشتبووەوە لەگەڵمان، ئەیوت "خەمی منتان نەبوود. خەمی کاسکێتەکەتان زیاتربوو". بە منیشی

دەوت "پێم پێکەنیوی". ئیتر هەموو بەسەرهاتێ دەبوو بە چیرۆک و دەبوایە هەموو برادەران بیزانن. (برغلیە)ی من بوو بە نوکتە و هەر ناوی ساواریان لێگۆڕیم و کردیان بە (برغلیە).

لەهەمان سەفەردا، ئەو وەختە کۆمەڵێک کارمەندی باڵیۆزخانەی ئەمریکا لە باڵیۆزخانەکەباندا دەستبەسەرکرابوون لەلایەن هەندێ خوێندکاری خوێنگەرمی دژ بە ئەمریکاوە بۆ پشتگیریی لە شۆڕشی ئێرانی، ئێمەش وەک کۆمەڵەی خوێنگەرمی ئەو سەردەمە و دژ بەئیمپریالیەت، چووینە بەردەم باڵیۆزخانەکە و پشتگیریی خۆمانمان بۆ خوێندکارەکان دەرخست.

### ناسینی عومەر شێخموس

یەکێک لەو کەسایەتییانەی کە لە ناوزەنگ ناسیم، کاک عومەر شێخ موس بوو. کاک عومەر، کەسایەتییەکە لە یەکەم دیدارەوە سەرسام دەبی پێی و ڕێزی لێدەگری. کەسێکی خۆش مەشرەب و قسەخۆشە، ئەوکات کە لەگەڵ مامە جەمال و ملازم عومەر دەکەوتنە یەک، هەر خەریکی گێڕانەوەی ڕووداوە خۆشەکان بوون، ئەوەندەیان سەرگوزشتەی خۆش دەگێڕایەوە، تێربوون نەبوو لە دانیشتنەکانیان. ئەوەی ئەو سەردەمە بەلامەوە زۆر گرنگ بوو، کەسیکی کوردستانی ڕۆژئاوا، دەستەی دامەزرێنەری یەکێتی بێ. ئەوەندە کوردستانیی بوو، تەنانەت دۆستایەتی لەگەڵ سەرکردەکانی ڕۆژهەلاتیش زۆر پتەوبوو. بە بیرکردنەوە چەپ بوو، بەڵام کوردستانیی بوو. کاک عومەر لە تەمووزی ١٩٧٩، هاتبووە ناوزەنگ و بە شۆڕشگێران ناسراوبوو، ئەندامی مەکتەبی سیاسیی یەکێتیی نیشتمانی بوو. جارێکی تر لە کانوونی دووەمی ١٩٨٠، لەگەڵ ئەگنێتای خێزانی گەڕانەوە ناوزەنگ، ئەوکاتە بەفر دونیای سپیکردبوو و زۆریش ساردبوو، بەلامەوە زۆر گرنگ بوو ژنێکی سویدی بەرگەی ئەو ژیانە سەختە بگرێت و لەناو ئەو خانووە قوڕانە و لەبەردەم سۆپای دار بژی، بەڵام بەهۆی خۆشەویستیی بۆ کاک عومەر شێخ موس و ڕێزگرتن لە بیروباوەڕ و کارەکەی، وەک ئێمە ڕەفتاری دەکرد. کاک عومەر لە تافی لاوێتییەوە دەستیکردووە بە کاری سیاسی و ئەندامی پارتی دیموکراتی کوردی سوریا بوو، بەو هۆیەوە کاتێ

خوێندکاری ئامادەیی دەبێ، دەگیرێ و تووشی ئەشکەنجەیەکی زۆر دەبێ، بەڵام وەک پاڵەوان هیچ شتێ نادات بەدەستەوە. دوایی بەبیانووی خوێندن، بەرەو هەندەران دەروا و لە سوید نیشتەجێ دەبێ، لە زانکۆی ستۆکهۆڵم خوێندن تەواو دەکات و پلەی ماجستێر وەردەگرێ.

لە سەرەتای لاوێتییەوە ئەبێتە دۆستێکی نزیکی مام جەلال، پەیوەندییان زۆر خۆشبوو هەرچەندە ناوبەناویش لە یەک زویر دەبوون، ئەوەندەی نەدەبرد ئاشتدەبوونەوە، بەڵام مام جەلالیش ڕێزێکی تایبەتی بۆ کاک عومەر هەبوو. لەنێوان (١٩٨١-١٩٨٦) یەکێک بوو لە بەرپرسانی پەیوەندییەکانی دەرەوە، لەگەڵ شێخ دارۆ پەیوەندییان زۆر توندوتۆڵ بوو، کەسێکی زۆر خوێندەوار و واقیعبین و ڕۆشنبیرە.

هەرچەندە لە ساڵی ١٩٨٦، وازی لە کارکردن هێنا وەک بەرپرسێک لە یەکێتی، بەڵام بۆ یەک ڕۆژیش وازی لە هاوڕێ و دۆستەکان و واقیعی یەکێتی نەهیناوە و دۆستی هەمووانە.

ئەوکاتەی کە لە توژەڵە بووین، ئەگنێتا بینیی قژی نازەنین و بەیان دەبڕم، وتی "هی منیش چاک بکە". منیش بۆم چاککرد، بەڵام زۆر کورتم کردبووەوە، کاک عومەر دەیویست بەینمان تێکبدا، دەیوت "تۆ بەدەستی ئەنقەست واتلێکردوە و هەر پێی دەڵێم". دەکەوتمە سوێندخواردن کە وانییە، بەڵام ئێستا کە وێنەکان دەبینێت بە ئەگنێتا دەڵێ؛ ئەو قژەت زۆر لێهاتبوو.

کاتێ کە چووینە سوید، بەردەوام سەردانی یەکترمان دەکرد. لە ساڵی ١٩٨٧ کە نارینی کچم لەدایکبوو، کاک عومەر و ئەگنێتا هاتنە لام بۆ نەخۆشخانە، کە بینیی نارین چاوی سەوزە، بەگاڵتەوە وتی "ئەم کچە چاوسەوزە لە کێ دەچێ؟" ئێمە بەیەکەوە گاڵتەمان هەبوو، وتم "لە قەرەجەکەی دراوسێمان بپرسە". کەوتینە پێکەنین و دوایی وتم "دایکم چاوسەوزە". لەدوای ڕۆیشتنی کاک عومەر، دارۆ تووڕەبوو، وتی "ئەو قسانە بە گاڵتەشەوە خۆش نییە". دوای تەمەنێک پێکەوەبوون، بە دارۆم وت "بەجدی بەو قسەیە تووڕەبووبووی". وتی "ئەوە گەنجێتییە وادەکات و ئیتر باسی ئەو تووڕەبوونە مەکەرەوە".

**شەهید عوسمان کاژاویی**

دەمێکبوو بڕیارم دابوو ئەگەر ڕۆژێ لە ڕۆژان بیرەوەرییەکانم بنووسمەوە، باسی عوسمان بکەم.

عوسمان کاژاویی، لێپرسراوی مەفرەزە بوو لە مەکتەبی عەسکەری و بەیەکەوە بووین. کوڕێکی لاوازی باریکەلە، تۆزێ لوتی لاربوو، بەردەوام پوزەوانە و کلاوێکی خوریی لەسەردابوو، خەڵکی کاژاو بوو، لە سلێمانی دائەنیشت، لە شەڕی قڕناقا و پشتئاشاندا شەهیدبوو.

لە حوزەیرانی ١٩٨٠، هەواڵێک هات بۆ هێزەکانی پێشمەرگە کە ڕژێمی بەعس بەتەمای هێرشە بۆ سەری مامەندە، هێشتا دونیا ڕووناک نەبووەوە هەموومان خۆمان پێچایەوە و ڕۆیشتین بەرەو سەر شاخی مامەندە. شاخێکی بەرز تا چاوبڕدەکات ئاسۆیەکی دوور، دونیا کشومات، شاخەکان هێمن هێمن بەرەو ئاسمان هەڵکشابوون، دەنگی هیچ شتێ نەدەهات جگە لە دەنگی چەک دامەزراندن و گلۆربوونەوەی ناوبەناوی بەردێکی تەمەن هەزاران ساڵ، ئەوەندە بەرزبووین هەستم دەکرد نزیکین لە خودا، هیچم نەدەبینی جگە لە ئاسۆیەکی دوور. من و عوسمان کەوتینە لای یەکەوە، کلاشینکۆفەکانمان دامەزراند و کەوتینە قسە و گفتوگۆ بە چرپە، ئەوەندە بەهێمنیی ئەدوواین، ئەترساین شاخەکان لێمان بستێنن و بیکەن بە سەدا.

عوسمانی لاو، خۆشەویست بوو لای هەمووان، مام جەلال و کاک نەوشیروان و مەکتەبی عەسکەری ناوبەناو نامەیان پێدا دەنارد بۆ هێزەکانی پێشمەرگە و ناوشار.

عوسمان نەیدەزانی بڕوا، قاچی زەوی نەدەگرت، بەڵکو لەپێناو عەشقی خاک دەفڕی بەرەو ئەو شوێنە مەترسیدارانەی کە قاسیدی بوو.

پاش جێگیربوونمان لە سەری مامەندە، عوسمان وتی "نەرمین زۆر خەفەت دەخۆم شەهید بیت". منیش بە پێکەنین و سوپاسەوە وتم "نەمدەزانی خەفەتم بۆ دەخوی". وتی "دەزانی بۆ؟ چونکە هێشتا فیشەکێکت نەتەقاندووە بەڕووی دوژمندا. شەهیدبیت ناوت دەچێتە مێژووەوە و دەبی بە داستان، لەبەرئەوەی ژنی. ئەوەش نیعمەتێکە خوا داویەتی بە ژن، منیش شەهیدبم کەس باسم ناکات و وندەبم". دەمانچەیەکم پێبوو دام بەپشتیدا و وتم

"وامدەزانی خەفەت بۆ من دەخۆی!". کردمان بە پێکەنین، نزیکی ئێوارە هەواڵ هات، وتیان "هێرشەکەیان بەرەو لای ئێمە راگرتووە، هێزەکانی خوارەوە بەرەنگاریان بوونەتەوە و تێکشکاون و وەستاون".

جارێک عوسمانیان بە ئیش نارد بۆ ناوشار، ماوەیەک دواکەوت، هەواڵ هات وتیان شەهید بووە. هەواڵەکە زۆر دڵتەزێن بوو بۆ هەمووان بەتایبەتی بۆ مام جەلال و ملازم عومەر. مام جەلال زۆر پێوەی دیاربوو بە پیاسەی سەربانە قوڕەکەیدا، مام هەرکاتێ دوودڵ بوایە یان خەفەتی هەبوایە، بە پیاسەکەی هەستماندەکرد شتێکی ناتەواو هەیە. دوای چەند رۆژێک عوسمان دەرکەوتەوە و هەموومان زۆر دڵخۆشبووین، ئیتر برادەران ناویان نا شەهید عوسمان، هەرواش بانگمان دەکرد.

کاتێ دارۆ بوو بە نوێنەر لە پەیوەندییەکانی دەرەوە لە سوریا، دەمانویست بڕۆین بەرەو سوریا، عوسمان هات بۆ لام بۆ خواحافیزی، کوڵەپشتێکی لە بەرەچنراوی بۆ هێنام وتی "ئەوەشت با لابێ وەک بیرەوەری و پێم ناخۆشە شەهید نەبووی"، کردمانە پێکەنین. دیارییەکەیم زۆر لا بە نرخ بوو، هەڵمگرتبوو تا ٣١ی ئاب لام مابوو، لە ماڵەکەی هەولێر هەڵمواسیبوو، وەک هەموو بیرەوەرییەکانی تری ماڵەکە، لە هەولێر جێما و دەستمان نەکەوتنەوە.

کاتێ لە سوریا بووین، من بروسکەکانی کوردستانم بە رادیۆیەکی تایبەت بە جفرە وەردەگرت و جفرەکانم شیدەکردەوە و هەواڵەکانم ئەدا بە ئینصات و برادەرانی پەیوەندییەکانی دەرەوەم لێ ئاگاداردەکردەوە. ناوی وێستگەکەمان ئاوارە بوو، ویستگەی کوردستانیش ناوی ئاسوودە بوو، لە کوردستان کاک نەوشیروان سەرپەرشتیی دەکرد و دەوترا "لە ئاسوودەوە بۆ ئاوارە". زۆرجار کاک نەوشیروان بەتەوسەوە دەیوت "ماشەڵڵا لەو ئاسوودەییە". لە یەکێک لە بروسکەکاندا هەواڵی دڵتەزێنی شەهیدبوونی عوسمانی تیابوو، نەمدەتوانی خۆم بگرم و نەگریم، ئەم خاکە شیرینە چەند لاوی وا بلیمەتی گرتۆتە خۆی کە ئێستا زۆرکەم باسدەکرێن، عوسمان دەبوایە لە ئاسمان شەهیدبێ نەک لەسەر زەوی، چونکە عوسمان هەڵۆیەکی بەرزەفڕ بوو!.

له ئابی ١٩٨٠ له ناوچەی تۆژەڵە، بەڕێز مام جەلال، بە دارۆی وتبوو "پێم باشە بچیتە سوریا بۆ وەرگرتنی بەرپرسیارێتیی پەیوەندییەکانی دەرەوە و بەرپرسی پارتە کوردستانییەکان". مام جەلال نەیدەویست دارۆ بەشێک بێ لەو دەستەگەرییانەی لەو کاتەدا هەبوون، بە تایبەتی کوتلەی زیندان، (بەو برادەرانەیان دەوت کە لە زیندان بەیەکەوەبوون و بە لێبوردنی گشتیی ئازادکران، بەتایبەتی لە زیندانی ئەبوغریب و موسل و هەندێ زیندانی تری عیراق) بە رای من، ئەوانە ماوەی چوار ساڵ، لە هەمان زیندان و چوار دیوار، هەمان ئەشکەنجە و ئازار، هەمان خواردن و دووریی لە دونیای دەرەوە و بڕیاردان لەسەر ژیانی خۆیان کۆیکردبوونەوە. من ناوینانیم دەستەگەری (تکتل)، تەنیا هەندێ تێبینییان لەسەر پەلەکردنی ئەو بەرنامانەی کومیتەی هەرێمەکان هەبوو، بەڵام خۆشەویستیی مام جەلال بۆ دارۆ تایبەت بوو. حەزی نەدەکرد تووشی هیچ کێشەیەک ببێ. سەرەتا من پێم خۆش نەبوو، بەلام کە مام بۆی روونکردمەوە بۆ ئەو بڕیارەی داوە، ئیتر منیش تێگەیشتم و دارۆ و من و هاوڕێی کورم خۆمان کۆکردەوە و بەرەو ئێران بەڕێکەوتین. لەسەر سنوور قەرارگەی رەمەزان بەڵگەنامەی پەرینەوەیان بۆ کردین، من بەناوی فاتیمە و دارۆ بەناوی محەمەد نوری، دارۆ لە سوریاش هەر بەو ناوە مابەوە لە رووی فەرمییەوە.

(لیسە پاس تەنیا بۆ چوونە دەرەوەیە و بۆ یەک جار بەکاردەهات) کە گەشتینە مەهاباد، سەردانی مەکتەبی شێخ عزەدین و ماڵی سلێمانی بلوریمان کرد (بە داخەوە سلێمان لە ١٩٨١ لە ناوشاری مەهاباد شەهیدکرا، کە بە مەفرەزەیەکی پێشمەرگەی کۆمەڵەی ئێران جووبوونە ناوشار) و لای ئەوان ماینەوە. هاوڕێی کورم بەو چەند مانگە کەمەی گەیشتبووە لامان، دەتوت شاری نەبینیوە، بەدیار هەموو دوکانێکەوە دەوەستا. پاشان بە پاس بەرەو تاران رۆیشتین و لە تاران چووینە ئوتێل (پارس) دابەزین. زوربەی برادەرانی یەکێتی لەو ئوتێلە دادەبەزین و دەمانەوە. د.فوئاد مەعسوم کە بەرپرسی بیرۆی پەیوەندییەکانی ئێران بوو، لە ئوتێل پارس بوو. هەر لەوێ ئەحمەد بامەڕنیم ناسی، کە بەرپرسی بیرۆی یەکێتی بوو لە فەرەنسا، لەگەڵ تیمێکی رۆژنامەنووسیی کەناڵی سێی فەرەنسی هاتبوون و خەریکی مامەڵەی پەرینەوە بوون، تەمایان بوو بچنە ناو پێشمەرگەوە. لەوێ لە نزیکەوە مامۆستا موحسینم ناسی، هەندێ خێزانیشی لێبوو بەتەمای چوونە هەندەران بوون، یەکێک لەوان ماڵی کاک حەمە چاوشین بوو.

د.فوئـاد (٥٠) دیـنـاری عیراقیی دامـێ، وتـی «ئـەوە کافیە سلێمان بۆی ناردووی». هەستێکی زۆر خۆشبوو، بەتەنگەوەهاتنی هاوڕێیەک.

د.فوئاد مەعسوم زوو زوو هاوڕێی کوڕمی تووڕە دەکرد و پێیدەوت «هاوڕێ خان». هاوڕێ، وایدەزانی خان هەر بۆ ژنان بەکاردێت.

لە دواشـەوی چاوەڕوانیی لیسە پاس، لە ئوتێل پارس، بۆ ماڵئاوایی بۆ یەکەمجار ئەسپییەکی بێزارکەر کەوتە لەشمەوە و نەیهێشت بنووم، دوای ئەو هەموو ماوەیە خۆپاراستن لە ئەسپێ، هات و وتی «منت بیرنەچێ».

ئێمە (دارۆ، من، هاوڕێ)، هەروەها ئەو برادەرانەی کە دەهاتن بۆ خولی مەشقی سەربازیی (قیادة سرایا) لە سەربازگەی فەلەستینییەکان (جبهة الدیموقراطی الفلسطینی) لە باشووری لوبنان لە (صور وصیدا) کە ئەمانە بوون: حامی حاجی غالی، شۆڕش ئیسماعیل، دانای ئەحمەد مەجید، ئازادی سەگرمە، ئاراسی شێخ جەنگی، سەلاح چاوشین، شەهید ئەنوەر حەسەن، مامۆستا ئەنوەر، شاخەوان عەباس و ئەسکەندەر. دوای چەند رۆژێک، لیسە پاسەکانمان وەرگرت.

حامی حاجی غالی، هەندێ پارەی لادانـابـووم، دانیشتبووین و کەوتنە بانگکردنی ناوەکان، ناوم لە لیسە پاسەکە (فاتیمە) بوو، پۆلیسەکە بانگی دەکرد؛ فاتیمە خانم، منیش بیرم چووبووەوە ناوم فاتیمەیە، حامی هاواریکرد وتی "راکە کچێ پارەکەم"، تینەگەیشتم و هێشتا زۆر شارەزای قسە خۆشەکانی حامی نەبووم، ئیتر رامکرد و کارتەکەم وەرگرت. د.فوئادیش هەندێ وشکەخواردنی پێدا ناردبووین بۆ ماڵەوەیان لە سوریا، ئەوانەیان گلدایەوە و نەیانهێشت بیبەین کە بەهۆی ئابلۆقەی ئێرانەوە قەدەغە کرابوو.

کە گەیشتینە سوریا، کاک شازاد صائیب پێشوازی لێکردین و ئێمەی بردە ماڵەکەی خۆی و لەوێ ماینەوە، شووقەکەی لە گەڕەکی (بەرامیکە) بوو، نزیک ماڵی شەهید د.خالید و د.فوئاد مەعسوم، ماڵی د.محمود عوسمانیش لەوێبوون و دوای ماوەیەک ماڵی عەلی حەویزیش هاتنە هەمان گەڕەک. ئەو شووقەیە هۆڵێکی بچووک و دوو ژووری نووستن و چێشتخانەیەک و ڕاڕەوێک بوو، لەگەڵ ئەو بچووکییەی، میوان و خەڵکێکی زۆر تێیدا ئەژیاین. دوای ماوەیەک و هەر هەمان ساڵ، خەباتی شێخ جەناب هات و چوو بۆ هەندەران بۆ چارەسەر،

که لەئەنجامی ئەشکەنجەدانی زیندان، تەندروستیی خراپ بووبوو. هەروەها حەمیدی برای رەزاق فەیلی و ئێمە و خێزانەکەشی لە هەمان شووقەبووین. رۆژانە میوانێکی زۆر رووی تێدەکردین، بەتایبەتی برادەرانی پارتە سیاسییەکانی تورکیا کە بەهۆی کودەتاکەی (کەنعان ئیڤرین) لە ١٢ی کانوونی یەکەمی ١٩٨٠ و گشتبگیری و کوشتن و برینی چالاکوانە سیاسییەکان لە تورکیا، روویان دەکردە سوریا.

هەندێ لەو پارتانە پێش کودەتاکەش لە سوریا بارەگایان هەبوو، وەک (DDKD) بە سەرۆکایەتی (عومەر چەتین) کە یارمەتییەکی باشی یەکێتییان دابوو لە گواستنەوەی پێشمەرگە و چەک بۆ دیوی عیراق. هەروەها (کوک) و (کوک سۆشیالیست)، پەیوەندیی ئەوتۆمان نەبوو لەگەڵیان. کوک، کورتکراوەی (بزووتنەوەی رزگاریخوازی کوردستان) بوو و پارتی سۆسیالیست بە سەرۆکایەتی (کەمال بورقای) بوو. ئەوانەشی لەدوای کودەتاکە هاتن و بڕیاری گرتنیان درابوو، ئاڵای رزگاری، هەڤاڵان (سەلیم و خالید و هەڤاڵ خەجۆ و گوڵفەری خێزانی سەلید). ئەوانە سەرەتا لای ئێمە بوون، دوایی شووقەیەکی تایبەتیان بۆ گیرا، بەڵام هەڤاڵ خەجۆ زیاتر لای ئێمە مایەوە و لای ئێمەشەوە چوو بۆ ئێران و لەوێوە بو لای سەرکردایەتی یەکێتیی نیشتمانی.

هەڤاڵ خەجۆ رۆژانە لەگەڵ هاوڕێ دەچوو بۆ قوتابخانە، هەردووکیان عەرەبییان نەدەزانی، هەڤاڵ خەجۆ دەیوت "دەترسم زوڵم لە هاوڕێ بکەن". بەدرێژایی رۆژەکە بەدیاریەوە دەمایەوە. هەندێکجار بەیەکەوە دەمناردنە بازاڕ، ناوی شتەکەم پێدەوتن یان بۆم دەنووسین، جارێک ناردمن بۆ کڕینی خوێ، پێموتن "بڵێن (ملح)". تا گەیشتبوونە دوکانەکە هەردووکیان بیریانچووبووەوە.

هەندێکجار کادیرەکانی لایەنە سیاسییەکانی کوردی تورکیا، بە قاچاخ دەهاتنە ناو سوریا و دەگیران و دەیانناردە بەدوای دارۆیا کە ناوی (محەمەد نوری) بوو، دارۆ کەفالەتی دەکردن.

گواستنەوەی پێشمەرگە و چەک لە سوریاوە بەرەو عیراق، زۆر ئەستەم بوو، بەتایبەتی بەهۆی ئەو رێککەوتنەی کە لە ساڵی (١٩٧٨) لەنێوان عیراق و تورکیا واژوو کرابوو، بۆ چاودێرییەکی بەهێزی سنوورەکان. هەروەها ئەو رێککەوتنەی ساڵی (١٩٨١) کە هێزە سەربازییەکانی عیراق و تورکیا بۆ

مەبەستی کۆنترۆلکردنی سنوور، بۆیان هەبوو (١٧کم) بچنە ناو خاکی یەکتری، ئامانجیشیان ئابلوقەدانی هاتووچۆی ئۆپۆزسیۆنەکانی هەردوو دەوڵەت بوو.

هەر لە ئەیلولی ١٩٨٠ برادەرانی (PKK) دەستیانکرد بە هاتنە ناو خاکی سوریا. رۆژێک دارۆ هاتەوە برادەرێکی لەگەڵ بوو، وتی "ئەم برادەرە، ئاپۆیە سەرۆکی (PKK)یە". ئەو وەختە بەرێز عەبدوڵلا ئۆجەلان بە ئاپۆ ناسرابوو و ناوی نهێنیی (عەلی) بوو. یەکەمجاربوو بیبینم، زۆر کەمدووبوو، هەردووکمان زاراوەی یەکتریمان باش نەدەزانی. دارۆ رۆیشت بۆ ئەوەی برادەرێکی تریان ئازادبکات. کەوتینە قسە و هەرچۆنێکبێ هەندێ گفتوگۆمان کرد، من هەندێ وشەی تورکی و کرمانجی، ئەویش هەندێ سۆرانی، تۆزێک لەیەک حاڵی دەبووین، لێمپرسی؛ منداڵ و خێزانەکەی لەکوێن؟ وتی "منداڵم نییە (زارۆک نینە)". بۆ خێزانیشی، وتی «ناوی فاتیمەیە". لەدواییدا زانیم ئەو ناوە ناوی نهێنیی (کەسیرە یلدرم)ە کە خێزانی ئاپۆ بوو. دەستمکرد بە ئامادەکردنی خۆراک، ئەویش کتێبێکی بەدەستەوەبوو دەیخوێندەوە. دوای چەند رۆژێک باشتر لەیەک حاڵی دەبووین وماڵێکیان لەهەمان باڵەخانەکەی کاک ئاوات عەبدولغەفور بۆ گرتن و یەکێتیی نیشتمانی کرێکەی ئەدا، لەوێ ناوبەناو سەردانمان دەکردن. ئەو برادەرانە دەروێشانە دەژیان. بو نموونە؛ خواردنەوەی مەی نەبوو لایان، رادیکاڵانە و بۆرژوازییانە مامەلەیان لەگەڵ خواردنەوە دەکرد. جارێک ئاوات عەبدولغەفور هەڤاڵ عەلی (ئاپۆ) رازیکردبوو بیرەیەک بخواتەوە، کاک ئاوات تەلەفۆنی بۆ دارۆ و کاک ئەحمەد نامەرنی کرد، وتی «وەرنە لامان، هەڤاڵ ئاپۆش بڕیاریداوە بیرەیەک بخواتەوە لەگەڵمان». ئیتر لەو دانیشتنەدا ئەو بڕیارەی جێبەجێکردبوو.

کوڕێک هەبوو ناوی ئەدهەم بوو، لەیادم نەماوە سەر بە کام لایەن بوو، بەڵام کوڕێکی وریا و بلیمەت بوو، لە شێوەزاری سۆرانیی باش تێدەگەیشت. جارێک من لە ماڵ نەبووم، تەلەفۆنی بۆ ماڵەوە کردبوو، خێزانی کاک حەمیدی برای رەزاق فەیلی هەلیگرتبوو، وتبووی «ئەز، ئەدەمم». کە هاتمەوە پێیوتم «ئەز ئەتەمم تەلەفونی کرد»، منیش وتم «نایناسم»، دوایی زانیم ئەدهەم بووە.

کاک ئاوات عەبدولغەفوریان کرد بە بەرپرس بۆ کاروباری (پەکەکە)، ئەو کارەکانی بۆ جێبەجێدەکردن جگە لە بەردانی ئەندامەکانیان کە تەنیا دارۆ بۆی هەبوو کەفالەتیان بکات.

له سەرەتای بوونمان له سوریا، له کەم شوێن دروشم و پیاهەڵدان بەسەر حافز ئەسەد (سەرۆک کۆمار)دا هەبوو، بەلامەوە نامۆ بوو بە بەراورد لەگەڵ عیراق که دروشم و پیاهەڵدان بەسەر سەدام حسێندا، چاوی کوێر کردبووین، بەڵام کاتێ له سوریا دەرچووین. وەک عیراقی لێهاتبوو، دروشمەکان بە هەموو شەقام و کۆڵانەکاندا بڵاوبووبوونەوە.

حافز ئەسەد، له ساڵی ١٩٨٣ تووشی نەخۆشیی شێرپەنجە بوو، له ساڵی ١٩٨٤ نەخۆشییەکە بە هەموو لەشیدا بڵاوببووەوە و بوو بەهۆی ئەوەی جارێک لەهۆش خۆی چوو. رەفعەتی برای، ئەمەی بەهەلزانی و دەسەلاتی گرتەدەست. هەر کە تەندروستیی حافز ئەسەد تۆزێ باشتربوو، جلی سەربازیی لەبەرکرد و دەسەلاتی گرتەوەدەست. ئەو سەردەمە باس لەوە دەکرا کە (باسل ئەسەدی) کوڕی حافز ئەسەد ئامادە دەکرێ بۆ وەرگرتنی دەسەلات و رەفعەت ئەسەد خۆی بەشایستەتر دەزانی. له هەموو دەزگاکانی راگەیاندن قارەمانێتیی باسل ئەسەد باسدەکرا کە چۆن بە پەرەشوت لەگەڵ گەنجان خۆی فڕێدەدا و چۆن بە یەکەم پاڵەوانی نیشانەشکێنی تفەنگ له سوریا دەستنیشانکراوە، هەموو خەڵکی سوریا دەیانزانی باسل ئامادە دەکرێ کە دوای باوکی دەسەلات وەربگرێ، بەڵام له ساڵی ١٩٩٤ له نزیک فرۆکەخانەی شاری دیمەشق، بە رووداوێکی ئۆتۆمبێل گیانی لەدەستدا، هەربۆیە دوای مردنی حافز ئەسەد له ١٠ی حوزەیرانی ٢٠٠٠، بەشار ئەسەد دوای مانگێک بوو بە سەرۆک کۆمار و دواتریش بوو بە ئەمینداری پارتی بەعس.

لەو ولاتانەی کە دەسەلات دەستاودەست ناکرێ یان بەشێوەیەکی دەستکاریکراو بەردەوام دەسەلات وەردەگرنەوە، وردە وردە بەرەو دیکتاتۆریەت هەنگاودەنێن و دەسەلات قۆرخ دەکەن و بە مافی سروشتیی خۆیانی دەزانن دەسەلات لەنێو خێزانەکەی خویان دەستاودەست بکات، بۆیە رژێمی سوری، زۆر بە زوویی له دەسەلاتێکی دیموکراتخوازەوە بوو بە رژێمێکی دیکتاتۆر.

باری ئابووریی خەڵکی سوریا زۆر خراپ بوو، خێزانەکان بە کارتێکی (موونە) خۆراکی سەرەکییان بە هەرزانتر دەستدەکەوت، بۆ ئێمە ئەو مونەیە نەبوو. له هەر ماڵێکی سوری سێ چوار کەس کاریدەکرد بۆ ئەوەی بتوانن بەسادەیی بژین. دراوسێیەکمان هەبوو شووقەکەیان هێندەی شووقەکەی ئێمە

بوو، (١٣) کەسی تیا دەژیا، جارێک لە ژنەکەم پرسی؛ چۆن جێگەتان دەبێتەوە؟ لەوەڵامدا وتی "الشاطر يحصل على مكان للنوم"، واتە؛ ئەوەی ئازابێت جێگای نووستن بەدەستدەهێنێت.

تازە گەیشتبووینە شام، جەژنی قوربان هات و مام جەلال لە شام بوو، (٥٠٠) لیرەی سوریی بە جەژنانە دامێ، ئەوسا نرخی لیرە بەرزبوو. منیش بەو ئۆتۆمبێلە (لادا) کۆنەی کە درابوو پێمان، لەگەڵ هاوڕێ چووین بۆ بازاڕ بۆ کڕینی جلوبەرگ، چونکە هەموومان بێ جلوبەرگ بووین. لە بازاڕ من و هاوڕێی کورم چووینە دوکانێکی لەفەی گەس و نانمان خوارد، کاتێ گەڕامەوە بۆ لای ئۆتۆمبێلەکە، سەیرمکرد نە پارەکەم پێماوە نە سویچی ئۆتۆمبێلەکە، هەردووکیان لێ دزیبووم. کە گەیشتمە ماڵەوە و رووداوەکەم باسکرد، دەستمکرد بە گریان، بۆ یەکەمجاربوو بۆ پارە بگریم. خەباتی شێخ جەناب گاڵتەی پێدەکردم و دەیوت "لیرەکانم، وەک (تەمسیلە کوردییەکەی جەنابی موفەتیش)، وەرە لامەوە وابورامەوە". منیش رقم هەڵسابوو، ئیتر بەگاڵتەوە بۆ هەموو برادەرانی خۆمانیان باسکرد و د.فوئاد مەعسوم تەلەفونی کرد، وتی "چییە نەرمین بۆ لیرەکانت دەگریت؟". یەکێ دەیوت "لیرەکانت قوربانی خۆت بێ". یەکێ دەیوت "حەیف بۆ ئەو لیرە چاوزەقانە". بووبوو بە نوکتە. منیش کردبوومە تەمسیل و نووسیبوومەوە وەک تەمسیلییەک، بەڵام بەداخەوە ئەو دەفتەرەشم وەک زۆربەی نووسینەکانی ترم نەما، خۆم و پارەکەم وەک ئەنەنە و هیزەی رۆنەکەم) لێکردبوو.

هەندێ کەسایەتیی کوردستانی باکوور هەبوون، وەک شەهید نەجمەدین یوکسک، ناسراو بە سەلاح نەجۆ، ئەوکاتەی من ناسیم وازی لە مەکتەبی سیاسیی (DDKD) هێنابوو، راستەوخۆ لەگەڵ یەکێتیی کاریدەکرد. هاوکاری یەکێتیی بوو بۆ دەربازکردنی پێشمەرگە و چەک، کەسێکی زۆر دڵسۆز و رووخۆش و هاوکاربوو. جارێک بەیەکەوە گەیشتینە ماڵەوە و کلیلم پێنەبوو، هەڤاڵ سەلاح بەسەر بۆریی لادیوارەکەدا چووە ناو بالکۆنی شووقەکەوە و دەرگای کردەوە.

لە ساڵی ١٩٨٢، بە هاوکاریی یەکێتی، پارتێکی دروستکرد بەناوی (پاک) پارتی ئازادیی کوردستان، لە سوریا و تورکیا کاری حیزبی دەکرد. یەکێتی دەزگایەکی چاپەمەنیی لە دەرەوی وڵات بۆ کڕی و گەڕایەوە بۆ تورکیا بۆ چالاکیی، دەست رژێمی تورکیا کەوت و گیرا، بەداخەوە لە٢٣ی کانوونی

دووەمی ١٩٨٤، لەناو زیندانی دیاربەکر، کە بە یەکێ لە خراپترین زیندانەکانی جیهان دادەنرێ لەرووی ئەشکەنجەدانەوە، لەژێر ئەشکەنجەدا شەهید کرا.

هەرچەندە یەکێتی ٢٦ی کانوونی دووەمی ١٩٨٤ی بە رۆژی شەهیدکردنی هەڤاڵ سەلاح دانا، بەلام بەپێی زانیاریی کەسوکاری، ٢٣ی کانوونی دووەمی ١٩٨٤ شەهید بووە.

زیندانی دیاربەکرد بەندکراوێکی زۆری پارتە جیاجیاکانی لێبوو، گەنجەکانیان مانیانگرت و هەڤاڵ نەجو بە گیانی بەرپرسیارێتی و کوردایەتی، خۆی لەوان جیانەکردبووەوە و بە بەرپرسیان دائەنا، ژەندرمەکانی تورک ئەشکەنجەیەکی نامرۆڤانەیان دابوو و بەهۆیەوە شەهیدبوو، دوایی زیندانەکەشیان سووتاند بەسەر مانگرە کوردەکاندا و بەندکراوێکی زۆر بەهۆی سووتانەکەوە شەهیدبوون.

پارتێکی تریش هەبوو کە بە (کاوە) ناسرابوون، لە ئەندامانی مەکتەبی سیاسییان، ئەوانەی کە دەماننناسین و هاتووچۆیان دەکردین: کاک ئەحمەد و خێزانەکەی باکسی (کە خوشکی مەحمود باکسیی نووسەر و رۆژنامەنووسی کوردی و سویدی) بوو، هەروەها دکتۆر سەردار. ئەو حیزبە، چەپی مارکسی بوون و لەسەر رێبازی ئەلبانیا (ئەنوەر خواجە) بوون، بەداخەوە دیسان دەستی چەپەڵی ژەندرمەکانی تورکیان گەیشتێ، لەوکاتەی لە شامەوە گەڕانەوە بۆ سەر سنوور، لە ماڵی (رەمەزان کابراش)، لە گوندی (چڕنک)، نزیک قامیشلوو، بۆمبیان خستنە ناو ماڵەکەوە و لەوێدا شەهیدیان کردن. ئەوکات باکسی دووگیانبوو، (تائێستاش دیارییەکی بەنرخی ئەوم لاماوە کە ئەنگوستیلەیەک بوو، بەدیاریی بۆی هێنابووم). بەگشتیی برادەرانی کاوە و ئەو ماڵەش کە لێیبوون، ١٥ کەسیان شەهیدبوون و ئەوانی تریش برینداربوون، شەهیدەکان (حسێن ئەرسەلان، نەجلا باکسی، محەمەد ئەمین موتلو، موسلم یاڵدز، محەمەد ئەمین دورسەن، حەسەن ئەکبابا، رەمەزان کابراش، مونیف رەمەزان، ئەمین رەمەزان، عەبدولکەریم رەمەزان، شوکر رەمەزان، ئازاد رەمەزان، خۆشناف رەمەزان، کاوە کەریم و ئافرات کەریم) بوون.

هەروەها پارتی سۆسیالیست (ئۆزگیلک یولو) بە رابەرایەتیی (کەمال بورقای) ناسرابوون بە رێگای ئازادی بەهۆی ئەو گۆڤارەی کە دەریاندەکرد، ئەوان پارتێکی چەپ بوون، بڵاوکراوەکانیان بە زمانی کوردی و تورکی بوو.

هەندێ پارتی تری لێبوو، وەک پارتی رزگاری کە پەیوەندیی ئەوتۆمان نەبوو لەگەڵیان. پارتی تریش هەبوو لە برادەرانی پارتی دیموکراتی کوردستان نزیکبوون و کەمتر لەگەڵ ئێمە پەیوەندییان هەبوو، وەک پارتی دیموکراتی کورد هەروەها حیزبی شیوعی عیراقی و کاک عەزیز محەمەد کە لە سوریا بوو، هەندێکجار کاک عەزیز محەمەد دەیوت "پەیوەندیی یەکێتی و حیزبی شیوعی (عەهدی زێڕین)ە".

پەیوەندییەکانمان لەگەڵ پارتی سۆسیالیستی کوردستانی عیراق (مەحمود عوسمان) باش بوو، ئەوکات کاک عادل موراد و کاک عەدنان موفتی، لەگەڵ کاک مەحمود بوون.

لەو پارتە کوردییانەی کوردی رۆژئاوا کە پەیوەندیی باشمان لەگەڵیان هەبوو، ئەوکات لە هەموویان زیاتر، پارتی دیموکراتی پێشکەوتنخواز، پارتەکەی (حەمید دەرویش) بوو، پەیوەندیی خێزانیشمان هەبوو لەگەڵیان، بارەگای سەرەکییان لە قامیشلوو بوو و سەردانی خێزانیمان هەبوو بەیەکەوە، لەگەڵ لەیلا خانی خێزانی کاک حەمید دەرویش کە خوشی چالاکوانێکی ژنان بوو، سەردانی عەفرین و سەر سنوور و حەلەبمان کرد، بەهۆی ئەوانەوە دەیان خێزانی کوردپەروەری کوردستانی سوریامان ناسی، لە نووسینێکمدا لەسەر لەیلا خان (لەیلا تیلۆ)، بە وردی باسمکردووە، بۆیە نامەوێ لێرە باسیبکەمەوە.

هەروەها پارتی کوردی چەپ لە سوریا ئەمینداری گشتی (عیسمەت سەیدا یوسف)، پارتی سوسیالیستی کوردی چەپ و سوریا (عەزیز شەرکس)، پارتی دیموکراتی کوردی سوری (شێخ محەمەد عەبدولباقی)، هەروەها لەگەڵ دەیان کەسایەتی و نووسەر پەیوەندی باشمان هەبوو.

پاش ماوەیەکی کەم، د.فوئاد مەعسوم هاتە سوریا و بوو بە بەرپرسی پەیوەندییەکانی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست. هەندێکجار سەردانی لیبیای دەکرد، ئەوسا لیبیا و سەرۆک قەزافی زۆر دۆستی کورد بوون و چەند جارێک بە پارە هاوکارمان بوون، هەرچەند گەشتی لیبیای بکردایە، جلی لیبیی بۆ دەهێنایین کە شەرواڵ و کراسێکی سپی بوو. پەیوەندیی خێزانیمان زۆر بەهێزبوو، هاوڕێی کوڕم هاوتەمەنی شوانی کوڕی د.فوئاد بوو کە بەداخەوە هەرزوو بە نەخۆشییەکی کوشندە جێیهێشتین، رووناک خانی هاوسەریشی وەک خوشکێکی گەورە وابوو بۆم.

لەگەڵ ماڵی شەهید دکتور خالید، لە هەموو ماڵەکانی تر زیاتر پەیوەندیمان هەبوو، لوتفی خانی هاوسەری شەهید دکتۆر خالید، ژنێکی زۆر ڕێزدار بوو، هاوڕێی دایکم بوو، وەک کویە دەڵێن (دەستەخوشک) بوون. هەروەها لەگەڵ ماڵی عەلی حەویز و حەلاوەخانی هاوسەری و ماڵی ئاوات عەبدولغەفور و پرشنگی هاوسەری.

لەو کەسانەی کە دەهاتن بۆ سوریا، خاتوو ئەگنێتای هاوسەری کاک عومەر شێخ موس بوو، لە کۆتایی ئازاری ١٩٨١، هاتە ماڵمان و نزیکەی مانگێک مایەوە لامان.

خاتوو ئەگنێتا خەڵکی سویدە، خاتوونێکی کوردپەروەرە، بەهۆی کاک عومەرەوە تێکەڵی شۆڕشی کورد و یەکێتیی نیشتمانیی بووە و مێژووی کوردی بە وردیی دەزانی. بە زمانی ئینگلیزی بەیەکەوە ئەدووایـن، زۆر ڕووداوی خۆش لەنێوانمان ڕوویئەدا بەهۆی کەمیی زانیاریم بۆ زمانەکە لەوکاتەدا. لەو سەردەمە هەڤاڵێکی کوردی تورکیا دەهاتە ماڵمان، سمێڵی زۆر گەورەبوو، هەرچەندە دەهات، چاک و چۆنی لەگەڵ ئێمە نەدەکرد. منیش جارێک وتم: "داخی ئەو سمێڵ دەسکە کەوەرە". ئەگنێتا، پرسی؛ یانی چی؟ منیش نەمزانی بە کەوەر دەڵێن چی، وتم "(Bundle of vegetables)، سمێڵ دەسکە سەوزە". ئیتر ئەویش بە هەمان ناو ئەیوت. ژنێکی تا بڵێی سادە و ساکار و ڕوحشیرین، زۆر شتی جوانی لێوە فێربووم.

ناوبەناویش خێزان دەهاتن، ماوەیەک دەمانەوە تا مامەڵەیان تەواودەبوو و بەرەو هەندەران دەڕۆیشتن. وەک؛ ماڵی سلێمانی قەساب و خێزانەکەی، ماڵی سەلمە خان و شێخ مەنسور و شێخ ناسری حەفید و شەهلا حەفید. شەهلا خان چوو بۆ سوید، ئەو ماوەیەی لەوێبوون، شێخ مەنسور و شێخ ناسری حەفید، هاوسەرگیرییان لەگەڵ میان و پەیمان، هەردوو کچە پوری هێرۆ خان ئەنجام دا، دارۆ داواکردنەکەی ئەنجامدا، لە مام جەلال داوایکردن.

کاک عومەر دەبابە و سورەیا خان و منداڵەکانی، لە سوریا بوون. کاک عومەر، نوێنەری بزووتنەوە بوو لە شام، دوای ماوەیەک بەرەو لەندەن ڕۆیشتن.

ئیدارەی ئۆفیسی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان لە شام، کاک ڕەزاق کۆیی بەرپرسی بوو.

کاک ڕەزاق فەیلی و ئامینە خانی هاوسەری و دیمەنی کچی، گەیشتنە سوریا. کاک ڕەزاق لە بالیوزخانەی سوریا لە ئێران ئیشیدەکرد و پاشان گیرا، کە بەربوو، ئەویش هاتە شام و وردە وردە کارەکانیان دابەشکرد. کاک ڕەزاق

پەیوەندیی باڵیۆزخانەکانی وەرگرت، ئارامی کوڕم ناوی لێنا (عەمو)، ئەو عەمو ڕەزاقەی هەر پێوەمایەوە.

پاش ماوەیەک، گواستمانەوە بۆ شووقەیەکی تۆزێ گەورەتر هەر لە هەمان گەڕەک (بەرامیکە).

کاک عەدنان گلی هاتە شام و لەسەر داوای کاک شازاد، ئەو هەواڵ و زانیارییانەی تایبەت بوون بە کوردستان و هەواڵە گرنگەکانی ڕۆژنامەی وڵاتە عەرەبییەکانی کۆدەکردەوە و دەیکردە نەشرەیەک نزیک (١٠) لاپەڕەی (A4) دەرئەچوو، دواتر (٥٠) کۆپییان لێدەکرد و دەیانناردەوە بۆ کوردستان. هەروەها ئەوکات (صوت الاتحاد) دەرئەچوو، کاک عدنان گلی لێپرسراوی هونەریی ڕۆژنامەکە بوو تا ئەو لە شام بوو. کە کاک عدنان ڕۆیشت، بەرپرسیارێتیی کۆکردنەوەی هەواڵی ڕۆژنامە عەرەبییەکانیان دا بە من، دوای کۆکردنەوەی هەواڵەکان، دەکەوتمە دۆزینەوەی وشەی یەکتربڕ (الکلمات المتقاطعة)، دارۆ زۆر پەست دەبوو، دەیوت "تاقەتت نەچوو؟" منیش لەبری تووڕەبوون پرسیارێکم لێدەکرد، ئیتر دەیوت "سوودی نییە لەگەڵتا".

هەر هەواڵێکی گرنگ هەبوایە و باسی کوردی تیابوایە، کۆدەکرایەوە. هەندێکجار دڵمان خۆشدەبوو بە باسکردنی کورد ئەگەر بشیانووسیایە (العصابات الکوردیة)، دەمانوت "گرنگ ئەوەیە باس بکرێین". ئەوەی ئامادەمان دەکرد، تەنیا بۆ کوردستان نەدەڕویشت، بەڵکو بۆ نوێنەرەکانمان لە ئەورووپاش دەڕۆیشت. ئینصاتیش دەرئەکرا. کۆکردنەوەی زانیاریی درابووە دەست نازەنینی خوشکم.

هاوڕێ، تەمەنی بوو بە حەوت ساڵ، زۆرکەس دەیانوت "با ئیتر هاوڕێ تەنیا نەبێ». هاوڕێ، خۆشی زۆر ئارەزووی بوو خوشکێ یان برایەکی هەبێ، بۆیە بڕیارماندا منداڵێکی ترمان هەبێ.

لە ئایاری ١٩٨١، سکم حەوت مانگ بوو کە دارۆ و برادەران گەڕانەوە کوردستان بۆ بەشداریی کۆنگرەی کۆمەڵە، پرشنگ خانی هاوسەری کاک ئاوات عەبدولغەفور هاتە لامان. لەو ماوەیەدا بڕیارمدا بچمە خولی زمانی ئینگلیزی، هاوڕێ و پرشنگ خان دەچوونە ماڵی شەهید دکتۆر خالید. من تەندروستیم باش نەبوو بەهۆی تووشبوونم بە نەخۆشیی شەکرە، لاوازیکردبووم و لە ژێر چاودێریی پزیشکیدا بووم، سێ ڕۆژ پێش لەدایکبوونی (ئارام)، دارۆ گەڕایەوە

بۆ سوریا. کاتێ ژانم بو هات، دارۆم دەستنەکەوت و تەلەفۆنم بۆ ئاراسی شێخ جەنگی کرد، بەپەلە هات بە لادایەک منی گەیاندە نەخۆشخانە و دوای تۆزێک دارۆ و کاک شازاد صائیب و کاک رەزاق کۆیی گەیشتن و لوتفی خانی هاوسەری شەهید دکتور خالیدیش پێش ئەوان لامبوو. لە ١ی تەمووزی ١٩٨١ لە نەخۆشخانە بووم، نزام دەکرد کە لە ١ی تەمووز منداڵەکەم لەدایک نەبێ. لوتفی خان دەیوت «چۆن نزای وا دەکەی، با زوو رزگارتبێ». دەموت «با لەگەڵ لەدایکبوونی زۆربەی گەلی عیراق نەبێ، وەک ئەوەیە رژێم ئەو بەروارەی بۆ دانابێ». بەرواری لەدایکبوونی زۆربەی خەڵکی عیراق (٧/١) نووسراوە. ئیتر ئارام کاژێر یەکی شەو لەدایکبوو و بە ٢ی تەمووزی ١٩٨١ نووسیمان.

ئارام، بەهۆی ئازاری ریخۆڵەکانی، زۆر دەگریا. ئەو ساڵە زۆر گەرمبوو و پانکەشمان نەبوو، بەبونەی لەدایکبوونی ئارام، پانکەیەکمان کڕی. ئەوکات دکتۆر شادمان مەستی گەیشتبووە لامان، رۆژانە کاتی نانخواردنی نیوەڕۆ دەهات بۆ ئەوەی ئارام بباتت تا من بتوانم بەهێمنیی نان بخۆم، (دکتۆر شادمان، پزیشک بوو لە ناوزەنگ و سەرکردایەتی).

نزیکەی دوو مانگ پاش لەدایکبوونی ئارام و دەوروبەی ئەیلولی ١٩٨١، نازەنین و بەیان گەیشتنە لامان. ئەوان وەک دوو پزیشکی پێشمەرگە لە ناوزەنگ، چووبوون بۆ فەرەنسا بەمەبەستی بەشداریکردن لە خولێکی شەش مانگیی پزیشکانی بێسنوور، لەبارەی فریاکەوتن و نەشتەرگەریی بچووک. کە گەیشتنەوە سوریا، دەبوایە جارێکی تر رێگایان پێبدرێت بگەڕێنەوە بۆ کوردستان، چونکە لە رێگای ئێرانەوە بە لیسە پاس هاتبوون و لیسە پاسیش تەنیا بۆ یەک جارە، ئەوکاتە نێوانی یەکێتی و ئێران باش نەبوو، پیاوێک هەبوو بەناوی حاجی، ئەو کارانەی ئەنجام ئەدا، مامەڵەی گەڕانەوەی بۆ نەکردن و ئیتر لە سوریا مانەوە و بێهیوابوون لە گەڕانەوە.

بۆ ساڵی دواتر، داوای خوێندنیان کرد تا لە سوریا خوێندن تەواوبکەن، نازەنین قۆناغی پێنجی ڤیتەرنەری بوو، بەیان قۆناغی چواری کۆلێجی پزیشکی بوو، نازەنین لە شاری (حەما) وەرگیرا و بەیان لە شام. نازەنین بە یەک ساڵ هەم هاوتای بڕوانامەکەی کرد و هەمیش خوێندنی تەواوکرد، ئیتر بڕوانامەی کاری وەرگرت.

پاشان هەردووکیان لە چەندین رووەوە هاوکارم بوون. دوای دەرچوونی نازەنین، ئیتر بوو بە بەرپرسی کۆکردنەوەی هەواڵەکان بۆ ئینصات.

ئەو ماوەیە، هەڤال خەجۆ و ئەگنیتای خێزانی کاک عومەر شێخ موسمان لابوو، هەروەها ماوەیەکیش برادەرانی پارتی کاوە و خێزانی کاک ئەحمەد و کاک شازاد صائیبیش، جێگامان زۆر تەنگبوو، گواستمانەوە بۆ شووقەیەکی تۆزێ فراوانتر هەر لە هەمان گەڕەک. ئەو شووقەیە نیوەی کەلوپەل و پێداویستیی تێدا نەبوو، کاک شازاد جگە لەوەی پیاوێکی زۆر رۆح سوک و قسە خۆشبوو، زۆریش رێزی دەگرتین و نەیدەهێشت جلەکانی بشۆم، ناوبەناویش دەهاتە چێشتخانە و دەیوت «یارمەتیت بدەم». منیش جارێک بە دارۆم وت «ئەها کاک شازاد چۆن دڵی با هاوکارت بم، کەچی تۆ قەت پێم ناڵێی». وتی «باشە ئەمجارە کە وتی، بڵێ باشە وەرە یارمەتیم بدە». کە بە کاک شازادم وت، بیانووی هێنایەوە. ئیتر دارۆ وتی «ئەها، من برادەری خۆمە لەمنداڵییەوە، باش یەکتر دەناسین». ئیتر بوو بە پێکەنین و دەهاتەوە دەیوت «ئەمجارە بەجدیمە، یارمەتیت ئەدەم»، بەلام من دڵم نەدەهات. دارۆ و کاک شازاد لەسەرەتاییەوە بەیەکەوە بوون، هاورێیەتییان رۆژ بەرۆژ بەهێزتر دەبوو. کاتێ کاک شازاد کۆچی دواییکرد، دارۆ لە براکانی زیاتر بۆی دەگریا، گریانی نەدەوەستا، هەر باسمان بکردایە چاوی پڕدەبوو لەئاو، بۆیە دەزانم چەند لای ئازیز بوو.

لە شووقە تازەکە، تاقمی دانیشتنمان نەبوو، دوای ماوەیەک تاقمێکی کۆنەمان کڕی، بەهۆی ئەوەی دارۆ لە زیندان مامۆستای دارتاشیی بوو، قوماشمان کڕی و خۆمان چاکمانکرد.

لەو شووقە تازەیە، رێژەمان زیاتری کرد، کچێکی ناسیاوی کاک رەزاق فەیلی، ئەو کاتەی راگویزرابوون بۆ ئێران، خۆی خوێندکاری ئەندازیاریی بوو لە عیراق، ئاوارەبوون و هاتە ماڵی ئێمە بۆ تەواوکردنی خوێندن، ناوی نیزاڵ بوو.

ماوەیەک دکتۆر مەجیدیش بەهۆی برینداریییەوە لە ماڵی ئێمە مایەوە تا مامەڵەی بۆ تەواوکرا و چوو بۆ سوید، بەهۆی برینداریییەکەیەوە توانای هاتووچۆی باش نەبوو، ساچمەی هاوەن بەر سەری کەوتبوو، لە ئێران بەشێک لە ئێسکی سەریان لادابوو. دارۆ لە کاتی شووشتنی سەری دکتۆر مەجید، نەیزانی هەر کە دەستی بۆ برد، هاواریکرد. ئیتر دەبوایە زۆر بە وریاییەوە

ئاگامان لێی بێت. بەداخەوە هەر لەبەر هەمان هۆ، دوای چەند ساڵێک شەهیدبوو.

کاک عومەری سەید عەلی، بەهۆی برینداربوونی بە سەختی، لە ناوەراستی کانوونی دووەمی ١٩٨١ گەیشتە شام، برینەکانی زۆر خراپ بوون و نەیدەتوانی رێبکات، یەکسەر لە فرۆکەخانەوە بردیانە نەخۆشخانەی سەربازی، رۆژانە بە نۆبە لای دەماینەوە، ئەویش مامەڵەی تەواوکرا و ناردیانە سوید. پیاوێکی زۆر ئازابوو، ئازارەکەی یەکجار زۆربوو، بەڵام دانی بە خۆیا گرتبوو. زۆربەی کات بە دەرمانی هێورکەرەوەی ئازار ئەیتوانی تۆزێک پشووبدات. هەروەها هونەرمەند و پێشمەرگە (کاوە)، ئەویش بەهۆی ساچمەوە کەوتبووە سەر عەرەبانە و گیانی هەمووی برین بوو. دوای کاک عومەر بەماوەیەکی کەم، دارۆ لە فرۆکەخانەوە گەیاندیە هەمان نەخۆشخانەی سەربازی. هەرسێکیان (دکتۆر مەجید، کاک عومەر سەید عەلی و کاوە) برینەکانیان زۆر سەخت بوون. بەداخەوە کاوە ئیتر نەیتوانی بکەوێتەوە سەر پێ و هەر لەسەر عەرەبانە مایەوە. ئەم یەکێتییە، جگە لەو هەزاران شەهیدە، هەزاران شەهیدی زیندووشمان هەیە لەشێوەی کاوە و کاک عومەر کە تائێستا بە ئازارەکانیانەوە دەژین.

کاوە، هەرچەندە بەهۆی بریندار بوونی، بوو بە خاوەن پێداویستیی تایبەت، لە خەباتی چەکداریی دابرا، بەڵام توانی لە رێگای هونەرێکی رەسەنەوە، بەجۆرێکی تر خزمەت پێشکەشی نیشتمان بکات، ئێستاش لە سوید نیشتەجێیە و لە چالاکیی هونەری و خزمەت بەردەوامە.

هەر لە هەمان شووقە، کاک حەمە تۆفیق و خێزانەکەی هاتن. کاک حەمە تۆفیق، ئازاری پشتی ئەوەندە زۆربوو، لەتاوا بە گەرمای هاوین لەسەر ئەرزی بالکۆنەکە دەخەوت. لەگەڵ ئەو هەموو ئازارە، لە خوێندنەوە وازینەدەهێنا. خواردنی زۆر تیژی دەخوارد، بەتایبەتی بیبەری تیژ، هەموو گیانی دەبوو بە ئارەق. پێمدەوت «کە وا هەموو گیانت دەبێ بە ئارەق، بۆ دەیخۆی».

ماڵی ئێمە، وەک قۆناغی دووەمی دوای ئێران بوو، بۆ ئەو بریندار و نەخۆش و ماڵانەی کە بەرەو هەندەران دەرۆیشتن.

هەموو یادەکانی نەورۆزیشمان دەکردەوە، ماڵە کوردەکان کۆدەبووینەوە و مەراسیمێکمان ئامادە دەکرد ئێمە (ژنان و کچان)، چالاکیمان ئامادە دەکرد وەک سروود و هەڵپەرکێ (بەندە، نازەنینی خوشکم، بەیان، مەیان، پەیمان،

زەینەب، کەژاڵ و بێخاڵ کچەکانی عەلی حەوێز) چالاکییەکانمان ئەنجام ئەدا. لە دوو نەورۆزدا، کاک سلێمانی قەساب، کەبابی بۆ کردین و منیشی فێرکرد، هەروەها بە شێوازی تایبەتی خۆی فێری شفتەی کردم. کاک سلێمان، کەسێکی قسەخۆش و خۆش مەشرەب و لەش سوک بوو.

لەبەردەم ئەو باڵەخانەیەی کە شووقەکەمانی لێبوو، هەندێ پاسەوانی لێبوو بۆ پارێزگاریی ئەو راوێژکارە روسیانەی کە لەوێبوون. داروش بەو لادا خراپە کە هەموو بەیانییەک لێی دەکوژایەوە، دەبوایە ئەو پاسەوانە ئێشکگرانە رۆژانە پاڵ بە لاداکەیەوە بنێن تا دەکەوتەوە ئیش. هەر کە دارو دەچووە خوارەوە، پشتیان تێدەکرد. بەڵکو بانگیان نەکات، لەڕووشیان نەدەهات بڵێن نایکەین، بەس پێیاندەوت «سەیدی، ئەو ئۆتۆمبێلە بۆ ناگۆڕی؟»

کاک عومەر دەبابە، سەرەتای دروستبوونی یەکێتیی نیشتیمانی، بەرپرسی بارەگای یەکێتی بوو لە قامیشلوو، لە خانوویەکی بچووکی بێ حەمامدا بوو. کە ئێمە لەوێبووین جارێکی تر گەڕایەوە بۆ شام، ئەمجارە وەک نوێنەری بزووتنەوەی سوسیالیست هاتبووەوە. تا کاتی چوونی بۆ لەندەن، زوو زوو داوای پاپراخی کوییانەی لێدەکردم و بۆم دروستدەکرد.

کاک عەدنان موفتی و کاک عادل موراد لە سوریا بوون و لەگەڵ د.مەحمود عوسمان بوون. ماڵی د.مەحمود عوسمان دراوسێمان بوون و پەیوەندیمان گەرم بوو، بەتایبەتی بەهار خانی هاوسەری هەم وەک هاوڕێ و خوشک بەیەکەوەبووین. هەم وەک دوو کوییش.

جارێک من و بەهار خان، بەیەکەوە بە ئۆتۆمبێل چووینە سەری چیای قاسیوون، من موڵەتی شۆفێریم نەبوو، بەڵام بەهار خان هەیبوو، منیش ئۆتۆمبێلەکەم لێدەخوڕی. بە دوو کەس نەمانزانیبوو بەنزینی تیا نەماوە، ئیتر هاتمە خوارەوە بۆ ئەوەی ئۆتۆمبێل بوەستێنم تا یارمەتیمان بدەن. ئۆتۆمبێلی یەکەم، کاک عەدنان موفتی و کاک عادل بوون، ئەمە مەگەر بەس فیلمی هیندی وابێ، لە شام لەسەر چیای قاسیوون دوو کورد بۆت بوەستن، من وەک ئەوروپییەکان دەستم بۆ راگرتبوون ئیتر بوو بە پێکەنین و گاڵتەپێکردن، بەڵام دوایی هاوکارمان بوون و گەیشتینەوە ماڵەوە.

**نوێنەرەکانمان لە پەیوەندییەکانی ئەورووپا، ئەم هاورێ و هەڤاڵانە بوون:**

عومەر شێخموس، بەرپرسی ئەورووپا بوو.

نوێنەرەکان:

ئەحمەد بامەڕنی – فەرەنسا

حمە سابیر – سوید

سەعدی پیرە – نەمسا

کەمال فوئاد، سەلاح رەشید – بەرلین

دکتۆر لەتیف رەشید – لەندەن .

وەک باسمکرد، لە سەرەتای تەمەنی، ئارام زۆر دەگریا، بەڵام دوایی کە تەمەنی بوو بە شەش مانگ. ئیتر گریانی نەدەزانی و منداڵێکی زۆر ڕووخۆش و هێمنی لێدەرچوو. ئەو کاتەش وردە وردە برادەران دەهاتنە شام و ژمارەمان زۆربووبوو، ئیتر زۆربەیان بەتایبەتی دەهاتن بۆ لای ئارام، یان دەیانبردە دەرەوە، وەک: ئەسکەندەر، شێخ مەنسور، شێخ ناسر، دکتۆر ئازاد خۆشناو و ئاراس شێخ جەنگی و رەزاق کۆیی و منداڵەکانی شەهید دکتۆر خالید. خۆشم کورسییەکم لە بالکۆنەکە بۆ دانابوو، لەسەری ئەوەستا و هەرکەسێ بە شەقامەکەدا تێپەڕیایە، هاواری دەکرد عەموو مەرحەبا. خەڵک فێربووبوون کە بە لای ماڵی ئێمەدا تێدەپەڕین، سەریان بڵند دەکرد و سڵاویان لە ئارام دەکرد. کاک ئەسکەندەری زۆر خۆشدەویست و پێیدەوت «ئەسیکی». هەر کە دەیبینی، بە خۆی و جێبە سەوزەکەی رایدەکردە ژوورەوە بۆ لای پێڵاوەکەی، بۆ ئەوەی بڕوات.

شێخ مەنسور و شێخ ناسر، دەیانوت «نابێ ئارام وا بە پاکی بەخێوبکرێ، منداڵی کورد دەبێ لوتی بە سەری دەستی پاکبکاتەوە و دەم و چاوی چڵکی پێوە رەشبووبێتەوە». ئیتر دەستیان دەخستە ناو سۆپای مازۆت (کە لە سوریا بە نەوتی پیس بەکاردەهات) و لە دەموچاویان دەسووی، ئەویش نەیدەوت نابێ و زیاتر دەچووە لایان.

لە کۆتایی ساڵی ١٩٨١ مام جەلال لە ماڵی ئێمە بوو، لەسەر مێزی نانخواردن نامەی دەنووسی. هاوری لە قوتابخانە دەهاتەوە، منداڵی گەڕەک شەڕیان

پێدەفرۆشت و دیاربوو هاوڕێ لێیدابوون، ئەوانیش جنێویان پێئەدا، جنێوێکیان بە خوشکی دا، هاوڕێش لەسەرخۆ وتی «ما في أخت»، واتە خوشکم نییە. ئیتر مام جەلال ئەو قسەیەی هاوڕێی زۆر لا خۆشبوو و قاقا پێدەکەنی، لە هاوڕێی پرسی؛ دیارە عەرەبی فێربووی؟ وەرە با پرسیارت لێبکەم، وتی «بە مریشک دەڵێن چی؟» هاوڕێ وتی «دژاژ»، وەک سورییەکان وتی. مام لێیپرسی؛ باشە بە کەڵەشێر دەلێن چی؟ وەستا و دوای تۆزێ وتی «زوج دژاژ»، واتە مێردی مریشک، مام جەلال ئەم وەڵامەی زۆر پێخۆشبوو. دوای چەند ساڵێک، لە کۆبوونەوەیەکی پەیوەندییەکانی دەرەوە لە هۆڵەندا، یەکێک لە کادیرەکانی پەیوەندییەکان، وتی «مامە، پارتی زۆر قسەمان پێدەڵێن». لەوەڵامدا، مام وتی «وەک کوڕەکەی دارۆ لەخۆتان بکەن، بڵێن (مافي أخت) و وەڵام مەدەنەوە». کە نارینی کچم لەدایکبوو، مام زوو زوو بە هاوڕێی دەوت: «هسە في أخت».

هاوڕێ و ئارام، لایماڵی مام جەلال تایبەت بوون و ناوبەناویش دەیانوت «وەرە بیری منداڵەکان دەکەین».

لە کۆتایی ساڵی ١٩٨٢، گەلاوێژ عابید و هەڵکەوت عەبدوڵڵا، لە پێشمەرگایەتییەوە چووبوونە ئێران و دواییش هاتنە سوریا، گەلاوێژ دووگیان بوو. هەڵکەوت بوو بە بەرپرسی مۆنتاژکردنی (صوت الاتحاد شرارە) و گەلاوێژیش هاوکاری بوو. گەلاوێژ، کاتی منداڵبوونی نزیکبووبووەوە و سەیرمانکرد جلی منداڵی ئامادە نەکردووە. ئیتر بەپەلە من و نازەنین و بەیان جلمان بۆ دووری و ئامادەمانکرد. لە ٦ی ئایاری ١٩٨٤، لە نەخۆشخانەی کۆماریی، (باقی) لەدایکبوو و هێنامانە ماڵی خۆمان تا تەندروستی باشتربوو.

ئەوەبوو لەگەڵ گەلاوێژ و هەڵکەوت و نازەنین و بەیان و کادیرەکانی کۆمەڵە، بەیەکەوە شانەکانی کۆمەڵەمان زیندووکردەوە و کەوتینە کۆکردنەوەی ئەندامەکان و کۆبوونەوەی بەردەوامیمان هەبوو. لەو ڕێکخستنانەی یەکێتی هەیبوو، ڕێکخستنی خوێندکارانی یەکێتی کە هەموو خوێندکارەکان ئەندامبوون و چالاکییان هەبوو. ڕەزاق کۆیی لێپرسراوی کارگێڕیی ئۆفیسی پەیوەندییەکان و بەرپرسی خوێندکاران بوو.

ئەو حیزبە عەرەبییانەی کە یەکێتیی نیشتمانیی پەیوەندیی لەگەڵیان هەبوو:

- حیزبی بەعسی عەرەبیی سۆسیالیست لە سوریا (حزب البعث العربي الاشتراكي في سوريا).

- حیزبی بەعسی عیراقی – نووسینگەی کاروباری عیراق (حزب البعث العراقی – مکتب شؤون العراق).
- حیزبی شیوعی سوری/ باڵی خالید بەکداش (حزب الشیوعي السوری / جناح خالد بکداش).
- حیزبی شیوعی سوری/ باڵی یوسف فەیسەڵ (حزب الشیوعي السوری / جناح یوسف فیصل).
- حیزبی یەکبوونی سۆسیالیستەکان (حزب الوحدويين الاشتراكيين).
- حیزبی یەکێتیی عەرەبیی سۆسیالست (الاتحاد العربي الاشتراكي).
- بزووتنەوەی سوسیالستەکانی عەرەب (حرکه الاشتراکیین العرب).

هەروەها بەشێک لە بزووتنەوەکانی فەلەستینی وەک (الجبهة الشعبية لتحرير فلسطين - القيادة العامة) بە سەرۆکایەتی ئەحمەد جبریل، (الجبهة الديموقراطية) بە سەرۆکایەتی نایف حەواتمە، (الجبهة الشعبية لتحرير فلسطين) جورج حەبەش، ناوبەناویش لەگەڵ (منظمة التحرير الفلسطيني).

دوای ساڵێک لە چوونمان بۆ سوریا، دارۆ رادیۆیەکی تایبەتی کڕی بۆ پەیوەندیی لەگەڵ سەرکردایەتی یەکێتی لە کوردستان و وەرگرتنی هەواڵە خۆش و ناخۆشەکان و پێویستییەکان لە رێگای جفرەوە، شیکردنەوەی جفرەکان خرایە ئەستوی من. وێستگەی ئێمە ناوی ئاوارە بوو، وێستگەی سەرکردایەتی ناوی ئاسوودە بوو. جفرەکان ژمارە بوون، لە کاتژمێر چواری پاش نیوەڕۆ دەکرایەوە بۆ ئەوەی بزانین شەپۆل هەیە یان نا. لەناوەوە کاک نەوشیروان سەرپەرشتیی دەکرد، جارێکیان کاک نەوشیروان تانەی لێداین و وتی "ماشەڵڵا، ئێمە ئاسوودەین و ئێوەش ئاوارە". سەرەتا، دووجار دەمنووسی سڵاو کاک نەوشیروان. ئیتر کاک نەوشیروان وتی "چاکوچۆنی مەکە، یەکسەر بڕۆ ناو بابەتەکە". من هەواڵەکانم کۆدەکردەوە و دارۆش دەیناردن بۆ لایەنە پەیوەندیدارەکان، یان لە رۆژنامەکان بڵاودەکرانەوە.

مام جەلال کە نامەی بۆ ناوەوە دەنارد، بەناوی (پیرۆت)ەوە دەینووسی. لە کاک عومەر شێخموسم بیست، وتی "مام جەلال چەند ناوێکی هەبوو، لە هەموویان زیاتر (پیرۆت)ی بەکاردەهێنا. وەختی خۆی مامۆستا جەمال نەبەز،

وەسفی مام جەلال دەکات و دەڵێ؛ (قوی البنیة، بهی والطلعة)، بۆیە مام جەلال جار جار بۆ خۆشیی ئەو دوو ناوەی بەکاردەهێنا".

عومەر شێخموس، ناوی هێمن بوو (هەرچەندە هەندێکجار مام پێیدەوت: هۆمەر).

کەمال خۆشناو، ناوی وشیار بوو.

رەزاق فەیلی، ناوی شیرۆ بوو.

د.کەمال فوئاد، ناوی فەرید بوو، هەندێکجار بەخۆی دەوت "فەرید الأصلع".

کاک نەوشیروان، ناوی مەولود بوو، بە ناوی منداڵێکەوە کە ناوی مەولود بوو، لەخۆینابوو.

دارۆ، محەمەد نوری بوو.

لە نیسانی ۱۹۸۲، کاک سەربەست بامەڕنی و بەیان خانی هاوسەری گەیشتنە سوریا، ئەوکات ئەندامی کۆمەڵەی رەنجدەران بوو، ئەویش هەندێ کاری بۆ ناوەندەکە دەکرد. کارەکان زۆربوون و لەنێوان خۆیاندا دابەشیان دەکرد، بەڵام دوای ماوەیەک وازهێنانی خۆی لە کۆمەڵە راگەیاند. وەک باسیکرد؛ بەهۆی ئەزموونی خۆی لەسەر وڵاتانی هەنگاریا و رۆمانیا، هەروەها نووسینەکانی (میلوڤان دوجیلاس) لەسەر چینی تازە (الطبقة الجدیدة). (میلوڤان دوجیلاس هاوڕێ و جێگری مارشاڵ تیتۆ بوو) کە زۆربەیان رەخنەبوون لەسەر رژێمی تۆتالیتاری، هۆکاربوون بۆ وازهێنان، بەڵام کاک سەربەست لە نووسین و چالاکیی بەردەوام بوو، لەگەڵ د.فوئاد چەند ژمارەیەک لە رۆژنامەی (الاتحاد) یان دەرکرد.

لە ۲۰ی نیسانی ۱۹۸۲ دەبوایە دارۆ بچێتە بەیروت بۆ لای رێکخراوی رزگاریی فەلەستینی (منظمة التحریر الفلسطینی) لە لوبنان. ئەوسا زۆربەی بارەگاکانیان لە باشووری لوبنان بوو، ئەو سەردەمەش شەڕی ئیسرائیل و بەرگریی فەلەستینی لەوپەڕی توندیدا بوو، ئیسرائیل لەژێر ناوی جەنگی ئاشتیی (حرب السلام)، هەوڵی دوورخستنەوەی بەرگریی فەلەستینی ئەدا لەسەر سنووردوە بەرەو ناوەوەی لوبنان بە قوڵایی (٤٠کم). شەوەکەی خەوێکی ناخۆشم بینی، بەیانی بە دارۆم وت "مەڕۆ بۆ ئەو شوێنە، خەونم بینیووە". دارۆ وتی "ئەگەر بەقسەی تۆ بکەم نابێ بجووڵێم". ئەوەندەی

پێنەچوو لە دەزگای ئاسایشەوە تەلەفۆنیان بۆ کرد، وتیان "یەکێک گیراوە دەڵێ تۆ ئەناسێ". ئیتر دارۆ رۆیشت، بەردانی ئەو هەڤاڵە، زۆری خایاندبوو، بەو هۆیەوە برادەرە عەرەبەکانی جێیانهێشت و رۆیشتن، ئیتر دارۆ نەیتوانی بڕوا. رۆژی دواتر، هێزە ئاسمانییەکانی ئیسرائیل ئەو ناوچەیەی بۆردومانکرد و بوو بەهۆی شەهیدبوونی خەڵکێکی زۆر. ئیتر دارۆ وایلێهاتبوو لە خەونەکانم ئەترسا، بەڵام هەموو جاریک دەیوت "ئەهۆ، دیسان خەون"، هەندێکجاریش دەیوت "تۆ مارکسیی چۆن باوەڕ بەو شتانە دەکەی؟".

یەکێک لەو بیرەوەرییە ناخۆشانەی کە هەرگیز بیرمناچێتەوە و کەوتمە بارودۆخێکی زۆر ناخۆش و شەرمەزارکەرەوە، لە ئایاری ١٩٨١ وەک میوان بانگهێشتکرابووین بۆ کۆنگرەی نیشتمانیی بەرەی دیموکراتیی بۆ رزگاریی فەلەستین (المؤتمر الوطني للجبهة الديموقراطية لتحرير فلسطين). من و دارۆ رۆیشتین، نایف حەواتمە پیشوازیی لێکردین، وەک پرۆتۆکۆڵ دەستی گرتم و ماچیکرد، منیش یەکەمجارم بوو ئەو دۆخەم تووش بێ، لەشڵەژاویدا ملیم ماچکرد، ئیتر دوایی هەم خۆم تەریقبوومەوە و هەم دارۆشم تەریقکردبووەوە. لێی نەئەبڕیمەوە، کردبووی بە گاڵتە و بۆ کاک شازادیشی گێڕایەوە، ئیتر کاک شازادیش ئەیپرسی؛ ئێ نەرمین بۆ وا پەلاماری ملیت دا؟ لێیانکردبووم بە نوکتە.

لەو کەسانەی سەردانی سوریایان دەکرد، شەهید فازیلی مەلا مەحمود بوو کە پێشتر لەگەڵ د.عادل عەبدولمەهدی (سەرۆک وەزیرانی ئێستای عیراق)، بەرپرسی (تنظيم وحدة القاعدة) بوون و وازیانهێنابوو، لەدوای ساڵی ١٩٧٥ چینییەکان بیروکەی تێزی (سێ جیهان)یان هێنابووە بەر باس، جیهانیان کردبووە سێ بلوک (العوالم الثلاثة)، یەکیان سەر بە ئیمپریالیەت و سەرمایەداریی بوو، ئەوی تر سەر بە سۆڤیەت و لایەنگرەکانیان، سێیەمیش پارتی کۆمۆنیستی چینی داینابوو لەگەڵ جیهانی سێ هاوپەیمانییەک ببەستن بۆ ئەوەی ببنە جەمسەری سێیەم لە جیهاندا. (وحدة القاعدة) یەکێک بوون لەو حیزبانەی باوەڕیان بە تێزی سێیەم هەبوو. دوای شۆڕشی ئیسلامی و سەرکەوتنی ئیمام خومەینی، (وحدة القاعدة) هەڵوەشایەوە، د.عادل و د.فازیل رەسوڵ بوون بە دۆستی شۆڕشی ئیسلامی لە ئێران. د.فازیل

ڕەسوڵ هاتبوو بۆ گفتوگۆ لەگەڵ یەکێتی و هەستمدەکرد زۆر ئیسلامییانە بیری دەکردەوە، لەمیانەی گفتوگۆکەمان پرسیم؛ ئەو گۆڕانکارییە دراماتیکییە چییە وا ڕوویداوە؟ بۆچوونی وابوو کە ناتوانی لەم ناوچەیە ڕۆڵی ئیسلام لە سیاسەت بەدووربکەین. لەو ماوەیە دووجار بینیم، گفتوگۆکانی لەگەڵ یەکێتی سەرینەگرت و گەڕایەوە بۆ نەمسا. بەداخەوە لەگەڵ شەهید عەبدولڕەحمان قاسملوو، لەمیانەی گفتوگۆیەکیاندا لەگەڵ ڕژێمی ئێران، لە ژووری گفتوگۆکە لە شووقەیەک، بە دەمانچەی بێدەنگ شەهیدکرا.

زۆربەی هاوکارییەکان، وەک پارە و پێداویستی، لە ئەوروپا و لیبیا و حیزبەکانەوە دەهاتن. جارێک پارەمان بۆ هاتبوو لە لیبیا، دەبوایە بیانژمێرین، ئامێری ژماردنمان نەبوو، من و د.ئازاد خۆشناو دانیشتبووین بەیەکەوە دەمان ژماردن، هاوڕێی کوڕم زوو زوو خۆی پێدا ئەدایین و دەبوایە لەسەرەوە بیژمێرینەوە. ئەوکاتە د.ئازاد خۆشناو لە سوریا بوو، هاتووچۆی دەکرد لەنێوان ئەڵمانیا و سوریا، هەرچەند گەشتی بکردایە، جلی پێویستی بۆ من و هاوڕێ دەهێنا، کوڕێکی قسەخۆشی چالاک بوو، چاونەترس بوو وەک باوکی، شەهید (مستەفا خۆشناو). د.ئازاد، ئەندامی کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان بوو.

جارێکیان، وەک یارمەتییەک، ژمارەیەکی زۆر بەتانی ڕەنگ شینی تەنکیان هێنا بۆ ئەوەی بینێرین بۆ کوردستان. سەیرمانکرد ناردنی ئەو بەتانیانە و گواستنەوەکەی زیاتری تێدەچێ لە نرخەکەی و هەروەها مەترسیشی تێدایە، بۆیە بڕیارماندا لە شام و ماڵەکان و بارەگای بنکەکان دابەشبکرێ. چوار بەتانی بەر ماڵی ئێمە کەوت. دووانم لەو پەتوانە دووری و کردم بە ڕۆبی زستانە بۆ دارۆ. گواستنەوەی پارە لە هەموو هاوکارییەکانی تر ئاسانتربوو، چەک گواستنەوەش، لە هەمووی مەترسیدارتر و ئاستەنگتربوو. دەیان شەهیدمان لەپێناو گواستنەوەی چەک داوە، بەتایبەتی برادەرانی کوردی ڕۆژئاوا، لەوانە (شێخموس ئیبراهیم، ئەحمەد بورهان، محەمەد، ڕەمەزان، مەحمود باقی و چەندین شەهیدی تر) کە زۆربەیان کوردی ڕۆژئاوا بوون.

یەکێک لەو کەسانەی کە هاوکاربوو بۆ گواستنەوەی چەک و کەلوپەل، هەڤاڵ بۆزێ بوو، بارەگایەکمان هەبوو لە گوندی دیرک وەک قۆناغێک بۆ ئەو گواستنەوانە.

لەو هەڤاڵانەی کە لە شام بوون کاتێ ئێمە گەیشتین، شەهید شەماڵ بوو، لەنێوان شام و بارەگای قامیشلوو، کە هەڤاڵ (شەماڵ، ئەسکەندەر، وشیار، وریا....) لەوێ بوون، هاتووچۆی دەکرد و بەشێ لە ئەرکی رێکخراوەیی و گواستنەوەی پێشمەرگە و چەکی لەئەستۆدا بوو، لە ساڵی ١٩٧٨ەوە لە شام بوو. شەهید شەماڵ کەسێکی کۆمەلایەتی و رۆحسووک بوو، زۆر زوو دەبوو بە هاورێ، لەو کەسانە بوو زۆر نزیکبوو لە ماڵی ئێمە. زیاتر مانەوەی لە قامیشلوو بوو، لە بارەگای یەکێتی کارەکانی دەکرد. لە زۆربەی بۆنە و سەیرانەکان لەگەڵمان بوو، لە ساڵی (١٩٨٢) گەڕایەوە بۆ کوردستان بۆ ناو پێشمەرگە و دیاربوو خۆی دەیزانی شەهید دەبێ، بۆیە رانگوچۆغەیەک و کامێرایەکی لە لای لەیلا خانی هاوسەری هەڤاڵ (حەمید دەروێش) جێهێشتبوو، وتبووی "کە شەهیدبووم، ئەم دوو شتە، یان بیدە بە هەڤاڵ دارۆ، یان بە مام جەلال". لەدوای پرۆسەی ئازادی و کاتێ هەڤاڵ مام جەلال سەرۆک کۆمار بوو، لە مەراسیمێکدا ئەو دوو یادگارییەی شەهید شەماڵی دایە دەست مام جەلال، ئەوسا دارۆش لە ژیاندا نەمابوو.

شەهید شەماڵ، لە ١٥ی نیسانی ١٩٨٣ لە ناوچەی خەلەکان - باقلان، بە دەستی (حسک) شەهید بوو. لەو کاتەی کە بەرەی (جود) هێرشیانکردبووە سەر مەڵبەندی چوار، د.کەمال خۆشناو بەرپرسی مەڵبەندی چوار بوو. دوابەدوای ئەوە، شەڕی براکوژیی دەستیپێکرد و سەدان شەهید و بریندار لە ئەنجامی ئەو شەڕە هەبوون. ئەم بروسکانە کە لەڕێی رادیۆوە دەگەیشتن، ماتەمینیی هەموو لایەکی دادەگرت و لە هەموو لایەکەوە تەلەفۆن دەکرا کە چ هەواڵێک هەیە؟

لە ئابی ١٩٨٢، کاک شازاد صائیب، شامی جێهێشت و رۆیشتەوە لای منداڵەکانی لە هۆڵەندا.

لە ساڵی ١٩٨٣، گواستمانەوە بۆ گەڕەکی (مساکن)، بەرزە گەڕەکێکی تازە بوو، جێگامان فراوانتر و ژیانمان تۆزێ باشتربوو، بەهۆی گەڕانەوەی د.فوئاد مەعسوم بۆ کوردستان و رۆیشتنی کاک شازاد صائیب، ئەرکەکانیان کەوتە سەر شانی دارۆ و ئەرکی زیاتر بوو، میوانیشمان زۆر زیاتر بوو، بەردەوام میوانی پارتە سیاسییەکانمان هەبوو، جگە لە ئەرکەکانی تر.

نازەنینی خوشکم چووە خولی چاپکردن، بۆ ئەوەی هاوکاری دەرکردنی ڕۆژنامەی (شرارە) و (صوت الاتحاد) و (ئینصات) بێ.

کوردەکانی شام، وەک پیشەی هەمیشەییان، لەسەر بەرزاییەک نیشتەجێن، گەڕەکەکە ناوی (حی الأکراد - رکن الدین)ە مێژووی (حی الأکراد) دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی ئەیوبییەکان، وەک مەزەندە دەکرێ لەساڵی ١١٧٠ز ئاوەدانکراوەتەوە و بەناوی شازادە (روکنەدین مەنکورس) ناودەبرێ و گۆڕەکەشی هەر لەو گەڕەکەیە.

لە (حی الأکراد - گەڕەکی کوردان) مەزاری شێخ خالید نەقشبەندی و ئەمیر جەلادەت بەدرخانی لێیە، هەروەها گۆڕستانی ئەیوبییەکانیش.

لە مێژووی سوریا، زۆر لەو شوێنانەی کوردی تیا ژیاوە یان دەژی، لە بەرزاییان. نموونەش؛ قەڵای سەلاحەدینی ئەیوبی لە پارێزگای لازقیە، لەسەر بەرزترین لوتکەیە. هەروەها قەڵای سەلاحەدینی ئەیوبی لەناو شاری حەلەب، قەڵای کوردان لە شاری حمس، ئەو کوردانەی کە ئیدریسییەکان هێنابوویانن، لەوێ نیشتەجێن و تائێستا پێی دەوترێ (حصن الأکراد - قەڵای کوردان).

وردە وردە پەیوەندییمان لەگەڵ خێزانە کوردەکانی ڕۆژئاوا زیاتر بوو، لە کەسایەتیی تێپەڕیکرد و وەک خێزانیش تێکەڵیمان دروستکردبوو. لە بۆنەکان بەیەکەوەبووین. هەندێکجاریش بۆ ئاهەنگی ژنهێنان بانگهێشتدەکراین بۆ شار و لادێ کوردییەکانی وەک؛ عەفرین و قامیشلوو (کفر جنن) و حەلەب و تا دواسنوور ڕۆیشتووین.

لە ساڵی ١٩٨٤ گفتوگۆ لەنێوان یەکێتیی نیشتمانی و ڕژێمی سەدام دەستپێکرد، ئەو گفتوگۆیە، ڕژێمی ئەسەد و حیزبی بەعسی سوری زۆر تووڕەکرد، ڕۆژانە پەیوەندییان بەلایەنەکانەوە دەکرد؛ "ئەو گفتوگۆیە بۆ؟". د.فوئاد مەعسوم یەکێک بوو لە ئەندامانی گفتوگۆکە، بۆیە فشارەکە تەنیا لەسەر دارۆ بوو، ڕۆژانە بانگدەکرا و پرسیاری لێدەکرا لەسەر گفتوگۆکە. مانگی (١٠) فەرەیدون عەبدولقادر و مەلا بەختیار چووبوون بۆ کۆبوونەوەیەک لە ئەورووپا لە پاریس، لە پاریسی (١٥) لە فلات هۆتێلێک کۆبوونەوەکەیان کردبوو بۆ ئەندامانی پەیوەندییەکانی دەرەوە. لە ئەنجام و ڕاگۆڕینەوە لەسەر ئەو گفتوگۆیە، لەوێ بڕیارماندا سوریا جێبهێڵین، چونکە ڕژێمی سوریا بە

ئاشکرا وتی "نوێنەرانی یەکێتی دەبێ سوریا جێبهێڵن و ئەگەر دەشیانەوێ وەک پەناهەندە بمێننەوە ئەتوانن، دەنا دەبێ بڕۆن و شوێنێکی تر بدۆزنەوە". دارۆ و کاک ڕەزاق فەیلی لەگەڵ ئەو بۆچوونە نەبوون و ئیتر دەبوایە بەپەلە خۆمان کۆبکەینەوە و شوێنی بدۆزینەوە بۆی بچین. مانگی (١١)ش بوو بەهۆی نزیکبوونەوەی پشووەکانی سەری ساڵ، زۆربەی باڵیۆزخانەکانی ئەوروپا لە سوریا لە پشوودا بوون و کەسمان پاسپۆرتێکمان نەبوو بتوانین پێی بڕۆینە وڵاتێکی تر، کاک ڕەزاق فەیلی پەیوەندیی بە باڵیۆزخانەی سویدەوە کرد، ئەوان توانییان لە ڕێگای خاچی سوورەوە پاسپۆرتمان بۆ بکەن و مۆڵەتی مانەوە بخەنە سەر پاسپۆرتەکان کە ئەویش وەک لیسە پاس وابوو، تەنیا بۆ یەکجار بەکاردەهات. هەندێکمان بەرەو سوید بەڕێکەوتین و هەندێک بەرەو لەندەن و نەمسا، کەوتینە نزیک کۆتایی کانوونی یەکەمی ١٩٨٤ ئێمە وماڵی ڕەزاق فەیلی و ماڵی مام جەلال (مەیان و پەیمان و زەینەب) بەرەو سوید کەوتینەڕێ، ماڵی دکتۆر فوئاد بەرەو لەندەن.

نازەنینی خوشکم کە ئەوکات دەسگیرانی ئەحمەد بامەڕنی بوو، کاک ئەحمەد بامەڕنی هات و ئەوان ڕۆیشتن بەرەو فەرەنسا. بەیان، بەهۆی ئەوەی قۆناغی شەشی کۆلێجی پزیشکی بوو، مایەوە و بۆ ساڵی دواتر بەرەو هەنگاریا کەوتەڕێ.

ئەو ماڵانەی مانەوە، ماڵی شەهید دکتۆر خالید و ماڵی عەلی حەوێز، بەهۆی ئەوەی منداڵەکانیان لە زانکۆ بوون، هەروەها عەبدولڕەزاق کۆییش مایەوە. پێشمەرگە تەنیاکانیش، بەشێکیان چوونە قامیشلوو و چاوەڕوانیی گەڕانەوەبوون بۆ کوردستان. ئەو وەختە تەنانەت دۆستەکانیشمان کەوتبوونە ژێر فشاری ڕژێمی ئەسەد، گەلاوێژ و هەڵکەوت چوونە نەمسا و لەوێوە جارێکی تر گەڕانەوە بۆ کوردستان.

ئەو ساڵە، لە ساتە ناخۆشەکانی ژیانم بوو، جارێکی تریش کۆلوباڵی خۆمان پێچایەوە و کەوتینە دابەشکردنی ناوماڵەکەمان بەسەر برادەر و دۆستەکانمان، لە هەمووی ناخۆشتر ئەلامەوە، هەموو ئەو یاداشتانەی نووسیبوومەوە و هەندێ دەقی کراوە و وێنەکانمان، لەکاتی گواستنەوەمان بەرەو هەندەران، لە ماڵەکەی خۆمان بردیان و نەماندۆزینەوە، تەنانەت کتێبێکی دەستنووسی خۆراک دروستکردنم نووسیبوو، ئەویشیان برد و نەما.

تا لە سوریا بووین، هەستمدەکرد نزیکم لە کوردستان، هەر رۆژێک لە شام ئیشمان نەما، دەگەڕێینەوە بۆ پێشمەرگایەتی، بەڵام چوونمان بۆ هەندەران، وەک ئەوە وابوو لە رەگەوە هەڵمان بکەنن.

لەو ماوەیەی کە لە شام بووین، باوکم و دایکم و کەژاڵی خوشکم، خۆیان لە رژێم شاردبووەوە و شەهید ئازاد و هاوتای براشم پێشمەرگە بوون. هەموو کۆتارۆژی مانگێک، دایکم بە نهێنیی دەچوو بۆ ماڵێکی ناسیاو، کاتمان دیاریکردبوو و بەیەکەوە قسەمان دەکرد.

یەکێک لە هەواڵە ناخۆشە جەرگبڕەکانی سەردەمی سوریا، کاتی راپەرینەکەی نیسانی ١٩٨٢ی شاری کۆیە بوو، ئەو راپەرینەی وەستانەوە بوو دژی جەور و ستەمی بەعسی فاشیست. خەڵکی کۆیە دلێرانە رژابوونە سەر شەقام و کۆڵانەکان، کچێکی مامم بەناوی شوکریە قادر حەسەن، بەشداریی لەو خۆپیشاندانە دەکات. وەک بە منداڵەکانی وتبوو "بەلایەوە شەرمە مرۆڤ بە بێدەسەلاتی و زەلیلیی بمرێت". ئیتر بە فیشەکی دەستی چەپەڵی دوژمن، ئەو ژنە خەباتگێرە دەبێتە یەکەم شێرەژنی شەهید لەو راپەڕینەی شاری کۆیە. هەواڵەکە، دایکم لە رێگای تەلەفۆنەوە پێیوتین. ئەو ئامۆزایەم، وەک پورێکی دڵسۆز وابوو بۆ ئێمە. هەروەها زانیمان کەژاڵی خوشکم لە راپەرینەکەی هەولێر بەشداریکردووە و یەکێک بووە لە رێکخەرەکانی خۆپیشاندانی زانکۆ و دەستگیرکراوە لەگەڵ هەڤاڵەکانی.

بیرەوەرییەکانم لەگەڵ شەهید ئەنوەر حەسەن، لە سەرەتای چوونمان بۆ سوریا ئەمەیە، شەهید ئەنوەر حەسەن لەگەڵ برادەرەکانی تر دەچوون بۆ مەشقی سەربازیی (قیادەی سەرای). پێشتر شەهید ئەنوەرم دەناسی، کاتێک لەگەڵ دارۆ لە زیندانی ئەبوغرێب بوو، یەکێک بوو لە هاورێ نزیکەکانی. شەهید ئەنوەر، دوای نزیکەی پێنج ساڵ لە بەندکردن و خۆڕاگریی قارەمانانەی ناو زیندان، بە لێبوردنی گشتی لەگەڵ برادەرانی زیندان ئازادکران. لەسەر داوای سەرکردایەتی ی.ن.ک پەیوەندیی بە هێزەکانی پێشمەرگەی کوردستانەوە کرد و بوو بە رابەر سیاسیی هەرێمی دووی کەرکوک. کۆمەڵەیەکی عەیار (٢٤) بوو، لەڕووی هەلسوکەوت و ئازایەتی و لەخۆبوردەیی. کاتی خۆی لە کۆلێجی ئەندازیاریی وەردەگیرێ، بەڵام بەهۆی چالاکیی ناو کۆمەڵەوە، دەگیرێ و ناتوانێ

بچێته زانکۆ. کادیرێکی رووناکبیر بوو، که دەهاته ماڵی ئێمه له شام، کتێبی له کتێبخانەکان دەکڕی و خۆی دەیخوێندەوه و بۆ منی دەهێنا. پێشبڕکێمان دەکرد له خوێندنەوه، منیش هەر شتێکم دەستبکەوتایه ئەمدایه بۆ خوێندنەوه، دەیزانی من کتێبەکانی محەمەد حەسەنین هەیکەل و عەلی وەریدم بەلاوه خۆشه، ئەگەر خۆشی نەیخوێندایەتەوه بۆ منی دەکڕی و دەیهێنا. دیاربوو یەکێک ئەمەی بۆ فەرەیدون عەبدولقادر گێرابووەوه که گوایه ئەوەندەی بایەخ بەو کتێبانه ئەدەم ئەوەنده بایەخ به کتێبی مارکسیی نادەم، گلەیی لێکردم و منیش گلەییەکەم قبوڵکرد، بەڵام نەمئەتوانی تەنیا بایەخ به کتێبی مارکسیی بدەم. بەداخەوه یەکێ له بروسکه پڕئازارەکان، هەواڵی شەهیدبوونی ئەنوەر بوو که له ٥ی ئازاری ١٩٨٢ له شەڕی داستانی قازاندا شەهیدبووبوو.

هەر له سوریا و له کوتایی ساڵی ١٩٨٠، جەواهیری، شاعیری گەورەی عیراقیم بینی، دارۆ لەسەر راسپاردەی مام جەلال سەردانی دەکرد بۆ ئەوەی لەنزیکەوه ئاگاداری هەواڵی بێ، منیش له یەکێک له سەردانەکان داوامکرد بچم لەگەڵی. جەواهیری، به فەرمی وەک میوانێکی قەدرگرانی سەرۆک کۆماری سوریا (حافز ئەسەد) دانرابوو، ماڵێکی خنجیلانەی هەبوو، دونیا ساردبوو سۆپایەکی مازۆتی دانابوو، هەرچەنده لەژێر رۆبێکی خورییەوه پانتۆڵ و کراس و یەلەکێکی رەشی لەبەربوو، بەڵام تووشی پەتا بووبوو و ئەو رۆژه تەندروستیی باش نەبوو. جەواهیری، دۆستێکی نزیکی مام جەلال بوو، دەیوت "کەس هێندەی جەلال، به قوڵیی له هۆنراوەکانم تێناگات و کەسیش هێندەی ئەو هۆنراوەکانی من به لەبەرووتنەوه نازانێ".

کڵاوه بەناوبانگەکەی که له کوردستان بەدیاریی وەریگرتبوو، وشەی کوردستانی لەسەر چنرابوو، لەسەریدابوو، دەیوت "بۆیه بەردەوام لەسەرمه، چونکه پرسی کورد و نەتەوەی کورد بەردەوام لەسەر سەر هەڵدەگرم".

ئەو کڵاوه، تا کۆتاروژی ژیانی لەسەریابوو. جەواهیری، تا کۆتایی ژیانی، وەک نیشتەجێ له سوریا دەژیا جگه له گەشتەکانی.

مام جەلال رێز و خۆشەویستییەکی زۆری بۆ جەواهیری هەبوو، ناوبەناویش دێڕێکی هۆنراوەی دەوتەوه که دەڵێ

(قلبی لکردستان یهدی الفم ... ولقد یجود بأصغرية المعدم)

هەر کە تەواو یشی دەکرد، دەیوت کێ ئەمەی بۆ کورد وتووە؟ لە وەڵامی نامەیەکی مام جەلالدا، جەواهیری هۆنراوەیەک بۆ مام دەنووسێ کە دەڵێ:

شوقا "جلال" كشوق العين للوسن

كشوق ناو غريب الدار للوطن....

هۆنراوەیەکی دوورودرێژە.

جەواهیری، جگە لە دۆستایەتی لەگەڵ مام جەلال، لەگەڵ هێرۆ خانیش پەیوەندیی زۆر خۆشبوو، هەرکاتێ مام یان هێرۆ خان لە سوریا بوونایە و جەواهیری لەوێبوایە، یەکتریان دەبینی.

کۆتایی ساڵی ١٩٨٤، گەیشتینە سوید، لە فڕۆکەخانە، نوێنەری بەڕێوەبەرێتی کۆچ و کۆچبەران لە ستۆکهۆلم. پێشوازییان لێکردین کە لەگەڵ د.محەمەد سابیر هاتبوون. چووینە ماڵی دکتور و لەوێ چەند ڕۆژێک ماینەوە تا شوێنێکمان لە شارێکی بچووک بەناوی (سورە هامەر)، سەر بە پارێزگای ڤێستەرۆس، وەرگرت. لەو شارە، ئێمەیان خستە خولی زمانی سویدی. مامۆستاکەمان ناوی ئێڤا بوو، دەربارەی کورد و مێژووی کورد شارەزابوو و ڕێزی زۆر لێدەگرتین، لەو خولە زۆربەمان کوردبووین. هاوڕێمان خستە خوێندنگا و لە پۆلی چوار دەستیکرد بە دەوام. ئارامیش لە باخچەی ساوایان. لەو شارە خولی زمانمان تەواوکرد و تاقیکردنەوەیان پێکردین و بە کاتێکی زۆرکەم بڕوانامەی زمانمان وەرگرت. پاشان گواسترایینەوە بۆ پایتەخت (ستۆکهۆڵم) و لە گەڕەکی رینکەبی نیشتەجێ بووین. ڕێژەی بیانییەکان لە (٨٠٪) زیاتر بووین، بەدەگمەن سویدیی بەدیدەکرا، ئەو دیاردەیە دیاردەیەکی نابەرابەری بوو لەنێوان سویدی و پەناهەندەکان، تەنانەت ئەگەر لە شەمەندەفەردا دابنیشتینایە کەم گوێمان لە زمانی سویدی دەبوو.

هەرچەندە سوید یەکێکە لە باشترین وڵاتانی پەناهەندەیی، بەڵام جیاوازیی بەرچاو هەبوو لەنێوان ئێمە و سویدییەکاندا، ئەو دیاردەیە ئێمەی زۆر ئازار ئەدا و بە زەحمەت هەستی هاوڵاتیبوونمان لا دروستبوو. بۆ جاری دووەم لە خولی زمانی سویدی وەرگیراینەوە و بە منیان وت "ئەتوانی بچی کار بدۆزیتەوە، زمانەکەت گونجاوە". گەڕام بەدوای کاردا، بەهۆی ئەوەی هیچ بەڵگەیەکم نەبوو دەربارەی بڕوانامەکەم، نەمتوانی بخوێنم و بەراوردی بڕوانامەکەم بکەم. لەسەرەتادا ئەو کارانەی بە بڕوانامەی سویدی ئەدران بە پەناهەندە، کارێک بوون کەمتر سویدی وەریدەگرت. یەکەمجار چووم بۆ لای کۆمپانیایەکی پاککەرەوە، کە زانییان خاوەن بڕوانامەم، بەئەدەبەوە سوپاسیان کردم، وتیان "تۆ ئاستی خوێندنت بۆ ئێرە ناگونجێ"، (مەبەستیان لەوەیە ئەگەر یەکێ خوێندنی بەرزی خوێندبێ، ئەترسن ئیشەکە بەباشی نەکات و بەئاستی خۆی نەزانێ)، چەند وتم تاقیمبکەنەوە، بەڵام بێسوودبوو. دوای ڕۆژێک، لەسەر دوکانێکی فەرش فرۆشی ئێرانی، چاوم بە هەلێکی کار کەوت و چوومە ناو دوکانەکە و وتم "من دەزانم فەرشی کۆن چاکبکەمەوە". خۆم ئەو کارە

فێربووبووم لە کوردستان. تاقیبانکردمەوە و وەرگیرام، بەڵام کارەکەم زۆر قورس بوو، ئەوکاتەش شانم ئازاری زۆربوو، نزیکەی دوو مانگ مامەوە و وازم لە کارەکە هێنا و چووم بۆ چاوپێکەوتن لە نەخۆشخانەیەکی بەساڵاچووان و وەرگیرام. دوای ماوەیەک کە بینییان کارەکە بەباشی ئەنجام ئەدەم، خستیانمە خولێکی شەش مانگی و شەش مانگیش وەک پراکتیک کاری نەخۆشخانەیان بۆ ئەژمارکردین و بروانامەیەکیان پێدام. لەو خولە، بە پلەی یەکەم دەرچووم و چەند چاوپێکەوتنێکی رۆژنامەوانییان لەگەڵ کردم. لەو خولە، سویدی و بیانی تێکەڵبوون، سویدییەکان بە چاوێکی کەمتر لەخۆیان سەیری پەناهەندەیان دەکرد. جارێکیان لییانپرسیم؛ ئێوە تەلەفزیۆن و ئۆتۆمبێلتان هەیە لە عیراق؟ هەرچەندە پرسیارەکان بە لای منەوە زۆر ناخۆشبوون، بەڵام بۆم شیکردنەوە کە بۆچی ئێمە لە وڵاتی خۆمان جێگەمان نەبووەتەوە، ئیتر لە کۆتایی خولەکە بە چاوێکی تر سەیریان دەکردم.

ئەو نەخۆشخانەیە ناوی (بلاک بێری) بوو، لە گەڕەکێکی دوور لەماڵەکەمان کە بە پاس و شەمەندەفەر ماوەی کاژێرێک رێگا بوو، هەندێکجاریش بە پاسکیل دەچووم.

دارۆش کارێکی دەستکەوت لە کارگەی لاستیک بەهۆی برادەرێکی کوردەوە، وەک دوو کەسی پەناهەندەی سیاسیی پێمان خۆش نەبوو لەسەر پارەی سۆشیال بژین، بۆیە بەدوای کاردا گەڕاین.

لەگەڵ کاری فەرمیی حکومەتی سویدیش، دارۆ وەک ئەندامی پەیوەندییەکانی دەرەوە، کاری سیاسیی دەکرد دوای هەڵوەشاندنەوە و سەرنەگرتنی گفتوگۆکەی نێوان یەکێتی و رژێمی سەدام. بارەگایەکیان گرتبوو، یەکێتییەکان ناوبەناو لەوێ کۆدەبوونەوە، هەرچەندە بە رای من بۆ ماوەیەک کاری پەیوەندییەکان لاوازبووبوو بە بەراورد بە پێش گفتوگۆکە، بەڵام دواتر رۆژ بەرۆژ کۆبوونەوەکان باشتردەبوون، هەروەها لۆبیی بۆ یەکێتی زۆرتر دەبوو.

لە شەوی سەری ساڵی ١٩٨٦ ئەو برادەرانەی کە هەندێکیان لە پەیوەندییەکانی دەرەوە کاریاندەکرد و هەندێکیشیان هاوڕێی کۆنمان بوون، لە هۆڵەندا لە ماڵی د.فوئاد حسێن کۆبووینەوە، هەم بوو بە کۆبوونەوە و هەمیش بۆ پتەوکردنەوەی پەیوەندییەکان و بەسەربردنی شەوێکی خۆشی سەری

ساڵ. ماڵەکە، ماڵی خەزووری فوئاد حسێن بوو، ماڵێکی گەورە بوو، جێگای هەموومان بووبووەوە کە هەریەکەمان لە شار و وڵاتی جیاوازەوە چووبووین. ئەو برادەرانە (ماڵی شازاد صائیب، تەیب بەرواری، ئەحمەد بامەڕنی و نازەنینی خوشکم کە لە فەرەنساوە هاتبوون، چیا عەباس لە هۆڵەنداوە هاتبوو)، بەشێک لەو هەڤاڵانە، لە هەرەسی شۆرشی ئەیلولی ١٩٧٤ەوە چووبوونە دەرەوەی وڵات. شەوەکەی کەوتینە وتنی گۆرانیی کوردی، هەندێ لەو برادەرانە هێشتا ئاشنا نەبوون بە گۆرانیی تازەی کوردی، هەر بە سەردەمی کۆن گۆرانییان دەوت و پێماندەوتن هێشتا لای ئێوە مُەلیک ماوە.

ماوەی سێ ساڵ و نیو لە نەخۆشخانەکە کارمکرد و لە ٢٢ی ئایاری ١٩٨٧ نارین لەدایکبوو، منیش و دارۆش بەلامانەوە زۆر خۆشبوو کچێک ماڵەکەمان جوانتربکات و خۆشییەکی تری خستە ماڵەکەمان. مۆڵەتی دایکایەتیم لە نەخۆشخانە وەرگرت و لەماوەی مۆڵەتی دایکایەتیدا، لە هەوڵی پەیداکردنی کارێکی خۆماندا بووین. بەدوای دوکانێکدا دەگەڕاین بەکرێی بگرین، بە ڕێنوێنیی دوو برادەری کورد، لە رۆژنامەکان شوێنێکمان دۆزییەوە، بەڵام زۆر دووربوو لە ماڵەکەمان و لە گەڕەکێکی سویدی بوو. لەگەڵ خاوەن دوکانەکە ڕێککەوتین و چووین بۆ داوای قەرز لە بانک، بەهۆی ئەوەی کارەکەی من کارێکی بەردەوامبوو، واتە هەمیشەیی بوو، هەروەها لەسەر روانگەی راپۆرتێکی نەخۆشخانەکە کە ئەگەر خۆشم بمنووسیایە وامنەئەنووسی، بانک قەرزەکەی دا بە من. ئیتر بووین بە خاوەنی کاری سەربەخۆی خۆمان، هەرچەندە سەرەتا کارەکە ئاسان نەبوو و نامۆ بوو بەلامانەوە، بەڵام بە هاوکاریی ئەو برادەرە کوردانەی کە پێش ئێمە دوکانیان هەبوو، فێری کارەکە بووین.

لەو کاتانەی دارۆ لە کارگەی پلاستیک و منیش لە نەخۆشخانە کارماندەکرد، هاوینان مانگێک پشوومان هەبوو، هەموو ساڵێک لەگەڵ دوو ماڵە برادەری کورد، ماڵی (حەمە چاوشین و شەوبۆ خان) رۆحیان شاد و ماڵی (کاک بەکر حسێن و نەرمین خان) دەچووین بۆ گەشت. هەندێکجار ماڵی ئەحمەد بامەڕنیش، پەیوەندییان پێوە دەکردین لە گەشتەکانمان. بە ئۆتۆمبێلێکی شڕ کە بە کۆنیی کڕیبوومان و خۆشمان بۆیەمان کردبووەوە، گەشتی ئەوروپامان دەکرد. بەو ئۆتۆمبێلە لە چادرگەی کەمپەکانی گەشتوگوزار دەماینەوە، لە سویدەوە بەرەو

دانیمارک و ئەڵمانیا و سویسرا و لۆکسمبۆرگ و فەڕەنسا و باشووری فەڕەنسا و شارەکانی (مۆنتیکارلۆ، نیس، کان)، ئیتاڵیا و شارەکانی (ڤینیسیا و مۆرانۆ). هەرچەندە گەشتەکانمان هیلاکی کردبووین، بەڵام نەمانئەتوانی گەشتی فڕۆکە و ئوتێل بکەین.

جارێکی تریش چووین بۆ نەرویج و دوورگەی گۆتلاند و ئیولاند، بۆ یەکەمجار لە دورگەی گۆتلاند بینیم ماسی دوکەڵاوی چۆن دروستدەکەن (ماسیی دوکەڵاوی زۆرتر تایبەتە بە ماسی سەلەمون، بە ڕێگای تایبەت دوکەڵاوی دەکرێت. مێژووی ئەو خواردنە دەگەڕێتەوە بۆ هیندییە سوورەکان، سروتی تایبەتییان بۆ کردووە بەمەبەستی هەڵگرتنی. لە ناوچە ساردەکانیش، بەهۆی ئەوەی رووبار و دەریاچەکانیان دەیبەستێت و توانای ماسیگرتنیان زۆر کەمدەبێتەوە و ئاسان نابێت، بۆیە بەشێوازی جۆراوجۆر ماسییان هەڵدەگرت. لەوانە لە ڕێگای دوکەڵاویکردنەوە. دوکەڵاویکردنی ماسی، بە شێوازی جیاواز دەکرێت. لە گۆتلاند، لەسەر زەوییەکە چاڵیان کردبوو، تووی داری سنەوبەریان دەسووتاند و ماسیی لەسەر شیش ریزکرابوون و بە لقەداری تەڕ داپۆشرابوون، بە گەرمیی کەم و دوکەڵ، ماسییەکە پێدەگەیشت. ئەو شێوازە، کاتی زۆری پێویستە).

جارێکیش هەر مالی خۆمان بە یاوەریی هەندێ گەنجی خزممان، چووینە گەشتێکی تایبەت کە بە بەلەمی جۆری (کانوت) بەناو رووباری خوڕدا تێپەڕین، گەشتێکی مەترسیدار بوو، بەڵام لامان خۆشبوو، لەو باوەڕەدابووین تا گەنجین ئەو گەشتانە ئاسانترن.

لە دوکانەکەمان، ماوەیەکی کەمی پێچوو و توانیمان جێگای خۆمان بکەینەوە لەنێو خەڵکی گەڕەکەکە، وایلێهاتبوو ژنە پیرەکانی گەڕەکەکە دەهاتنە لامان دائەنیشتن و منیش تا بۆمکرابایە هاوکاریان بووم. زۆرجار هاوڕێکانم دەیانوت «تۆ خەڵوەتگای پیریت کردووەتەوە یان دوکان؟». ئەو خەڵکە بەتەمەنانە، لەبەر من بەدوای هەواڵی شەرەکانی ئێران عیراقدا دەگەڕان و بۆیان دەهێنام. لە ٨ی ئابی ١٩٨٨ وەک هەواڵیکی خۆش، زۆربەیان هاتنە دوکان و هەواڵی راگرتنی شەڕی عیراق ئێرانیان پێراگەیاندم و بەو بۆنەیەوە هەریەکەیان شتێکیان لەگەڵ خۆیان هێنابوو لە شیرینی و گوڵ. منیش پێموتن «دوای چی؟ دوای ئەوەی

عیراق لەڕووی ژێرخانی ئابووری و مرۆییەوە وێران بوو، هەزاران کەمئەندام و دیلمان هەیە!».

ئەوکاتەی کە لە نەخۆشخانە کارمدەکرد، هەوڵمدا بۆ خوێندن و بەراوردکردنی بڕوانامەکەی زانکۆی عیراقم، هەرچەندە بڕوانامەکەم پێ نەبوو (باوکم بۆیناردبووم و نەگەیشتە دەستم)، بەڵام ناوم لە لیستی دامەزراندنی شەماڵ رەشید هەبوو، ئەوەیان وەک بەڵگەیەک ئەژمارکرد. هەروەها د.محەمەد سابیریش هاتە زانکۆ لەگەڵم و شایەتیی ئەوەی دا کە لە زانکۆ چیم خوێندووە و کەی دەرچووم. ئەو دوو بەڵگەیەیان بۆ ئەژمار کردم و دکتۆرێکیان بەرەوڕوو کردمەوە بۆ ئەوەی ئەو وانانەی کە لای خۆمان کەم خوێندومانە، بیخوێنم. لە نەخۆشخانە هاوکارم بوون، رۆژانی شەممەو یەکشەممەیان وەک کار بۆ دانام و دوو رۆژیان لە ناوەڕاستی هەفتە لەبری پشوو بۆ دانام و دەچوومە زانکۆ. لە زانکۆ وەک توێژەر و بەراوردکاری بڕوانامە دایاننام و کەوتمە خوێندن، بەڵام زۆر هیلاک دەبووم، کارێکی ئاسان نەبوو (ئیش و خوێندن و ماڵ و منداڵ) پێکەوە، بەڵام چاونەترسیی لە هیلاکی و دوارۆژ، بەلامەوە گرنگتربوون.

ئەو ماوەیەی کە لە دوکانەکە بووین، دراوسێکان دەهاتن ئارام و نارینیان دەبردە دەرەوە، بۆ ئەوەی هەندێ هاوکارم بن. دراوسێکانی دوکان، زۆربەیان هونەرمەند و فیلمساز و رۆژنامەنووس و نووسەر بوون. گەڕەکێکی کۆنی شاری ستۆکهۆڵم بوو، تەنانەت شارەوانیی نەیئەتوانی گۆڕانکاریی لە باڵەخانەکانیاندا بکات کە زۆربەیان هی سەدەی پێشوو بوون.

جارێک فیلمسازێک، داوابکرد ئارام بەشداربێ لە یەکێ لە فیلمەکانیدا وەک منداڵێکی بیانی، ئەویش بەشداربوو، فیلمەکە لە سینەما و تەلەفزیۆن نمایشکرا.

هەندێ دراوسێی شیوعیمان هەبوو لە دوکان، ساڵی ١٩٨٩ کاتێ شۆڕشەکانی رووخانی دەسەڵاتی شیوعییەکان و حیزبە تۆتالیتارەکان و پایزی ئەو وڵاتە شوعییانە دەستیپێکرد، وڵاتە شیوعییەکان یەک بەدوای یەک دەڕووخان، بەتایبەتی لە ئەورووپای ناوەڕاست و رۆژهەڵات. دەهاتنە لام و دەردەدڵی خۆیان هەڵدەڕشت، باسیان لەوە دەکرد کە ئەم حکومەتانە نەیانتوانیوە شیوعیەت بپارێزن. منیش ئەو سەردەمە زۆر پەیوەندیم بەهێزبوو لەگەڵ سۆسیال دیموکرات، باوەڕم وابوو یەکێ لە داواکارییەکانی ئەو میللەتانە، رژێمێکی

سۆسیال دیموکراتە و دەکەوتینە گفتوگۆ و دەستیان دەگرتم لە جێبەجێکردنی کارەکان. ڕۆژێک دارۆ وتی «ئەوانە لە بێکەسیدا ڕوودەکەنە ئێرە، وابڕوا ناهێڵن کاربکەین». جارێک بە ژنێکیانم وت «کارم زۆرە بۆ نایەیتە سەر کاسەکە و من بچم کارەکانی خۆم بکەم». هەستیکرد کە ڕێگرە، وتی «کە هاتم پێمبڵێ پارمەتیت ئەدەم». ئەو قسەیەی وایلێکردم وازبهێنم و بهێڵم بێن بۆ لامان.

ژنێک دراوسێمان بوو، شتی بیردەچووەوە، هەفتەی دووجار دەهات و هەمان شتی دەکڕییەوە. وەک (فیوزی کارەبا). منیش پێم وت «زۆرت کڕیوە و دێم بۆ ماڵەوە بۆ لات بزانم کێشەکەت چییە؟!». کە چووم سەیرمکرد نە بەفرگر کاردەکات و نە کاتژمێری دیوار و دونیایەک فیوزی لەخۆی کۆکردبووەوە. بانگی بەرپرسی گەڕەکەکەم کرد و شتەکانمان بۆ چاککرد، ئیتر وایدەزانی هەموو ئیشێک دەکەم. سەیرمکرد، ڕۆژێک کۆمەڵێک جلی پیسی بۆ هێنابووم، بۆی بشۆم، منیش دڵیم نەشکاند و بۆم شووشت. ڕۆژێ وتی «قژم بۆ ببڕە»، ئەویشمکرد. بەڕاستیی دارۆ لەو کارانەی من تاقەتی چووبوو، دەیوت «دڵتبێ، پێیان بڵێ ئەوە کاری من نییە»، بەڵام نەمئەتوانی. ماوەی دوو هەفتە ئەو ژنە نەهاتە دوکان، سەرپەرشتیاری گەڕەکەکەم ئاگادارکرد و ئەویش چوو لە دەرگاکەی دا، وەڵام نەبوو، بەیانی کە گەڕامەوە بۆ دوکان، سەیرمکرد ئۆتۆمبێلی پۆلیس و فریاکەوتنی خێرا و پۆلیسێکی زۆر لای دووکان بوون، کە سەرپەرشتیاری گەڕەکەکەم بینی، سوپاسیان کردم کە بەتەنگ گەڕەکەکەوەم، تومەز ژنەکە چەند ڕۆژێک بوو گیانی لەدەستدابوو، لەبێکەسیدا کەس درکی پێنەکردبوو. ئیتر ڕۆژنامەی شارەوانی گەڕەک، هاتن و چاوپێکەوتنیان لەگەڵ کردم و دیاری و گوڵیان بۆ هێنام.

تەنیایی بەتەمەنەکانی ئەو وڵاتە ئەوروپییانە، بۆ کولتووری ئێمە، شوێنی بەزەیین. هەرچەندە تارادەیەک لای ئەوروپییەکان ئاساییترە، بەڵام هەستم دەکرد کە ئەوانیش سکاڵا لە بەدبەختیی خۆیان دەکەن و هەندێکجار گوێم لێدەبوو کە کوڕ و کچیان هەیە، بەڵام ساڵی یەکجار ڕەنگە یەکتر نەبینن.

جارێکیان کە ئەوکات لە نەخۆشخانە کارمدەکرد، ژنێکی نووسەر کە نەخۆشیی ڕۆماتیزمی درێژخایەنی هەبوو، کۆچی دواییکرد. ئەرکی کارمەندبوو پەیوەندیی بە کەسە نزیکەکانییەوە بکات، کچێکی هەبوو ناوبەناو سەری ئەدا.

من پەیوەندیم لەگەڵ نەخۆشەکە زۆر باشبوو، پەیوەندیم بەو کچەیەوە کرد و هەواڵەکەم پێراگەیاند، کچەکەی لەوەلامدا وتی: "ئیسراحەتی کرد، ناتوانم بێم، ئێستا لە ئیشم، ئێوە شتەکانی بۆ دابنێن، دوایی خۆم پەیوەندی دەکەمەوە"، (نازانم ئێمە راستین یان ئەوان. بەڵام چەند بیر لە ئەوروپا دەکەمەوە، ئەوانە زیاتر دێنە بەرچاوم لەچاو خۆشییەکانی. تا لەناو پیرەکانیان کارنەکەی، ئازاری تەنیاییان هەستپێناکەی، سیستەمەکەیان بۆ زوگرتیی باشە و خراپیی خۆی تیایە). ئیتر من و هاوکارەکەم، ژنەمان شووشت، لەوێ واباوە جلی جوانی لەبەر دەکەن و تەنکەسوراویک و قژی دائەهێنی و لە شوێنەکەی خۆی تا بەیانیی مۆمی بۆ دائەگیرسێنی، کارمەندانی شەو یان کەسوکار (ئەگەر هەیبێ) و بیانەوێ، بەدیارییەوە دائەنیشن. نەمتوانی ئەو ژنە بێکەسە جێبهێڵم، تەلەفۆنم بۆ دارۆ کرد و تا بەیانی هاوکاربووم لەگەڵ کارمەندی شەو و بەدیارییەوە مامەوە.

پەیوەندیم لەگەڵ نەخۆشەکان وەک دایک و کچ بوو، نەمئەتوانی وەک نەخۆش رەفتاریان لەگەڵ بکەم. هەر ئەو هۆیەش بوو وایکردبوو نەخۆشخانە راپۆرتێکی وا بۆ من بنووسن. پەیوەندیم کاردانەوەی لەسەر نەخۆشەکان کردبوو، ئەگەر رۆژێ دیارنەبوومایە، هەموویان هەواڵیان دەپرسیم. لای من مرۆڤ هەر مرۆڤە، ئەگەر سنووری گەڕەک و شار و وڵات و نەتەوە جێنەهێڵی، ناتوانی مرۆڤدۆستبی و داوای ماف بکەی.

کاتێ کە لە دوکان کارماندەکرد، کارمان ئاسان نەبوو، دەبوایە دارۆ و منیش هەردووکمان لە کارەکەبین. سەرەتای دوکان، لەگەڵ ماڵی کاک رەسوڵ و خێزانەکەی بەیەکەوە کارماندەکرد، دوایی ئەوان نەیانتوانی بەردەوامبن و وازیانهێنا، ئیتر خۆمان ماینەوە، ئەرکمان رۆژ بەرۆژ قورستر دەبوو. کە دەستمانکرد بە کار، هێشتا تەمەنی نارین نەگەیشتبووە ساڵێک، دەبوایە بیبەمە دوکان. خۆی منداڵێکی هێمن بوو، لەناو عەرەبانە دامئەنا، دراوسێکان ناوبەناو دەهاتن و دەیانبردە دەرەوە.

ئارام، منداڵێکی زیرەک و لەسەرخۆ بوو، زۆر ئارەزووی خوێندنەوەی هەبوو، پێش چوونە قوتابخانە، خوێندنەوە فێربووبوو. لە باخچەکەی خۆی کتێبی چیرۆکی بۆ منداڵەکان دەخوێندەوە و مامۆستاکانی ناویاننابوو (پەسوس) واتە

مەسیحی ناو باخچەی ساوایان، کاتێ دەهاتە دوکان گۆڤارێکی منداڵانی دەگرت بەدەستەوە و دەیخوێندەوە. کاتێ نارینیش تەمەنی دایەنگەی هات، لای ژنێک (دایکی رۆژانە)مان دانا و هاورێ و ئارام ئاگایان لێدەبوو، هەزارجار دەڵێم؛ ئەگەر وەک ماڵ، هەموومان هاوکاری یەک نەبووینایە، ئەو ئەرکە قورسانەمان بۆ جێبەجێ نەدەکرا.

زۆر هاورێمان دەهاتن بۆ هاوکاریمان لە دوکان، لە ساڵی ١٩٨٩ سۆرانی کاکە شەهاب (شەهید شەهاب) لە ئەڵمانیاوە هاتە سوید و لامان دەژیا و لە دوکان هاوکارمبوو، بەتایبەتی کە دارۆ گەڕایەوە بۆ کوردستان، بەیەکەوە لەگەڵ سۆران ئەرکی دوکانمان هەڵگرتبوو. ماڵیشمان بەردەوام پڕبوو لە میوان، بەتایبەتی ئەو ماڵە خزم و دۆستانەی کە دەهاتن بۆ پەناهەندەیی، چیشمان پەیدا دەکرد جگە لە بژێویی ژیانی خۆمان، هاوکاریی خزمانمان پێدەکرد لەناوەوەی وڵات و ئەوانەی پێشمەرگە بوون. لەگەڵ ئەو کارانەش، لە کاری سیاسەت بەردەوام بووین، بەشدار و ئەنجامدەری هەموو خۆپیشاندانێک و مانگرتنێک بووین، هاوکات کۆبوونەوەکانی شانەکانی یەکێتیمان ئەنجام ئەدا.

لە کۆتایی ساڵی ١٩٨٨ کۆنگرەی ژنانی سۆسیال دیموکراتی ئینتەرناسیۆناڵ گیرا، لە کوردستان، بەڕێز هێرۆ خان بانگهێشتکرابوو، لە سویدیش من و رووناک خانی خێزانی کاک سەردار بەشداربووین. ئەو کۆنگرەیە بایەخێکی زۆری پێدرابوو. کۆنگرەکە لەلایەن خێزانی یەکەمی نیلسۆن ماندێلا (وینی مادیکیزیلا ماندێلا) کرایەوە کە ئەوسا هێشتا نیلسۆن ماندێلا ئازاد نەبووبوو، هەرچەندە ئەو سەردەمە هەوڵی نێودەوڵەتیی زۆر زیاتربوو بۆ ئازادکردنی و هەرئەوە بوو بە یەکێ لە داواکارییەکانی کۆنگرەش. هێرۆ خان، کاتی قسەکردنی بۆ دانرابوو، لەناو کۆنگرەکە سەرەتا تەنیا پێنج خولەک دانرابوو، بەڵام بەهۆی کاریگەریی وتەکەی، درێژبووەوە بۆ (١٥) خولەک. ئەوسا جینۆسایدی ئەنفالی بەدناو و کیمیابارانی هەڵەبجە و شوێنەکانی تریش ئەنجام درابوون و دەستیانپێکردبوو، لە وتەکەیدا هێرۆ خان باسی لە ئەنفال و کیمیاباران کرد و وتی "ئەگەر فریای کورد نەکەون، میللەتێک نامێنێ بەناوی کوردەوە و ئەوسا تەنیا ناوی کورد لە کتێبە مێژووییەکان و مۆزەخانەکان دەدۆزنەوە". قسەکانی زۆر کاریگەربوون، کە قسەکانی تەواوکرد، هەموو کۆنگرە هەڵسانە

سەرپێ و بوو بە هۆیەکی گەورە بۆ ناساندنی ئەنفال و کیمیاباران لای وڵاتان. لەکاتی پشووی کۆنگرەدا، دەیان ڕۆژنامە و تەلەفزیۆن ڕوویانکردە ئێمە، بۆ چاوپێکەوتن لەسەر ئەو بابەتە.

لەکاتی بۆردومانی هەڵەبجە و شاڵاوەکانی ئەنفال، خۆپیشاندان لە سەرتاسەری ئەوروپا دەستیپێکرد. لە ستۆکهۆڵم، خۆپیشاندانێکی گەورە لەسەر شەقامەکانی ناوشار و بە بەشداریی کوردەکانی هەموو پارچەکان و دۆستە سویدییەکان و دۆستانی نەتەوەکانی تری ئەو شارە، ئەنجامدرا. هەموو هاوکارمان بوون، شەقامەکان هەموو گیرابوون و دروشمی سەرەکیمان (ستوپە مەساکرئی کوردستان - کومەڵکوژی لە کوردستان بوەستێنن)، (سەدام سەدام میورداری - سەدام سەدامی پیاوکوژ) و بەدەنگی بەرز هاواردەکرا. ڕۆیشتین بەرەو باڵیۆزخانەی عیراق لە ستۆکهۆڵم، کە گەیشتینە نزیک باڵیۆزخانە، پۆلیسی سویدی، پیادە و سوارە، دەوریان گرتین و هەندێ بوتڵی ئاگراوی بەسەر باڵیۆزخانەدا درا. ئەوسا شوانە چاوشین سەرپەرشتیی گەنجەکانی دەکرد، پۆلیس کەوتنە گرتنیان، من و هەتاوی خێزانی کاک حەمە سابیر، توانیمان خۆمان دەربازبکەین.

کاتێ پەلاماری عیراق بۆ سەر کوەیت دەستیپێکرد لە ٢ی ئابی ١٩٩٠، ئیتر ماڵی ئێمە پڕبوو لەبرادەران و بەدیار تەلەفزیۆنەوە دائەنیشتن. دارۆ نەیئەتوانی یەک چرکە تەلەفزیۆن جیبهێڵێ و فەرەیدون عەبدولقادریش لەلامان بوو. لە ٩ی ئابی ١٩٩٠، کاتێ عیراق بڕیاری دا کە کوەیت پارچەیەکە لە عیراق، دوو بۆچوون هەبوون لە ماڵی ئێمە و لای برادەران، یەکێ دەیوت "تازە عیراق بەهێزتر بووە" و یەکێکیش دەیوت "ئەمە دەبێتە هۆی هاتنی ئەمریکا و هێرشی وڵاتە عەرەبییەکان و ئەو دەوڵەتانەی کە بەرژەوەندییان لە کوێت هەیە". ئەمانە بە تەلەفۆن بە من دەوترا لە دوکان، چونکە خۆم بۆ ڕانەدەگیرا هەواڵ نەزانم.

من ڕام وەک ڕای دارۆ وابوو، کە بە زووترین کات هێرشی بەرپەرچدانەوە دەبێ، بەڵام ئەوەندەی نەخایاند و دوای چەند کاژێرێک، لەلایەن کوەیت و ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاوە داوای کۆبوونەوەی (ئەنجومەنی ئاسایشی نێودەوڵەتی) کرا و بڕیاری ژمارە (٦٦٠) دەرچوو بە کشانەوەی عیراق لە کوەیت و لە ٦ی ئابی ١٩٩٠ ئابڵوقەی ئابووری خرایە سەر عیراق.

ئەو ماوەیەی سوید، دەیان خەم و پەژارەی قورسمان بینی، لە کۆچی دوایی شێخ جەناب و شێخ نیهادی برای دارۆ و نازەنین خانی خێزانی شەهید شەهاب و لەکۆتاییشدا شەهیدبوونی ئازادی برام. هەر خەریکی پرسە بووین، زۆربەی کات جلی رەشم لەبەردابوو، کە بە لای سویدییەکانەوە پەسەند نەبوو، کولتووری جیاواز ئەو جۆرە بۆچوونانە دروستدەکەن.

جارێک ژن و مێردێک دوای یادی (٥٠) ساڵەی هاوسەرگیرییان، پیاوەکە کۆچی دواییکرد، پێشتر ئەو ژن و مێردە دەهاتنە دوکان بۆ کڕینی پێویستییەکانی رۆژانەیان. کاتی پرسەی پیاوەکە، ژنەکە هاتە دوکان بۆ کڕینی پێویستیی، ئەو رۆژە خۆی جوانکردبوو، پێیوتم "رەنگە سەیرمبکەی، بڵێی بۆ وا خۆی جوانکردووە؟! من و مێردەکەم (٥٠) ساڵ بەیەکەوە ژیاین و ژیانێکی بەختەوەرمان هەبوو، ئەگەر من وەک تۆ جلی رەش لەبەربکەم، هاوڕێکانم لێم دووردەکەونەوە، ئێستا من لەو تەنیاییەم پێویستم بە هاورێ هەیە". پاش چەند مانگێک، وتی "دەچمە خولی فێربوونی زمانی ئەڵمانی». تەمەنی لەسەروو حەفتا ساڵەوە بوو، وتی «دەبێ ژیان بەردەوامبێ و پێویستم بەوەیە زیاتر لەدەرەوەبم». ئەوانە جۆرێکی تر بوون لە خێزانی سویدی و منداڵەکانیشی سەردانیاندەکرد.

دوای ئەوەی لە لوبنان کۆبوونەوەیەک کرا بۆ نوێنەران و ئەندامانی یەکێتی لە دەرەوەی وڵات، بڕیار درا هەندێکیان بگەڕێنەوە بۆ کوردستان. لەوانە، د.حەمە سابیر و دارۆ لە سویدەوە گەڕانەوە بۆ کوردستان. کاتێ ڕاپەڕین دەستپێیکرد لە ٥ی ئازاری ١٩٩١ و دوای ١٠ ڕۆژ لە ڕزگارکردنی کەرکوک، هێرشە پێچەوانەکەی ڕژێمی سەدام دەستپێیکرد، کورد بڕیاری دا کە نایەوێت لەژێر دەسەڵاتی ڕژێمی دیکتاتور بمێنێتەوە و کۆڕەوی ملیۆنیی دەستپێکرد. هەموو میدیاکانی جیهان کۆرەوەکەیان،خولەک بە خولەک پیشاندەدا، هەستێکی پڕ لە ئازاربوو بۆ ئێمە لەو دوور وڵاتەوە، نەماندەزانی کەسوکارمان چییان بەسەر هاتووە و پەیوەندیمان نەمابوو.

ئەوەی لەدەستماندەهات، خۆپیشاندان و مانگرتن بوو. بڕیاردرا لەبەردەم بارەگای نەتەوە یەکگرتووەکان و باڵیۆزخانەکانی ئەورووپا و ئەمریکا مانبگرین لە نانخواردن، چادرمان هەلدا لەبەردەم بارەگای نەتەوە یەکگرتووەکان و لە هەموو ئەورروپا ئەو بڕیارە درا.

لەهەمانکاتدا کەوتینە کۆکردنەوەی هاوکاریی مادی و مەعنەوی بۆ ئاوارەکان، نامەماننووسی بۆ هەموو لایەک کە هەڵوێست وەربگرن. یەکێ لەو لایەنانە، فەلەستینییەکان بوون، بۆ بردنی نامەکە، من و هەتاو ئیبراهیم ئەحمەد و شوانە چاوشینیان ناردە لای فەلەستینییەکان، بەداخەوە دەرگایان بەسەردا داخستین و نەیانکردەوە، سەرەڕای ئەوەی کۆمکاری عەرەبی دژی ڕژێم بوون لە پەلاماردانی عیراق بۆ سەر کوەیت، ئەو هەڵوێستەی فەلەستینییەکانم هەرگیز بیرناچێتەوە.

بە هیمەتی هەموو لایەک، توانیمان هاوکارییەکی زۆر کۆبکەینەوە. هاوکارییەکان پێداویستیی ڕۆژانە بوون، کۆنتێنەرێک دەرمانمان کۆکردەوە و منیان ڕاسپارد بیگەیەنمە کوردستان، ئیتر ڕێگەپێدانمان لە باڵیۆزخانەی ئێران وەرگرت و من و نارین ڕۆیشتین، هاوڕێ و ئارام کاتی خوێندنیان بوو. گەیاندنی ئەو دەرمانانە کارێکی ئاسان نەبوو، لە دەیان شوێن تەگەرەیان بۆ دروستکردین، هەرچەندە لەناو فڕۆکەخانەی ئێران ئاسانتربوو.

ماڵی باوکم ئاوارەی ئێران بوون، لە فڕۆکەخانەی تاران هاوتای برام چاوەڕێم بوو، زۆر هاوکارم بوو و ئەرکی زۆری لە سەرشان کەمکردمەوە، تا سەر مەرزی کوردستان لەگەڵم هات و دەرمانەکانم بردە شەقڵاوە.

برادەران لە ئوتێلێک نیشتەجێبوون، دارۆ و مام جەلال لەو ئوتێلە بوون و دەرمانەکانم دا بە پزیشکەکانی شۆڕش. لەگەڵ دارۆ گەڕاینەوە بۆ قەڵاچوالان کە بارەگای سەرەکییان لەوێبوو، لە قەڵاچوالان (هێرۆ خان، د.کەمال فوئاد، عومەری سەید عەلی، سالار عەزیز، د.حەمە سابیر، حسێن شنگالی) لەو بارەگایە دەژیان.

سێ ڕۆژ لە قەلاچوالان مامەوە و بڕیارم دا سەرێکی سلێمانی بدەم، ڕۆژنامەنووسێکی بیانییان لەگەڵ ناردم بۆ ناو سلێمانی، یەک ڕۆژ لە سلێمانی مامەوە و خزمانم بینی و گەڕامەوە بۆ قەڵاچوالان.

هێشتا هەندێ هێزی بەرگریی عیراق، بەسەر ئەزمەڕەوە مابوون. لە قەڵاچوالانەوە بەرەو ئێران ڕۆیشتم بۆ سەردانی ماڵی باوکم لە مەهاباد، دوای ١٢ ساڵ، یەکەمجار بوو بگەڕێمەوە بۆ کوردستان و ماڵی باوکم ببینم. بە بینینی باوکم، لەسەر جێگا و بەو شێوەیە، نەمئەتوانی گریانی خۆم بوەستێنم. دایکم دەپاڕایەوە چیتر نەگریم، ڕەنگە کۆبوونەوەی ئەو هەموو ئازارە وایکردبێ کە نەتوانم دان بەخۆمدا بگرم. نارین کە دەیبینی ئەوەندە دەگریم، ئەترسا و نەدەچووە لای کەس و نەخۆشکەوت، دەیوت "بابگەڕێینەوە بۆ لای باوکم". گیانی هەمووی جێی پێوەدانی مێشوولە بوو، دەرمانەکانی سوید سوودیان نەبوو، هاوتای برام دەرزیەکی لێدا و بەوە باشتربوو.

ڕۆیشتین بەرەو تاران، لە ماڵی بەکر فەتاح ماینەوە، کافیە خان و کەژاڵ خانی خێزانی کاک بەکر لەوێبوون. ڕۆژێک لە تاران ماینەوە و گەڕاینەوە سوید و نارینیان لە نەخۆشخانە خەواند. نارین، بەهۆی ئەو گەشتەوە، بەو منداڵییە، سێ کیلۆ کەمیکردبوو.

بەهۆی ئەو کۆڕەوە ملیۆنییە، ئەنجومەنی ئاسایشی نێودەوڵەتی، لەسەر داوای حکومەتی فەرەنسا، بڕیاری ژمارە ٦٨٨ی بەسەر عیراقدا سەپاند و هێڵی (٣٦)ی دروستکرد، بە قەدەغەکردنی فڕین بەسەر ئاسمانی کوردستاندا. لە ٥ی نیسانی ١٩٩١ عیراقیش بڕیاری ئابڵوقەی ئابووریی بەسەر کوردستاندا سەپاند. کوردستان کەوتە ژێر دوو جۆر ئابڵوقەی ئابوورییەوە، ئابڵوقەی ئابووریی جیهان بەسەر عیراق و ئابڵوقەی عیراق بەسەر کوردستاندا، بۆیە باری ئابووریی کوردستان زۆر خراپ بوو، تەنانەت مووچەش نەبوو، ئەوەی

هەبوو تەنیا هاوکاریی دەرەکی بوو، بەڵام ئەو ناوچە ئازادە (free zone) وایکرد زۆربەی ئاوارەکان بەرەو ماڵەکانیان بگەڕێنەوە و ئاوارەیی کەمبێتەوە.

لە سوید، رۆژێک نارین پرسی؛ دایە، باوکم چیمانە، خزممانە، ئەوەندە خۆشماندەوێ؟ هەستمکرد دووریی باوک و دایک هەرچەند بێ، منداڵ پێویستی بەو سۆزەیە. ئیتر زیاتر لە منداڵەکان نزیکبوومەوە بۆ ئەوەی ئەو هەستەیان تارادەیەک بۆ پڕبکەمەوە.

لەو ماوەیەدا، جارێکی تر دارۆ سەردانی سویدی کرد، منداڵەکان یەک چرکە جێیان نەدەهێشت. دارۆ ئەوکات بەرپرسی پەیوەندییەکانی دەرەوە بوو.

نزیک سەری ساڵی ١٩٩٢ بوو، چووین بۆ فەڕەنسا و کاک کۆسرەتیش هاتبوو. هەمووومان لە فەرەنسا بووین، شەوی سەری ساڵ لە چێشتخانەکەی هەڵشۆ تایەر بووین. ئیتر من بە دارۆم وت «با هاوڕێ پۆلی شەشی ئامادەیی تەواوبکات، ئامادەبە ئێمەش دەگەڕێینەوە بۆ کوردستان». وتی «بڕیاری خۆتە، بەڵام وەرەوە و سەیربکە بزانە ژیان چۆنە، ئەوسا ئەو بڕیارە بدە». پاشان دارۆ لەگەڵ کاک کۆسرەت گەڕانەوە بۆ کوردستان.

لە ناوەڕاستی ١٩٩٢ هێرۆ خان هات بۆ سوید و بیرۆکەی دروستکردنی منداڵپارێزی پێبوو، بیروکەکەم زۆر لاپەسەند بوو و کەوتینە کار بۆ کۆکردنەوەی کۆمەک بۆ دروستکردنی منداڵپارێز. لەگەڵ رووناکی خێزانی کاک سەردار، بۆ ئەو مەبەستە سەرەتا لەناو سوید کارمانکرد و سەردانی کەنیسەکان و منداڵپارێزی سویدی (ریدەبارن)مان کرد. دوایی چووینە نەرویج و لە ماڵی شنۆی هاوژینی شەهید ئازاد هەورامیماینەوە، سەردانی زۆر لایەنمان کرد و بایەخێکی زۆریان پێداین و دەیان چاوپێکەوتنیان لەگەڵ کردین. دواتریش چووین بۆ فینلەندا، لە ماڵی هونەرمەندی جوانەمەرگ، رەهبەر جەلال بووین کە هەم دراوسێی کۆن بووین و باوکیشمان بەیەکەوە مامۆستا بوون، هەم هاوڕێی شەهید ئازادی برام بوو. خۆی و خێزانە فینلەندییەکەی زۆر هاوکارمان بوون و خەڵکێکی زۆریان لە ماڵەکەی خۆیان بۆ کۆکردینەوە، داواکاری و بیرۆکەی خۆمانمان بۆ باسکردن و دەیان جۆر پەیوەندی و کۆڕ و کۆبوونەوە و چاوپێکەوتنیان بۆ دروستکردین. لە هۆڵەکانی کۆبوونەوە، ئەو گرتە ڤیدیۆییانەی ئەنفال و کیمیاباران و کۆڕەوەکە و ڤیدیۆی زیندانییەکان و

شەهیدکردنی دیلەکانمان نمایشدەکرد. بەو جۆرە سەردانانە توانیمان کۆمەکێکی باش پەیدابکەین کە بەشی زۆری لەلایەن (رێکخراوی ئۆلف پالمێ)وە بوو. رووناک خان، کۆمەکەکەی لە رێگای تورکیاوە گەیاندەوە کوردستان بۆ لای هێرۆ خان و بوو بەهۆی دروستکردنی سەنتەری خانەی بێسەرپەرشتەکانی منداڵانی ئۆلف پالمێ و بازاڕێکیشمان لە سوید کردەوە بۆ فرۆشتنی ئەو کەلوپەلانەی لە ماڵەکان کۆکرابوونەوە، ئەویش تاڕادەیەک هاوکاربوو.

جارێکی تریش کۆنتێنەرێک پێڵاوی جیاوازمان کۆکردەوە و لە رێگای رێکخراوێکی خێرخوازیی سویدییەوە، ناردمانەوە بۆ کوردستان.

ئەو ماوەیە. کۆبوونەوەی بەردەواممان هەبوو لەگەڵ لاوانی سۆسیال دیموکراتی سویدی و هاوکارمان بوون بۆ کۆکردنەوەی کۆمەک. لە ساڵی (١٩٩١) بەیەکەوە بڕیاری بایکۆتی کەلوپەلی تورکیمان دا و دەیان دروشمی دژ بە رژێمی تورکیامان لە هەموو شوێنێک هەڵواسی، بەهۆی رەفتاری تورکیاوە بەرانبەر بە کورد.

تا لە سوید بووم دەنگم ئەدا بە پارتی سۆسیال دیموکرات و ئەندام بووم لەگەڵیان و هاوکاربووم بۆ بڵاوکردنەوەی فۆڵدەر و دروشمەکانیان، لەو پارتانە بوون بۆچوونیان لەسەر پەناهەندەکان پۆزەتیڤ بوو.

لە تەمووزی ١٩٩٢ لەگەڵ ئارام و نارین، لە رێگای تورکیاوە گەڕاینەوە بۆ کوردستان. ئەوکات دارۆ بەرپرسی پەیوەندییەکانی دەرەوە بوو و لە هەولێر نیشتەجێبوو. هات بەدواماندا بۆ سەر سنوور، ئەوسا بە قەیاغ دەپەڕینەوە لە ئاوەکەی سەر سنوور، سیمی قەیاغەکە بەربوو و من و دارۆ هەموو گیانمان تێکشکا، من شانم درزی برد و پەراسوویەکم شکا، سەرەتای گەشتەکەمان بە قورسیی دەستیپێکرد.

دارۆ، لە بارەگاکەی، تەلەفۆنێکی سەتەلایتی گەورەی لێبوو، رۆژنامەنووسە بیانییەکان راپۆرت و هەواڵەکانیان لە لای ئەوەوە دەنارد، هەمان جۆری تەلەفۆن لای د.کەمال فوئادیش هەبوو.

یەکەم هەڵبژاردنی پەرلەمانی کوردستان تەواو بووبوو کە لە ١٩ی ئایاری ١٩٩٢ کرابوو. هەروەها حکومەتی هەرێمی کوردستان بە سەرۆکایەتی د.فوئاد مەعسوم پێکهاتبوو، لەوێ بڕیاری کۆتاییم دا بە یەکجاری بگەڕێمەوە.

سەردانێکی بەڕێز مام جەلالمان کرد لە شەقڵاوە، پەخشان زەنگەنەشم دوای ئەو هەموو ساڵە لەوێ بینییەوە و زۆر لە برادەرانی حیزبەکانی تریشی لێبوو. مام ئێمەی بردە نانخواردن و وتی «ژنان لەپێشەوە (Ladies First)". ئارامی کورم وتی "ئەوە رۆمانییەکان لەکاتی شەڕدا، ژنانیان پێشدەخست". مام گوێی لێبوو، وتی "خۆت و براکەت هەر خەریکی قسەی زلن". مام چیرۆکی هاوڕێ و شەڕەکەی هاوڕێی، بۆ ئامادەبووان گێڕایەوە.

گەڕاینەوە سوید، ئەو ساڵە خەریکی خۆ ئامادەکردن بووین بۆ گەڕانەوەی یەکجاری. هاوڕێ، پۆلی شەشی ئامادەیی تەواوکرد و لە ئەمریکا وەرگیرا، لە زانکۆی ئۆکلاهۆما لە بەشی ئەندازیاریی تەکنیکی و کاروباری ئەویشمان جێبەجێکرد.

لە تەمووزی ١٩٩٣، گەڕاینەوە کوردستان و پاشان گەڕاینەوە سوید و لە ئەیلولی ١٩٩٣، بەیەکجاریی گەڕاینەوە کوردستان. ماڵەکەمان کۆکردەوە و دوکانەکەشمان دا بەکرێ بە دەستی دوو، بۆ ئەوەی سەرچاوەیەکی ژیانمان هەبێ کاتێ دەگەڕێینەوە بۆ کوردستان، ماڵەکەشمان خستە (٢٥) کارتۆنی شەحن بەرەو کوردستان و لە ڕێگای کارگۆی فرۆکەخانە، بەرەو تورکیام نارد. ئەوسا شازاد صائیب نوێنەری یەکێتی بوو لە تورکیا، ناونیشانێکی دایێ و بەو ناونیشانە ناردمەوە. کە گەیشتینەوە کوردستان، لە (٢٥) کارتۆن، تەنیا شەش کارتونمان وەرگرتەوە و (١٩) کارتۆن حکومەت و میتی تورکی دەستی بەسەردا گرت. سەرەڕای ئەو هەموو هەوڵەی کاک شازاد کە تەنانەت وەزارەتی ناوخۆی تورکیاش کاری لەسەر وەرگرتنەوەی کرد، بەڵام بێسوود بوو. بەهۆی ئەوەی زۆربەی ئەرشیفەکانمان و ئەلبومی وێنەکانمان لەناو ئەو کارتۆنانەدا بوون، بەداخەوە هەموو یادەوەری و یاداشت و ئەرشیفەکانمان فەوتاو نەما. کە لە هەمووی ناخۆشتربوو و ئێستا کە یادەوەرییەکان دەنووسمەوە، زیاتر هەست بە ئازارەکانی دەکەم. من کەسێکم ئەرشیف کۆدەکەمەوە، بەڵام دوای ئەو ڕووداوە، ئیتر ئەو ئارەزووەم نەما، تا بووم بە وەزیر. یەکێ لەو بیرەوەرییانەی لەناو ئەو کارتۆنانەدا فەوتا، هەندێ چیرۆک و هۆنراوەی نووسراوی خۆم بوون کە ئێستا زۆر کەمیانم لەیادە.

له ٢٦ی نیسانی ١٩٩٣، دارۆ بوو به وەزیری دارایی له کابینەی دووەمی کۆسرەت رەسوڵ، ئیمەش له تەمووزی ١٩٩٣ گەیشتینه هەولێر و لەوێ نیشتەجێ بووین.

ئارام گەیشتبووه پۆلی یەکەمی ناوەندی و نارینیش له کوردستان خستمانه بەر خوێندن. سەرەتا بۆ هەردووکیان زۆر قورسبوو لەگەڵ سیستمی کوردستان بگونجێن. ماوەی یەک مانگ، رۆژانه لەگەڵ نارین دەچوومه دەوام و له ژووری مامۆستاکان چاوەڕێم دەکرد. رۆژێک مامۆستاکەی وتی "ئەمرۆ قوتابییەکان دەنگه دەنگیان کردووە، نارین وتوویەتی، تۆ چۆن مامۆستایەکی ناتوانی بێدەنگیان بکەی، مێشکم چوو".

ئارام کێشەی له زمانی عەرەبی هەبوو، کوردیمان باش فێرکردبوو، له ماڵی خۆشمان به کوردی قسەمان دەکرد و زمانی سویدی بەکارهێنانی قەدەغەبوو جگه له خوێندنی وانەکان. رۆژێک مامۆستای عەرەبی، هۆنراوەیەکی سەردەمی جاهلیی پێدابوون، منیش تێبینیمکرد زۆر سەختە و ناتوانێ ئەزبەری بکات. وتم "کورم وازی لێبێنه، مامۆستاکەت دەزانێ تۆ عەرەبیت نەخوێندووە". که گەڕایەوە له خوێندنگا، ئەحمەد بامەڕنی له ماڵی ئێمه بوو که ئەندامی پەرلەمانی کوردستان بوو، ئارام یەکسەر چوو بۆ ژووری خۆی، وتی "نەموت دەبێ لەبەریکەم" و دەستیکرد به گریان، تومەز مامۆستاکەی لێیدابوو. منیش بەدەست خۆم نەبوو لەگەڵی گریام و بڕیارمدا ئەو کێشەی لێدانه بگەیەنمه پەرلەمان له رێگای ئەحمەد بامەڕنی و د.کەمال فوئادەوە، لەگەڵ لیژنەی پەروەردە دەیان دانیشتنم کرد و بڕیاریاندا لێدان قەدەغەبکەن، چووشمه خوێندنگاکەی بۆ بەدواداچوونی رووداوەکە.

کاتێک گەڕاینەوە، بەر له گەڕانەوەمان، سویدییەکان ئاهەنگێکی خنجیلانەیان بۆ کردین. لایان خۆش نەبوو، بەڵام به گرنگیان زانی که دەگەڕێینەوە بۆ وڵاتی خۆمان و رۆژنامەی (Dags nyheter)ی سویدی، دوو لاپەڕەیان بۆ تەرخانکردبووین. دوای چەند مانگێک، هەمان رۆژنامە، دوو رۆژنامەنووسیان ناردە کوردستان و راپۆرتێکیان لەسەر ئارام کرد (لەماڵەوە تا چوو بۆ خوێندن و لەناو پۆل و گەڕانەوەی)، تا بزانن له کوردستان ژیانی رۆژانەی چۆن دەباتەسەر. ئەو راپۆرتە بۆ تەلەفزیۆن و رۆژنامە بوو، له کەناڵە سویدییەکان

بڵاوکرایەوە. لەو ماوەیەی دواتر کە لە زانکۆ دەرچووبووم، لە گۆران نێت دەستبەکاربوو، بۆ هەمان مەبەست و بەدواداچوونی ڕاپۆرتەکەیان، هاتنەوە کوردستان بۆ نووسین و تەواوکردنی بەسەرهاتی ئارام.

ئەوکات، تا ئارام و نارین لەگەڵ کەشوهەوای کوردستان ڕاهاتن، چەندینجار تووشی نەخۆشی و پەتابوون و هیچ نەخۆشییەک نەما نەیگرن.

### کارکردنم لە منداڵپارێز و سەنتەری گەنجان

لەساڵی ١٩٩٣ - ٢٠٠٠ لە منداڵپارێزی کوردستان کارمکرد. کاتێ لە سوید گەڕامەوە و لە هەولێر نیشتەجێبووم، دارۆ وەزیری دارایی بوو، پێمدەوت "لە سوید زۆر هیلاک بووم، ماوەیەک وەک شێخژن پشوو دەدەم"، بەڵام زۆری پێنەچوو، هێرۆ خان هاتەماڵەوە و وتی "لێتناوەشێتەوە دابنیشی، برۆ منداڵپارێز چاوەڕێتدەکات و لەوێ دەستبەکاربە". ئیتر بە دارۆم وت، پێم پێدەکەنی، وتی "شێخ ژنییەکەت زۆری نەخایاند".

سەرەتا لە هەولێر بووم، تا ٣١ی ئاب و شەڕی نەگریسی ناوخۆ، دوای ئەوە هاتمە سلێمانی و لە ئۆفیسی سلێمانی، لە کار و پرۆژەکانم بەردەوام بووم. لێرەدا ئاماژە بە هەندێک لەو پرۆژانە دەدەم کە بەشداربووم لە جێبەجێکردنیاندا:

- سەرەتا، لە هەوڵی پەیداکردنی سەرچاوەیەکی داراییدا بووم بۆ بەردەوامیی ڕێکخراوەکە لە هەولێر. بۆ ئەو مەبەستە، باخێکی گەورەمان وەرگرت لە ڕێگای وەزارەتی کشتوکاڵ و بەڕێوەبەرێتی گشتیی وەزارەتەکەوە، ئەوەش دوای مشتومڕ و کۆبوونەوەیەکی زۆر، کە بەڕێوەبەری گشتی (کاک ئیسماعیل) زۆر هاوکار بوو، ئەو زەوییە شوێنی چاندنی گەنم هەبوو، بە داهاتەکەی توانیمان خانووەکەی عەینکاوە بکڕین و پێداویستیی ڕۆژانەمان دابینبکەین.

- پرۆژەی کردنەوەی خوێندنگای نەوجەوانان، بەتایبەتی کە منداڵ بەهۆی ئەو کارەساتانەی بەسەر کوردستان هاتبوو، دەستیان لە خوێندن هەڵگرتبوو. لەگەڵ پەروەردە توانیمان خوێندنگای نەوجەوانان بکەینەوە کە لەبری شەش ساڵ، بتوانن بە ماوەی چوار ساڵ خوێندنی سەرەتایی تەواو بکەن. ئەو کۆمەکانەش کە لە دەرەوە بۆمان دەهات، بەسەر ئەو خوێندکارانەدا دابەشییکەین.

ئیدی وەک سەرپەرشتیار سەردانی ئەو خوێندنگایەم دەکرد، پەروەردەش زۆر هاوکاربوو، هەموو پێداویستییەکیان لە خوێندنگا و مامۆستا و کەلوپەلی خوێندن بۆ دابینکردین.

- پرۆژەی منداڵانی سەر شەقام، ئەم پرۆژەیە، کاتێکی زۆری دەویست و بەردەوام بەدوای ئەو منداڵانەوە بووین کە بەهۆی بێسەرپەرشتیارییەوە لەسەر شەقامەکان دەمانەوە. ئەوەندە کاتی بردبووم، رۆژێک چوومە ماڵەوە، ئارام وتی "دایە تۆ منداڵپارێز فیت". وتم "بۆ؟" وتی "چونکە ئاگات لە منداڵی خۆت نەماوە". زانیم کە کەمتەرخەمم بەرانبەریان و لەکارەکەم تێناگەن، ئیتر فێربووبووم ئەگەر کاتیان هەبوایە لەگەڵ خۆم دەمبردن، بۆ ئەوەی تێبگەن من بۆچی ئەو کارە دەکەم کە کارێکی خۆبەخشیی بوو. دارۆ مەرجی ئەوەبوو مووچە لە منداڵپارێز وەرنەگرم، بۆیە منداڵپارێز ئەرکبوو نەک سەرچاوە.

دەیان منداڵم بردە خانەی نەوجەوانان یان خێزانمان بۆ پەیدا دەکردن بۆ بەخێوکردنیان، هەندێکیش خۆمان یارمەتیمان ئەدان. ئێستا ئەو منداڵانە گەورەبوون و بە من دەڵێن دایە، خاوەن خێزان و ماڵ و منداڵن و بەشێکی بەرچاویشیان مام جەلال و هێرۆ خان مووچەیەکیان بۆ ئەو خێزانانە بڕییەوە و لەلایەن ئەوانەوە بەخێودەکران.

- پرۆژەی هاوکاریی منداڵی بێ باوک و دایک (sponsor ship). نوێنەرەکانمان لە ئەوروپا و خێرخوازێکی زۆر هاوکارمان بوون، مانگانە بڕێک پارەیان دەنارد، ئەماندا بەو منداڵانە یان بەو خێزانانەی کە منداڵی بێ باوک و دایکیان لابوو.

رۆژ بەڕۆژ ژمارەیان زۆر دەبوو، خێزانی واهەبوو، سێ چوار منداڵی لەخۆگرتبوو بە پارە ناردنەوە، هاوکارییەکەش تا تەمەنی (١٨) ساڵی بوو.

- پرۆژەی بەندیخانەی نەوجەوانان (سجن الاحداث). ئەو پرۆژەیە، لەلایەن رێکخراوی (فرانس لیبەرتی) بە سەرپەرشتیی (مەدام میتران) ئەنجامدرا، بە هاوکاری و کارئاسانیی وەزارەتی تەندروستی و ناوخۆ، بینایەکی گونجاو و گەورەیان بۆ کردین و مەدام میتران خۆشی هات بۆ سەردانی پرۆژەکە.

پێشتر، بەندکراوی نەوجەوان، تێکەڵ بە گەورەکان دەکران.

کەژاڵی خوشکم، بوو بە بەڕێوەبەری ئەو بەندیخانەیە. بەشە تەندروستییەکەشی. هاوتای برام بەخۆبەخش توانی کەلوپەلی بۆ پەیدابکات و سەرپەرشتیی دەکرد لەگەڵ چەند خۆبەخشێکی تر.

ئەوسا خۆبەخشیی زۆر زیاتر بوو لە ئێستا، هەر کەسێکم بناسیایە داوای هاوکاریم لێدەکردن. هەروەها دەیان چالاکیی هونەری و کردنەوەی خولی تایبەت بۆ منداڵان کە ئەوانەش مامۆستاکان بەخۆبەخش دەیانکرد. ئەمە جگە لە دابەشکردنی کۆمەک و هاوکاریی بەسەر خانەی نەوجەوانان و زیندانییەکان و هەندێکجاریش بۆ باخچەی ساوایان.

ئەوەندە لەگەڵ ئازارەکانیان دەژیام، واملێهاتبوو قسەم نەمابوو جگە لە باسی ئازاری ئەو خەڵکە، ڕاهێنەرێکی بەریتانی بەناوی پیتەر، پێیوتم "دەبێ تۆ کەسایەتیی خۆت بپارێزی بۆ ئەوەی بتوانی چارەسەری کێشەکانیان بکەی". جارێک پیاوێکی گەنج، لە منداڵپارێز هاتە لام و باسی خراپیی باری ئابووری خۆی بۆ کردم و منداڵی زۆری هەبوو، سەرەتا بەپێکەنینەوە پێموت "بەو گەنجێتیەتەوە چۆن فریای ئەو هەموو منداڵە کەوتووی کە دەزانی خۆت باری ئابووریت ڕێگات نادات؟". (باری ئابووری هەموو کەسێک خراپ بوو بەهۆی ئابڵۆقە ئابوورییەکانەوە) پیاوەکە دەستیکرد بەگریان، کە ئەو گریا، منیش دەستمکرد بە گریان. ئەو گریانی وەستا و من هەر دەگریام، تا وایلێهات پیاوەکە ڕۆیشت، کە چووبووە دەرەوە وتبووی "بڕۆن ئەو خوشکە ژێربکەنەوە". دوایی ستافەکە بەگاڵتەوە دەیانوت "لەمەودوا خەڵکت بۆ دەنێرین بەدەستی بەتاڵ بیانێرەوە، تەنیا گریانی تۆ بەسە".

هەروەها هەندی پرۆژە و چالاکیی ترمان بۆ گەنجان ئەنجامدا.

هاوکاریمان دەبردە کەمپەکانی ئاوارەکان و بە هاوکاریی وەزارەتەکانی هەرێم، چەندین پرۆژەمان بۆ ئەو کەمپانە جێبەجێکرد.

خانەی نەوجەوانان، کەلوپەلی زۆری تێدا نەمابوو، هەوڵماندا کەلوپەلەکانیان بۆ دابینبکەین لەبری وەرگرتنی ئەو منداڵانەی کە بۆیان دەبەین، وەک پێخەف و جلوبەرگ.

لەگەڵ ڕێکخراوی ئەمەل کە ڕێکخراوێکی خێرخوازیی عەرەبی بوو، هەنا ئەدوارد سەرپەرشتیی دەکرد، هاوکاری بنکەیەکی تەندروستی بووین و کارمان بۆ کرد، هەروەها چەند بنکەیەکی نەهێشتنی نەخوێندەواریشمان کردەوە.

دوای ۳۱ی ئاب و شەڕی ناوخۆ، ئێمە چووینە سلێمانی، دکتۆر جوتیار بەرپرسی لقی سلێمانیی منداڵپارێز بوو، هاتمە ناو بارەگای منداڵپارێز و لەوێ دەستمکردەوە بە کار. دوای ماوەیەک دکتۆر جوتیار لە ڕێگای نەتەوە یەکگرتووەکانەوە چووە هەندەران و من بووم بە بەرپرسی منداڵپارێز و هێرۆ خان سەرپەرشتیی دەکردین، لە دەرەوەی وڵاتیش شاناز ئیبراهیم ئەحمەد سەرپەرشتیی چالاکییەکان و کۆکردنەوەی کۆمەکی بۆ منداڵپارێز دەکرد. پرۆژەکانمان لە هەمان چوارچێوەدا بوون، وردە وردە پرۆژەی ترمان زیادیکرد، لەوانە پرۆژەی چارەسەری دەروونیی بۆ ئەو منداڵانەی کە بەهۆی شەڕ و کرداری جینوسایدەوە، تووشی (تراوما) بووبوون. هەروەها ڕاهێنانمان بە زۆر لە دەروونناسەکان و کۆمەڵناسەکان کرد. هەروەها یەکێکی تر لە پرۆژەکانمان دابەشکردنی مەڕ و ماڵات و پەلەوەر بوو بەسەر ماڵە هەژارە گوندنشینەکاندا.

پاشان لە ڕێگای هەندێ خێرخوازەوە، هەندێ منداڵمان ناردە دەرەوە بەتایبەت ئەوانەی تووشی نەخۆشیی بووبوون و چارەسەریان لە کوردستان نەبوو. هەندێکیش لەڕێگای کەسایەتییەکانەوە، بۆ نموونە پورم (زیبا عەبدولواحید) دوو کەسی بردە سویسرا و لەوێ چارەسەریان کردن. پاش ماوەیەک پرۆژەی سەنتەری گەنجان هاتە پێشەوە و (کاک جوتیار و هەندێ لە کارمەندی منداڵپارێز بەهۆی بڕیاری کشانەوەی هەندێ چالاکوانی مەدەنی بۆ ئەمریکا و وڵاتانی دەرەوە کە پەناهەندەییان قبوڵکرابوو لەدوای ۳۱ی ئابەوە، ئەویش بەرەو ئەمریکا ڕۆیشت).

شوێنی سەنتەری گەنجان دیاریکرا، سەرەتا لە گردی بەرانان (ربعایە) لە چەند ژوورێکدا چالاکیمان دەستپێکرد. دوای دیاریکردنی شوێنێک کە بیناکەی کاتی خۆی سەر بە وەزارەتی کاروباری کۆمەڵایەتیی سەردەمی ڕژێم بوو، درا بە سەنتەر. بینایەکی رووخاوی وێرانە بوو، بەهۆی هاوکاریی ڕێکخراوە نێودەوڵەتییەکانەوە. ئەو بینایە چاککرایەوە. ڕۆژانە سەردانی کرێکارەکانم دەکرد بەمەبەستی پەلەکردن لە کارەکانیان و هۆڵەکەشیمان چاککردەوە بۆ کۆبوونەوە و چالاکیی گەورە.

ئەو چالاکییانەی لەو سەنتەرەدا دەکرا:

- ستۆدیۆیەکی تۆمارکردنی دەنگمان ئامادەکرد و (دیاری قەرەداغی) هونەرمەند بوو بە سەرپەرشتیاری ئەو ستۆدیۆیە و هونەرمەندانی سەرکەوتوو لەو شوێنە کار و چالاکیان دەکرد.
- بەشی کۆمپیوتەرمان دانا بۆ فێربوونی کۆمپیوتەر.
- بەشی هونەری وێنەکێشان، فۆتۆگراف، شانۆ، کۆنفۆ، تایکواندۆ، کرانەوە.
- کتێبخانەمان کردەوە کە بوو بە سەرچاوەیەک بۆ خوێندکار و کتێبەکانمان بەشی زۆری لە خێرخواز و دۆستانی کتێب پەیدا دەکرد.
- بەشی شانۆ و سینەما، شۆان عەتوف سەرپەرشتیی دەکرد و چالاکیی جۆراوجۆری تیا ئەنجام ئەدرا. جارێکیان پێشبڕکێی خۆشترین دەنگ و نمایشی جلوبەرگی کوردیی تیا ئەنجامدرا.
- کافتریایەکی تیادا بوو، بۆ پشوو و کۆبوونەوەی گەنجانی کوڕ و کچ.
- هاوکاریی تیمە وەرزشییەکانمان دەکرد.
- مەراسیمی گەوردی تیادا ئەنجام دەدرا کە دەیان هونەرمەندی لەخۆی کۆکردبووەوە.

بۆ هەموو ئەو خول و چالاکییانە، ڕاهێنەری پرۆفیشناڵی لێبوو، گەنجێکی زۆری لەخۆی کۆکردبووەوە و زوو زووش پێشانگامان بۆ دەکردنەوە. هەرچەندە سەرەتا هەندێ خێزان قسەیان دژی دەکرد، دواتر هەر خۆیان منداڵەکانیان دەنارد. توانیمان دەیان گەنج بنێرینەوە بەر خوێندن و دەیان کادیری میدیایی بەرهەمبهێنین. هێرۆ خان، زوو زوو سەری ئەداین و هاندەر و پشتیوانێکی زۆر بەهێزبوو بۆمان، دڵی بە هەموو چالاکییەک خۆش دەبوو.

بۆ کردنەوەی سەنتەری گەنجان، یەکەم ڕۆژ، بەڕێز مام جەلال میوانداریکرا و سەنتەرەکەی کردەوە.

هەروەها پرۆژەیەکی ترمان هەبوو، بەهەمان شێوەی هەولێر، خوێندنگای نەوجەوانانمان کردەوە و هاوکاریان بووین لە بەڕێوەچوون.

یارمەتیی خانەی نەوجەوانمان ئەدا، بە کۆکردنەوەی هاوکاری و بەدواداچوون و چارەسەرکردنی کێشەکانیان لە ڕێگای دەروونناسەکانەوە.

پرۆژەی (Sponser ship)، هاوکاریی منداڵی بێ سەرپەرشتیار پەرەیسەندبوو. ژمارەیان لە هەزار منداڵ تێپەڕی و منداڵپارێز بوو بە سەرچاوەیەکی بژێوی ژیان بۆ زۆر لەو ماڵانە.

پێش پرۆژەی کازیوە،ماڵێکمان گرتبوو، ئەو منداڵانەی کە کاریان دەکرد، لەکاتی پشوویان سەردانی ئەو شوێنەیان دەکرد و کار و چالاکییان تێدا ئەنجامدەدا.

دەیان منداڵمان لە دیاردەی سواڵکردن رزگار دەکرد. ئەمانە (مشتێک بوون لە خەرمانێک) پرۆژەی گرنگ کە بە هاوکاریی هەموو لایەک ئەنجام ئەدرا و بە سەرپەرشتیی خوشکی بەڕێزمان هێرۆ خان، تا ئەوکاتەی من لە منداڵپارێز بووم، دوای ئەوەش و تائێستاش بەردەوامە لە کار و چالاکیی.

مەبەست لە کردنەوەی سەنتەری گەنجان، یەکەم: لەبەر نەبوونی شوێنی تایبەت بۆ سەرقاڵکردنی گەنجان لەکاتی دەستبەتاڵییان بە کار و چالاکیی بە سوود.

دووەم: لەو سەردەمەدا، رەوتی بزووتنەوەکانی ئیسلامی سیاسی، کاریان لەسەر گەنجان دەکرد و لەلایەکی ترەوە رەوتە توندڕەوەکانیش بەهەمان شێوە، بۆیە مەبەستمان بوو گەنجان بتوانن ئارەزووەکانی خۆیان لەو سەنتەرە ئەنجامبدەن و دووربکەونەوە لەو لایەنانە.

سێیەم: بۆ پتەوکردنی پەیوەندیی نێوان گەنجان و لێکفێربوونی کاری چاک و بەسوود.

هەرچەندە لەسەرەتادا دژایەتیمان زۆر دەکرا، بەتایبەتی بەهۆی ئەوەی ئەو سەنتەرە بۆ کوڕ و کچی گەنج بوو، لۆمەیان دەکردین و دەیانووت "شوێنێکی خراپە"، بەڵام سڵمان نەکردەوە لەو قسەوباسانە. هەر کارێکی تازە بە لای خەڵکەوە نامۆیە و ڕەتدەکرێتەوە، بەتایبەتی ئەگەر دژی نەریتە باوەکان بێت.

هەرچەندە شەڕی ناوخۆ ماڵوێرانکەر و بیرەوەرییەکی پڕ لە ئازارە، بەڵام بە گرنگی دەزانم بۆ خستنەڕووی راستییەکان و بەهیوای دووبارەنەبوونەوە و پەندوەرگرتن، ئەو بیرەوەرییە تاڵانە باسبکەم. ئەویش ئەوەندەی ئاگام لێبووە و پەیوەندیی راستەوخۆی بە ژیان و گوزەرانی خۆم و کەسوکارمەوە هەبووە.

لە کۆتایی نیسان و سەرەتای ئایاری ١٩٩٤، شەڕی ناوخۆ دەستیپێکرد، بەهۆی ئەو گرژی و ئالوزییانەی کە دەمێکبوو دەستیپێکردبوو. ناوشاری هەولێر بەجۆرێک بوو وەک بڵێی قەدەغەی هاتووچۆ هەیە، هەرکەسێ دەچووە دەرەوە بۆ ناوشار، ترسی ئەوەی لەسەربوو دووچاری شەڕ و کێشە ببێت، هەرچەندە سەرەتا شەرەکان لە دەوروبەری هەولێر بوون.

یەکەم شەڕ، لە ٢ی ئایاری ١٩٩٤ لە قەڵادزێ روویدا. پاش قەڵادزێ، شەڕەکە هەموو کوردستانی گرتەوە. ئەو شەڕە نەگریسە، هەر لەسەرەتاوە بوو بەهۆی پەلکێشانی سوپای عیراق و ئێران و تورکیا بۆ ناو خاکی کوردستان و زیانێکی زۆری لەڕووی ئابووری و کۆمەڵایەتییەوە بە کۆمەڵانی خەڵک گەیاند و هەزاران ماڵی هەڵوەشاندەوە. بوو بەهۆی ئاوارەبوونی هەزاران ماڵ لە هەردوولا کە تائێستاش ئاسەوارەکانی هەر ماون و زۆربەی خێزانەکان لە شوێنی باپیرانیان هەڵکەندران و چوونە شوێنێکی تر بۆ پارێزگاریی لە ماڵ و سەر و گیانیان.

یەکێتی، جگە لە شەڕی پارتی، لەگەڵ بزووتنەوەی ئیسلامییش رووبەڕووی شەڕبووبووە کە لە خورماڵ دەستیانپێکردبوو.

لە شاری هەولێر، لە ١٥ی ئایاری ١٩٩٤ شەڕ دەستیپێکرد و پێشمەرگەکانی هەردوولا راستەوخۆ رووبەڕووی یەکتربوونەوە. هەوڵی زۆر درا شەڕ بوەستێنرێ، هەر لە بانگەوازی مەسعود بارزانی و کۆبوونەوەی (کۆسرەت رەسوڵ و مەسعود بارزانی) و هەوڵی حیزبەکانی تر، بەڵام سوودیان نەبوو، رۆژ بەڕۆژ دژایەتییەکە توندتردەبوو و بڕیارەکان کاریگەرییان لەسەر هێزەکانی پێشمەرگەی هەردوولا نەبوو.

سەرباری شەڕەکە و گیانلەدەستدانی ئەو هەموو کەسە، گرانی و نەبوونی خزمەتگوزاری و ترس، باڵیان بەسەر خەڵکدا کێشابوو. دزی و

تالانی و راووڕووت، یەکجار زۆر بووبوون، هەر لایەک شوێنی لاکەی تری داگیربکردایە، کەسانێک هەبوون پەلاماری شوێنەکەیان ئەدا و تالانیان دەکرد. راووڕووت و تالانی، ئەو دوو وشەیە زۆر بە سادەیی باسدەکران، بەو هێزەیان دەوت "هێزی (RR)". لە نزیک شەڕەکان دەوەستان تا کۆتایی شەڕەکە و هێزی راووڕووت (RR) ئامادەبوون بۆ تالانکردنی شوێنەکە.

لەوکاتەی شەڕ لە ناوشاری هەولێر توندبوو، ماڵی ئێمە کە لە گەڕەکی شۆڕش بووین. ناوچەیەکی پارێزراو نەبوو، رۆژێک گوللە ئارپیجییەکیان نا بەناو گەراجی ماڵەکەمانەوە. بەهۆی ئەوەی هەموو ئەندامانی مەکتەبی سیاسی، لە باردگای مەکتەبی سیاسیی دەژیان، لەبەرئەوە دارۆ لە لای ئێمە نەبوو، بۆیە وتی "بچن بۆ ماڵی کاک کۆسرەت". بەهۆی ئەوەی منداڵەکانمان هاوڕێی یەک بوون بەتایبەتی ئارام و دەربازی کاک کۆسرەت لە یەک پۆلدا بوون لەهەمان خوێندنگا، هەروەها نارینی کچم و رێناسی کاک کۆسرەتیش زۆر هاوڕێ بوون. ئەوێ شوێنێکی پارێزراوتر بوو.

دواتر شەڕ کەوتە کۆڵانەکان و تەقە دەکرا، لە یەکێ لەو شەڕانەدا پوری جەبار فەرمان بەرکەوت کە ئەوانیش لە نزیک ماڵی کاک کۆسرەت بوون. بەپەلە هێنایانە ماڵی ئەوان، بەهۆی ئەوەی من ماوەی سێ ساڵ و نیو لە نەخۆشخانەیەکی سوید کارمکردبوو، هەندێ شارەزای تیمارکردنی برین و دوورینەوە بووم، هەرچۆنێکبێ ئەو فیشەکەی بەردەستی کەوتبوو، بەو کەلوپەلانەی لامانبوو بۆ هاوکاریی سەرەتایی، دەرمهێنا و برینەکەم بۆ دوورییەوە و تیمارمکرد. دواتر تا کۆچی دواییکرد هەر دەستخۆشیی لێدەکردم.

رۆژێک، ئارام چوو بۆ ژووری سەرەوەی ماڵی کاک کۆسرەت بۆ هێنانی پانکەیەک، لە ماڵی سامی عەبدولڕحمانەوە تەقەیان لێکرد و زۆر نزیکبوو لەوەی بەربکەوێ. پاش چەند رۆژێک هێرۆ خان بەدوایدا ناردین و چووینە ماڵی ئەوان، مام جەلال لە دەرەوەی وڵات بوو، بەیەکەوە فاکسی هەواڵەکانمان بۆ دەرەوە دەنارد و مام جەلال و کاک نەوشیروان ئاگادار دەکرانەوە.

سەرەتای شەڕی ناوخۆ، لە شەڕی بزووتنەوەوە دەستیپێکرد، لە گرتنی شێخ عوسمانی رابەری بزووتنەوە لەلایەن یەکێتییەوە. مەسعود بارزانی

هەرەشەی شەڕی سەرتاسەریی کرد ئەگەر شێخ عوسمان بەرنەدرێت، ناچار یەکێتی بەریدا و ماوەیەک لای پارتی مایەوە، دواتر گەڕاندیانەوە بۆ هەڵەبجە. پارتی، بە ئاشکرا پشتیوانی بزووتنەوە بوون و لە قەڵادزێش شەڕەکەیان بەیەکەوە دەکرد، هەر بەیەکەوەش کۆنترۆڵی قەڵادزێ و پێنجوێنیان کردبوو، هەروەها بزووتنەوەی ئیسلامی لە خورماڵیش شەڕی دژ بە یەکێتی دەستپێکرد.

لەوکاتەی کە لە ماڵی مام جەلال بووین، کاتی تاقیکردنەوەی سەری ساڵ بوو، ماڵی کاک کۆسرەت دەهاتن بەدوای ئارامدا و لەگەڵ دەرباز دەیانبردن بۆ تاقیکردنەوە. ڕۆژێک هەندێ چەکدار دەچنە خوێندنگاکە بۆ ڕفاندنی ئارام و دەرباز، بەپەلە مامۆستاکان پێی دەزانن و لە دیواری پشتەوەی خوێندنگاکە ڕزگاریاندەکەن. هێرۆ خان تووڕەبووبوو، بە منی دەوت "منداڵەکە قوربانی خوێندن دەکەیت؟"، بۆیە دواتر کە دەچوون بۆ تاقیکردنەوە، خوێندنگاکە ڕێیان بە پاسەوانەکان دا چاودێربن لە دەرەوە تا تەواو دەبوون.

ئەو چەند ڕۆژە دڵمان لەناو دەستماندا بوو، هەر لە کۆتایی مانگی ئایاردا، ڕۆژێک بڕیارمدا بچمە منداڵپارێز بۆ دابەشکردنی ئەو هاوکارییە مانگانەیەی کە لەلایەن منداڵپارێزەوە دابیندەکران بۆ منداڵە بێ سەرپەرشتەکانی بنەسڵاوە، سێ کەسم لەگەڵ بوو، ئامانجی برازای دارۆ و دوو پێشمەرگەش (دیاری و ناسیح). ئامانج دەمانچەیەک و کلاشینکۆفێکی پێبوو، چووم بۆ منداڵپارێز، بارەگاکەمان لە تەنیشت بارەگای لقی پارتی دیموکراتی کوردستان بوو، هەر کە گەیشتم، هێشتا دانەنیشتبووین، هێزێکی چەکداری زۆر دابەزینە شوێنەکەوە و دەوریاندایین و ئێمەیان بردە ناو لق، ئامانج و دیاریان گرت و چەکەکانیان لێوەرگرتن و بە قۆناغە تفەنگ هەموو گیانی ئامانج و دیاریان شین کردبووەوە، ناسیحیش لە دەرەوە لای دیوارێک هاواری دەکرد هەر کەسێ نزیکبێتەوە تەقەی لێدەکەم و دەستناپارێزم.

دراوسێیەکی ئێمە لە ماڵەوە، دوکانەکەی لە نزیک لق بوو، تەلەفۆنی بۆ ماڵی ئێمە کردبوو، ئارامی کوڕم هەڵیگرتبوو، هەواڵەکەی پێدابوو، ئەویش بە جیهاز قسەی لەگەڵ مەکتەبی سیاسیی کردبوو، د.فوئاد مەعسوم هەڵیگرتبوو، ئیتر ئەو هەواڵە بە هەموو لایەکدا بڵاوبووبووەوە. ماڵی مام جەلال، هێزەکەیان بەخۆیان و زرێپۆشێکەوە هاتبوونە نزیک لق، لای فولکەکە وەستابوون.

ئەوسا سەرۆکی لیژنەی ئاساییکردنەوە (مەلا بەختیار وەک یەکێتی و عارف تەیفور وەک پارتی) بوون، ئەوانیش گەیشتنە لای لق. چەکدارەکانی پارتی سەربانەکانیان گرتبوو، لەناو لقیش هەندێ خەڵکی چەکداری لێبوو، زۆر قسەی ناشیرینیان دەکرد و دەیانووت "ئێوە هاتوون بۆ سەر لق"، گوێیان نەدەگرت کە بۆ چ مەبەستێ هاتووین. مەلا بەختیار بە بڵندگۆ و بە دەنگی بەرز هاواریدەکرد "وەرنە دەرەوە، کەس تەقەتان لێناکات"، بەڵام من نەمدەویست پێش وەرگرتنەوەی چەکەکان بچمە دەرەوە، پاش هەوڵی زۆر، هەردوو چەکەکەم وەرگرتەوە و داوای فیشەکەکانیشم دەکرد، بەڵام وتیان "دیارنییە، ئێستا برۆن دوایی بۆتان ئەنێرینەوە". ئەویش بە تەلەفۆنی ئازاد بەرواری بوو، منیش لەتاو دۆخی ئامانج، چی قسەی ناشیرین بەدەممدا هات، پێموتن. کاتێ هاتینە دەرەوە، بینیمان دونیا ورووژاوە، مەلا بەختیار وتی "باشە ئەوە رۆژە تۆ دێیتە دەرەوە؟"، منی رزگارکرد لەو بارە خراپە. دارۆش زانیبووی چی روویداوە، خۆی بۆ نەگیرابوو هاتبووە لای لق و مەلا بەختیار نەیهێشتبوو زیاتر بێتە پێشەوە.

خەریکبوو لەسەر کارێکی خێر، دەیان کەس بکوژرێ و لەسەر من شەڕ هەڵبگیرسێتەوە. پاشان منیان بردە مەکتەبی سیاسی، د.فوئاد وتی "باشە کە دەیانوت وەرنە دەرەوە، بۆ نەدەهاتی؟". منیش پێموت "هەر ئێوە دوایی دەتانوت ژن بوو. بۆیە چەک کرا".

مەلا بەختیار زوو زوو پێمدەڵێ؛ دووجار رزگارمکردووی لە مردن. راستیش ئەکات و منیش هەموو جارێک سوپاسی ئەکەم.

هەر لەوکاتەی کە لە ماڵی مام جەلال بووین، ئارپیجییەک بەر ماڵی کەژاڵی خوشکم کەوتبوو، ژوورێکی سەرەوەیانی وێرانکردبوو (شەڕەکان ئەوەندە دژوار بوون، هیچ ماڵێک پارێزراو نەبوو) و تازەش کوڕەکەی (بینا) لەدایکبووبوو.

لە ٢ی حوزەیرانی ١٩٩٤، مام جەلال و کاک نەوشیروان، لە دەرەوە گەڕانەوە کوردستان. لە ٣ی حوزەیرانی ١٩٩٤، یەکێتی تاکلایەنە ئاگربەستی راگەیاند. لە ٢٠ی حوزەیرانی ١٩٩٤، ئەندامانی پەرلەمان بەئامادەبوونی مام جەلال و مەسعود بارزانی، کۆبوونەوە. ولاتانی دەرەوە و حیزبە کوردییەکان هەوڵی

چڕکردنەوەی کۆبوونەوەکانیان زیاترکرد بۆ هێورکردنەوەی بارگرژییەکە، بەڵام شەڕ کۆتایی نەهاتبوو هەرچەندە تۆزێ ئاسایی بووبووەوە.

لە ١٣ی تەمووزی ١٩٩٤، من و هەردوو منداڵەکەم (ئارام و نارین)، بە ئۆتۆمبێل بەرەو سوید دەرێکەوتین، کە گەیشتینە فرۆکەخانەی دیاربەکر، ئەوەندەی پێنەچوو شاندی دانوستانی یەکێتی و پارتی گەیشتنە هەمان فرۆکەخانە کە بە هەلیکۆپتەر هاتبوون. شاندی یەکێتی بە سەرۆکایەتی نەوشیروان مستەفا بوو، شاندی پارتی بە سەرۆکایەتی سامی عەبدولڕەحمان بوو، منیش نازەنین خانی خێزانی کاک عومەری سەید عەلیم لەگەڵبوو، کاک عومەر وتی "بەیەکەوە بڕۆن". دارۆش ئەندام بوو لەو شاندە. کاتێ کاک نەوشیروانم بینی، وتی "چییە مەوعیدتان داناوە لەگەڵ دارۆ؟" هەرچەندە هیچمان ئاگاداری یەکتری نەبووین.

ئەو شاندە دەڕۆیشتنە فەرەنسا، بەمەبەستی چارەسەرکردنی کێشەکانیان و وتوویژکردن لەسەر بارودۆخی ئەوسا و پاشەڕۆژی کوردستانی باشوور. کۆبوونەوەکان لە (١٦ تا ٢٢ی تەمووزی ١٩٩٤)ی خایاند و بە چاودێریی بێرنارد دوران، راوێژکاری دەوڵەتی فەرەنسا و باڵیۆزی فەرەنسا و کەنداڵ نزان، سەرۆکی ئەنیستیتۆی کورد لە پاریس و دکتۆر نەجمەدین کەریم، سەرۆکی کۆنگریسی نیشتمانیی کورد (KNC)، لەو کۆبوونەوانەدا رێککەوتننامەیەکیان واژووکرد، مەرجیش دانرابوو پێش کۆتاواژوو، راوبۆچوونی هەندێ حیزبی تری کوردستانی وەربگیرێ.

لەو گەشتەمان، بەهۆی باری سیاسی و گرژییەکانی کوردستانەوە، رێگا نەبوو بگەڕێینەوە، پارتی سنوورەکانی تورکیای کۆنترۆڵکردبوو، یەکێتیش لەگەڵ ئێران نێوانیان باش نەبوو، بۆیە بە ناچاریی لە سوید ماینەوە تا مانگی تشرینی دووەم، ئەو ماوەیە لە سوید ئارام و نارینم ناردەوە بەر خوێندن.

لە مانگی تشرینی دووەم، رێگای تورکیا ئاساییکرایەوە و گەڕاینەوە بۆ هەولێر، بەو شێوەیە تا کۆتایی ١٩٩٤ ناوبەناو شەڕ بەردەوام بوو. بەپێی ئامارەکانی ئەو سەردەمە و ئەو ساڵە، زیاتر لە (٣٠٠) پێشمەرگە لە هێزەکانی هەردوولا شەهیدبووبوون

ساڵی ١٩٩٥ شەڕەکان توندتر بوون، لە ١٥ی کانوونی دووەمی ١٩٩٥ یەکێتی بەتەواوی شاری هەولێری کۆنترۆڵکرد و شەڕ بەردەوام بوو، سەرباری هەولی زوری ناوەوە و دەرەوە. تا ساڵی ١٩٩٦، زۆربەی ناوچەکان کەوتە ژێر کۆنترۆلی یەکێتی و حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێرانیش کەوتە دژایەتی یەکێتی.

لە ١١ی تشرینی دووەمی ١٩٩٥ ئەوکات ئێمە هێشتا لە هەولێر بووین، ئێوارەیەک، ئارپیجییەکیان بە قولەی پاسەوانیی ماڵی ئێمەوە نا، گوایە، ئەوانەی ئەو کارەیانکردووە هێزەکانی حیزبی دیموکراتی ئێران بوون. ئەو چرکەیە پاسەوانەکە لە شوێنەکەی خۆی هاتبووە دەرەوە و چووبووە دیوەکەی تری کۆڵانەکە. پاسەوانەکە ناوی فاروقە، تائێستاش هەر لەگەڵمان ماوەتەوە، ئەمە وایکرد زیاتر چاودێریی خۆمان بکەین.

دارۆ، لەو ماوەیەدا دارایی و ئیدارەی گشتی گواستەوە بۆ سلێمانی، ئەو لە پێشبینیکردنی ڕووداوەکاندا زۆر وردبوو. لە ١٧ی ئابی ١٩٩٦ یەکێتی ناوچەکانی ڕەواندوز و سۆران و شەقلاوە و زۆر ناوچەی تری کۆنترۆڵکرد. لە ٢٢ی ئابی ١٩٩٦ مەسعود بارزانی نامەیەکی بۆ سەدام حسێن نووسی، داوای هاوکاریی سەربازیی کرد.

ئێمە لە کۆتایی ساڵی ١٩٩٥ خانوویەکمان لە سەرچنار لە شاری سلێمانی بەکرێ گرت و لەنیوان سلێمانی و هەولێر دەژیاین، دارۆ هەر لە هەولێر بوو. لە ٢٥ی ئابی ١٩٩٦ من و منداڵەکان و شوانی خوشکەزای دارۆ، چووین بۆ ئێران بۆ تازەکردنەوەی پاسپۆرتی سویدی، هێشتا پاسپۆرتەکە تەواو نەبووبوو هەواڵی هاتنی سوپای عیراقمان بیست، کە لە ٣١ی ئابی ١٩٩٦ هاتوونەتە هەولێر. وەک باسدەکرا نزیکەی ٣٠ هەزار سەرباز و ٥٠٠ تانک و زرێپۆش بوون. لەگەڵ پێشمەرگەکانی پارتی هەولێریان کۆنترۆڵکردبوو. ئەو هێزەی یەکێتی کە لەوێ بەرگرییانکردبوو، لەڕووی ژمارە و چەکەوە نەیانتوانیبوو بەرەنگاربینەوە.

ئێمە بڕیارماندا بگەڕێینەوە بۆ کوردستان، دوای دوو ڕۆژ گەیشتینەوە سلێمانی. هەرچەندە باڵیۆزخانەی سوید پێیانوتین «چیتان دەوێ بۆتان دەکەین، بڕۆنەوە بو سوید و مەگەڕێنەوە بۆ کوردستان»، بەڵام بڕیارماندا

بگەڕێینەوە. لە دلەڕاوکێی ئەو چەند ڕۆژە، نارین بە بەردەوامی هەڵدەپەڕی و ئێمەش بەم هەموو خەفەت و دووڵییەوە، دوایی بۆمدەرکەوت ئەویش دڵەڕاوکێی منداڵیی خۆی بەو شێوەیە دەردەبڕی، وتی «بابچینەوە لای باوکم بەتەنیا نەبێ».

بەردەوام هەواڵەکانمان پێدەگەیشت و نەماندەزانی برادەرانی هەولێر و خزمانمان چییان بەسەر هاتووە، کاتێ گەیشتینە سلێمانی، هێشتا کۆیە نەگیرابوو، کۆبوونەوەیەکی مەکتەب سیاسیی لە کۆیە کرا و دارۆش ڕۆیشت، کە گەڕایەوە وتی «هەرچەند ورەی پێشمەرگە و هێزەکان زۆر بەرزە، بەڵام بەرگریی سوودی نییە و دەبێتە هۆی ماڵوێرانیی زۆر». ئەوەبوو کۆیە گیرا، هێزەکانی ڕژێم و پارتی بەرەو سلێمانی هاتن و لە١٠ی ئەیلولی ١٩٩٦، بڕیاری چۆڵکردنی سلێمانی درا و دەرچوون بەرەو سنووری ئێران، بۆ کەمکردنەوەی زیانەکان و پارێزگاریی لە سەروماڵی هاوڵاتی. دارۆ هاتە ماڵەوە و وتی «سلێمانی چۆڵدەکەین، دەبێ چەندی دەکرێ لە بەڵگە و نووسراوەکان کۆبکەینەوە و ئەوەی پێویستیش نییە بیسووتێنین». ئەوەبوو بە چەند جارێک کە بەڵگە و یاداشت و نووسراوی زۆر بەهۆی دوژمنەوە بسووتێنین. لای من، لە هەموو ئازارێک قورستر، نەمانی بیرەوەرییە، خۆم کەسێکم ئارەزوومە پارچە پەڕتوکێک کۆبکەمەوە، ئەگەر بزانم پێویستە، بەڵام ئەو هەموو دۆکیۆمێنت و نووسراوانە نەدەبران. ئەوەی پێویستبوو دارۆ لەگەڵ خۆی بردی و وتی «من دەبێ بەجێتانبهێڵم و لەگەڵ ئیدارەی گشتی و ستاف و کەلوپەل و پارە دەرچین و ئێوەش تەگبیری حاڵی خۆتان بکەن». ماڵی ئێمەش پڕبوو لە میوان، ماڵی کەژاڵی خوشکم بە ڕێگای قاچاخ لە هەولێرەوە گەیشتبوونە لامان، ماڵی برای دارۆ و ماڵی کاک ڕوشدی عەزیزی ئامۆزای دارۆ و ماڵی خوشکەزای دارۆ، ئەوەی پێویستبوو کۆمانکردەوە و ئەوەی پێویست نەبوو جێمانهێشت. هەمووومان دابەشبووین بەسەر ئۆتۆمبێلەکاندا و ڕۆیشتین، بەشێک لە پاسەوانەکان لەگەڵ ئێمە هاتبوون. تا چەمی چۆمان، یەک دووجار وەستاین. بەشێک لە ئۆتۆمبێلەکان پەکیانکەوتبوو، بەو هۆیەوە لەدیوی ئێران لای چەمی چۆمان ماینەوە و لەوێوە گوێمان لە دەنگی هاوەنبوو. ئۆتۆمبێلەکانی پاسدارانی ئێران لەوێوە خواردنیان بۆ دەهێناین، نەیانئەتوانی

له شاخەکە تێپەڕین و ئێمە بە هاوکاریی ئەوان ئۆتۆمبێلەکانمان نارده ئێران بۆ چاککردنیان و شەو لەسەر ئەو شاخە ماینەوە.

بەرگریی بە سەرپەرشتیی کاک کۆسرەت بوو، دارۆ کەوتبووە دڵەڕاوکێ و بروسکەی بۆ کاک کۆسرەت کردبوو، تا هۆکاری نەگەیشتنی ئێمە بزانێ، کاک کۆسرەت پێشمەرگەیەکی نارده لامان و هۆکارەکەیان وەرگرت و بۆیان ناردبوو.

لەوێ ماڵی کەژاڵی خوشکم لێمان جیابوونەوە و چوونە ناو ئێرانەوە، بەهۆی ئەوەی منداڵەکانیْ زۆر وردبوون. زۆربەی ماڵەکان بەرەو ئێران رۆیشتن و ئێمە ماینەوە، کاتێ ئۆتۆمبێلەکان گەیشتن، ئێمەش بەڕێکەوتین و رۆیشتین بەرەو نوکان. بەهۆی راهاتنم له رووداوی جۆراوجۆر، توانیمان هەمووان بە سەلامەتیی و بێ کەموکوڕیی بگەینە شوێنی دیاریکراو.

که گەیشتین، بەهۆی پێشمەرگایەتییەوە ناوچەکه بەلامەوه ئاشنابوو، کەوتینە خۆشکردنی جێگاکەمان و دانانی چادر و هێنانی ئاو لەسەر شاخ و دروستکردنی حەمام و دەستشۆر. شاخ، زۆر ساردبوو بەتایبەتی شەوان، حەمامەکەمان بە چنار رایەڵکرد، چنارەکان دوای ماوەیەک لەدیوی ناوەوە کەوتە گەلاکردن. براژنی دارۆ کە ئەمەی دەبینی هەر خەریکم جێگا خۆشدەکەم، وتی "خوا شاخ دەبینێ، بەفری تێدەکات، بۆیە تۆش ئەو هەموو چەرمەسەریەت بەسەر دێت". لای من هەمیشه وابووه (دەبێ بەرپرسیارێتیی وەربگری ئەگەر بتەوێ ژیانی دەوروبەر خۆشبکەی).

سەرکردایەتی و مەکتەبی سیاسی، لەو ناوە کۆبوونەوە، هەرکەسە بارەگای خۆیان دروستدەکرد. دارۆ، زۆر وردبوو له دابینکردنی پێداویستی، کەسایەتییەک بوو دووربین و وردبوو، لەو کاتانەی ئێمە خەریکی دروستکردنی جێگاکانی خۆمان بووین، دارۆ لەهەمانکاتدا لەگەڵ هاوڕێکانی له ئیدارەی گشتی. کەوتنە دروستکردنی بارەگاکانی ئیدارەی گشتی. لەنێوان دوو دۆڵەکە پردیکی دروستکرد بۆ پەڕینەوە و مەرجی هەبوو کە ئەو پردە، بایز تاڵەبانی (خوا لێی خۆشبێ) بتوانێ بەسەریدا بڕوا. ئەویش بەگاڵتەوە دەیوت "چییه کاکە ئەتەوێ بمکوژی؟"، بەڵام دارۆ خۆی و من و کەسێکی تری بەیەکەوە بەسەر پردەکەدا پەڕاندەوە و ئەو مەرجەی تەنیا بۆ گاڵتەکردن بوو.

خۆشەویستی و ریزی دارۆ بۆ کاک بایز تاڵەبانی، بێسنوور بوو، باوەڕێکی زۆری بە دەستپاکیی ئەو پیاوە هەبوو. ئیتر بارەگای ئیدارەی گشتی چووە ئەوبەر ئاوەکە، شەوێک بوو بە تەقە، وتیان دز هاتووەتە ناوچەکە، دوایی ترسان و دەرچوون.

ئەو ماوەیە مێرووی هەزارپێ زۆربوو لەناو چادرەکاندا، بۆیە لەکاتی خەوتنیاندا گوێی منداڵەکانم دەپێچا. نارین، تەمەنی نۆ ساڵان بوو، ئەرکی پاککردنەوەی ناو چادری دانیشتنمان خستبووە ئەستۆی ئەو. رۆژێک هێرۆ خان لامانبوو، نارین شوێنەکەی پاکدەکردەوە، دیاربوو بێزاربووبوو، وتی "دەک ماڵت رمێ مەسعود، مێزی نانخواردنمان نەبوو، گسکی کارەبامان نەبوو، بۆ واتکرد؟". (دوای ئاشتبوونەوەی یەکێتی و پارتی، ئەو قسەیە گەیشتبووە دەمی زۆربەی برادەرانی پارتی).

رۆژێک لەناو چادرەکە، لەژێر مۆکێتەکەوە دوپشکێک دای بە رانمەوە، تا چوار مانگیش شوێنەکەی چاک نەدەبووەوە، هەرچەندە خۆم دەمزانی دوپشکی ئەو ناوە ترسناک نییە، بەهۆی ساردی و ئاوی زۆری ناوچەکەوە، بەڵام دەرزییان لێدام و شوێنەکەی زۆر بەئازاربوو.

ئەو ماوەیە چەندینجار لەلایەن وەزارەتی دەرەوە و بەرگری ئێرانەوە هاوکاریی خواردن و کەلوپەلی پێویستیی ژیانە سادەکەی ئەو ناوچەیەیان بۆ دەناردین و دابەشدەکرا بەسەر بارەگا و ماڵەکاندا، بەتایبەتی ئەو ماڵانەی لەناو نۆکان یان لە نزیک چەمی نۆکانەوە دەژیاین.

جارێک کاک کۆسرەت و دارۆ لەگەڵ ئێرانییەکان دانیشتبوون و گفتوگۆیان دەکرد لەسەر کڕینی چەک. دوای چەند رۆژێک دارۆ و کاک کۆسرەت و منیشیان لەگەڵ بووم، چووین بۆ لای مام جەلال، بە مامیان وت "ئەتوانین دەست بە چالاکیی سەربازی بکەینەوە و جارێکی تر ناوچەکان ئازادبکەینەوە". دارۆ وتی "منیش ئەوەندە پارەم لایە ئەتوانم مووچەی سێ مانگی پێشمەرگە بدەم و هەندێ چەک و تەقەمەنی بکڕم کە پێویستن". مام جەلال هەردووکیانی ماچکرد و ئەوەبوو هەر ئەو رۆژە، بڕیاری خۆئامادەکردنیان دەستپێکرد.

شاندێکی ئێران هاتن و لە چادرەکەی ئێمە گفتوگۆیان دەکرد، ئامادەباشیی چەککڕینیان دەستپێکرد، بەڵام کاتێ کە قسە دەکرا، یەکێ لە شاندەکەی

ئێران وتی "نابێ هەولێ چوونە ناو هەولێر بدەن و لە دێگەڵە تێپەڕن، ئێمە لێتاندەدەین". کە رۆیشتن، لە دارۆم پرسی؛ ئەوان ئەو مافە چۆن بەخۆیان دەدەن و ئەو قسەیە بۆچی دەکەن؟ دارۆ لەوەڵامدا وتی "وڵاتانی دەوروبەرمان نایانەوێ حیزبێک لە کوردستان هەبێ باڵادەستبێ، هەموومانیان دەوێ بە لاوازی". منیش وتم "ئێستا هەستدەکەم سیاسەت چەند یارییەکی خەتەرناکە، جاران وامدەزانی گرنگ خۆمان و بڕیاری خۆمانە". ئیتر خواحافیزیمان لە کاک کۆسرەت و کاک ملازم عومەر کرد و دارۆش لەگەڵ بەشێک لە برادەرانی ئیدارەی گشتی، وەک هێزی پشتیوانی، هاوکاری و جێبەجێکردن و ئامادەکردنی پێداویستییە هەنوکەییەکانیان لەئەستۆبوو، لەدوای ئەوانەوە رۆیشتن و گەردەلولی تۆڵە دەستیپێکرد.

لە ١٣ی تشرینی یەکەمی ١٩٩٦ گەیشتنە سلێمانی و سلێمانی ئازادکرا و بە بروسکە هەنگاو بەهەنگاو ئاگادارییاندەکردین (هێشتا زۆرێک لە بارەگاکان لەوێبوون)، ئەدرا بە راگەیاندن و بڵاودەکرایەوە، لەوێشەوە هەر رۆژی دوای ئەوە بەرەو دوکان و بالیسان بەڕێکەوتبوون.

کاتێ دارۆ گەیشتبووە سلێمانی، بروسکەیەکی بۆ ئێمە کرد، وتبووی "مەگەڕێنەوە،ماڵەکەیان سووتاندووین و هەموو شتەکانیان تاڵان کردووە". دوایی بۆمان دەرکەوت ئەوەی هاوکار و رێنیشاندەری تاڵانییەکە بووە، پاسەوانێکی لای خۆمانبووە، بۆ ئەوەی خۆشی شتی دەستبکەوێ.

ئەو راووڕووت و تاڵانکردنە، بۆتە کولتوور لە کاتی شەڕ و دەربەدەریدا و پێویست دەکات دەیان لێکۆڵینەوەی لەسەر ئەنجام بدرێ، کە بۆ ئەم کۆمەڵگەیەی ئێمە جێی ئەو جۆرە کولتوورەی تیادا دەبێتەوە. ئەوە ئێران، خۆ شای ئێران دیکتاتۆر بوو، چەند ساڵ ئامادەکاریی بۆ شۆڕش دەکرا، کەچی کۆشکی شا هەموو شتێکی پارێزراوە تەنانەت پێڵاو و شانە و جلەکانیشیان، کە ئێستا بوون بە شوێنێکی گەشتوگوزاری و کەلوپەلەکانیان نمایشدەکرێ و دەستکەوتی باشی هەیە. ئەوە رۆمانیا، کە تاکە وڵاتە لەو وڵاتانەی شۆڕشی دژی شیوعیەتی تێداکرا بە توندوتیژی و شەڕ، لە ساڵی ١٩٨٩ نیکۆلای چاوچیسکۆ و ئەلێنای خێزانی کوژران و لەدوای ماوەیەک کەلوپەلی باڵەخانە و جل و پێڵاوی ئەلێنایان نمایشدەکرد و هەموو شتێ لە

شوێنی خۆیبوو. ئەم کولتوورەی ئێمە، لە دەستکەوتی شەڕ (غنائم الحرب)ەوە وەرگیراوە، بۆیە دەبێ لێکۆڵینەوەی زۆری بۆ بکرێ و ڕێگاچارەی بۆ دابنرێ.

لە تشرینی دووەمی ١٩٩٦ گەڕاینەوە، یەک ژوور لە ماڵەکەمان چاککرابووەوە. ماڵی خالم (خالید دلێر) و موحسین، هاوسەری کەژاڵ و خۆشمان لەو ماڵە بەتاڵە ئەژیاین. تا وردە وردە چاککرایەوە.

ماڵی باوکم، بەهۆی تەندروستی باوکمەوە، نەیانتوانیبوو لە هەولێر دەربچن، بەڵام لەناو هەولێر هاوکاربوون بۆ دەربازبوونی هەندێ لە برادەرە نزیکەکانمان. هاوتای برام بۆی باسکردم، وتی «دوو ڕۆژ پێش هاتنی سوپای عیراق بۆ ناو هەولێر، دوو کەسی ئۆپۆزسیۆنی حیزبە عیراقییەکانیان هێنابووە سەر تەلەفزیۆن و باسیان لەوە کردبوو کە سوپای عیراق لەناو قایمقامیەتی کەڵەکە و لەوێ کۆبوونەوە کراوە، بەڵام هەستم نەکرد زۆر بەهەند وەرگیرابێ". وتیشی "ڕۆژی ٣١ی ئاب، چوومە مەکتەبی سیاسیی یەکێتی و لەوێ کاک کۆسرەت و کاک ملازم عومەری لێبوو، هەر ئەو ڕۆژەش فەرمانی مەکتەبی سیاسیم بۆ دەرچووبوو تا وەک کارگێڕ لە سکرتاریەتی مەکتەبی سیاسیی لای کاک ملازم عومەر کاربکەم". هەروەها وتی "ئیتر ناوشاری هەولێر وردە وردە پڕبوو لە ئوتۆمبێلەکانی ڕژێم، چەکدارەکان کۆڵانەکانیان گرتبوو، گەڕامەوە ماڵەوە لەسەر داوای دایکم. دوای چەند ڕۆژێک، لە ماڵ نەبووین، هاتبوونە ماڵمان و ماڵەوەیان پشکنیبوو، ئۆتۆمبێلەکەم و کامێرایەکی ڤیدیۆیان بردبوو".

هەروەها چووبوونە ماڵی خالم (ماڵی شەهید جەعفەر)، زۆر ئیهانەیان کردبوون و خواردن و شتەکانیان تێکەڵکردبوون، ئۆتۆمبێلەکەی ڕەوا (کچی خالم)یان بردبوو، وێنەکەی خالمیان داگرتبوو و خستبوویانە سەر زەوی و جامەکەیان شکاندبوو.

ئەو جۆرە ڕەفتارانە لە هەردوولاوە دەکرا، هەستمدەکرد خەڵکانێک هەن سوود لەو شەڕە وەردەگرن، بۆیە ناهێڵن گفتوگۆکان سەربگرن، بازرگانی جەنگ زۆربووبوون.

له ١٩ی تشرینی دووەمی ١٩٩٦ باوکم کۆچی دواییکرد، دەڵێن هەر کە هەولێر دەگیری، ڕۆژ بە ڕۆژ تەندروستیی باوکم بەرەو خراپیی ڕۆیشتووە، بەڵام پارتی هێشتیان تەرمەکەی بهێننەوە کۆیە، منیش لەسلێمانییەوە چوومە کۆیە و لەوێ بەخاکمانسپارد. ئازارێکی زۆر گەورەبوو کە نەمانتوانی بەیەکەوە پرسەکەی بەڕێبکەین، نیوەی لە هەولێر و نیوەش لە سلێمانی، ئەمانە هەمووی دەرهاویشتەی شەڕی ناوخۆبوون.

لە کانوونی یەکەمی ١٩٩٦ ڕۆژێک ئامۆزایەکم نەخۆشدەکەوێ و هاوتای برام دەچێتە سەردانی و لەکاتی گەڕانەوەی، هەندێ ئۆتۆمبێلی ئاسایشی پارتی، کۆڵانەکە دەگرن و داوای ناسنامەی هاوتاو ئامۆزاکەی ترم دەکەن. بە هاوتا دەڵێن لە ئاسایش داواتدەکەن و ئامۆزاکەشمی لەگەڵ دەبەن، بەهۆی بەربوونی ئامۆزاکەمەوە زانرا کە هاوتا لەکوێ زیندانی کراوە. ئیتر بە هەموو لایەک کەوتینە هەوڵدان بۆ بەربوونی، خوالێخۆشبوو عەلی عەبدوڵڵا هەوڵی بەردانی دابوو، وتبوویان "دارۆی شێخ نوری زاوایەتی". ئەویش وەڵامیدابوونەوە وتبووی "بۆ سەیری ئەو لایەنە دەکەن و سەیری باوکی ناکەن کە من و مامۆستا عوسمان یەکەم شانەی پارتی دیموکراتمان لە کۆیە پێکهێناوە و ئەندامی ناوچە بووە؟". هەروەها بەهۆی تەمەر کوچەر و هەندێ لە خزمەکانمان کە پارتی بوون، واتە لە هەموو لایەکەوە هەوڵی بەردانی ئەدرا، وەک هاوتا گێڕایەوە وتی "ئامادەبوون بەرمبدەن، بەڵام ئەوەندەیان لێدابووم، هەموو گیانم شوێنی لێدانەکەی پێوە دیاربوو و نەیاندەویست بەو شێوەیە بەرببم". ئیتر دوای زیاتر لە یەک مانگ و نیو، بە سپاردەی خاڵۆژنم (خێزانی شەهید جەعفەر) ئازادکرا کە خانووەکەی خۆی بارمتە دەکات بۆ سپاردەکە، بەڵام مەرجی بەربوونەکەی نەچوونە سلێمانی بوو، بۆیە ئەوانیش بە ڕەزامەندیی پارتی و ئاسایشی پارتی، بەرەو دهۆک و لەوێشەوە بەرەو هەندەران ڕۆیشتن.

لە کانوونی دووەمی ١٩٩٧ حکومەتی هەرێم، لە سلێمانی دامەزرایەوە و ئەو ماوەیە دارۆ بەهۆی دامەزراندنەوەی حکومەت و دامودەزگاکانی، بەردەوام خەریکی کاربوو. توانیان لەماوەیەکی کورتدا حکومەتی هەرێم

(زۆنی سەوز) سەرپێ بخەن و دەستبەکاربوو. گومرکەکان کەوتنەوە کار و بازرگانیی نێوان ئێران و ناوچەی سەوز باشتربوو، داهات باشتربوو، ئەتوانرا مووچە بدرێت و ئاگاداربووم رۆژ بەرۆژ کۆدەکرایەوە و بە چەند رۆژێک دەیانوت مووچەی وەزارەتێکی دیاریکراو دابینبکرێ. رۆژانە بروسکەی گومرکەکان و داهاتی باج و کارەبا کۆدەکرانەوە بۆ ئەوەی بژێویی خەڵک دابینبکرێ. هەروەها بەهۆی ئەو خواردنانەی لە رێگای بەرنامەی نەوت بەرانبەر بە خۆراک بەسەر هاولاتیدا دابەشدەکرا، خۆراک زیاتر بوو و گوزەرانی خەڵک باشتربوو، ئەو بەرنامەیە (لە ئایاری ١٩٩٦) نەتەوە یەکگرتووەکان بریاری لەسەر دابوو.

لە ٢٥ی تشرینی یەکەمی ١٩٩٧ تورکیا هاتە ناو عیراق و سنووری بەزاند، وەک کاری هەمیشەیی، پەلاماری بارەگاکانی یەکێتی و پەکەکەی دا. لە ٢٥ی تشرینی دووەمی ١٩٩٧ پارتی ئەو ئاگربەستەی کە لەنێوان یەکێتی و پارتی هەبوو، شکاندی و شەڕ لە ناوچەکە دەستپێکردەوە. ئاگربەستەکە لە کۆتایی مانگی تشرینی یەکەمی ١٩٩٧ لە ئەنقەرە واژوو کرابوو، بە چاودێریی نوێنەرانی تورکیا و ئەمریکا و بەریتانیا و بەرەی تورکمانی، بەندێک لە رێککەوتننامەکە سەبارەت بە ئاگربڕ دەڵێ: "هەردوو حیزب لە شوێنەکانی بەرگریی خۆیان دەمیننەوە و دەستدرێژیی بۆ سەر یەکتری ناکەن".

لە شەڕەکانی تشرینی یەکەم و دووەمی ١٩٩٦، نزیکەی (١٢٠٠) کەس لە هێزی پێشمەرگەی هەردوولا شەهیدبوون و نزیکەی (١٠٠٠٠) ئاوارە هەبوون.

بەکۆی گشتی، بەپێی ئەو راپۆرتانەی کە لەئەرشیفدا لامن، لەماوەی ئابی ١٩٩٦ تا کانوونی یەکەمی ١٩٩٧، (٤٩٠٠٠) ئاوارە هەبوون، کە لە ناوچەکانی پارتییەوە هاتبوونە ناوچەکانی یەکێتی.

بەهۆی رێککەوتننامەی واشنتۆنی (ی.ن.ک) و (پ.د.ک) کە لەلایەن (جەلال تاڵەبانی و مەسعود بارزانی) واژوو کرابوو، لە ١٧ی ئەیلولی ١٩٩٨، ناوچەکە دیسان هێمنیی بەخۆوەبینی و پرۆژە بەدوای پرۆژە ئەنجامئەدرا و ناوچەکان بە گشتیی بوژانەوەیان پێوە دیاربوو.

بەهۆی ئەوەی دارۆ بەشدار دەبوو لە بەشێک لەو گفتوگۆیانەی نێوان یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان و پارتی دیموکراتی کوردستان و ئەرشیفەکانیم پاراستووە. وەک وەفایەک، هەر سێ ڕێککەوتننامەی (پاریس، ئەنقەرە، ئەمریکا) لەم کتێبەدا بڵاودەکەمەوە کە قۆناغەکان جیاوازن و خاڵەکانیشیان هەندێکیان هاوشێوەن لە ناوەڕۆک و هەندێکیشیان بەهۆی کاتەکانیانەوە جیاوازییان هەیە.

ئاژاوە و شەڕ و ناسەقامگیریی، هەرێمی کوردستانی بەرنەئەدا، بەهۆی ترسی هەرێمیی لە بەدەوڵەتبوونی کوردستان، ئیتر لە هەموو لایەکەوە و بە چەندین شێواز، پیلانگێڕیی لەسەر ئەم ناوچەیە لەئارادایە و زۆربەی کاتیش کورد بە دەستی کورد دەکوژرێ و دەبێتە داردەستی لایەنێکی بێگانە. یەکێ لەو شەڕانەی کە رووبەڕووی کوردستان بەگشتی و یەکێتیی بەتایبەتی بووەوە و بەڕای من تائێستاش مەترسییەکانی لەئارادا ماون، شەڕی ئیسلامیی جیهادی و توندڕەوەکان بوو. دەمێکبوو پێش شەڕی جوندولئیسلام، یەکێتی و ناوچەکە رووبەڕووی شەڕی ناوبەناوی ئەو گروپانە دەبووەوە. ئەوەبوو ماوەیەک لەگەڵ بزووتنەوەی ئیسلامی لە چەند شوێنێک و لە قۆناغی جیا جیا، رووبەڕووی یەک بووینەوە.گروپی توندڕەو لە جۆری (قاعیدە) و هاوشێوەکانی لە کوردستان سەریانهەڵدا، لە هەموویان دڕندەتر لە ساڵی (٢٠٠١) گروپی تیرۆرستیی جوندولئیسلام بوو کە لەدواییدا بوون بە ئەنسارولئیسلام .

هەر لەو ساڵەدا، پێش رووداوی کارەساتی خێڵی حەمە، ناوبەناو جموجووڵ و کردەی تیرۆرستیی ئەنجام ئەدران، من خۆم لە یەکێ لەو کردەوە تیرۆرستییانەدا کرامە ئامانج. لە (٤ی ئازاری ٢٠٠١) چەند رۆژێک پێش جەژنی قوربانی ئەو ساڵە بوو، لەگەڵ کچەکەم کە ئەوسا تەمەنی نزیکی چواردە ساڵان بوو، چووین بۆ بازار بە ئۆتۆمبێلێکی بچووک و یەک پاسەوان بەناوی نوری. لای شەقامی ئۆرزدیبەوە نزیک بەردەرکی سەرای سلێمانی، سەرەتا گوێم لە تەقەیەکی بەهێزبوو لە نزیک ئۆتۆمبێلەکەوە، پرسیم؛ چییە؟ وتیان "لەوە دەچێ فیشەکەشێتە بێ". دوای کەمتر لە یەک خولەک، فیشەکێک دای لە جامی لای سەری منەوە کە لە پشت پاسەوانەکەوە دانیشتبووم و لە لای سەری شۆفێرەکەوە دەرچوو. جامەکان هاڕەیانکرد، (بەڵام کە رۆژت نەهات، پارێزراو دەبی) هەموومان سەلامەت بووین. ئەوکات من وەزیری کاروباری کۆمەڵایەتی بووم، هەرچەندە پۆلیسەکانی بەردەرکی سەرا هاتن بەدەنگمانەوە و داوایان لە ئێمە کرد کە بگەڕێینەوە ماڵەوە و لەوکاتەدا کەسیان نەدۆزییەوە. لەدواییدا و پاش لێکۆڵینەوە، پێیان راگەیاندین کە ئەو فیشەکە لە سەربانەکانەوە بووە و گروپێکی ئیسلامیی بوون.

جوندولئیسلام لە کوردستان، گرووپێکی توندڕەوبوون و لە یەکگرتنی دوو گرووپی ئیسلامیی توندرەو دروستبوون. گرووپێکی جیهادیی بوون، سەرەتا لە ناوچەی (سینا) لە میسر پەیدابوون و هەندێکیان لە لوبنان بەناوی (جوندوڵڵا) کاریاندەکرد. جوندولئیسلام، گرووپێکی هاوشێوەی تاڵیبانی ئەفغانی بوون، وەک ئەوان رەفتاریان دەکرد بە بڵاوکردنەوەی: قەدەغەکردنی تەلەفزیۆن و گوێنەگرتن لە گۆرانی و نەچوونی کچان بۆ خوێندن و خۆداپۆشینیان و پەچەکردن و نوێژکردن لە مزگەوت و یاسای (الامر بالمعروف والنهی عن المنکر)، هەروەها داخستنی تەکیەی تەریقەتی سۆفییەکان و قەدەغەکردن و رووخاندنیان و لابردنی مەزارەکانیان، لەوانە هەڵکەندنی مەزارگەی (شێخ حسامەدین) لە گوندی باخەکۆنی نزیک بیارە و گواستنەوەی بۆ گۆڕستانی گشتی و قەدەغەکردنی سەردانی، کە ئەم رووداوەش بوو بەهۆی نارەزاییەکی زۆر لای هەمووان. هەرچەندە لەدواییدا وتیان "بە بڕیار نەبووە". هەروەها پەلاماری ئارایشتگاکانی خانمان و شوێنی مەشروب فرۆشتن و بارەکان و هەرەشەی کوشتنیان.

جوندولئیسلام، لە ١ی ئەیلولی ٢٠٠١ دروستبوو، لە یەکگرتنی هەردوو گرووپی ئیسلامیی جیهادیی چەکداریی (تەوحید) بە سەرپەرشتیی (ئەبوبەکر) و گرووپی (هێزی سۆران) بە سەرپەرشتیی (ئەبو عەبدوڵڵای شافعی). لەو رۆژەدا یەکەم بەیاننامەی دروستبوونیان راگەیاند و پەڕۆیەکی رەشیان کرد بە ئاڵای خۆیان.

دوای سێ مانگ لەو بەروارە، لە ٥ی کانوونی یەکەمی ٢٠٠١ گرووپی جوندوئیسلام بە رابەرایەتی ئەبو عەبدوڵڵای شافعی و گرووپی ئیسلاح (کە لە بزووتنەوەی ئیسلامی کوردستان جیابووبوونەوە) بە رابەرایەتی نەجمەدین (مەلا کریکار)، یەکیانگرت و ئەنسارولئیسلام راگەیەنرا. ئەوانیش بەهەمان شێوە بە گرووپێکی سەلەفیی جیهادیی ئەژمار دەکران و هەمان پەیڕەویان هەبوو، (ألامر بالمعروف والنهي عن المنكر) و جێبەجێکردنی شەریعەتی ئیسلام.

ئەنسارولئیسلام، لەلایەن ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاوە، بە گرووپێکی تیرۆریست و بەشێک لە (قاعیدە) ئەژماردەکران. لەنێو گرووپی ئەنسارولئیسلام، عەرەبە هەڵهاتووەکانی ئەفغان و ئوردن و عیراقیان تیابوو، کە بەشێکیان

له ڕێگای سنوورەکانی ئێرانەوە هاتبوونە نێو جوندولئیسلام و لەدواییشدا ئەنسارولئیسلام.

ئەوان بە بەیاننامە ڕایانگەیاند کە دژی یەکێتین، بە حیزبێکی عەلمانیی دۆستی ئەمریکا و لادەر (مرتد) لە ئاینی ئیسلام و کافر ناویان دەبرد و بڕیاری دوژمنایەتییان دا و هەموو بەرپرسانی یەکێتییان بە کافر لەقەڵەم ئەدا. سەرەتا یەکێتی نەیدەویست ڕووبەڕووی ئەو گروپانە بێتەوە و تووشی شەڕێکی تری ناوخۆ ببێ، هەرچەندە مەترسیی ئەو گروپەی دەزانی، بەڵام دەیویست بە ڕێی گفتوگۆ، مامەڵە بکات و شەڕ ڕوونەدات.

بە دروستبوونی گروپی ئەنسارولئیسلام، سێ گروپی ئیسلامیی لە هەڵەبجە و دەوروبەری هەبوون، کە ئەمانەبوون:

١- بزووتنەوەی ئیسلامی کوردستان، بارەگاکەیان لە شاری هەڵەبجە بوو، دوای ماوەیەک گواستیانەوە بۆ دەرەوەی شار و لە نزیک گردە درۆزنە، کە ڕووداوی خێڵی حەمەی لێ ڕوویدا، هەرچەندە لەکاتی ڕووداوەکە لەو ناوچەیە نەمابوون.

٢- کۆمەڵی ئیسلامی، کە لە خورماڵ نیشتەجێبوون.

٣-گروپی ئەنسارولئیسلام، لە بیارە بوون، بەڵام مەفرەزەکانیان وەک شەڕی پارتیزانی لە هەموو ناوچەکە جووڵەیان هەبوو.

یەکێتی و کۆمەڵی ئیسلامی، بەپێی ڕێککەوتنی تاران، شەڕ لەنێوانیاندا وەستا و ئەنسارولئیسلام دژی ئەو ڕێککەوتنە بوو و بە کۆمەڵیان دەوت «لادەر (مرتد)».

لە سەرەتای ئەیلولی ٢٠٠١ بە بەیاننامەیەک، جوندولئیسلام دژایەتی یەکێتییان ڕاگەیاند. ئیتر مەترسیی شەڕ ڕۆژ بەڕۆژ زیاتر دەبوو، تا کارەساتی خێڵی حەمە ڕوویدا کە بوو بەهۆی تەقینەوەی ناکۆکییەکان بەیەکجاری.

چەند شەوێکیش پێش کارەساتەکە، دەچوونە سەر بارەگاکانی پێشمەرگە لە ناوچە جیاجیاکان و بە هوتافکێشان و تەقەکردنەوە دەیانووت «بمرێ عەمیلە ئەمریکییەکان و کافرەکان».

هەموو ئامانجیان دروستکردنی ئەمارەتێکی ئیسلامیی بوو لە ناوچەی کوردستان و لەناوبردن و سەرکوتکردنی هەموو ئایدۆلۆژیاکانی تری

کوردستان. کوشتن بەلایانەوە ئاسانترین کردە بوو، دڵڕەش بوون، لەئاڵاکانیان ڕەشتر، دڵیان بوو.

لە شەوی ٢٣ی ئەیلولی ٢٠٠١ دوای (١٢) ڕۆژ لە کارەساتی (١١ی سێبتەمبەر)ی ئەمریکا. لە هەڵێکی غافڵگیرانەدا، پەلاماری چەند پێشمەرگەیەکیان دا لە خێڵی حەمە و (٤٢) پێشمەرگەیان بەدیلگرت و بەشێوەیەکی دڕندانە و دوور لە هەموو بەها ئایینی و مرۆڤایەتییەکان، کەوتنە کۆمەڵکوژی و بە سەربڕین و پارچە پارچە کردنیان، شەهیدیان کردن. کارەساتی خێڵی حەمە، پەڵەیەکی ڕەشە بە نێوچەوانی گروپی تیرۆرستیی جوندولئیسلامەوە. ئەو شەهیدانەش، پاش بەرگرییەکی دلێرانە و شەڕێکی سەخت، تا دوافیشەک بەرگرییانکرد و شەهیدبوون.

هێزەکەی جوندولئیسلام، ئەفغانی و عەرەبی تێدابوو، پێش شەهیدکردنی پێشمەرگە دیلەکان، گرتە ڤیدیۆییەکیان تۆمارکردووە کە تێیدا یەکێک لە پێشمەرگە دلێرەکان بەناوی (فەیزوڵڵا ڕەشید) کە لێپرسراوی هێزە، تف دەکاتە ڕووی تیرۆرستەکان و پێیاندەڵێ "براکەم مەکوژن، خاوەنی سێ منداڵە"، بەڵام زۆر دڕندانە پارچە پارچەی دەکەن. لای هەموو ماڵێکی ئەو شەهیدانە، چیرۆکێکی دڵتەزێن هەیە کە چەند نامرۆڤانە ڕەفتاریان لەگەڵ ئەو دیلانە کردووە، هەموو دەرگایەک لەسەر ئەو شەهیدانە داخرابوو، تەنانەت ماڵەکانی گوندی خێڵی حەمە نەیاندەوێرا دەرگاکانیان واڵابکەن بۆ بەهاناوەچوونیان.

پرسیار زۆرن، وەڵامەکانیانم لانییە، پێویستە مێژوونووس و لێکۆڵەران بەدوای وەڵامی پرسیارەکاندا بچن و لەسەر ئەو تاوانە دواقسەی خۆیان بکەن. ئەوە پرسیارێک بوو لای دارۆش، لە دواهەناسەیدا دەستم لەناو دەستیدا بوو، تاکە قسەی و دواقسەی کە وتی "خێڵی حەمە!". نەمزانی مەبەستی چیبوو و بۆ وتی "خێڵی حەمە". کە ئەمە تا ئەمرم گرییەکە لەدڵما چۆن وەڵامم بۆ پرسیارەکانی تر نییە، ئاواش وەڵامم نییە بۆ دوا وتەی دارۆی خۆشەویستم.

ئەو ڕووداوە، هەموو مرۆڤدۆستانی دونیای هەژاند و ڕووی ڕاستەقینەی جوندولئیسلامیان بۆ ڕوونبووەوە.

هەرچەندە سەرەتا یەکێتی نەیدەویست ڕووبەڕووی ئەو گروپانە بێتەوە، بەڵام دوای کارەساتی خێڵی حەمە، لە ٢ی تشرینی یەکەمی ٢٠٠١ بڕیاری

شەڕی دا لەگەڵ ئەو گرووپە توندڕەوانە. هێزەکانی پێشمەرگە توانیان لەماوەی سێ ڕۆژدا لە هەڵەبجە و چیاکانی شنرۆێ دەریانبکەن و بەرەو بیارە کشانەوە کە دەکەوێتە بناری شاخی شنرۆێ و لە (١٩) گوند پێکهاتووە. مانەوەیان لە بیارە و ژیان بەسەربردنیان لەوێ، وەک شێوازی مانەوەی قاعیدە بوو، لە تۆرابورای ئەفغانستان. دەوری بیارەیان پڕکردبوو لە مین و چەکەکانیان لە ئەشکەوت و شاخەکان دەشاردەوە.

لە ٢٤ی تشرینی یەکەمی ٢٠٠٨، یەکێتی، لێبوردنێکی گشتیی بۆ ئەو گەنجانە دەرکرد کە دوای ئەو گرووپە کەوتبوون، لێبوردنەکە تا ٢٣ی تشرینی دووەمی ٢٠٠١ بوو.

ئەنسارولئیسلام، شارەزاییان لە چاندنی مین پەیداکردبوو، هەرچەند لەو ناوچانە دەرکران، بەڵام لە کردە تیرۆرستییەکانیان نەدەوەستان، هەر ئەوانیش بوون کە هەوڵی تیرۆرکردنی (د.بەرهەم سالح)یان دا لە ٢ی نیسانی ٢٠٠٢ لە ماڵەکەی خۆی، کە ئەوکات سەرۆک وەزیران بوو.

پارتی دیموکراتی کوردستان، بە بروسکە، چەند جارێک ئامادەیی خۆی پیشاندا بۆ هاوکاریی هێزەکانی پێشمەرگەی یەکێتی و ئەوانیش بە گرووپێکی مەترسیداریان لەقەڵەمدا ئەدان و کوشتنی فرانسۆ هەریریش لە ١٨ی شوباتی ٢٠٠١ بە دەستی ئەو چەکدارە توندڕەوانە بوو. لاشیان ڕوونبوو، ڕاستە لەوکاتەدا لە ناوچەی یەکێتین، بەڵام هەر ڕۆژێکبێ مەترسیی دەچێتە ناوچەکانی ژێر دەستی ئەوانیش.

دواتر هەر ئەم گرووپە چەندین کاری تیرۆرستیی تریان ئەنجامدا و لە شەوی جەژنی قوربانـدا لە ١٣\٤ی کانوونی یەکەمی ٢٠٠٢، دەستە ڕەشەکانیان گەیاندە گوندی تەپەکورە و (٥٠) پێشمەرگەی قارەمانیان شەهیدکرد. هەروەها لە کردەیەکی تیرۆریستیی تردا، شەهید شەوکەتی حاجی موشیر و هاوڕێکانی لە گوندی گامێشتەپە لەلایەن ئەوانەوە شەهیدکران. شەهید شەوکەت، ماوەیەک سەرقاڵی گفتوگۆ بوو لەگەڵ ئەو گرووپانەدا، ئەوەش لەسەر فەرمانی یەکێتی نیشتمانیی بەمەبەستی هێورکردنەوەی بارودۆخی ناڵەباری دەڤەرەکە، لەگەڵ ئەوەشدا بێویژدانانە و بێ بەهای مرۆڤانە، لەگەڵ هاوڕێکانی شەهیدیان کرد. هەر ئەو کارە قێزەون و دڕندانانەی ئەو گرووپە لادەرانە لە ئایینی ئیسلام و

بەهاکان، وایکرد ویلاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و ئەوروپا بێنە سەرخەت و لە هەڵمەتی نەهێشتنی گروپە تیرۆریستییەکان، بارەگاکانی ئەو تیرۆرستانە لە دەریای سوورەوە مووشەکباران بکەن، کە لەهەمانکاتدا پێشمەرگەش هێرشیان کردە سەریان و بەتەواوی ناوچەکەیان لێ پاککرایەوە.

مەلا کریکار، سەرکردەی گروپی تیرۆرستیی ئەنسارولئیسلام، لە ٢٠٠٣ هەڵهات بەرەو هەندەران بۆ لای ماڵ و منداڵەکەی کە پێشتر لە ساڵی ١٩٩١ پەناهەندەییان لە وڵاتی نەرویج پێدرابوو.

بەهۆی چالاکییەکانم لە سەنتەری گەنجان و کردنەوەی چەند خول و سیمینارێک دژ بە رەوتی ئیسلامیی سیاسی و دواتریش کە بووم بە وەزیری پەروەردە و لە وەزارەتی پەروەردە، بەهۆی گۆڕینی هەندێ کتێبی ئایینیی پۆلەکان و هێنانی پەروەردەی هەرزەکاریی بۆ ناو خوێندن، کەوتنە دژایەتیم، سەرەتا بە نووسین و دواتریش بە هەڕەشە، ئیتر کرابوومە ئامانج لەلایەن گروپە توندرەوەکانەوە. تاڕادەیەک ئاگام لەخۆم بوو، بەڵام جارێک کەوتمە بۆسەیەکیان وەک پێشتر باسمکرد.

یەکەم وەزارەت کە کارم تێداکرد، وەزارەتی کار و کاروباری کۆمەڵایەتی بوو، یەکەم وەزیری ئەو وەزارەتە بووم، چونکە پێشتر ئەو وەزارەتە لەناو پەیکەری ئەنجومەنی وەزیراندا نەبوو، بەشەکانی لەناو چەند وەزارەتێکی تردا بوو، وەک تەندروستی و ناوخۆ و دەزگای شەهیدانیش هەر خۆی بە جیا بوو. بەڕێز مام جەلال، وەک سەرۆکی هەرێم، لە ٢٦ی کانوونی دووەمی ٢٠٠٠، فەرمانی پێکهێنانی ئەو وەزارەتەی دەرکرد و کاک کۆسرەت رەسوڵ، سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران و دکتۆر یادگار رەئوف حیشمەتی وەزیری تەندروستی راسپارد بۆ جێبەجێکردنی ئەو فەرمانە. سەرەتا لەبەر نەبوونی شوێن، لە سەرۆکایەتی ئەنجومەنی وەزیران چەند ژوورێکیان داینێ، لە جێگای کاک ملازم عومەر بووین کە کابینەی پێشتر، جێگری سەرۆک وەزیران بوو، لەو ژوورانەوە دەستمانکرد بە کار و لە خاڵە سەرەتاییەکانەوە دەستمانپێکرد.

هەنگاوی یەکەم؛ دەستمانکرد بە داڕشتنی یاسایەک بۆ وەزارەت بەسوودوەرگرتن لە یاسای وەزارەتی هاوشێوە لە بەغدا، بە هاوکاریی یاساناسەکانی ئەنجومەنی وەزیران، وەک بەڕێزان چالاک تاڵەبانی و عەبدولباست مەولود. دواتر لەلایەن هەردوو سەرۆکایەتی ئەنجومەنی وەزیران و سەرۆکایەتی هەرێمەوە پەسەندکرا و بە هاوکاری داروی شێخ نوری و بایز تاڵەبانی، پەیکەری وەزارەتمان داڕشت و پەسەندکرا.

لەبەر رۆشنایی پەیکەری وەزارەت و بەپێی یاسا و رێنماییەکان، دەسەڵاتەکانم دابەشکرد. دوای ماوەیەک خانوویەکمان لە نزیک ئەنجومەنی وەزیرانەوە بەکرێ گرت، دوای چەند مانگێک، چووینە بینایەکی ترەوە لە گەڕەکی شۆڕش (عەقاری) لە شەقامی سالم. بەهۆی کەمیی دەرامەتی حکومەتەوە، کەلوپەلەکانمان بە سواڵ و سەدەقە و هەندێ هاوکاریی ئەنجومەنی وەزیران، پەیداکرد. لەوانەی کە هاوکارمان بوون؛ زیاتر ملازم عومەر بوو، هەروەها لەناو وەزارەت ستافێکی لەخۆبوردەبوون و کارمان بەیەکەوە راییدەکرد بێ جیاوازیی بەوپەڕی بەرپرسیاریتی و لەخۆبوردووییەوە.

ئاوات حەمەڕەش، ئەمیرە محەمەد، حاکم سابیر سمایل، کامەران عەلی حەسەن، نعمەت پیرداود، راوێژکار شادان، بەڕێز نەشئەت عەبدولڕەحمان بوو بە بریکاری وەزیر، بەداخەوە دوای هەشت مانگ کۆچی دواییکرد، لە ٣١ی ئابی ٢٠٠٠ دوای ماوەیەک مامۆستا عەبدولڕەحمان محەمەد ئیسماعیل بوو بە بریکار.

ساڵێک و حەوت مانگ لەو وەزارەتە مامەوە، لەو ماوەیەدا دەیان پرۆژەی گرنگمان بە هاوکاریی هاوکارانم جێبەجێکرد.

لەو پرۆژە گرنگانە:

١- پێکهێنانی ئەنجومەنی چاودێریی نەوجەوانان، بەپێی یاسای ١٩٧٦، ئەو ئەنجومەنە، بە سەرپەرشتیی وەزیر و ئەندامەکانی: بریکاری وەزیر، حاکم ئاراس - نوێنەری وەزارەتی داد، نوێنەری وەزارەتی ناوخۆ - (لیوا/ نەزەر) - بەشی پولیسی نەوجەوانان، دکتۆر کەژان - نوێنەری یونسێف، مامۆستا حیسام نوێنەری رێکخراوەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی (KIDO)، ئاوات حەمەڕەش، بوو.

یەکێک لە کارەکانی ئەنجومەنی چاودێری، وەرگرتنی ئاماری مانگانە بوو لە پۆلیسی نەوجەوانان، تا بزانین رێژەی لادان (تاوان) چەندە و لە کام ناوچە زۆرە، ئەوەش بوو بەهۆی بیرکردنەوە لە دانانی توێژەری کۆمەڵایەتی لە قوتابخانەکاندا، سەرەتا لەو خوێندنگایانە دامانان کە ناوچەکانیان رێژەی لادان و سەرپێچیی زۆربوو.

تا لەو وەزارەتە بووم، بەهەماهەنگی لەگەڵ وەزارەتی پەروەردە (١٠ بۆ ١٥) توێژەرمان دامەزراند.

بیرۆکەی دامەزراندنی توێژەری کۆمەڵایەتی وەک مامۆستا، لەو ئەنجومەنەوە هات. دواتریش کە بووم بە وەزیری پەروەردە ئەو بیرۆکەیەمان جێبەجێکرد.

یەکێکی تر لە کارە گرنگەکانی ئەو ئەنجومەنە، دامەزراندنی دادگای نەوجەوانان و منداڵان بوو، کە پێشتر لەگەڵ دادگای گشتیی تێکەڵ بوو. حاکم ئاراس بوو بە دادوەری ئەو دادگایە، تەنانەت پۆلیسەکانیشی بە

جلی مەدەنییەوە بوون و هەوڵدرا ئەو کەیسانەی کە دەمێک بوو بەهۆی سەرقاڵیی دادگاکانەوە دواکەوتبوون، پێشبخرێن.

٢-کەمکردنەوەی دیاردەی سواڵکردن، پاش توێژینەوەیەک کە لەلایەن (ئـاوات حـەمـەڕەش)ەوە ئەنجام درابـوو، بڕیـارمـاندا لـەو روانگـەیـەوە چارەسەری ئەو دیاردەیە بکەین. بۆ ئەو مەبەستە خانوویەکمان لە ناوچەی پیشەسازی پەیداکرد و کەلوپەلمان بۆ دابینکرد و توێژەری کۆمەڵایەتی و چاودێرمان بۆ دامەزراند، بە هاوکاریی پۆلیسی نەوجەوانان و وەزارەتی ناوخۆ و منداڵپارێز.

بە ئەنجامدانی ئەو کارە، بەشێکی باشمان لەو دیاردەیە کەمکردەوە، هەندێکجار کە سواڵکەرەکان، من یان کارمەندێکی وەزارەتیـان دەبینی، رایاندەکرد.

٣-قەدەغەکردنی فرۆشتنی خواردنەوەی کهولی و جگەرە لەلایەن منداڵ و دارشتنی یاسایەکی تایبەت بۆ منداڵەکان و دوکاندارە مەیفرۆشەکان، بە قەدەغەکردنی فرۆشتنی خواردنەوە کهولییەکان بە منداڵی خوار تەمەن ١٨ ساڵ.

٤-چاودێریی دوکان و یانە و گازینۆ و چایخانەکان کە نمایشی فیلمی ڤیدیۆییان دەکرد، یان شوێنی یارییە ئەلکترۆنییەکان بوون، بۆ نەهێشتنی دیاردەی نمایشی فیلمی سێکسیی بۆ منداڵانی خوار تەمەن (١٨) ساڵ، هەر شوێنێک سەرپێچی بکردایە، بە بڕیاری وەزارەتی ناوخۆ دادەخرا.

٥-کـردنـەوەی دایەنگەی گـەڕەک، دوای ئـەوەی پرۆژەیەکمان بردە ئەنجومەنی وەزیـران بۆ کردنـەوەی دایـەنگـەی گـەڕەک (لـەبـەر کەمیی باخچەکان و کێشـەی ژنانی کارمەند) و پەسەندکردنی لەلایەن ئەنجومەنی وەزیرانـەوە، هانی ئەو ژنانەمان ئەدا کە ئەیانتوانی لە ماڵەکەی خۆیان ژوورێک تەرخانبکەن وەک دایەنگە، بە مووچەی مانگانەی (٥٠٠) دینار و دابینکردنی کەلوپەل و یاریی لەلایەن یونسێفەوە و بینینی خولی تایبەت بەو پرۆژەیە، دەیان دایەنگەمان لە گەڕەکەکان کردەوە.

٦-بایەخدان بە بەندیخانە و بەندییەکان و کردنەوەی دەیان پرۆژەی گرنگ بە هاوکاریی کادیرەکانی وەزارەت بەتایبەتی حاکم سابیر و کاک نعمەت

و ئەمیرەخان و ئاوات حمەڕەش. ئەو پرۆژانەی کە لەناو بەندیخانەکان کردمانەوە: کتێبخانەیەکی گەورە و دابینکردنی سەرچاوەی کتێب، دانانی کۆمپیوتەر و کردنەوەی خول بۆیان، دانانی ژوورێکی تایبەت بۆ بینینی هاوسەرەکانیان. زیندووکردنەوەی بەرنامەی خوێندن و تاقیکردنەوەکان، کردنەوەی چەند پیشانگەیەکی کاری دەست، کردنەوەی وەرشەی میکانیک و دارتاشی، دابینکردنی هەندێ تایبەتمەندیتی بۆ ژنانی بەندکراو و دانانی توێژەری کۆمەلایەتی بۆ ناو بەندیخانە. ئەمانە و پەیوەندیی راستەوخۆ بە نامە لەلایەن بەندکراوەکانەوە بۆ وەزارەت و دۆزینەوەی چارە بۆ کێشە کۆمەلایەتییەکانیان، بەشێک لەو بەندکراوانەی کەیسەکانیان دواخرابوون، هەوڵماندا بۆ پێشخستنیان.

لەوانەش گرنگتر، گۆڕینی هەندێ یاسای سەردەمی رژێم بوو بە هاوکاریی وەزارەتی داد، بۆ نموونە: دزیکردن لەکاتی شەو، سزاکەی زۆر قورس بوو، لە (١٥) سال بەرەو سەرەوە بوو، ئەو یاسایە بۆ سەردەمی رژێم دانرابوو. هەروەها بازرگانیی ماددە هۆشبەرەکان و ئەوانەی توشبووبوون بە کێشانی، هەمان سزایان بەسەردا ئەدرا.

توانیمان بەشێک لەو یاسایانە بگۆڕین، بەتایبەتی ئەو کەیسانەی کە لەسەر دزی گیرابوون. ئەوسا نەبوونییەکی زۆر هەبوو، منداڵی تێدابوو لەسەر پاقلاوە دزین گیرابوو، هەبوو لەسەر نان دزین، هەبوو لەسەر مانگایەک کە بە شەو بردبووی دادگا (١٥) ساڵ سزای دابوو، توانیمان زۆرێک لەو کێشانە چارەسەر بکەین.

٧-پرۆژەی تایبەت بە خاوەن پێداویستییە تایبەتەکان، لەوانە مۆڵەتی دایکایەتی بۆ ئەو دایکانەی منداڵی ئیفلیجیی مێشک (شلل دماغ)یان هەیە، بە مووچەی تەواو و ئەژمارکردنی راژەکەیان.

٨-بایەخدان بە خوێندنی (برایل) بۆ نابینایان و دابەشکردنی گۆچانی تایبەت و کاتژمێری تایبەت کە لەلایەن یونسێفەوە دابینکرابوون، تۆمارکردنی سەدان (CD) بۆیان. هەروەها کردنەوەی وەرشەی دارتاشیی بۆ کەڕولاڵەکان و دروستکردنی شوێنی تایبەت بۆیان.

٩-پێشکەشکردنی پرۆژەی برینەوەی مووچەی تایبەت بۆ خاوەن پێداوسیتییە تایبەتەکان و توێژە کەم دەرامەتەکان کە لەژێر هێڵی هەژارییەوە بوون و بەڕێوەبەریتییەکمان بۆ دروستکردن، لە سەردەمی کابینەی د.بەرهەم ئەو پرۆژەیە کەوتە بواری جێبەجێکردنەوە و بوژانەوەیەک لەژیانیاندا روویدا، ژمارەیەکی زۆریش لەو کەم دەرامەتانەی گرتەوە.

١٠-هەروەها هێنانی کتێبی تایبەت بە هێماکان (ئیشارات)ی کەڕ و لاڵەکان و کردنەوەی خولی تایبەت بۆیان، لەدواییشدا کە بووم بە وەزیری پەروەردە، بە چاپمان گەیاند.

١١-پرۆژەیەکمان دابەشکرد بەسەر هەموو دەزگاکانی حکومەتدا بۆ دروستکردنی شوێنی تایبەت بە هاتووچۆی عەرەبانەکانی خاوەن پێداویستییە تایبەتەکان و دروستکردنی دەستشۆری تایبەت لە خوێندنگاکاندا بەتایبەتی لەو خوێندنگایانەی کە لەبواری دروستکردندا بوون.

١٢-دامەزراندنی خاوەن پێداویستییە تایبەتەکان بەپێی رێژەیەکی دیاریکراو لە دەزگاکانی هەرێمدا، خۆشبەختانە بوو بە بڕیار و ئێمە سەرپشککراین و یەکەم خاوەن پێداویستیی تایبەتمان لە وەزارەت دامەزراند، کە کاک عومەری سەرۆکی رێکخراوی خاوەن پێداویستییە تایبەتەکان بوو.

١٣-لەگەڵ دەزگا ئاینییەکان و وەزارەتی ئەوقاف، پرۆژەی فەتوای شووکردنەوەی ئەو ژنانەی پاشماوەی ئەنفال بوون.

١٤-پێشکەشکردنی پرۆژەیەکی تایبەت بۆ نەخۆشییە دەروونییەکان و کردنەوەی شوێنێکی تایبەت لەگەڵ یونسیف و یونسکۆ، کە لەو سەردەمەدا جێبەجێ نەکرا، بەڵام لەدواییدا جێبەجێکرا.

١٥-پێشکەشکردنی پرۆژەیاسای قەدەغەکردنی فرەژنی و کوشتنی ژنان لەژێر ناوی شەرەف و هەردوو یاسای (٥٩ و ٦٢) بە بڕیاری بەڕێز سەرۆکی هەرێم (مام جەلال) دەرچوو، کە تائێستاش کاری پێدەکرێت. ئەم پرۆژەیە بەهاوبەشیی لەگەڵ یەکێتیی ژنانی کوردستان پێشکەشکرا.

١٦-لیژنەیەکی راوێژکاریی بۆ کار و دەستەبەری کار پێکهات کە جوتیار نوری، سەرۆکی گشتیی یەکێتی سەندیکاکانی کرێکاران، ئەندام بوو لەو لیژنە راوێژکارییەدا ئەمە پرنسیپی کاری حیزبە سۆسیال دیموکراتەکانی

دونیایە، بەمەبەستی گۆڕینی یاساکانی کار و دابینکردنی هەلی کار و بیمەی کار بەپێی ئەو هەلومەرجەی کە دەهاتە پێشەوە. چەند جارێک بەڕێز مام جەلال ڕێنماییکردین لەکاتی سەردان و چاوپێکەوتنەکانماندا، دواجار مام جەلال داوای لێکردین کە یاسای کاری عیراقی (قانون العمل رقم ٥٨ لسنە ١٩٧٠) یاسای کاری ژمارە (٥٨)ی ساڵی ١٩٧٠، هەروەها یاسای ٧١ ساڵی ١٩٨٦ کە کرێکاری کەرتی گشتیی گۆڕی بە فەرمانبەر، بگۆڕین و دەستکاری بکەین بەپێی هەلومەرجی ئەوکاتەی عیراق و لە ڕوانگەی پارتە سۆسیال دیموکراتەکانی دونیاوە، بەتایبەتی کە یەکێتی خۆی هەڵگری ئەو بیروباوەڕەیە، بۆیە وەزارەتەکەمان بە هاوکاری و هەماهەنگیی سەندیکاکانی کرێکارانی کوردستان و دادگای کار، لیژنەیەکی سێ کەسیی بە سەرپەرشتیی وەزیری کار پێکهات و لیژنەکە لە (مامۆستا عەبدولڕەحمان، بریکاری وەزیر و جوتیار نوری سەرۆکی سەندیکا و حاکم سابیر) پێکهاتبوو، بەمەبەستی داڕشتنی مادە بەمادەی یاسای کار کە پشتمان بەست بە یاسای کاری عیراقی ساڵی ١٩٧٠ و سوودمان لە یاساکانی وڵاتانی دەوروپشتمان وەرگرت، وەک تورکیا و میسر و یاسای سویدیش، هەروەها سوودوەرگرتن لە ڕێنماییەکانی (انشطة العمال)ی سەر بە نەتەوە یەککگرتووەکان و ڕێنماییەکانی (اتحاد النقابات الحرة). پاش شەش مانگ لە چاککردن و گۆڕانکاری لە هەندێ مادە و داڕشتنی هەندێکی تر، ڕەشنووسی پرۆژەکە کە بریتیبوو لە (٢٥١) مادەی تەواوکراو، پێشکەشمانکرد بە بەڕێز مام جەلال بەهۆی ئەوەی لەسەر پێشنیازی ئەو جێبەجێکرا کە بەڕێزیان هەوڵیشبدات لەسەر ئاستی کوردستان جێبەجێبکرێ.

هەنگاوی دووەم؛ بە کردەوە لە وەزارەتی کار لەگەڵ سەندیکای کرێکاران بڕیار درا چەند لیژنەیەک دابنرێ و کاربکەن بۆ دەستەبەرکردنی داواکارییە پیشەییەکانی کرێکاران کە ئەمە خۆی لەخۆیدا پوچەڵکردنەوەی بڕیاری بە کارمەندکردنی کرێکارانی کەرتی گشتی بوو، ئەمانەش ڕۆڵی کاریگەریان هەبوو لەناو کارگەکان و شوێنی کارەکان، لەو کارانەی کە کردمان:

١- ڕێکخستنەوەی کاتی کارکردنی کرێکاران و دەستەبەرکردنی دەرماڵەی مەترسی و کاری زیادە.

٢- دەستەبەرکردنی دەزگایەکی تەندروستیی تایبەت بە کرێکاران لە کارگەکان و شوێنی کارەکان.

٣- بەهێزکردنی رۆلی لیژنەی سەندیکاکان لەناو ئەنجومەنی کارگێڕیی کارگەکاندا.

٤- کردنەوەی خولی پێگەیاندنی کادیری سەندیکایی لەو شوێنانەی لیژنەی سەندیکایی تیابوو، لە ئەنیستتیوتی کاری پیشەیی.

٥- دانانی (خۆپاریزیی پیشەیی) لە هەموو ئەو شوێنانەدا بە دابینکردنی کەلوپەلی پێویست لە (کڵاو، پێڵاوی تایبەت و جلی تایبەتی کارکردن) کە ئەوکات بە ئەستەم پەیدا دەکرا، بەڵام توانیمان بە رێگای تایبەت بۆیان پەیدابکەین.

٦- دابینکردنی ئامرازی هاتووچۆ بۆ کرێکاران.

٧- دەرکردنی بڕیارێک لە ئەنجومەنی وەزیرانەوە بۆ ئەو کەسانەی بە رووداوی کار گیان لەدەستدەدەن، وەک شەهید ئەژمار بکرێن و مووچەکانیان کەم نەکرێتەوە.

٨- هەرچەندە داواکارییەکی زۆرمان پێشکەش بە حکومەت کرد بۆ گەڕانەوەی ماڵ و موڵکی وەزارەتی کار کە پێشتر بە یاسا لە ساڵی ١٩٨٦دا دەستیان بەسەردا گیرابوو، بەڵام بەهۆی باری دارایی حکومەت جێبەجێ نەکرا، هەرچەندە هەموو لایەنە پەیوەندیدارەکان لەگەڵ بۆچوونەکانمان بوون.

٩- پرۆژەیەکی تری بەڕێوەبەرێتی بەشی کار، ئەویش بەگەڕخستنەوەی نووسینگەی کار کە پێشتر نەمابوو، بۆ ناونووسینی ئەو کەسانەی کە پێویستیان بە کار بوو بەپێی پسپۆڕییان، بەسوودوەرگرتن لە پرۆژەیەکی سویدی (ئامو سەنتەر)، لەم روانگەیەشەوە هەندێ خەڵکمان دامەزراند، لای دارتاش و فیتەر و پیشەوەرەکان، مووچەیان لای ئێمەوە بۆ دابیندەکرا بەمەبەستی فێربوونی پیشەکان، بۆ ماوەی چەند مانگێک.

١٠- دروستکردنی بەڕێوەبەرێتی هێزی کار.

هەر ئەوکات کە وەزیری وەزارەتی کاروباری کۆمەڵایەتی بووم، ستێت دیپارتمێنتی ئەمریکی (united state department of state)

بەرنامەیاکی تایبەتی بۆ عیراق ئامادەکردبوو، لە ٢ تا ١٦ی کانوونی یەکەمی ٢٠٠٠ لەلایەن سەنتەری ئینتەرناسیۆناڵی میردیان ئەنجامدرابوو، بەشداربووان لە عیراق: بەندە، وەک وەزیری کاروباری کۆمەڵایەتی و ئەندامی یەکێتی.

عەلی عومەر عەبدوڵڵا، بەڕێوەبەری گشتیی مین و ئەندامی یەکێتی.

باسم ئەلعەلی، ئەندامی کۆنگرەی نەتەوەیی عیراق.

ئاگرین عەبدوڵڵا عەزیز، ئەندازیار و ئەندامی پارتی دیموکراتی کوردستان.

رۆژ نەریمان بەهجەت، بەڕێوەبەری گشتیی پەیوەندییەکان و ئەندامی یەکێتی.

سەراجەدین بارزانی، ئەندامی پارتی.

سەرهەنگ سالار حەمە سەعید، لە منداڵپارێزی کوردستان.

شێرزاد محەمەد ساڵح جبرائیل، کۆنگرەی نەتەوەیی عیراق.

محەمەد محەمەد عەلی، کۆنگرەی نەتەوەیی عیراق.

چلورە هەردی، رێکخراوەکان و ئەندامی پارتی دیموکراتی کوردستان.

محەمەد سابیر سلێمان، ئەندازیار.

بەیەکەوە هەموومان وەک گروپێک پێشوازییان لێکردین و لە یەک میوانخانە دایاننابووین.

بەرنامەکان: رۆژی یەکەم، گەشتێک بوو لەناو واشنتۆن و شوێنە گرنگەکان. رۆژی دواتر، ئیتر بەرنامەکانیان بۆ (چۆنێتی گفتوگۆ، هۆکاری گرژی و چۆنیتی چارەسەرکردنیان، بە ئاشتیکردنی کۆمەڵگا، چۆنێتیی گۆڕینی بیرۆکە بۆ پرۆژە). سەردانی کۆنگرێس و رۆژانە بەرنامەی خوێندن و پێگەیاندن کە لەسەر ئاستی زانکۆ و شارەزاکان، وانەکانیان دەوتەوە.

سەردانی کارۆلینای باکوور، لەسەر مێژووی ناوچەکان و ئابووری و گەشەکردنی ناوچەکان، ئەم گەشتانە دەکران بۆ ئەوەی پیشانمان بدەن دەکرێ لە نەگونجان و کێشە، ئاشتەوایی بەدیبێت و ببێتە هۆی گەشەکردن و بە ئاشتییانە پێکەوە بژین.

لەسەر سیستمی زانکۆکان و پرۆژەی قەرزی بچووک و پرۆژەی ژنان، دەیان راهێنانیان پێکردین. ئەتوانم بڵێم یەکێک بوو لە بەشدارییە گرنگەکانی

ژیانم کە سوودی زۆرم لێوەرگرتووە و تائێستاش بەشێکی بووەتە پەیڕەو لەژیانمدا. هەر لەوێوە هەندێ پرۆژەمان پێشکەش بە لایەنی پەیوەندیدارکرد، کە ئەو کتێبانەمان پێبدەن کە بۆ ئاشتی و بەئاشتیکردنی خوێندنگاکانمان پێویستن. دوایی بە پۆست هەموو سەرچاوەکانیان بۆ ناردین و کاتێ بووم بە وەزیری پەروەردە، بە هاوکاریی ڕێکخراوی (کیدۆ) توانیمان ڕێنماییەکانی بەئاشتیکردنی خوێندنگاکان وەک ڕێگەچارە وەربگێڕین بۆ سەر زمانی کوردی و کردمان بە خول بۆ بەڕێوەبەر و مامۆستاکان، بۆ ئەوەی بتوانن پەیڕەوی بکەن، کە لە ڕێی یونسێفەوە چاپ و دابەشکران.

**سەنتەری هاموون**

لە ١٠ی حوزەیرانی ٢٠٠١، وەک وەزیری کاروباری کۆمەڵایەتی لەگەڵ بەڕێز کاک ئازاد جندیانی کە ئەوسا لێپرسراوی مەڵبەندی سێی هەولێر بوو، پارێزگاری هەولێر و قایمقامی قەزای کۆیە و ئۆفیسی منداڵپارێزی کوردستان و گەنجانی شاری کۆیە و سەرجەم ڕێکخراوە پیشەیی و دیموکراتییەکان، سەنتەری چالاکییە ڕۆشنبیرییەکانی (هاموون)مان لە کۆیە کردەوە. ئەو سەنتەرە لەسەر داوای گەنجانی شاری کۆیە بوو کە لە مانگی شوباتی ٢٠٠١ لە شاری کۆیە ئاراستەی بەڕێز سەرۆک مام جەلال، سەرۆکی هەرێمی کوردستان کرابوو. ئەویش پشتگیریی تەواوی خۆی پیشاندابوو، هاوکاریی تەواوی مادی لەلایەن بەڕێزیانەوە بوو، منی ڕاسپارد بۆ کردنەوە و جێبەجێکردنی داواکەیان و ئاراس شێخ جەنگی هاوکارم بوو بۆ ئەنجامدانی بە هاوکاریی ئەو گەنجانە (ئاسۆ کاکەڕەش وەک لێپرسراوی سەنتەرەکە، ڕوژان بەکر قادر لێپرسراوی بەشی وەرزشی، ڕۆشنا ئەحمەد ڕەشید – بەڕێوەبردن، ئاراس ڕەسوڵ ئەحمەد – ڕاگەیاندن، نیگار سەمەد مەحمود – ئامار، سامان سابیر موراد – دارایی، بەهرام مەولود کەریم – پەیوەندییەکان).

سەنتەرەکە، چالاکییە هونەری و وەرزشی و زانستی و ڕووناکبیرییەکانی گرتبووە خۆی بۆ خزمەتی گەنجانی کۆیە.

داواکارییەکە، لە ڕێگای ئاسۆی کاکەڕەشەوە پێشکەش بە بەڕێز مام جەلال کرابوو. ئەویش بە تێبینییەک لەسەر نامەکە بۆی نووسی بووم (خوشکە نەرمین خانی بەڕێز، سڵاوێکی گەرم، زۆرم پێباشە و منیش ئامادەی هاوکاریی مالیم بۆ ئەو پرۆژەیە... واژووی مام جەلال لە ٢٣ی شوباتی ٢٠٠١) هەروەها ڕەزامەندیی مەڵبەندی سێیان وەرگرتبوو، بە نامەیەک ئاراستەیان کردبووم کە پشتگیری تەواوی کردنەوەی سەنتەرێک دەکەن بۆ گەنجانی کۆیە. هەروەها ڕێکخراوی ئازادیی لاوان و کۆمیتەی ڕێکخستن و کۆمەڵەی خوێندکاران، یەکێتی مامۆستایان، تیپی مامۆستایانی باواجی کۆیە. مەکتەبی مافی مرۆڤ، پشتگیرییان کردبوون. بەم شێوەیە، لەسەر ئەرکی بەڕێز مام جەلال و بە هاوکاریی هەمووان، توانرا لەکۆتاییدا ببێتە سەنتەریکی چالاکی ناوچەکە.

له ۳۰ی کانوونی دووەمی ۲۰۰۱، کۆنگرەی دووەمی (ی.ن.ک) دەستی بەکارەکانی خۆی کرد و جەنابی مام جەلال لەناو دەرگای هۆڵی کارگەی جلوبەرگی سلێمانی کە کۆنگرەکەی تێدا ئەنجامدرا، بەخێرهاتنی لە تەواوی ئەندامانی کۆنگرە کرد کە بریتی بوون لە (۱۲٤۷) ئەندام و تا ٥ی شوباتی ۲۰۰۱ درێژەی کێشا.

پاش دەستپێک و راگەیاندنی بەستنی دووەمین کۆنگرەی (ی.ن.ک)، مام جەلال (سکرتێری گشتی)، راپۆرتی سکرتێری گشتیی پێشکەشکرد، کە راپۆرتێکی تێروتەسەل و هەمەلایەنە و فرەرەهەند بوو. تێیدا ئاماژەی بە دەور و کاریگەریی یەکێتی کرد لەماوەی نۆ سالی نێوان کۆنگرەی یەکەم و کۆنگرەی دووەم و لە راپۆرتەکەدا دەستکەوتەکانی خستبووەڕوو. هەروەها پێشنیازی بۆ هەموو بوار و سێکتەرە جیاجیاکان هەبوو، بە ئامانجی گەشەسەندنی زیاتری وڵات لە سایەی حوکمڕانی و بەڕێوەبردنی یەکێتیدا. کە لەڕاستیدا ئەگەر لەسەر ئەو روانین و پێشنیازانەی مام جەلال کارمان بکردایە، ئێستا هەرێمی کوردستان بەجۆرێکی تر و لە ئاستێکی باشتر و باڵاتری حوکمڕانی و ژیاریدا دەبوو.

ئەبێ ئاماژە بۆ ئەوە بکەم، راپۆرتی سکرتێری گشتیی کە لەلایەن مام جەلالەوە پێشکەشکرا، چەند کاژێرێکی خایاند، بەڵام مام جەلال بە یەک ئاست و گوڕوتین لە سەرەتا تا کۆتایی و بە پێوە راپۆرتەکەی پێشکەشی هەمووان کرد، کە مایەی سەرسامیی بوو بۆ تەواوی ئەندامانی کۆنگرە و سەلماندیشی چەند بەپەرۆشە لەسەر راپەراندنی ئەرکە حیزبییەکانی خۆی. تەواوی ئەندامان لەماوەی ئەو چەند کاژێرەدا هەریەکە و چەند جارێک پشوومان وەرگرت، بەڵام مام بە هەمان هەناسەی سەرەتا، تا کۆتایی و بە پێوە لە پێشکەشکردنی راپۆرتەکەی بەردەوام بوو.

پاشان سکرتێر و تەواوی سەرکردایەتیی پێشوو، لەبەردەمی کۆنگرەدا پلەکانیان لێوەرگیرایەوە و هەموو بوونەوە ئەندامی کۆنگرە.

لیژنە، دەستی بە کارەکانی کرد و لیژنە لاوەکییەکانی دروستکرد بۆ (پەیڕەو و پرۆگرام، دارایی، بەرنامەی یەکێتی و...هتد).

ئەندامانی کۆنگرە، بەشێکی بە هەڵبژاردن هاتبوونە کۆنگرە و هەندێکیش بەهۆی پۆستەکانیان و هەندێکیش مام جەلال مافی پێدرابوو بیانهێنێتە کۆنگرە،

نوێنەری ڕێکخراوەکانیش بەشێکی بە هەڵبژاردن هاتبوون. بەندە، وەک وەزیرێکی یەکێتیی بەشداربووم، نەچووبوومە پرۆسەی هەڵبژاردن. لەناو لیژنەکان چوومە لیژنەی بەرنامە (پرۆگرام)ی یەکێتی کە مەلا بەختیار سەرپەرشتیی دەکرد، لە هۆڵی (دیالۆگ)ی مەکتەبی ڕێکخراوە دیموکراتییەکان کۆبووینەوە. لەناو ئەو لیژنەیە، دوو بۆچوون هەبوو؛ (ئایا بەرنامەی یەکێتی، چەپێکی هاوچەرخی ریالیستی سۆسیال دیموکرات بێ بەو چەمکەی لە ئەورووپادا پەیڕەو دەکرێ، یان چەمکێک بێ بۆ ڕۆژهەڵات بگونجێ؟)، هەشبوو دەیوت با دیموکراتییەتی سۆسیالیست بێ کە ئەو بۆچوونە سەرینەگرت و وەک حیزبێکی سۆسیال دیموکرات مایەوە و پەسەندکرا.

فەزای کۆنگرە وای دەردەخست کە هەناوی یەکێتی پڕ و ئاوساوە لە گیروگرفت و گیانی دەستەگەریی، بە ئاشکرا بەدیدەکرا. لەناو یەکێتی دوو باڵ بە ئاشکرا کاریاندەکرد، باڵی (عومەری سەید عەلی و جەبار فەرمان) و باڵی (کۆسرەت ڕەسول). مام، نەچووبووە هیچ هاوکێشەیەکەوە. هەشبوون هەوڵی جدییان ئەدا بۆ نەهێشتنی ئەو دەستەگەرییە و جەختیان لەسەر یەکڕیزیی و برایەتیی ناو یەکێتیی دەکردەوە، مەلا بەختیار یەکێکبوو لەوانە.

من و دارۆ هەردووکمان بەشداربووین لە کۆنگرە. دارۆ بووە قوربانیی ئەو دەستەگەرییەی ناو یەکێتی و لە ڕۆژی هەڵبژاردن، هیچ یەکێک لەو دوو باڵە پشتیان نەگرت و بەپێچەوانەوە پشتیان تێکرد. کاتێ لەناو کۆنگرە هەندێ لە برادەرەکانمان ناوی لیستەکانی باڵەکانیان بۆ هێنام، لە هەردوو لیستەکە ناوی دارۆی تێدا نەبوو، مام جەلالیش خۆی لیستی نەبوو کە دارۆ لەسەر مام جەلال ئەژماردەکرا. لەناو کۆنگرە، چووم بە دارۆم وت، هەستمکرد زۆری پێناخۆش بوو، هەرچەندە وتی «بەلامەوە گرنگ نییە». هەر لەناو کۆنگرە چووم بۆ لای عومەری سەید عەلی، پیموت «ئەمەت کردووە بەرانبەر دارۆ». ئەویش وتی «ئەوە لیستی من نییە»، بەڵام دڵنیابووم کە ئەو لیستە هی باڵی عومەری سەید عەلی و جەبار فەرمان بوو. هەروەها ناوی لە لیستی کۆسرەت ڕەسوڵیش نەبوو. ئەو دووانە، کە خۆیان لە برادەرە نزیکەکانی دائەنا، بەڵام لە کۆنگرە پشتیان تێکرد. دارۆ بەو ڕەفتارەی من دڵگرانبوو، وتی «کێ پێی وتووی ئەمە بکە؟». وتم «خۆم، چونکە لە هەموو کەس چاوەڕوان بووم، لە عومەری سەید عەلی چاوەڕوان نەبووم».

دارۆ، بەهۆی ئەوەی دارایی یەکێتی لابوو و بەپێی ڕێنماییەکانی دارایی کاریدەکرد، زۆرکەس بەو ڕێنماییانەی دارۆ دڵگران بووبوون. هەروەها ئەگەر خەرجییەک بەدەر لە ڕێنماییەکان بوایە، پرسی بە مام جەلال دەکرد بۆ خەرجکردن یان خەرجنەکردنی.

لەلایەکی تریشەوە، مەکتەبی دارایی و ئیدارەی گشتیی، ڕاپۆرتێکی تێروتەسەلی ئامادەکردبوو لەسەر سەرچاوە داراییەکان و پرۆژەکان و چۆنێتیی خەرجکردنی داراییەکان بۆ مەکتەبەکانی یەکێتی و پرۆژەکان و کەسایەتییەکان و لایەنەکان و هەریەکە چەندی وەرگرتووە، بەڵام لەناو کۆنگرە د.فوئاد مەعسوم وتی «پێویست ناکات ئەو ڕاپۆرتە بخرێتەڕوو». نەیانهێشت ڕاپۆرتەکە لەبەردەم کۆنگرە بخوێنرێتەوە، هەرچەندە دوای بینینی لیستەکان، من زۆرم لە دارۆ دەکرد خۆی بچێت بیخوێنێتەوە، بەڵام دارۆ وتی «بوار نادەن».

لای دارۆ، دڵڕازیکردن نەبوو، بەڵکو پەیڕەو و بەرنامە هەبوون. لە کۆنگرە، دەنگی نەهێنا و زوڵمێکی زۆر گەورەیان لێکرد و تا دوارۆژی ژیانی ئەو زوڵمەی لە دڵ دەرنەئەچوو. زۆریش ئازاری ئەدا، ئەگەر بشموتایە «برادەرەکانت زوڵمیان لێکردیت» دەیوت «پەیوەندیی بەتۆوە نییە». سەرباری ئەوەی بەسەریانهێنا، هێشتا نەیدەویست بەنیگەرانییەوە باسیانبکەم.

کەسایەتی دارۆ لەو جۆرانە بوو کە خەمەکانی دەرنەدەبڕی، بەڵام لەناوەوە دەکوڵا و نەخۆشی دەخست. کەسێک بوو خۆدەرخەر نەبوو، دووربوو لە میدیا و چاوپێکەوتن و باسکردنی کارەکانی.

ئەوەی پشتی گرت، مام جەلال بوو، مام جەلال هاتەماڵەوە و بە دارۆی وت «ئەمە هەر دژی تۆ نەبوو، بەڵکو دژی منیش بوو، بۆیە نابێ دووربکەویتەوە و واتلێبکات کارنەکەیت، هەرئەبێ لە ئیدارەی گشتیی بمێنیتەوە». دارۆ وتی «نایکەم، وازدەهێنم». بەڵام دوای چەند جارێک بینینی دارۆ، مام ڕازیکرد کە وازنەهێنێ و لە ئیدارەی گشتیی بمێنێتەوە. مام، وتیشی «هەڵەی من بوو کە پێش کۆنگرە بە کارێک تۆم نارد بۆ ئێران، دەبوایە لێرەبوویتایە، نەمزانی ئەمەت بەرانبەر دەکەن».

لەو کۆنگرەیە، هەرچەندە چەند ژنێک خۆیان کاندیدکرد، بەڵام دەرنەچوون. لەوانە: کویستان و وەسفیەی (رەوانشاد)، هەرچەندە مام جەلال وەسفێکی جوانی وەسفیەی کرد لەناو کۆنگرە، هەروەها رووناکی شێخ جەنابیش.

پێش کۆنگرە. مام جەلال بەدوایدا ناردم بۆ ئەوەی خۆم کاندید بکەم، بەڵام پێموت «مامە، ناکرێ لەماڵێکدا دوو کەس خۆی کاندیدبکات». لەدوای کۆنگرە، مام جەلال وتی «داوام لە هێرۆ و کافیە و نەرمین کردووە خۆیان کاندید بکەن، کەسیان نەیانکردووە». ئەمەی لە چاوپێکەوتنێکی رۆژنامەوانیدا وت.

کۆنگرە لە ٥ی شوباتی ٢٠٠١ کۆتاییهات، مام جەلال بە سکرتێری گشتیی هەڵبژێردرایەوە و (٣٧) سەرکردایەتی و (١٠) یەدەگ هەبوون و (١٦) کەسیش بوون بە ئەندامی مەکتەبی سیاسیی کە سەرجەمیان پیاوبوون.

تا ئەوکاتەی لە وەزارەتی پەروەردە دەستبەکار بووم، سێ کابینەی حکومەتی خۆماڵی، لە هەرێمی کوردستاندا بەڕێوەچوو بوو. کابینەکەی ئێمە، بەڕێز د.بەرهەم ئەحمەد ساڵح سەرۆکایەتیی دەکرد. بەرنامەی کارکردنی، بریتی بوو لە: پەرەپێدانی پرۆژەکان، ڕێکخستنەوە و باشکردنی بەڕێوەبردن، هاندانی بازاڕی ئازاد و کەرتی تایبەت، وەبەرهێنانی خۆماڵی و دەرەکی. کابینەکە، بە ڕۆحیەتێکی نەتەوەیی و بەیەکەوە جێبەجێکردنی کارەکان و هاوڕێیەتی کاری دەکرد. بەلام ڕێگریشی هەبوو. جگە لە هۆکارە دەرەکییەکان، دابەشبوونی هەرێمی کوردستان بەسەر دوو ئیدارەیی و بوونی ئابڵوقەی ئابووریی حکومەتی ناوەند دژ بە کوردستان و ئابڵوقەی جیهانیی دژ بە عیراق. هەردوو قابڵوقەکە، ڕاستەوخۆ کاریگەرییان بەسەر حکومەتەوە هەبوو، تەنانەت کاریگەرییان بەسەر بچووکترین پێداویستییەکانەوە هەبوو. بۆ نموونە؛ زۆر مادەی کیمیایی کە دەبوایە بۆ تاقیگەکانی خوێندنگا و زانکۆکان دابینبکرێت، قەدەغەبوو بیانهێنینە کوردستانەوە. هەرچەندە ئەوکات بەرنامەی نەوت بەرانبەر بە خۆراک و بڕیاری (٩٨٦)ی UN جێبەجێ دەکرا و حکومەتی هەرێم بە هەماهەنگیی لەگەڵ ئاژانسەکانیUN دا، توانی چاکسازییەکی بەرچاو تۆمار بکات لە شێوازی ژیانی هاولاتیانی هەرێمەکە. بۆ نموونە؛ کەمبوونەوەی ڕێژەی مردنی منداڵان و کەمبوونەوەی چوونە دەرەوەی منداڵان و دوورکەوتنەوەیان لە خوێندن، بەپێچەوانەوە بەرنامەی نەهێشتنی نەخوێندەواری و نەوجەوانانیش هاتە پێشەوە، کاری جدیی لەسەر دەکرا و لە هەموو بوارەکاندا بەرەوپێشچوونی ئاشکرای بەخۆوەبینی.

ئیدارەی ناوخۆ، هاوکار لەگەڵ ڕێکخراوەکانی سەر بەUN ، دەیەها پرۆژەی گرنگی سەردەمیانەیان ئەنجامدا، بەشێکی لەسەر بودجەی حکومەت بوو، بەشەکەی تر بە هاوکاریی UN و بودجەی نەوت بەرانبەر بە خۆراک بوو. بڕیارێکیشمان پێشکەش بە حکومەت کرد و پەسەندکرا، ئەویش ئەوەبوو کە هەر کەسێ مزگەوتێ دروستبکات، دەبێ خوێندنگایەکیش دروستبکات. ئەوەش بوو بەهۆی ئەوەی چەند خوێندنگایەک لە گوند و شارۆچکەکان بنیادبنرێ.

کۆنفرانسی دووەمی پەیمانگای مەڵبەندی مامۆستایانی هەرێمی کوردستان، لە ٢٠ و ٢١ی ئابی ٢٠٠٢ بەسترا، کۆنفرانسی یەکەم لە ساڵی ١٩٩٥ لە هەولێر کرابوو.

ئەو کۆنفرانسە، یەکێک بوو لە کۆنفرانسە گرنگەکان بەتایبەتی بۆ داڕشتنەوەی پەیرەوی ناوخۆی پەیمانگاکان و پێشکەشکردنی ڕاپۆرتێکی تێروتەسەل لەسەر ڕەوشی ئەوسای پەیمانگاکان و دۆزینەوەی ڕێگەچارە و داڕشتنەوە و گونجاندنی لەگەڵ سەردەم. ئامادەکردنی ڕاپۆرتەکە، لەلایەن ئەم بەڕێزانەوە بوو:

ستار عەبدوللا. بەڕێوەبەری بەشی (پرۆگرام و نەخشەکێشان)، سەرۆکی لیژنەکە بوو.

محەمەد عەبدولباقی ئیبراهیم، سەرۆک بەشی عەرەبی پەیمانگای رانیە.

محەمەد خەلیل عەلی، پەیمانگای مامۆستایانی مەڵبەندی رانیە.

فوئاد عەلی جەمشید، سەرۆک بەشی کۆمەڵایەتی کەلار.

لەتیف کەریم عومەر، پەیمانگای سلێمانی.

وتەی بەندە لەو کۆنفرانسە:

بەڕێز جێگری سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران

میوانە بەڕێزەکان

ئامادەبووانی بەڕێز...

بەخێرهاتنێکی گەرمتان دەکەین بۆ کۆنفرانسی مەڵبەندەکانی پەیمانگای مامۆستایان.

بەڕێزان...

وەزارەتی پەروەردە لە هەرێمی کوردستان، ئەرکی پێگەیاندنی مامۆستایانی سەرەتایی گرتووەتە ئەستۆ، بۆ ئەم مەبەستە، چەند دامەزراوەیەکی گرنگی ئەکادیمیی پەروەردەیی و زانستیی لە پارێزگاکانی هەرێمی کوردستان دامەزراندووە بەناوی پەیمانگا مەڵبەندییەکانی مامۆستایان.

پەیمانگای مەڵبەندی مامۆستایانی سلێمانی، ساڵی ١٩٩٢ دامەزراوە، ساڵی پار ١٤٨٧ خوێندکاری هەبووە.

پەیمانگای مەڵبەندی مامۆستایانی کەلار، ساڵی ١٩٩٥ دامەزراوە، ساڵی پار ٤٠٠ خوێندکاری هەبووە.

پەیمانگای مەڵبەندی مامۆستایانی رانیە، ساڵی ١٩٩٦ دامەزراوە، ساڵی پار ٤٦٣ خوێندکاری هەبووە.

پەیمانگای مەڵبەندی مامۆستایانی چەمچەماڵ، ساڵی ١٩٩٨ دامەزراوە، ١٦٥ خوێندکاری هەبووە.

پەیمانگای مەڵبەندی مامۆستایانی هەڵەبجە، ساڵی ١٩٩٩ دامەزراوە، ٢٥٢ خوێندکاری هەبووە.

ئەگەر ئەو پەیمانگایانە بەجۆرێک لە جۆرەکان و بەشێوەیەکی دروست و زانستی، ئایندەیەکی رووناکیان لێ چاوەڕوان بکرێ، ئەبێ بەرنامە و سیستمێک دابڕێژرێ کە لەگەڵ رەوتی خوێندن و زانستی سەردەمدا بگونجێ.

بەپێی میتۆدێکی زانستی، مەفهومەکانی ژیان و ئازادی و دیموکراتی و مافی مرۆڤ و خۆشەویستیی خاک و نیشتمان و خەسڵەتە خوییەکانی کۆمەڵگای کوردی بەشێوەیەک لەشێوەکان بخرێنە بەرنامەکانی خوێندنەوە.

بەڕێزان، کۆمەڵێ کێشەی سەرەکیمان هەیە لە پەیمانگاکاندا کە بریتین لە:

- نەبوونی پەیڕەوێکی گونجاو، تاکو ئێستا پەیڕەوێک پیادە ئەکرێ کە لەگەڵ ئەم سەردەمەدا ناگونجێ.

- واقیعی بیناکان، بیناکان هیچ مەرجێکی پەیمانگایان تێدا نییە.

- پرۆگرامی خوێندن، نەبوونی پرۆگرامێکی یەکگرتوو لە هەموو پەیمانگاکان و نەگونجاویی ئەو پرۆگرامانە کە مەرجەکانی نوێکاری و تازەگەریی تێدا نییە.

- مامۆستایانی پەیمانگا، لەڕووی ژمارەوە کەمن و لەڕووی پسپۆڕیی و شارەزایی و زمانەوە، هەندێکیان دەوڵەمەند نین.

- شێوازی وەرگرتنی خوێندکاران، هیچ پلانێکی داڕێژراوی رێکوپێک نییە بۆ وەرگرتن و دابەشکردنیان بەسەر بەشەکاندا لەڕووی چۆنێتی و چەندایەتی.

- هۆیەکانی فێرکردن، نەبوونی سەرچاوەی زانستی و پەروەردەیی و نەبوونی تاقیگە و یەکەی کۆمپیوتەر و وەرشە و کۆمەڵێ هۆی تر.

- کەمیی بەشی ناوخۆیی بۆ خوێندکاران.

- راهێنانی خوێندکاران، راهێنانی خوێندکاران تەواوکەری پرۆسەی خوێندنە.

ئەمانە و کۆمەڵێ کێشەی تر هەن کە ئەبێ لەم کۆنفرانسەدا باسی لێوەبکرێ و پلانی زانستیی بۆ چارەسەرکردنیان دابڕێژرێ بۆ ئێستا و دواڕۆژ.

بەڕێزان...

ئەو پێشنیازانەی کە لەبەردەستی بەڕێزتاندایە، دەرەنجامی کۆمەڵێ کۆبوونەوە و ڕاپرسییە کە قابیلی گفتوگۆکردنن لەم کۆنفرانسەدا، رای ئێوەی بەڕێز، بۆ دەوڵەمەندکردنی پێشنیازەکانە بەرەو باشکردن و گۆڕانکاریی، بەخۆشحاڵییەوە گوێبیستی هەموو پێشنیازێکی تازەین کە لە خزمەت پێشخستنی پەیمانگاکاندا بێ.

نامەوێ باس لە هەموو ئەو پێشنیازانە بکەم، بێگومان کۆمەڵێ لەو پێشنیازانە پێویستی بە گفتوگۆی زۆر هەیە، رەنگە هەندێکیان پەسەندبن و هەندێکیان پەسەند نەکرێن و هەندێ بابەتی تر بێتە پێشەوە.

لەکۆتاییدا، هیوادارم ئەم کۆنفرانسە سەرکەوتووبێ و ئامانجەکانی بەدیبهێنێ و دەستخۆشیی لە سەرۆک بەشەکان و مامۆستایانی پسپۆڕ و بەڕێوەبەرێتیی نەخشەکێشان دەکەم.

ئێوەش ئەی میوانە بەڕێزەکان، جارێکی تر بەخێربێن.

بەڕێزان، ئەم کۆنفرانسە دوو رۆژ ئەخایەنێ، پاشنیوەڕۆی ئەمڕۆ و بەیانی، وتوویژ ئەکری لەسەر پێشنیازەکان و ئەنجامەکانی پوختە ئەکرێ بەو پەیڕەوەی کە لەمەودوا لەسەری ئەڕۆین.

دواتر لە سالی (۲۰۰۲)، وەزارەتی پەروەردە بە هاوکاریی زانکۆی سلێمانی و پەیمانگای پیشەیی و بەڕێوەبەرایەتی ئاماری سلێمانی و بە هاوکاریی مادیی رێکخراوی یونسکۆ، بە دوو قۆناغ، راپۆرتێکی گرنگی دەربارەی بازاڕی کار و کاریگەریی لەسەر خوێندنی پیشەیی ئامادەکرد. قۆناغی یەکەم، راپۆرتێکی (۹٦) لاپەڕەیی بوو. قۆناغی دووەم، بە دووجار دەرچوو، بە هەردووکیان (٤۱۱) لاپەڕە بوون.

توێژینەوەیەکی زۆر تێروتەسەل و فراوان بوو، مەبەستیش هەڵسەنگاندنی پێداویستییەکانی بازاڕ و دەرچووانی بەشە پیشەییەکان و راگرتنی هاوسەنگیی نێوانیان بوو. توانیمان ئەو ئامانجە بپێکین بە پێکهێنانی لیژنەیەک لە وەزارەتی پەروەردە و رێکخراوی یونسکۆ و بەشداریی زانکۆی سلێمانی و پەیمانگای پیشەییەکان و بەڕێوەبەرایەتی ئاماری سلێمانی. لیژنەی سەرەکی و لیژنە لاوەکییەکان پێکهێنران، خولی راهێنانمان بۆ ئەنجامدانی ئەو توێژینەوە

مەیدانییە کردەوە و هەموو ئامارەکان و داتاکان بە کۆمپیوتەر کران و ئەنجامی توێژینەوەکەمان دیاریکرد کە زیاتر لە شەش مانگی خایاند، ئەمە جگە لە گفتوگۆ و هەوڵە سەرەتاییەکان کە بە تێکڕا، نزیکەی ساڵێکی خایاند.

لیژنەی سەرەکیی، پێکهاتبوو لە:
نەرمین عوسمان حەسەن، وەزیری پەروەردە (سەرۆکی لیژنە).
دکتۆر کەمال محەمەد سەعید خەیات، زانکۆی سلێمانی.
دکتۆرە شەونم عەبدولقادر مچیدین، زانکۆی سلێمانی.
دکتۆر ئاراس حسێن مەحمود، زانکۆی سلێمانی.
نزار عەبدولقادر عەلی، زانکۆی سلێمانی.
عوسمان عەبدولقادر، پەیمانگای هونەرەجوانەکان.
جەلال عەبدوڵلا محەمەد، پەیمانگای هونەرە جوانەکان.
حسێن محەمەد عەزیز، ئەنجومەنی وەزیران.
کەمال نوری غەریب، وەزارەتی پەروەردە.
محەمەد عەبدولحەکیم محەمەد، وەزارەتی پەروەردە.
مەحمود عوسمان مەعروف، بەڕێوەبەرایەتی ئامار.
هەروەها لەلایەن یونسکۆوە، کەسێک بەناوی (مادلین) ئەندام بوو.

توێژینەوەکە، بە یەکێک لە توێژینەوە گرنگەکانی وەزارەت ئەژمار دەکرێ، توانیمان دوای ئەوە سیستمی وەرگرتن لە پەیمانگاکان بگۆڕین و زۆرێک لە هاوکاری و ڕێپیشاندان بێنینە ناو سیستمی قبوڵکردنی خوێندکاران. ئەو ڕاپۆرتانە، تائێستا لای من هەڵگیراون، هەرکەسێ بیەوێت، دەتوانێت وەک سەرچاوە بۆ لێکۆڵینەوە و سوودوەرگرتن بەکاریانبهێنێ.

لە ١٣ی ئەیلولی ٢٠٠٣، کۆبوونەوەیەک بە سەرپەرشتیی د.بەرهەم ساڵح، سەرۆک وەزیران و ئامادەبوونی بەندە وەک وەزیری پەروەردە و عوسمان شوانی بریکاری وەزیری دارایی و هەندێ لێپرسراوی ئیداریی کشتوکاڵ و بەرهەمە نەوتییەکان و بانکەکان، لەگەڵ ژەنەڕاڵ هیلمک کرا. بابەتی گرنگی ڕۆژ باسکرا، هەروەها ژەنەڕاڵ هیلمک شاندێکی ناوچەکانی موسڵی لەگەڵدا بوو.

ئێوارەی هەمان ڕۆژ کۆبوونەوەیەک لەگەڵ ڕێکخراوی (یونۆکی) بە

لێپرسراوێتی (تسفا یمۆر) و بەرپرسی ڕێکخراوەکە لە کوردستان ئەنجامدرا، بە ئامادەبوونی بەندە، وەک وەزیری پەروەردە و عەبدولڕەزاق فەیلی وەزیری پەیوەندییەکان و هاوکاری، گفتوگۆ لەسەر پرۆژەکانی UN لە کوردستان و پرۆژەکانی بواری پەروەردە کرا.

شتێکی دیکە کە بە گرنگی دەزانم ئاماژەی بۆ بکەم، کردنەوەی چەند خوێندنگایەک بوو لە کەرکوک و خانەقین، لە١٣ی ئایاری ٢٠٠٣ کە خوێندن تێیاندا بە زمانی کوردی بوو. لەڕاستیدا ئەمە کە ڕاستەوخۆ پاش پرۆسەی ئازادکردنی عیراق بوو، بۆ من جێی بایەخ و گرنگییەکی زۆربوو تا نەوەی داهاتوو، لە خوێندن بە زمانی کوردی بێبەش نەبن، تەنانەت کتێب و پێداویستیی خوێندن و تەختەی دانیشتن و نووسینیشمان بۆ دابینکردن.

### پەروەردەی هەرزەکاری

یەکێ لەو پرۆژانەی کە جێی شانازیمە، وتنەوەی وانەی پەروەردەی هەرزەکارییە، هەرچەند لە زۆر لاوە کەوتمە بەر ڕەخنە و لۆمە و سکاڵالێکردن و نووسینی وتار. لە ڕۆژنامەیەکدا نووسرابوو "ژنە شێخێک، لەو جۆرە بابەتانە ئەهێنێتە ناو گەنجانەوە». تەنانەت چووبوونە لای بەڕێز مام جەلال، وتبوویان "وانەیەکی هێناوەتە پەروەردە کە بۆ کۆمەڵگای ئێمە ناگونجێ". کە چووم بۆ لای مام و وانەکەم پیشاندا، وتی «بڕۆ ناوی خوای لێبێنە و بەردەوامبە، مامی خۆت پشتیوانتە".

بۆ ئەو مەبەستە، بە شێوازێکی زانستی و بە سوودوەرگرتن لە سەرچاوەکانی وتنەوەی هەمان وانە لە وڵاتە پێشکەوتووەکاندا، دەستمان بە کار کرد. سەرچاوەیەکمان دەستکەوت لەڕێگای ڕێکخراوی (DC)ی هۆڵەندییەوە و لەسەر ئەرکی هەمان ڕێکخراو، لە ساڵی (٢٠٠٢)دا ڕێبەرێکمان بۆ مامۆستا و ڕاهێنەر و ڕاوێژکارەکان و ئەو کارمەندە گەنجانەی کە سەرقاڵی فێرکردن و ڕاهێنان بوون. لە زمانی ئینگلیزییەوە بۆ کوردی وەرگێڕا. ئامانجەکانی ئەو پرۆژەیە بۆ یارمەتیدانی گەنجان بوو بۆ وەرگرتنی ئەو زانیاری و کارامەیی و بەهایانەی کە ئامادەیان دەکات بۆ بەرپرسیارێتییەکانی ژیانی خێزانی و شووکردن و ژنهێنان و دایکایەتی و باوکایەتی و بەشداریکردنێکی کاریگەرانە

له ژیانی کۆمەڵگادا. ئەمەش بەشداریکردنیان لە ژیانێکی دروست و ئاسوودە، هەروەها بەشداریکردن لە پێشخستنی (تاک) بۆ سەرخستنی خۆشی و رەفتاری بەرپرسانە و یارمەتیی گەنجان بۆ تێگەیشتن لە هەست و بڕواکانیان بۆ ئەوەی زاڵبن بەسەر ئەو گۆڕانکارییە جەستەیی و سۆزداری و کۆمەڵایەتییانەی کە بەشێکن لە گەورەبوون و بۆ ئەوەی کە ئاشنای ئەو شتانە ببن کە گرنگن بۆیان. هەروەها بۆ ئەوەی بتوانن بە شێوازێک رەفتاربکەن کە بەرپرسیاریتی و بایەخدان بە بەرانبەر و کۆمەڵی تێدا رەچاوکرابێت. هەروەها یارمەتیی گەنجەکانی ئەدا بۆ ئەوەی بەشێوەیەکی کاریگەر لەگەڵ خەڵکی تردا پەیوەندیی بکەن و بڕیاری ژیرانە دەربارەی ئەو بابەتانە بدەن کە پەیوەندییان بە ژیانی خێزانی و کۆمەڵەوە هەیە. ئەو پرۆژەیە گرنگ بوو بۆ بەدەستهێنانی تەواوی ئامانجەکانی پەروەردەی خێزانی کە بریتییە لە پێگەیاندنی گەنجێکی بەتوانا و بەرپرس.

ئەو بابەتە گرنگانەی کە خرابوونە بەرنامەکەوە: لایەنی جەستەیی گەنجان، لایەنی کۆمەڵایەتی، رۆڵە تۆخمییەکان، ئەو نەخۆشیانەی کە بەهۆی تۆخمەوە دەگوێزرێنەوە، گۆڕانە سۆزدارییەکان کە لە کچ و کوڕدا روودەدەن لەو تەمەنەدا و باڵقبوون و گۆڕانکارییە جەستەییەکان، هەروەها لەسەر رەفتاری شێواو.

ئیتر دوای وەرگێرانی کتێبەکە لەڕێگای یونسکۆوە، دەستمانکرد بە کردنەوەی خولی راهێنان، بەتایبەتی بۆ مامۆستاکانی تایبەت بە وتنەوەی وانەی بایۆلۆجی و وانەی چالاکییەکان و ئەوانەی کە ئارەزوومەندبوون بۆ وتنەوەی وانەکان.

### کۆنگرەی پەروەردەیی

کۆنگرەی پەروەردەیی، لە ٢٣ی تشرینی یەکەمی ٢٠٠١ لە هۆڵی سەنتەری چالاکیی گەنجان لە سلێمانی دەستیپێکرد. چەند لیژنەیەک بۆ کۆنگرە دانرا، وەک لیژنەی (راگەیاندن، رێکخستنی هۆڵ، وەرگێران و چاپ، دۆکیۆمێنتکردن، دارایی و لیژنەی لێکۆڵینەوەکان و... هتد). بۆ ئەو مەبەستە، بەگشتیی (١٢) لیژنەمان پێکهێنا بۆ چەندین بابەتی گرنگی پەروەردەیی.

وەک سەرۆکی کۆنگرە وتارێکم پێشکەشکرد، کە بەپێویستمزانی لێرەدا دەقەکەی بڵاوبکەمەوە:

بەڕێز نوێنەری بەڕێز مام جەلال، سەرۆکی هەرێمی کوردستان
بەڕێز سەروکی حکومەتی هەرێمی کوردستان بە وەکالەت
بەڕێزان ئەندامانی مەکتەبی سیاسی و سەرکردایەتیی یەکێتیی نیشتیمانیی کوردستان
بەڕێزان نوێنەرانی حیزب و لایەنە تێکۆشەرەکانی کوردستان
بەڕێزان ئەندامانی ڕێکخراوەکان و میوانە بەڕێزەکان
بەڕێزان ئامادەبووانی خۆشەویست
زۆر بەخێربێن...

ئامانجی سەرەکیی ئەم کۆنگرەیە، سازدانی هەلومەرجی تێرامان و دانوستانە کە دەبێتە هۆی دامەزراندنی ئاسۆیەکی نوێی پەروەردە لە ئایندەدا. نیازمان وایە کە هەموومان بەیەکەوە لە بایەخ و مەرامە چاوەڕانکراوەکانی، بەشداریی یەکتر بکەین، لەگەڵ دەستنیشانکردنی ئەرک و پەیامەکانی وەزارەتی پەروەردە. کەواتە لێرەوە با بە هەمووومان ستراتیژییەتێک پەسەندبکەین کە ببێتە پاڵپشت بۆ وەدیهێنانی ئامانجەکانمان. بە واتایەکی تر، هەموو ئەو بەڕێزانەی کە لێرە ئامادەن و ئەوانەش کە لە دەرەوەن، توانای ئەوەیان هەیە کە دواڕۆژی ئێمە لەڕێگای پەروەردەوە بنەخشێنن، با هەمووومان سەرگەرم و خولیای ئەو ئەرک و پەیامانە بین. هەر لەهەمان ڕوانگەوە، دەتوانین دوو جەمسەر بۆ گەشەسەندنێکی هەمیشەیی لەبواری پەروەردەدا فەراهەم بکەین:

یەکەم: خۆسازدان بۆ ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ هەموو ئەو گرفت و کێشانەی کە کتوپڕ دێنە بەردەممان.

دووەم: پشتگیریکردنی هەر پێشکەوتنێکی ئابووری و کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیری و کارگێڕیی، بەشێوەیەک هەموو هەوڵ و توانای هاوڵاتیانی کوردستان یەکبخات کە لەگەڵ بەها و سیاسەت و پەیامە نەتەوەیی و نێونەتەوەییەکاندا یەکبگێتەوە. هەروەها ئەرکی ئێمەیە کە پەیوەندییەکی توندوتۆڵ لەنێوان کۆمەڵگا و خوێندنگاکاندا دابمەزرێنین کە دەکرێت لەوێوە هاوکاریکردنی هەموو لایەنە پەیوەندیدارەکان لە جیهانی پەروەردە، دەستەبەر بکرێت. بە تەنیا لەم ڕێگەیەوە دەتوانین ئەو ئامانجانەی خوارەوە بەدیبێنین کە خواستی سەرەکیی کۆنگرەکەمانە:

- دواڕۆژی ئێمە، بەندە بە پەروەردەکردنی هەر منداڵێک.
- هەر منداڵێک وەک هاولاتییەک رەفتار بکات .
- دەبێت هەر هاولاتییەک، بو گەشەسەندنی لایەنی ئابووری و رۆشنبیری و کۆمەلایەتیی، پشک و بەشداریی خۆی هەبێ.

ئەرک و پەیامەکانی پەروەردە لەسەر ئاستی ئەم ناوچەیە، ئەوەیە کە دلنیابین لەوەی هەر هاولاتییەکی کورد هەل و بواری یەکسانی بۆ بڕەخسێ تاوەکو زانیاری و بەهرە و تواناکان و هەلسوکەوت و هەلویستەکان پەرەپێبدات، کە ئەوەشیان پێویستە بۆ بەشدارییەکی کارا و چالاک بە ئامانجی هەرچی زیاتری گەشەسەندنی ناوچەکە، سەرباری پێشکەوتن لەسەر ئاستی تاکەکەسدا.

ستراتیژی ئێمە لەم قوناغەدا جەختکردنە لەسەر وەدیهێنانی هەندێ داوا کە لێرە و لەوێ بەردەوام دووبارەی دەکەنەوە و دەکرێ هەندێکجار سادە دەربکەوێت، بەلام تابلێی گرنگە، ئەویش:

- تۆمارکردنی هەموو ئەو منداڵانەی کە سەروەختی خوێندنیان هاتووە تاوەکو هەموویان لەم بوارەدا هەلیان بۆ بڕەخسێ و بەهرەمەندبن.
- دلنیابوون لە چۆنیتیی هێنانەکایەی ژینگەیەکی تەندروستی فێرکردن و فێربوون تاوەکو پرۆسەی پەروەردە بەئامانجی خۆی بگات، جگە لە چاودێریکردنی بەردەوامی ئەو هەل و بوارانەی کە بۆ هەمووان بە یەکسانی دەڕەخسێنرێ.
- بایەخدان بە گەشەسەندنێکی دەزگایی هەموو قوتابخانەکان و بەڕێوەبەرێتییەکانی پەروەردە و وەزارەت ، ئەوەش لەڕێگای بەشدارییەکی توندوتۆل لەگەل هەموو کەسایەتی و دەزگا و دامەزراوە کۆمەلایەتییەکان (مزگەوتەکان، کلێساکان. ڕیکخراوە ناحکومییەکان، دایکان و باوکان، کارگوزاران، مەلبەندەکانی کار و پرۆژەکان و هەر هەموو بەشداران و خەمخۆران).

دیارە بۆ دەستەبەرکردنی ئەم ستراتیژە، پشت بە خۆمان و بەو هاوڕێیانە دەبەستین کە لە سەرخستنی ئەم پرۆژەیەدا هاوکارن. دەکرێ ئێمە پشت بە هەریەک لە ئێوە ببەستین بۆ ئایندەی منداڵەکانمان کە ئایندەی ئێمەیە و وا لە چنگی مامۆستاکاندایە.

دەبێ لە هەوڵی ئەوەدابین، هەمووان بە یەکسانی دەستیان بگات بە زانیاریی، کە مافی هەر بچووک و گەورەیەکە.

لەوەدا نابێ هیچ کەسێک لەسەر ئاستی رەگەز و ئایین و بیر و بڕوا لەیەکدی جیابکریتەوە، دەبێ هەر یەکێک لە ئێمە، زەمینەی بۆ بڕەخسێ کە بە ئازادیی دەستیبگاتە سەرچاوەکانی زانیاری.

لەوەشدا دەبێ بیر لە چۆنێتیی خوێندن بکەینەوە، لەم سەردەمەدا کە سەردەمێکی تازە و جەنجاڵە، ناکرێ بە هەمان چەک و کەرەستە کۆنەکانی خوێندن و پەروەردە پێ بخەینە ناو سەدەی بیست و یەکەوە.

بۆ هەر کردەیەکی ستراتیژیی، ئەمانەی خوارەوە لەبەرچاو دەگرین:

- پوختەکردنی لایەنی کارگێڕیی قوتابخانەکان.
- چاککردنی هەموو ئامراز و کەرەستە و پێویستییەکانی خوێندن و کەڵکوەرگرتن لەکاتی ئەو خوێندنە.
- بەرزکردنەوەی ئاستی زانیاریی و بەهرە و تواناکانی مامۆستاکان.
- بەرزکردنەوەی ئاستی زانیاریی قوتابیان.
- تێکەڵکردنی بەکەکانی ناو پرۆگرامی خوێندن لەگەڵ ئەو کردە و کارانەی کە لە ژیانی رۆژانەدا دەیکەین، جگە لە بایەخدانێکی زیاتر بە خوێندنی پیشەیی و تەکنیکی.

بۆ دامەزراندنی ژینگەیەکی وا تەندروست، وا چاکە دایکان و باوکان و هەموو چین و توێژەکانی کۆمەڵگا، خەمخۆرمان بن.

ئێمە ناچارین روو لە مامۆستاکان بکەینەوە تاوەکو ئەم پرۆسەیە سەربکەوێ کە دیارە ئەوانیش هەندێ ئەرکی قورسیان لەسەر شانە؛

چاندنی زانیاریی دروست لە مێشکی خوێندکاراندا، لەرێگای بابەت و وانەکانەوە، لێرەشدا فەلسەفەی تازەی پەروەردە، وا کاردەکات کە قوتابیی جوغز و سەنتەری هەموو کارەکانمان بێ، چونکە دواجار دەمانەوێ هاوڵاتییەکی شارستانی و هۆشمەند لەنێو کۆمەڵگەی کوردی دروستبکەین کە خەونی دامەزراندنی سیستمێکی دیموکراسییە.

بۆ ئەوەش، مەرجە کە رێز لە:

شکۆمەندیی هەر تاکێکی کورد بگرین و وابکەین بڕوای بەخۆی هەبێ،

بتوانێ لە هەنوکە و لە ئایندەدا پشت بەخۆی ببەستێ.

دەبێ بۆ هەمیشە بایەخ بە بەها ئەخلاقی و کۆمەڵایەتی و رۆحییەکانی خۆمان بدەین، بەرانبەر بە جیاوازییە ئاینی و رەگەزی و کولتوورییەکان بەخشندە و میهرەبان بین. بە واتا، ئێمە بە جیاوازییەکانمانەوە جوانین، ناکرێ ئێتنیکیی ببێتە مایەی ململانێ و دوژمنداری.

بۆ وەدیهێنانی ئەم ئامانجانەش، بەرژەوەندی و قازانجی هەموو کۆمەڵگا لەبەرچاودەگرین، کەواتە لە (کوێ) لە (کێ)وە دەستپێبکەین؟

کێ پێویستی بە فێربوون هەیە؟

وەڵامەکەمان ئاسانە.

هەر هەموومان، بەوانەشەوە کە لە وەزارەتدا کارمەندن، لە پێش هەمووتانەوە من.

من بڕوام وایە کە ئەو توانایەمان هەبێت.

دەکرێ پشت بەتواناکانی خۆمان ببەستین.

لەکۆتاییدا حەزدەکەم ئاماژە بە پرنسیپەکانی فێربوون بدەم کە لەم رێنماییانەدا بەرجەستە دەبن:

١. فێربوون، بەشێوەیەکی زۆر بنەڕەتی، کردەیەکی کۆمەڵایەتییە.

٢.فێربوون، یەکدیگیرە لەگەڵ ژیانی کۆمەڵانی خەڵکدا.

٣.فێربوون، کردەیەکی هاوبەشییە.

٤.فێربوون و زانین، لەسەر کارکردنێکی پراکتیکیی وەستاوە.

٥.سەرگەرمیی کارکردن، لە بەخشینی هێز و دەسەڵات جیانابێتەوە.

٦.نوشوستی و دواکەوتن لە فێربوون، دەرەنجامی وەلانان و دوورکەوتنەوەیە لە بەشداری.

٧.هەموو کەسێک بە سروشتی خۆی، هەتاهەتایە فێرخوازە.

دواوتەشم، دووبارەکردنەوەی ئەو رازەیە کە دەبێ هەر هەموومان سەرگەرم و خولیای ئەو ئەرک و پەیامانە بین.

سوپاس و پێزانینم بۆ هەموو لایەک، ناکرێ رۆڵی چالاکانەی رێکخراوی یونسکۆ و یونسیف فەرامۆش بکەین.

دیسانەوە بەخێربێن بۆ کۆنفرانسی پەروەردەیی لە سلێمانی.

دواتر، وتاری هەریەک لە هەڤاڵ نەوشیروان مستەفا و بەڕێز عەدنان موفتی، سەرۆکی حکومەتی هەرێم بەوەکالەت و مامۆستا جەمال عەبدول، یاریدەردەری سکرتێری گشتیی بۆ کاروباری پەروەردە و خوێندنی باڵا و فوئاد قەرەداغی، سەرۆکی یەکێتیی مامۆستایانی کوردستان، پێشکەشکران.

بەشداربووان، لە هەموو جومگەکانی حکومەت و کۆمەڵگەی مەدەنیو ڕێکخراوە جەماوەرییەکانی یەکێتیی نیشتمانیی بوون، وەک خوێندکاران و لاوان و ژنان و... هتد.

لەکۆتایی کۆنگرەکە، دوای دوو ڕۆژ کارکردن لە لیژنەکان و خوێندنەوەی ڕاپۆرتەکانیان و گوێگرتن لە ڕاوبۆچوونەکان و کار و چالاکییەکانی وەزارەتی پەروەردە، ڕاپۆرتی کۆتایی کۆنگرە خوێنرایەوە و بە ڕێنمایی کارکردنی وەزارەت و لەسەر ڕاپۆرتی کۆتایی، پلانمان داڕشت بۆ کارکردن.

ئەوکات زیادکردنی دەرماڵەی پیشەیی و دەرماڵەی گواستنەوە و ناوچەیی، هەروەها کردنەوەی خولی بەردەوام بۆ مامۆستاکان لەلایەن هەردوو ڕێکخراوی یونسێف و یونسکۆ و ڕێکخراوە نێودەوڵەتییەکانەوە، بوون بەهۆی بەرزبوونەوەی ئاستی بژێویی مامۆستا و کارکردنی مامۆستا لە دەرەوەی شار، ئاسانتر بوو. لەهەمان کاتدا توانیمان هەندێ هۆی هاتووچۆ بۆ ئەوانەی لە دەرەوەی شار مامۆستان دابینبکەین. ئەمانە زیاتر بوون بە هاندەر کە بمێننەوە و هەوڵی زۆری گەڕانەوە بۆ ناوشار نەدەن، لەگەڵ ئەوانەشدا بە پێوەر مامۆستا دەگوێزرایەوە بۆ ناوشار و واستەمان نەهێشت.

لەو ماوەیەی لەو کارەدا بووم، تەنیا یەک مامۆستای ژن نەبێ کە بەبێ پێوەر گەڕایەوە شار، ئەویش بەهۆی ئەوەی تووشی نەخۆشیی شێرپەنجە بووبوو، وەکو تر ناوەکانمان هەڵدەواسی و هەموو کەس بۆی هەبوو ڕەخنە بگرێت.

ئەم پابەندبوونە بە جێبەجێکردنی یاسا، ئاسان نەبوو، بەڵام بەڕێز مام جەلال پشتیوانم بوو، جەنابی وتی "هەرکەسێ واستەی کرد، نامەکەیم بۆ بێنە". هەروەها د.بەرهەمیش پشتیوانم بوو، بۆ یەک جاریش داواکارییەکی نایاسایان لێنەکردم.

ئەو سەردەمە، ژمارەیەکی زۆر زیاتر لە کارمەندی خوێندنگاکان لە (نووسەر و پاسەوان و پاککەرەوە) دامەزرابوون، زیاتربوون لە پێویست، خوێندنگای وای تیابوو (٤٠) نووسەری هەبوو، هەندێکیشیان بەهۆی شەڕی ناوخۆوە لە شوێنەکانی خۆیان نەمابوون و هاتبوونە سلێمانی، لە دەرەوەی شار خوێندنگای وامان هەبوو، ژمارەی پاککەرەوە و پاسەوانی لە خوێندکارەکان زیاتربوو. لەهەمان کاتیشدا باخچەکان بێ مامۆستا بوون، بۆیە بڕیارماندا ئەو نووسەرانە، دوای بینینی خولێک، بگوێزینەوە بۆ باخچەکان. سەرەتا بوو بە هەڵا و دژی وەستانەوە، بەهۆی ئەوەی ئەو نووسەرانە بەشێکیان هەر دەوامیان نەدەکرد، یان بە خشتە دەوامیان کەم کردبوونەوە و ڕێکیانخستبوو، هەبوو یەک ڕۆژی بەردەکەوت لەهەفتەیەکدا، بەڵام دوای بڕیارەکەی وەزارەت و پشتیوانیی سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران، بڕیار درا هەر کەسێ ئەو بڕیارە جێبەجێ نەکات ئەوا لە کار دووردەخرێتەوە، بۆ ئەو مەبەستەش لیژنەی تایبەت ئەو کارەیدەکرد.

وەک پێویست گرنگیی بە باخچەکان نەدرابوو لەڕووی بینا و مامۆستا و ژینگەی بیناکانەوە. ئەمەمان کردە یەکێک لە خەمەکان و داوامانکرد یاسا و ڕێنماییەکان ئاسان بکرێن بۆ کردنەوەی باخچەی ساوایانی ئەهلی، ئەو بڕیارە ژمارەی باخچەی ساوایانی ئەهلیی زیاتر کرد. هەروەها داوامانکرد بۆ کارئاسانیی کاری ژن، هەوڵبدرێ لە هەموو دەزگاکانی حکومەتدا، شوێنێک وەک باخچە دابینبکرێ بۆ ئەوەی کارمەندە ژنەکان بتوانن ئاسانتر و ئارامتر لە شوێنەکانی خۆیاندا کاربکەن، بۆ ئەوەش زۆر لایەن بەدەنگمانەوە هاتن و کەلوپەلیشمان لەڕێگای یونسێفەوە بۆ دابینکردن، هەروەها حکومەتیش تاڕادەیەک هاوکاربوو. بە هەموو زۆنی سەوز، تەنیا (٢٨) باخچە هەبوو. بەهۆی ئەو بڕیارە، ژمارەکە بوو بە چەند بەرانبەر. هەروەها هانی دەرچووانی زانکۆمان دا کە ئەوانیش بێنە ناو باخچەکان، بۆ ئەوەی کەسانی بەئەزموونی پەروەردەیی رووبکەنە ئەو شوێنە گرنگە، کە تێیدا بەشێکی کەسایەتیی منداڵ دروستدەبێت و ئەو قۆناغە قۆناغی پێگەیاندن و بنیاتنانی بنچینە بەهێزەکانی مرۆڤە و سنوور بۆ هەموو ئاکار و ڕەوشتەکانی دادەڕێژێت، هەروەها فێربوون لەم قۆناغەدا زۆر گرنگە.

پێداچوونەوەیەکی تەواومان کرد، بۆ پرۆگرامەکانی باخچە و سوودمان لە ئەزموونی وڵاتانی پێشکەوتوو وەرگرت. بۆ ئەو گۆڕانکارییانە، ستافی وەزارەت وەک هەنگ کاریاندەکرد. ئەو هەموو ئەرکە، بەدڵفراوانییەوە و بێ وەستان ئەنجام دەدران و ساڵانە چالاکیی و پێشبڕکێ بۆ چالاکییەکانیان ئەنجام دەدرا.

ئەو ڕێکخراوانەی کە پەیوەندییان لەگەڵ وەزارەتی پەروەردە هەبوو (یونیسێف، یونسکۆ، هابیتات) بوون و هەندێک ڕێکخراوی تریش لابەلا هاوکارییان دەکردین، کە بەشێک لە کارەکانیان پەیوەندیداربوون بە پەروەردە. ڕێکخراوی (یونۆکی)، لەسەروو ی هەموویانەوە بوو لە هاوکاری و بەدواداچوون، ڕاپەڕاندنی ئیشەکان لەنێوانیاندا بەم جۆرە دەبوو:

## ڕێکخراوی هابیتات (UN- HABITAT)

بارەگای سەرەکیی لە نایرۆبی بوو، کاری دروستکردن و چاککردنەوەی بینا و دامودەزگا پەروەردەییەکان بوو، وەک: (قوتابخانەی چوار پۆلی و شەش پۆلی و ١٢ پۆلی، خانووی مامۆستایان، باخچەی ساوایان، بەشی ناوخۆیی، هۆڵی خوێندنگا، سەنتەری دابەشکردن، بینای سەرپەرشتیاران، گەنجینە، سەنتەری تاقیکردنەوە، هۆڵی داخراوی وەرزش و...هتد). لە قۆناغی پێنجەوە، لە پاڵ کاری دروستکردن، کاری نۆژەنکردنەوەشی دەستپێکرد و لە قۆناغی شەشەوە، کەلوپەلی کارگێڕیشی خستە بەرنامەکانییەوە. ئەتوانم بڵێم زۆربەی بەرنامەکانی ئەنجام ئەدا هەرچەندە سەرەتا کارکردن ئاسان نەبوو، بەهۆی بیرۆکراتیەتی ڕێکخراوەکەوە. دەبوایە هەر پرۆژەیەک لەلایەن وەزارەتەوە پێشنیازبکرایە، بچوایەتە بەغدا و لە بەغدا ڕەزامەندیی لەسەر بدرایە و پاشان بچوایەتە نایرۆبی و لەویش ڕەزامەندیی لەسەر بدرایە. ئەوەش کاتی زۆر دەبرد و دەبووە هۆی ئەوەی زۆربەی پرۆژەکان لەکاتی خوێندندا دەستبەکاربوونایە و کاریگەریی دەخستە سەر پرۆسەی خوێندن، بەڵام پاش گفتوگۆیەکی زۆر، بڕیاردرا ڕاستەوخۆ لەگەڵ نایرۆبی مامەڵەبکرێ بەبێ گەڕانەوە بۆ بەغدا، ئەمەش پێویستی بە گفتوگۆی زۆربوو، د.بەرهەم ڕۆڵی سەرەکیی بینی بۆ کارئاسانی و لە زۆربەی دانیشتنەکاندا من و ڕەزاق فەیلی لەگەڵی دەبووین.

## ڕێکخراوی یونسکۆ

تایبەت بوو بە قوناغی خوێندنی (ناوەندی، ئامادەیی، ئامادەیی پیشەیی، پەیمانگاکان) و ئەرکی دابینکردنی زۆربەی پێداویستییەکانی خوێندن بوو، وەک: (بابەتەکانی پەڕاوگە. کەلوپەلی کارگێڕی، کورسی پۆل، تەختەڕەش، کەلوپەلی

چاپ و تاقیگەکان، کتێب، ئامێری کۆمپیوتەر و فۆتۆکۆپی و چاپ، ئۆتۆمبێل، مۆلیدەی کارەبا، فێنککەرەوەکان، کەلوپەلە وەرزشییەکان، کەلوپەلی هونەری و مۆزیک، کەلوپەلی خوێندنە پیشەییەکان). سەرەتا هەندێ خوێندنگاشی چاککردەوە، بەلام لەدواییدا تەنیا (هابیتات) ئەو کارەیدەکرد. لە کردنەوەی خولی راهێنان و کۆنگرە و کۆنفرانسەکانی پەروەردەیی هاوکارمان بوون، هەروەها لە دامەزراندنی تەلەفزیۆنی پەروەردەیی هاوکار بوون. هەر لەو سەردەمە بڕیاری خوێندنی کۆمپیوتەرمان دا لە خوێندنگا ناوەندییەکاندا، بۆ ئەو مەبەستە، ئامێرەکانیان هێنا بۆ وەزارەت و خولی راهێنانیان کردەوە و توانیمان ئەو بەشە لە زۆربەی خوێندنگاکاندا بکەینەوە، بەتایبەتی لە خوێندنگا نموونەییەکان وەک دەستپێک.

هەروەها پرۆژەی (نێت وۆرک)مان تەبەنی کرد و هەندێ بەڕێوەبەرمان ئامادەکرد لەگەل ستافی خوێندنگا، خۆشم لەگەڵیاندا هەندێ خولم بینی بۆ چۆنێتیی بەکارهێنانی ئەو سیستەمە، بۆ ئەو مەبەستەش چەند خوێندنگایەکمان وەک تاقیکردنەوە دەستنیشانکرد، بەلام بەداخەوە ئەو بەرنامەیە لەدوای وازهێنانی یونسکۆ و رووخانی رژێمی سەدام، پەکخرا و تەواونەکرا.

پاش بەسەرکردنەوەی ئەرشیفی وەزارەت کە بەشێکی هی سالانی بیست و سییەکان بوون، خەریکبوو دادەڕزان و مێرووی کتێب لە هەندێ لە پەڕەکانیانی دابوو، ئیتر داوای هاوکاریم لە یونسکۆ کرد و هاتن بەدەنگمانەوە، سەردانی بەشەکەیان کرد و بەرنامەیەکیان بۆ دارشتن کە هەموو ئەو دۆکیۆمێنتانە بخەینە سەر کۆمپیوتەر و (CD) و بیانپارێزین لە فەوتان. کۆمپیوتەریان هێنایە وەزارەت و کەوتنە کردنەوەی خول بۆ ستافی تایبەت لە وەزارەت بە هاوکاریی ستافی ئوردنی کە یونسکۆ هێنابوونی، بەشێک لەو دۆکیۆمێنتانە خرانە سەر (CD). بەداخەوە ئەو پرۆژەیەش دوای من وازیلێهێنرا.

یەکێک لە گرفتەکانمان ئەوەبوو کە ئەو کەلوپەلانەی کە یونسکۆ دەیهێنان، هەر زوو خراپ دەبوون یان پارچەی یەدەگیان نەبوو کاتێک لەکاردەکەوتن، هەر بۆیە کە بەرپرسی یونسکۆ هات بۆ عیراق و سەردانی سلێمانی کرد، لە ئەنجومەنی وەزیران، بە سەرپەرشتیی د.بەرهەم کۆبوونەوەیەک ئەنجام درا و ئەم گرفتەم خستەروو، پێموت "جاری داهاتوو کە هاتیت، ناهێڵین بێیتە ناو

شاری سلێمانی و خۆپیشاندان دەکەین و هەموو ئامێرە خراپەکان دەهێنینە سەر ڕێگاکەت". ئەمەم لە پریس کۆنفرانسێکیشدا خستەڕوو، کە بووە مانشێتی ڕۆژنامەکان و نووسیبوویان "خۆپیشاندانی ئامێرەکان".

گرفتەکە لەوەوە سەرچاوەی گرتبوو، لەکاتی هەڵبژاردن و تەندەر و کڕینی ئامێرەکاندا، کارمەندانی کوردستان ئامادەنەبوون، ئەوان بەخواستی خۆیان کارەکانیان ئەنجام دەدا. پێویستە ئەوەش بڵێم کە یونسکۆ، لە بەرنامەی خوێندنی نەوجەوانان و نەهێشتنی نەخوێندەواریشدا هاوکارمان بوون. لە بەشێکی تردا، هەوڵدەدەم تایبەت بەو دوو پرۆسەیە زیاتر بدوێم.

### ڕێکخراوی یونیسێف

ئاشکرایە سروشتی ئەو ڕێکخراوە تایبەتە بە منداڵ، لە قۆناغی باخچەی ساوایان و سەرەتایی و نەوجەوانان. ئەو ڕێکخراوە، ئەرکی دابینکردنی زۆربەی پێداویستییەکانی باخچە و قوتابخانە سەرەتاییەکانی لەئەستۆدەگرت، وەک: (بابەتەکانی پەڕاوگە، مێز، کورسی، دۆلاب، کومبار، سۆپا، کورسی قوتابیان (رەحلە)، تەختەرەش و... هتد). هەروەها دابینکردنی ئامێرەکانی، وەک: (کۆمپیوتەر، ڕۆنیۆ، چاپ، چاپخانەی گەورە، مۆلیدەی کارەبا، ئۆتۆمبێل و پاس). ئەمە جگە لە نۆژەنکردنەوەی بینای باخچەی ساوایان و قوتابخانە سەرەتاییەکان و دامودەزگاکانی پەروەردەیی. هەروەها هاوکارێکی گەورەبوون لە کردنەوەی خولەکانی مامۆستایان و ڕاهێنانیان و دابینکردنی بودجەی خولەکان و پارەی هاوکاریی مامۆستاکان، تەنانەت بۆ ناوچە دوورە دەستەکانیش ئەو بەرنامەیە سەریگرت لەژێر ناوی (خوێندنی دوور) و زۆرجار پێیاندەوتم "تۆ عیراقیشت لێ ورووژاندوین بەو بەرنامەیەت". هەروەها لە ڕوپێوویی مەیدانی و ڕاپۆرتەکانیان، لە بەرنامەی نەهێشتنی نەخوێندەواریی بە چاپ و بابەتەکانی پەڕاوگە و کردنەوەی خولەکان و ڕاهێنان لەژێر ناوی (خوێندن بۆ هەمووانە)، هاوکارمان بوون. بە دەیان خولی جۆراوجۆر بۆ مامۆستایان و کارمەندانی وەزارەت ئەنجامدرا، وەک: (خولی کارگێڕی و چاپکردنی پێداویستییەکانی تاقیکردنەوە و سەرژمێریی و کتێبی مافەکانی منداڵ).

بۆ بەرنامەی مافەکانی منداڵ، جگە لە چاپکردنی بابەتەکانیان، خولی

تایبەتمان بۆ مامۆستایان کردەوە، بۆ چۆنێتیی وتنەوەی وانەکە. لەو سەردەمەدا بە گفتوگۆی زۆر و کۆبوونەوە و کۆنفرانسی تایبەت، لێدانی منداڵمان قەدەغەکردبوو، بۆ ئەوەش لە زۆر لاوە دژایەتیمان کرا. چەند جارێک خۆم بابەتی تایبەتیم لەسەر ئەو بڕیارە دەوتەوە و چەند چیرۆکێکی منداڵانم بڵاوکردەوە، بەڵام هەر نەمانتوانی لێدان بنەبڕبکەین، تەنانەت بە سزای مامۆستا توندوتیژەکانیشەوە. (سکاڵاکان راستەوخۆ دەهاتنە لای من).

جارێکیان دایکێک و منداڵەکەی بەیەکەوە هاتن بۆ لام، دەموچاوی منداڵەکە چوار پەنجەی لێدانی مامۆستاکەی پێوەبوو، لێمپرسی؛ مامۆستا بۆ وایلێکردویت؟ وتی "چونکە بەندەکانی مافی منداڵم ئەزبەر نەکردبوو". لەسەر ئەو بابەتە، پێش لۆمەکردنی مامۆستاکە لۆمەی خۆمانمان کرد، بە کاک ئاواتی حەمەرەشم وت "ئەوە خەتاکەی بەرەورووی ئێمە دەبێتەوە، باش لەو مامۆستایانەمان نەگەیاندووە بۆ و چۆن ئەو وانەیە دەڵێنەوە، دیارە خولەکان لەو ئاستەدا نەبوون».

جگە لەو سێ ڕێکخراوە، ڕێکخراوی (WFP)یش هاوکارمان بوون بۆ دابینکردنی خۆراک بۆ هەندێ خوێندنگای گەڕەکە هەژارەکان. هەروەها دەیان ڕێکخراوی (NGO) و خێرخوازیی و مرۆڤدۆست هاوکارمان بوون، لەوانە: (SCF، KLA،KRN ، شێلتەر، فرانس لیبەرتی، کەنیسەی دانیمارکی - ئیکۆ، ئیکۆلیبەرتی، شنەبای یابانی، DCهۆڵەندی، ئۆفدا، TDC ،NPA ،KRO ،RS، CMC، سۆلیداریتی، ئۆکسفام، قەندیلی سویدی، منداڵپارێزی کوردستان، فریاکەوتنی ئیسلامی، ریچ و...هتد).

ئەو کارانەی ئەو ڕێکخراوانە دەیانکرد: (دابینکردنی هەندێ کەلوپەلی خوێندن، ڕێنمایی تەندروستی و کوتان و پشکنینی چاو و دروستکردنی چاویلکە، هێنانی جلوبەرگ بۆ منداڵی هەژار و خواردن بۆ هەندێ خوێندنگای ناوچە هەژارنشینەکان، خولی جۆراوجۆر، ڕێنمایی لەسەر مین، بەتایبەتی لەو ناوچانەی مینی زۆریان لێبوو لە ناوچەکانی دەرەوەی شار، وێنەکێشان، موزیک، خولی هاوینە بۆ خوێندکاران و دەیان پرۆژەی بچووک)، بەشێکیان لەو کاتەوەی لە منداڵپارێزی کوردستان بووم ئەو کارانەمان دەکرد لەگەڵ بەشی پەروەردە.

لەو کێشانەی کە رووبەڕوومان دەبوونەوە، وەک باسمکرد لەبەر بیرۆکراتیەتی زۆر، زۆرجار پرۆژەکانمان دوادەخران و دوادەکەوتن، بۆ بچووکترین گۆڕانکاریی دەبوایە ئەو رێکخراوانەی سەر بە (UN)ن بگەڕێنەوە بۆ (هەولێر و بەغدا و نایرۆبی و پاریس و نیویۆرک) و ئەوان رەزامەندیی دەربڕن. هەریەک لەو رێکخراوانە بارەگای سەرەکییان لە وڵاتی جیا جیا بوون، ناتەبایی نێوان رێکخراوەکانی UN خۆیان، هۆکاربوو کە کارەکانیان بە باشی نەدەرۆیشت بەڕێوە و هەروەها زۆرکەم گوێیان ئەدا بە ژێرخانی ئابووری لەبەر بەرژەوەندیی خۆیان. بۆ نموونە؛ داوای چاپخانەی گەورەمان بۆ چاپکردنی کتێب بۆ قۆناغەکانی خوێندن لە هەرێم کرد، بەڵام پشتگوێخرا. چەند پرۆژەیەکی تایبەتمان وەک پرۆژەی (کاغەز و قەڵەم و تەباشیر) هەبوو، هەروەها کارگەی بازیان، تا کەوتەکار چەند ساڵێکی ویست لە قۆناغی یەکەمدا دوادەخرا تا جێبەجێ بوو، تاکە پرۆژە بوو لەو پرۆژە ستراتیژییانە کە جێبەجێ بکرێت.

هەندێکجاریش کێشەکە ناوخۆیی دەبوو، بۆ نموونە خوێندنگایەک بودجەی بۆ دەردەچوو کەچی زەوی بۆ دابین نەدەکرا، هەروەها کێشەیەک لەنێوان بەڵێندەرەکانی هابیتات کەوتەوە و بوو بەهۆی دواخستنی پرۆژەکان بۆ ماوەی دوو ساڵ. هەندێکجاریش پرۆژەکانیان ئەنجامدەدرا و پاش ماوەیەک دەمانبینی وەک پێویست ئەنجام نەدرابوون و لەپڕ دیوارێکی خوێندنگا درزی دەبرد، ئەویش بەهۆی ئەوەی (چاودێر و نەخشە و... هتد) هەمووی خۆیان بوون، ئێمە دەسەڵاتمان نەبوو.

بۆ مەبەستی چاودێریی، یەکەیەکی ئەندازیاریمان لە وەزارەت پێکهێنا ئەویش لەسەر پێشنیازی کۆنگرەی پەروەردەیی بوو، بەمەبەستی بەدواداچوون و چاودێریی ئەو پرۆژە ئەندازیارییانەی کە وەزارەت خەریکیان بوو یان بڕیاربوو بۆ دروستکردنیان، دواتر هەستمانکرد کارەکانیان بەشێوەیەکی باشتر ئەنجام ئەدا.

### دانانی توێژەری کۆمەڵایەتی

هەر لەو کاتەی کە وەزیری کاروباری کۆمەڵایەتی بووم، یەکەم هەنگاومان نا بۆ دانانی توێژەری کۆمەڵایەتی لە خوێندنگاکاندا بە هەماهەنگیی لەگەڵ وەزارەتی پەروەردە، بەتایبەتی لە گەڕەکە هەژارنشینەکان، لەو

شوێنانەی کە بەهۆی دەستکورتی و بژێویی ژیانەوە منداڵەکانیان لە خوێندن دوورکەوتبوونەوە و کاریاندەکرد بۆ پەیداکردنی بژێویی ژیان و هاوکاریی ماڵەوەیان. ئەو پرۆژەیە، لەمیانەی پرۆژەی منداڵی ئیشکەر وەک (شاگرد و دەستگێرەکان)ەوە سەرچاوەی گرتبوو. دوای ئەوەی بووم بە وەزیری پەروەردە، ئەو بیرۆکەیە زیاتر پەرەیسەند و بە هاوکاریی یونسیف و یونسکۆ، لەهاویندا هەندێ خولمان کردەوە کە ماوەی سێ مانگی خایاند. بەڕێوەبەرایەتییەکمان بەناوی بەڕێوەبەرایەتی پرۆگرامی توێژەری کۆمەلایەتی (DOPS) دامەزراند، بەڕێوەبەرەکەی ناوی خاتوو بەناز بوو، بە سەرپەرشتیی ئاوات حەمەڕەش بەرنامەکە بەڕێوەدەچوو. ئەو بەڕێوەبەرایەتییە سەرپەرشتیی توێژەرەکانی دەکرد و بەدواداچوونی بۆ بەرنامەکە دەکرد. بوو بەهۆی دامەزراندنی دەیان کەس لە دەرچووانی ئەو بوارە و هاوکاری مامۆستایان و بەڕێوەبەرایەتی خوێندنگاکان بۆ چارەسەری کێشەی خوێندکاران لە هەموو ڕوویەکەوە. بەداخەوە، ئەو بەرنامەیە دوای من ئەوەندەی پێنەچوو بایەخی پێنەدرا و پشتگوێخرا، ئەمە یەکێکە لە هەڵە بەردەوامەکانی بەڕێوەبردنی وەزارەتەکان.

یەکێکی تر لە بڕیارەکانی پەروەردەیی کە لەسەر پێشنیازی کۆنگرە بوو، ئەنجامی تاقیکردنەوەی قوتابیانی پۆلی یەک و دووی سەرەتایی بە نمرە نەبێت، تەنیا بەشێوەی زارەکیی دایک و باوکەکە ئاگاداربکرێنەوە لە ئەنجامی تاقیکردنەوەکە بە دەرچوون و دەرنەچوون.

هەروەها پێشنیازی کردنەوەی کۆلێجی مامۆستایان (پەروەردەی بنەڕەتی) لە زانکۆی سلێمانی یان هەر جێگایەک کە حکومەت بەباشی دەزانێ و بەپێی پێویستیی خوێندنگاکان لەڕووی جۆری وانە و پێداویستی کاربکرێت و بە پلاندانان لەگەڵ وەزارەتی پەروەردە ئەو بەرنامەیە ڕێکبخرێت. ئەم گفتوگۆیە لەگەڵ وەزارەتی خوێندنی باڵا چرکرایەوە و بەیەکەوە پلانمان دارشت بۆ جێبەجێکردنی و هەروەها پێشنیازی وەرگرتنی (١٠) یەکەمەکانی پەیمانگاکانی سەر بە پەروەردە لە زانکۆکان و لەو بەشانەی هاوشێوەن، هەروەها وەرگرتنی خوێندکارە سەرکەوتووەکان لە بەشی وەرزشی.

### باخچەکان

لە روانگەی بایەخدان بە ژینگە و پاکوخاوێنیی خوێندنگاکان و زیاترکردنی رووبەری سەوزایی لە شارەکان و خوێندنگاکاندا، بەشی باخچەکان لە وەزارەت، کاری زۆر گرنگی کرد. هاوکات لەگەڵ جێبەجێکردنی فەرمانی بەڕێز مام جەلال بۆ ناشتنی نەمام، نزیکەی (٢٠) هەزار نەمامی جۆراوجۆر دابەشکرا و بە هاوکاریی رێکخراوەکان و کارمەندانی خوێندنگاکان و باخچەکان، ئەو پرۆژەیە بەباشیی سەری گرت و پێشبڕکێی جوانترین باخچەمان هێنایە پێشەوە، کە سالآنە ئەنجامئەدرا و لە کەناڵی تەلەفزیۆنی پەروەردە پەخشدەکرا. بۆ ئەو کارە، لیژنەی تایبەت دامەزرا بۆ هەڵسەنگاندن، هەروەها کەلوپەلی پێویست بۆ باخچەکانی خوێندنگاکان دابینکرا.

هەروەها چەند پێشانگایەکی گوڵ کرایەوە، لەهەمانکاتدا بایەخ درا بە رووەکی ئینجانەکان و هانی خوێندکار ئەدرا بۆ چاودێریکردنیان. بۆ هەمان مەبەست، هەندێ مادەی خوێندن دەربارەی ژینگە و پارێزگاریی ژینگە و کشتوکاڵ، خرایە ناو بابەتەکانی خوێندنەوە.

### تاقیگەکان

بایەخمان دا بە کردنەوەی تاقیگەی دەنگ بۆ هەندێ خوێندنگا، بۆ زمانی ئینگلیزی، بەتایبەتی لە خوێندنگا نموونەییەکان، بەڵام بەهۆی کەمیی بودجە، نەتوانرا وەک ئەوەی چاوەڕوان دەکرا ئەنجامبدرێ.

### کتێبخانە

لەو روانگەیەی کە کتێبخانە رەنگدانەوەی فەلسەفەی پەروەردەیە و خوێندکار فێری وەرگرتنی زانیاری و نووسینی راپۆرت و خوێندنەوە و چێژوەرگرتن لە بابەتەکان دەکات. هەروەها پێویستیشە بۆ فراوانکردنی هزر و بیرکردنەوە و خەیاڵی خوێندکار و منداڵ و فێرکردنی توێژینەوە و لێکۆڵینەوەی زانستی و بابەتیی، بڕیار درا ئەو بەشە گەشەی پێبدرێ و بودجەیەک بۆ کتێبکڕین تەرخابکرێت و هانی خەڵکیش بدەین کتێب ببەخشنە کتێبخانەی خوێندنگاکان، ئەمەش بووە هۆی ئەوەی ئەو بەشە زۆر چالاکتر بێت.

لەلایەکی تریشەوە، هانی توێژینەوەی بە گروپمان دا و لە چەند مەراسیمێکی قوتابخانەکان ئامادەبووم لەکاتی باسکردنی توێژینەوەکان، بەمەبەستی هاندان و بەردەوام بوون. هەروەها بڵاوکراوەی خوێندنگاکان بەهێزتربوو و پێشبڕکێمان ئەنجام دەدا لەنێوان خوێندگاکان، بۆ هەر دامەزراوەیەکی تازە، بوو بە بڕیار دەبێ هۆڵی خوێندنەوە و کتێبخانەی تیابێ.

### نەهێشتنی نەخوێندەواریی

بەرنامەی نەهێشتنی نەخوێندەواریی، یەکێک بوو لە پرۆژە سەرکەوتووەکانی وەزارەتی پەروەردە. پێش بڕیاری دەستپێکردنی بەرنامەی نەهێشتنی نەخوێندەواریی سەرتاسەریی، چەند پۆلێکی کەم هەبوو، بۆ ئەو مەبەستە لیژنەیەکی سەرەکیمان لە وەزارەت پێکهێنا و بە چەند کۆبوونەوەیەک و بە نوێنەرایەتی یونسکوش لەو لیژنەیە، بڕیارماندا دەست بەو بەرنامەیە بکەین. هەرچەندە سەرەتا زۆر لە کادیرانی پەروەردەیی بە کارێکی زەحمەتیان دەزانی، بەڵام لەدواییدا ئەوانیش هاتنە سەر راکەی من کە ئەکرێ و دەبێ بکرێ. ئیتر دەستبەکاربووین و سەرەتا بە خولی ئامادەکاریی مامۆستایان دەستمانپێکرد، پاشان دانانی بەرنامەی خوێندن بەتایبەت بۆ نەهێشتنی نەخوێندەواری و بەردەوام لەگەڵ نەمیرە محەمەد و ستافی وەزارەت، سەردانمان دەکردن و لە کێشەکانیان نزیکبووین.

### یەکەم تەلەفزیۆنی پەروەردەیی

کاتێک کە وەزیری پەروەردەبووم، لەگەڵ هاوکارەکانم لە وەزارەت، بەپێویستمانزانی تەلەفزیۆنێکی تایبەت بە بواری پەروەردە هەبێت. ئەوکات تاک تاک بەرنامەی پەروەردەیی لە تەلەفزیۆنی خاک هەبوو، نە لە عیراق و نە لە کوردستان، لەو جۆرە تەلەفزیۆنە نەبوو کە خوێندکارەکان بتوانن سوودی لێوەربگرن، بەتایبەتی خوێندکارە نەدار و هەژارەکان کە توانای دابینکردنی مامۆستای تایبەتیان نەبوو، بۆیە ئەو بڕیارە ئاسان نەبوو لەکاتێکی وادا و لە دۆخی نەداری و کەمیی بودجە. دواتر ئەو بیرۆکەیەمان لەگەڵ مامۆستا خەسرەو بابان باسکرد و بیروکەکەی زۆر بەدڵ بوو، کەوتە دۆزینەوەی ستاف و داڕشتنی

بەرنامەکانی تەلەفزیۆن و دانانی پلان. هەروەها دەستنیشانی بەڕێزان (کاوە ئەحمەد میرزا و شەماڵ فەهمی)مان کرد وەک دوو کەسی خاوەن ئەزموون، هاتنە ناو دەستەی دامەزرێنەر و بووینە چوار کەس (بەندە، مامۆستا خەسرەو بابان، کاوە ئەحمەد میرزا، شەماڵ فەهمی). بیرۆکەکەمان لەگەڵ سەرۆک وەزیران (د.بەرهەم) باسکرد و هەموو پشتیوانییەکی بۆ دەربڕین و پێمانوت "زۆرجار پارەی پرۆژەکان دەمێنێتەوە کە پێشتر دەکرا بە پاداشت، یان دەچووە سەر بودجەی وەزارەتی دارایی، پێویستمان بە کردنەوەی ئەژمارێکی بانکیی تایبەت هەیە بۆ وەزارەت و پرۆژەکە". ڕەزامەندیی لەسەر دەربڕی و یەکەم هەنگاو، ئەژمارێکی بانکیمان کردەوە. دووەم هەنگاومان، دەستنیشانکردنی شوێنێک بوو بۆ ئەو کارە، لەناو بینای چالاکیی هونەریی قوتابخانە و خوێندنگاکان بەرانبەر پارکی ئازادی، شوێنێکمان دەستنیشانکرد، بەڵام پێویستی بەوەبوو کە شوێنەکە بگونجێنرێ بۆ تەلەفزیۆنەکە و ستۆدیۆی تیادا دابمەزرێ.

خەسرەو بابان، بوو بە سەرپەرشتیاری گشتیی تەلەفزیۆنەکە کە پێشتر هەر بەڕێوەبەری گشتی بوو لە سلێمانی. کاک کاوەی هونەرمەند، بوو بە بەڕێوەبەری تەلەفزیۆنەکە. پێشتریش بەڕێوەبەری چالاکیی هونەریی بوو شەماڵ فەهمی هونەرمەند، کرایە یاریدەدەری بەڕێوەبەر و ستافێکی باش و خاوەن ئەزموونی پەروەردەییمان بە هاوکاری و دەستنیشانکردنی مامۆستا خەسرەو و کاک کاوە و کاک فەهمی، گواستەوە لە شوێنەکانی خۆیان بۆ ناو تەلەفزیۆن. نزیکەی (٢٠) کادیری شارەزا لە کوڕ و کچ هاتنە ناو تەلەفزیۆنەکە، بە ئارەزوویەکی زۆرەوە و وەک ئەزموونێکی تازە، بەوپەڕی لەخۆبوردەییەوە کاریاندەکرد. هەندێکجار شەوانیش کاریاندەکرد بێ ئەوەی بۆڵەیەک یان بێزارییەکیان پێوەدیاربێ.

ئاوات حەمەڕەشیش، درێغی نەدەکرد و بەردەوام لەگەڵ من هاوکار بوو بۆ دۆزینەوەی ڕێگەچارە بۆ هەر کێشەیەکی دارایی و کارگێڕیی کە دەهاتە ڕێگەمان. سەبارەت بە ستافەکەش، کارەکانمان بەپێی پسپۆڕییان بەسەردا دابەشکردن (مۆنتێر، وێنەگر، بێژەر، گرافیک، وەرگێڕ، بەشی کارگێڕی، ستۆدیۆ، بەشی سەتەلایت، هەروەها بەشی ئارایشت و ڕووناکیی) تەنانەت چێشتخانەیەکمان دروستکرد بۆ دابینکردنی ژەمە خواردن بۆ ستافەکە.

تەلەفزیونی گەلی کوردستان، ڕێگەیان پێداین ئەنتێنایەک لەسەر بورجەکەیان دابنێین، کە بەو کارە، پارەیەکی یەکجار زۆریان بۆ گەڕاندینەوە. ئەو کارە، لەسەر پێشنیازی بەڕێوەبەرێتی وزەی کارەبا بوو، نزیکەی نیو ملیۆن دیناری (سویسری)مان بۆ گەڕایەوە، بۆیە لەم بیرەوەرییەدا، دەمەوێ سوپاسی ئەو لایەنانە بکەم کە هاوکارمان بوون، ئەوان نەبونایە ئەو خەونە کە بۆ ئەو کاتە زۆر پێویست بوو، نەدەهاتە دی.

لە ١٩ی ئایاری ٢٠٠٢، یەکەم پەخشمان بە سەرکەوتوویی دەستپێکرد و بە ئامادەبوونی سەرۆک وەزیران و میوانێکی زۆر، تەلەفزیۆن کرایەوە. وانەی تایبەت لە هەموو وانە پێویستەکانی پۆلەکانی شەشی ئامادەیی و سێی ناوەندی پەخشدەکران، مامۆستاکان خۆبەخشانە وانەکانیان تۆماردەکرد و بڵاودەکرانەوە. لە پاڵ وانە تایبەتەکاندا، هەندێ بەرنامەی گرنگ هەبوون کە بۆ ئەو سەردەمە پێویستبوون، وەک: (فێربوونی کۆمپیوتەر، فێربوونی زمانەکانی ئینگلیزی و عەرەبی، ڕاهێنانی مامۆستایانی باخچەی ساوایان و سەرەتایی، دۆبلاژکردنی فیلم کارتۆنی پەروەردەیی، بەرنامەی ژینگەیی و ڕێنماییەکانی هاتووچۆ و چاوپێکەوتن لەسەر بواری پەروەردە و ڕێنماییەکانیان، بەرنامەکانی نەهێشتنی نەخوێندەواری و هاندانی خەڵک کە بچن بۆ خوێندن، ناوبەناو سەردانی قوتابخانەیەکیشیان دەکرد و تێبینییان لەسەر قوتابخانەکە ئەدا، کار و چالاکیی قوتابخانە و باخچەی ساوایانیان پەخشدەکرد و چەندین چالاکیی تر). بۆ هەموو بەرنامەکان و فیلمەکان، هەڵسەنگاندنی پەروەردەییان بۆ دەکرا پاشان پەخشدەکران. دەتوانم بڵێم ئەوەندەیتر بڕوام بە ستافی پەروەردەیی پەیداکرد، لەسەر بەردی ڕەق توانیمان بەرهەمێکی گرنگ بە هاوکاریی دەستەی دامەزرێنەر و ستافەکە، ئەنجامبدەین. زۆریشمان هەوڵدا بیکەین بە سەتەلایت، بەڵام بۆمان نەگونجاو ئەو خەونەمان نەهاتەدی، پێویستە ئەوەش بڵێم کە یونسێف و یونسکۆش زۆر هاوکارمان بوون.

له ١٤ و ١٥ی كانوونی یەكەمی ٢٠٠٢، له هۆتیل هیلتۆن، له ناوەڕاستی شاری لەندەن، كۆنگرەی ئۆپۆزسیونی عیراقی بەسترا. بەندە، دەستنیشانكرابووم بۆ بەشداریی لەو كۆنگرەیە و پێشكەشكردنی وتارێک دەربارەی ژنی عیراق و نەهامەتییەكانی بەهۆی رژێمی سەدامەوە.

لەو كۆنگرەیەدا، نزیكەی (٤٠٠) ئەندام بەشداربوون كە نوێنەری زۆربەی پارتە ئۆپۆزسیۆنەكانی دژ بە رژێمی سەدام بوون، جگە له چەندین میدیای جیهانیی كە مەزەندە دەكرا بە (٦٠٠) رۆژنامەنووس و پەیامنێر. بە سەركەوتووترین و بەهێزترین كۆنگرەی ئۆپۆزسیۆنی عیراقی ئەژماركرا. ئامانجی ئەو كۆنگرەیە، چۆنێتیی خۆئامادەكردن بوو بۆ دوای كۆتاییهێنان بە رژێمی سەدام، كە له سەرەتای ساڵی ٢٠٠٢ لەلایەن سەرۆكی ئەمریكاوە یاسای رزگاركردنی عیراقی واژووكرابوو. بڕگەیەكی یاساكە بریتیبوو له (یارمەتیی سەربازیی بۆ هێزەكانی ئۆپۆزسیۆن، لەناویشیاندا یەكێتی و پارتی).

ئەو لایەنە سەرەكییانەی كە بەشداربوون:

یەكێتیی نیشتمانیی كوردستان

پارتی دیموكراتی كوردستان

ئەنجومەنی باڵای شۆرشی ئیسلامی (المجلس الاعلى للثورة الاسلامية)

كۆنگرەی نیشتمانیی عیراقی (المؤتمر الوطني العراقي)

حیزبی نیشتمانی ئاشووری (الحزب الوطني الاشوري)

حیزبی ئیسلامیی عیراق

بزووتنەوەی ویفاق

بزووتنەوەی دیموكراتیی عیراق

بزووتنەوەی نیشتمانیی عیراق

رێكخراوی كاری ئیسلامی (منظمة العمل الأسلامي)

بزووتنەوەی پادشایی دەستووریی عیراقی (الحركة الملكية الدستورية العراقيه)

بەرەی توركمانی الجبهة التوركمانية)

یەكێتیی ئیسلامیی توركمانیی عیراق (الاتحاد الاسلامي لتركمان العراق)

حیزبی شیوعی كوردستان (الحزب الشيوعي الكوردستاني)

حیزبی دەعوەی ئیسلامی (الحزب الدعوة الاسلامية)

حیزبی سۆسیالیستی دیموکراتی کوردستان (الحزب الاشتراکي الدیموقراطي الکوردستاني)

ئەنجومەنی باڵای رزگارکردنی عیراق ( المجلس الأعلی لأنقاذ العراق)

بزووتنەوەی دیموکراتیی ئاشووری (الحرکة الدیموقراطیة الاشوریة)

جگە لە دەیان چالاکوان و کەسایەتیی دیار، هەندێ لایەنی بیانیی بەشداربوون. زەڵمای خەلیلزاد و دیڤید پێرس (ئەمریکا)، ئان کلود و ئیما نیلکسۆن (بەریتانیا)، (ئەو دوو خانمەم پێشتر دەناسی بەتایبەتی ئان کلود، چەند پرۆژەیەکمان پەیەکەوە بۆ منداڵپارێز ئەنجامدابوو، لەدوای رزگارکردنی عیراقیش ئیما نیلکسۆن کاری زۆری بۆ باشووری عیراق کرد). لە کوەیتیشەوە (محەمەد ئەلسەقەر) بوو کە تاکە وڵاتی عەرەبیی بوو بەشداربوو، هەروەها نوێنەرانی فەرەنسا و بەلجیکا و چین و دانیمارک و یۆنان و... هتد.

لەو وڵاتە گرنگانەی بەشدارییان نەکرد، روسیا یەکێکیان بوو، هیچ وڵاتێکی عەرەبیش بەشدارنەبوو جگە لە کوەیت.

کۆنگرەیەکی چڕوپڕ بوو، لەجیاتی ژنانی عیراق وتارێکم هەبوو، بە هاوکاریی خوالێخۆشبوو مامۆستا مستەفا ساڵح کەریم و د.فوئاد مەعسوم، وتارەکەم نووسیی بە زمانی عەرەبی و بەپێی زۆرێک لە رای ئامادەبووان، یەکێک لە وتارە کاریگەرەکان بوو. کاک مەسعود بە مام جەلالی وتبوو "باشترین و کاریگەرترین وتار بووە". هەردووکیان دەستخۆشییان لێکردم، هەتا لەژیانیشدابوو، مستەفا ساڵح کەریم باسی لێوەدەکرد، تاکە ژن بووم کە لە ناوەوەی عیراق چووبووم بۆ بەشداریی. هەندێ لایەن لە کۆنگرەکە هاتنە دەرەوە، هەندێکیش لەبەر هەندێ هۆکار هەر لەسەرەتاوە بەشدارنەبوون.

ئەو لایەنانەی هاتنە دەرەوە لە کۆنگرە:

بزووتنەوەی رەوتی سەدری

بزووتنەوەی ئیسلامیی تورکمانی عیراقی

بزووتنەوەی ویفاقی ئیسلامی

یەکێتیی زانایانی ئایینیی عیراق

بزووتنەوەی ئیسلامی لە کوردستان

لیژنەکانیان پێکهێنا و من چوومە لیژنەی فیدرالّیەت، دوای تەواوبوونی کاری لیژنەکان و هەڵبژاردنی (٦٥) کەسایەتی وەک ئەنجومەنی نەتەوەیی کە ئەرکی پەیوەندیکردن بێ بە لایەنەکان و وڵاتانەوە بەمەبەستی هاندانیان بۆ بەشداریی لە رووخاندنی رژێمی سەدام. هەروەها ئەو ئەنجومەنە ئەرکی بەڕێوەبردنی وڵاتی پێ بسپێردرێ دوای رووخانی رژێمی سەدام بۆ ئەوەی بۆشایی لە حوکمدا پەیدا نەبێ و دارشتنی شێوازی حوکمی لەئەستۆبێ.

لەو کۆنگرەیە، بریار لەسەر فیدرالّیەت بۆ کوردستان درا، هەروەها ناوی (٤٩) بەرپرسی عیراقییان ئامادەکردبوو بۆ دادگاییکردنیان دوای رووخانی رژێم.

دوای هەڵبژاردنی ئەنجومەنەکە، سەیرمانکرد ریژەی ژن زۆر کەمە و هیچ ژنێکی کوردی تیا نییە. بە مام جەلالمان وت، مام جەلال لە من و شاناز ئیبراهیم ئەحمەد توورەبوو، هیلاکیی خۆی بە ئێمە رشت و وتی "ئاگاتان لێ نییە چی روویدات، ئەو هەموو دەنگە دەنگە لەسەر بەشدارییە".

یەکێک لەو ژنانەی دەستنیشانکرابوو لەو ئەنجومەنە بەشداربێ، سەفیە سوهەیل بوو. لەو کۆنگرەیە، سەفیە سوهەیل بایەخێکی زۆری پێدرابوو، لەگەڵ یەکەم کەسانی سەر شانۆکە و لە یەکەم دەستپێک دانرا و بووش بە ئەندامی ئەو ئەنجومەنە و وتاریشی هەبوو، لەو رۆژەوە یەکترماننناسی و بووین بە هاورێ.

لەو کۆنگرەیە، بریار لەسەر دوو بەڵگەنامە درا. یەکەمیان، پرۆژەکانی قۆناغی گواستنەوە و ئەرکەکان بوو، کە لە ١٨ خاڵدا کۆکرابوونەوە. دووەم، شێوازی حوکمڕانیی بوو و لەگەڵ شێوازی پیادەکردنی هەنگاوەکانی.

پێشتر بەشێکی زۆری بەرپرسانی ئەو حیزبە سیاسییانەی کە بەشداربوون دەمناسین، بەهۆی کونگرەی ئۆپۆزسیۆنی عیراقی کە لە هاوینە هەواری سەلاحەدین لە تشرین دووەمی١٩٩٢ بەسترا. دارۆ، لەو کۆنگرەیە بەشداربوو، رۆژێکیش بەشێکی زۆری ئەندامانی کۆنگرەمان بانگکردبوو بۆ نانخواردنی نیوەڕۆ و دواتریش بەشێکی زۆریان لە کوردستان بارەگایان دانا و هەندێکیان نیشتەجێبوون و هاتووچۆشمان هەبوو، وەک؛ د.ئەحمەد چەلەبی و نوێنەرانی حیزبەکانی دعوە و... هتد. ئەوکات، وا مەزەندە دەکرا، د.ئەحمەد چەلەبی

سەرۆکی عیراقە لەدوای رووخانی سەدام، دارۆش کە د.ئەحمەدی پێناساندم، وتی "الرئس العراقي القادم د.أحمد".

ئەو ئەندامانەی کە لە کۆنگرەی ئۆپۆزسیۆنی عیراقی لە هاوینە هەواری سەلاحەدین بەشداربوون، ئەوانەبوون کە لە کۆنگرەی ڤیەننا لە (١٦-١٩ی حوزەیرانی ١٩٩٢) هەڵبژێردرابوون. کە بریتی بوون لە (١٧) کەسایەتی و سەرۆک حیزبەکان وەک لیژنەیەکی جێبەجێکار و بەدواداچوونی بڕیارەکان. لە یەکێتی، د.لەتیف رەشید بوو، لە برادەرانی پارتی، هوشیار زێباری و ئەوانی تریش لە حیزبە عەرەبییەکان و بەشداربووانی تر بوون.

دوای ٣١ی ئاب، بەشێک لەو پارتە ئۆپۆزسیۆنانە لە (زۆنی سەوز) نیشتەجێبوون، بەهۆی کاری دارۆ لە مەکتەبی ئیدارە و دارایی گشتی و هاوکاریی یەکێتی بۆ بەشێک لە ئۆپۆزسیۆن، پەیوەندیمان هەر مابوو. دوای رووخاندنی رژێم، لە بەغدا بینیمنەوە.

هەروەها لە ١ی ئازاری ٢٠٠٢، کۆنگرەیەکی تر لە هاوینە هەواری سەلاحەدین بەسترا. لەو کۆنگرەیە، سەرکردایەتییەکی یەکگرتوو پێکهێنرا بۆ دوای رژێمی سەدام و شەش کەس دەستنیشانکران وەک ئەنجومەنی سەرکردایەتیی بۆ گرتنەدەستی دەسەڵات و بەڕێوەبردنی وڵات دوای رووخاندنی رژێم. ئەوانیش؛ (مام جەلال، مەسعود بارزانی، ئەحمەد چەلەبی، عەدنان پاچەچی ، عەبدولعەزیز حەکیم، ئەیاد عەلاوی). زەڵمای خەلیلزاد، وەک لایەنی ئەمریکی هاتبوو، من خێزانی زەڵمای خەلیلزاد و خۆشیم لە ئەمریکاوە دەناسی، کاتێ بۆ خولی گفتوگۆی نێوان پارتی و یەکێتی نێردرابوومە دەرەوە، سەرباخ خانی خێزانی د.بەرهەم ئێوارەخوانێکی بۆ شاندەکە کردبوو، لەوێ خێزانەکەی زەڵمای بانگهێشتکردبوو.

ئەو کۆنگرانە و دەستنیشانکردنی ئەو ئەنجومەن و سەرکردانە، هەم هاندەرێکبوون بۆ رووخاندنی رژێم و هەمیش بەشدارییپێکردنی وڵاتانی جیهان بوو لەو هەڵمەتە. هەروەها بوو بەهۆی ئەوەی بۆشایی حوکمڕانیی لە عیراقی دوای رژێم پەیدا نەبێ و یەکسەر جومگەکانی دەوڵەت بەدەستەوەبگرن.

له ۲۰ی ئازاری ۲۰۰۳، کاژێر ۲:۳۰ خولەکی سەرلەبەیانی، دانیشتوانی بەغدا، لە دەنگی تەقینەوەی مووشەکی فڕۆکە جەنگییەکانی ئەمریکا بۆ سەر کۆشکی سەرۆکایەتی بەئاگاهاتن. بەرەبەیان بوو، دارۆ بەئاگایهێنام و ئەو هەواڵە خۆشەی پێدام.

هێزە هاوپەیمانەکان کە (٤٩) وڵات بوون، پشتیوانیی خۆیان بۆ رزگارکردنی عیراق دەربڕیبوو، ئەو لایەنانەی کە بە هێز پشتیوانییان لێکردین، سەرەتا ئەمریکا و بەریتانیا و ئوسترالیا و هەندێ لایەنی تر بە ژمارەیەکی زۆر کەم بەشداربوون و لە ۹۸٪ی هێزەکان ئەمریکی بوون. هەندێ وڵاتیش لەڕووی لۆجستییەوە بەشداربوون، هەشبوون تەنیا پشتیوانیی خۆیان دەربڕیبوو.

بەپێی روونکردنەوەکەی ئەنجومەنی ئاسایشی نێودەوڵەتی، بڕیاری (١٤٨٣ – ۲۰۰۳) ، لە ۲۰ی ئازاری ۲۰۰۳ هێرشەکان دەستیانپێکرد. لەڕێگای سنووریی (عیراق – کوەیت)، هێزە هاوپەیمانەکان هاتنە ناو عیراقەوە و هەروەها لەڕێگای هێزی دەریاییەوە، هێزە تایبەتەکانی هاوپەیمانی، هاتنە ناو بەسراوە بەمەبەستی گرەنتیکردنی بەسرە و دەوروبەری و کێڵگە نەوتییەکانی، لەترسی ئەوەی نەوەک وەک شەڕی کەنداوی دووەم، کێڵگەکان بسووتێنرێن.

رۆژانە، بەبێ بەرگریی، هێزە عیراقییەکان دەکەوتن، کەوتن لەدوای کەوتن (کەم کەم بەرگریی دەکرا) لە ماوەی سێ رۆژدا و لە ۲۳ی ئازاری ۲۰۰۳ گەیشتنە شاری ناسریە.

نەورۆزی ئەو ساڵە، نەورۆزێکی پڕ لە هیوا و خۆشیی بوو، پێش هەموو هێرشێکی سەربازیی، هێرشەکانی هێزی ئاسمانیی ناوچەکانیان وێراندەکرد و پاشان هێزە سەربازییەکان دەچوونە پێشەوە. هێزەکانی عیراق، بە ماوەیەکی زۆر کورت ورەیان رووخا.

لە ۲٦ی ئازاری ۲۰۰۳، هێزەکانی هاوپەیمانان بە پەرەشوت لە نزیک کەرکوک دابەزین و هێزی پێشمەرگەش دەستیکرد بە خۆکۆکردنەوە و خۆئامادەکردن بۆ چوونە ناو کەرکوک. هەزاران هاوڵاتی، داوای ئەوەی دەکرد وەک خۆبەخش بچێتە ریزەکانی هێزی پێشمەرگەوە بۆ رزگارکردنی کەرکوک.

چاودێریی کێڵگە نەوتییەکان، خرایە ئەستۆی هێزە تایبەتەکانی بەریتانیا و ئوسترالیا، بەمەبەستی بەدوورگرتنیان لە تالانی و سووتان.

له ١٠ی نیسانی ٢٠٠٣، هێزەکانی هاوپەیمانی و هێزەکانی پێشمەرگە، کەرکوکیان کۆنترۆڵکرد. دوای چەند رۆژێک لە کۆنترۆڵکردنی کەرکوک، دارۆ دەچووە ناو کەرکوک، داواملێکرد بچم لەگەڵی و رەزامەندیی دەربڕی (ئەوسا وەزیری پەروەردە بووم). دوای ٢٤ ساڵ کەرکوکم بینییەوە، بەناو شەقامەکانیدا دەڕۆیشتین، شتێ نەدەبینرا کە پاشماوەی شەڕە، بەڵام شارێکی پڕ لە پیسیی بوو، لەوە دەچوو ماوەیەک بێت شارەوانیی کاری نەکردبێت.

هەموو هێرشەکە، سێ هەفتەی خایاند و لە ٩ی نیسانی ٢٠٠٣، بەغدا کەوت و رژێمی سەدامیش بەهەمان شێوە.

لە ١ی ئایار بانگەوازی رزگارکردنی عیراق راگەیەنرا، هەرچەند لە میدیای عیراقی، وتەبێژی سەدام (محەمەد سەعید سەحاف) کە وەزیری راگەیاندنی عیراق بوو، لەو رۆژەی تانکەکان لەناو شەقامەکانی بەغدا دەبینران و هاتووچۆیان دەکرد، ئەو هاواریدەکرد و جنێوی بە سەربازە ئەمریکییەکان ئەدا و دەیوت «بە هەزاران لە سنووری بەغدا خۆیان دەکوژن» و ناوی لە سەربازە ئەمریکییەکان نا (علوج). ئەو وشەیە چووە فەرهەنگی دونیاوە، هیچ وشەیەکی هاومانای نەبوو، لە میدیا بیانییەکانیش، بە هەمان شێوەی سەعید سەحاف، دەیانوت: «علوج». ئێستاش لای خۆمان بە زۆر شت دەوترێ (علوج)، وەک؛ ئۆتۆمبێلی علوج... وشەکە چووەتە فەرهەنگی زمانەوە.

دوای کەوتنی بەغدا، (سەعید سەحاف) خۆی تەسلیمی هێزی ئەمریکی کرد، بەهۆی ئەوەی لە کەسە داواکراوەکانی رژێم نەبوو، ئازادیانکرد و بە فڕۆکەی تایبەت بردیان بۆ ئیمارات.

تاکەشوێن کە بەرەنگاربوونەوە تێیدا روویدا، فڕۆکەخانەی بەغدا بوو، ئەویش بەهۆی ئەوەی هەردوولا دەیانویست ناوچەکە بە پارێزراوی لەو شەڕە دەرچێ، هەرچەندە هێزە ئەمریکییەکان بە سەدان مووشەکی کروزی بە کڵاوەی یۆرانیۆمەوە بە ناوچەکانی دەوروبەریدا داوە کە لەدواییدا ئەمانە هەمووی پاککردنەوەیان بوو بە ئەرکی وەزارەتی (بەرگری، ژینگە، زانست و تەکنەلۆژیا).

رزگارکردنی عیراق، لە میدیاکانی وڵاتاندا، ناوی جیاوازی بەخۆوەدەبینی. کەناڵی ئەلجەزیرە و هەندێ وڵاتانی دونیا کە دژی ئەو پرۆسەیە بوون،

دەیانوت؛ داگیرکردنی عیراق (احتلال العراق). هەشبوون دەیانوت؛ شەڕی کەنداوی سێیەم (ئەوانەبوون دڵی هەموو لایەکیان رازیی دەکرد).

جگە لە کوەیت، ولاتە عەرەبییەکان، راستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ، دژی رزگارکردنی عیراق وەستانەوە. سعودیە رایگەیاند «نابێ وێستگە و بنکە سەربازییەکانی ئێمە بەکاربێت لەلایەن هێزە هاوپەیمانەکانەوە بۆ لێدانی عیراق». تورکیاش بەهەمان شێوەی سعودیە، دەیوت «نابێ بنکەی ئینچەرلیک و بنکە سەربازییەکانمان بەکاربهێنن»، ئێرانیش رۆڵێکی دووڕووی دەبینی، یەکەم بەهۆی ترسی لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا وەک دوژمنێکی سەرەکی و ئەترسان ئامانجی دووەمیان دوای عیراق، ئێران بێ، بەتایبەتی کە ئەمریکا دەیوت «ئێران پشتیوانیی لە گروپە تیرۆریستییەکان دەکات». و بە ئامانجی دووەمیان دائەنا دوای عیراق، هەر لەبەر ئەو ترسە بوو پێشوەخت وەزیری بەرگریی ئێران (عەلی شمخانی) لە شوباتی ۲۰۰۲، وتی «ئەمریکا نابێ بەهیچ شێوەیەک ئاسمانی ئێران بۆ لێدانی عیراق بەکاربهێنێ»، ئیسلامییەکان ئەترسان وڵاتێکی نزیکیان حوکمڕانییەکی تێدا پێکبهێنرێ دۆستی ئەمریکا و رۆژئاوا بێت. لەهەمانکاتیشدا رژێمی عیراقیان بە دوژمنی دێرین و سەرەکیی دەزانی، هەربۆیە ئامادەیی ئاشتبوونەوەی گشتییان نەبوو لەگەڵ عیراق و لە کانوونی دووەمی ۲۰۰۳، وەزیری دەرەوەی عیراق (ناجی سەبری)، ویستی سەردانی ئێران بکات، بەڵام ئێران مەرجی زۆر قورسی دانا، رایگەیاند «دەبێ عیراق بە فەرمیی داوای لێبوردن لە ئێران بکات و دان بە رێککەوتننامەی ۱۹۷۵ و کەنداوی فارسی بنێ، هەروەها هەزار ملیار دۆلار قەرەبووی شەڕ بدەنەوە». ئیتر بەو هۆیەوە عیراق ئەو سەردانەی وازلێهێنا، دیاربوو ئێران نەیدەویست پەیوەندیی لەگەڵ عیراق پەیدابکاتەوە. لەسەرێکی ترەوە، ئێران دەیویست دەستی هەبێ لە دامەزراندن و داڕشتنی سیاسەتی ناو عیراقی دوای سەدام، ئەو دووفاقییە لە سیاسەتی ئێران، وایکردبوو کە ئەمریکاش لای روونبێ ئێران نابێتە رێگر لە ئازادکردنی عیراقدا، بەتایبەتی لەبەر شیعەکان کە چەندەها ساڵە رژێمی سەدام دەبانچەوسێنێتەوە. لە مانگی شوبات، هێزە ئێرانییەکان ناوچەی کەنداویان کۆنترولکردبوو بەناوی ترس لە تالانی و وێرانکردنی ناوچەکە و کەرەستە ئاوییەکانی.

له زۆر ولاتی دونیاشەوە ناوبەناو خۆپیشاندان دەکرا دژی هاتنی هێزە هاوپەیمانەکان بۆ ناو عیراق، خەڵکی وڵاتانیش دەهاتنە ناو بەغدا لەڕێگای سوریا یان تورکیاوە و دەکەوتنە خۆپیشاندان، بەڵام ئەمانە هیچیان سوودیان نەبوو، عیراق لە دەستی دڕندەترین ڕژێم ڕزگارکرا. کە لەدوای خۆی وڵاتێکی وێرانی شکستخواردووی چەند شەڕێکی دۆڕاو و قەرزارییەکی زۆری وڵاتان و کۆمپانیا جیهانییەکان بەجێهێشت، کە نزیکەی (٤٠٠) ملیار دۆلاری قەرزی دوای خۆی جێهێشت، ئەمە جگە لە ملیۆنەها ئاوارە و هەزاران شەهید و سەدان ناوچەی رووخاو و هەزاران تەن سکرابی پاشماوەی شەڕەکان کە زۆربەیان بە (یۆرانیۆمی پیتێنراو) پیسبوون و هەژاریەکی زۆر، کە هەموو ئەوانە و شتی زیاتریش بوون بە بەرپرسیارێتیی حکومەتەکانی دوای سەدام حسێن، لەگەڵ ئەوەشدا هیواکان زۆربوون.

لەدوای رزگارکردنی عیراق، بە فڕۆکەیەکی سەربازیی ئەمریکیی شەش کەس لەگەڵ د.بەرهەم کە منیشی تێدابووم چووینە شاری بەغدا. هێشتا فڕۆکەخانەی بەغدا بەگەڕنەخرابووەوە، لە فڕۆکەخانەی سەربازیی فڕۆکەکە دابەزی و دوای چاوپێکەوتنی هەندێ لایەنی سەربازی، ئیتر ئێمەیان برد بەرەو کۆشک. لە ناوشار بە هاوکاری و چاودێریی چەکدارە هاوپەیمانەکان گەیەنراین و بە لای ئەبو نەواس و شەقامەکانی کەڕادە و گۆڕەپانی نسوردا ڕۆیشتین، ئەو ئۆتۆمبێلەی کە لە پێشمانەوە بوو بۆ چاودێری و ڕێپیشاندان، کچێکی سەربازی ئەمریکی لەسەربوو. دەیان خەونی گەورەمان لەو ڕێگایە باسدەکرد و چاوەڕێ بووین عیراقێکی دیموکراتیی فیدراڵیی جێگیر دروستببێ، خەونەکان هێشتا بە ئەنجام نەگەیشتبوون.

ئەوکات، جەی گارنەر، حاکمی عیراق و بەڕێوەبەری جێبەجێکاری چاککردنەوەی عیراق بوو، پێشتر دەمانناسی و دۆستی دێرینی کورد بوو. هەر ئەو ژەنەڕاڵە، لە ساڵی ١٩٩١ هەوڵی بێپایانی دا بۆ دروستکردنی ناوچەیەکی ئارام بۆ کورد و ئەو کاتەی لە کوردستان بوو، چەند جارێک بۆ کردنەوەی پێشانگا هونەرییەکانی چالاکیی خوێندنگاکان بانگهێشتمانکرد بۆ کردنەوەی پێشانگاکان و چەند جارێک لە ئەنجومەنی وەزیران یەکمان بینیبوو.

هەروەها لەدوای ئازادکردنی شاری موسڵ و پاککردنەوەی لە دەزگاکانی

سەر بە رژێمی سەدام، لە حوزەیرانی ٢٠٠٣ بە هەلیکۆپتەری سەربازیی تایبەت و بە هاوکاریی ژەنەراڵ هێلماک، د.بەرهەم، سەرۆک وەزیرانی ئەوکات و فەرەیدون عەبدولقادر و بەندە، چووینە شاری موسڵ و لەوێ چاومانکەوت بە ژەنەراڵ دیڤید پاتریوس، بەرپرسی هێزی ئاسمانیی (١٠١)ی ئەمریکییەکان، کە ئەو هێزە ئەرکی رزگارکردنی شاری موسڵ و رێکخستنەوەی هێزی سەربازی و ئیداریی موسڵی پێ سپێردرابوو. لە رزگارکردنی موسڵ، هێزی پێشمەرگە رۆڵێکی سەرەکیی هەبوو لەپاڵ هێزە هاوپەیمانەکاندا.

ئەوەندەی پێنەچوو، لەبەر هەر هۆیەک بووبێ، جەی گارنەر لە کارەکەی لابرا و پۆڵ بریمەر بوو بە حاکمی عیراق و لە ١٢ی ئایاری ٢٠٠٣ دەستبەکاربوو. دوای چەند رۆژێک لە دەستبەکاربوونی، سوپای عیراقی بە هەموو پێکهاتەکانیەوە هەڵوەشاندەوە و بڕیاری دا هێزێکی تازە دروستبکات، هاوشێوەی پێکهاتەکانی عیراق، فرەڕەنگ بێ.

لە کۆتایی مانگی ئایار، داوای چاوپێکەوتنی لەگەڵ هەندێ کەسایەتیی عیراقیی دەرەوەی بازنەی بەرپرسە باڵاکانی کردبوو، یەکێک لەوانە من بووم، لە باڵەخانەی سەروکایەتیی چاوپێکەوتنەکە ئەنجامدرا. سەرەتا لەسەر رەوشی پەروەردە و رەوشی ژنان لە عیراق بەگشتی و کوردستان بەتایبەتیی، پرسیاری لێدەکردم (ئەوسا وەزیری پەروەردە بووم لە حکومەتی هەرێم/ ئیدارەی سلێمانی)، هەروەها داوای را و بۆچوونی کردین لەسەر چۆنێتیی داڕشتنی سیستمێک لە عیراق و هەڵەکانی هێزە هاوپەیمانییەکان. لەمیانەی قسەکردنەکە، من رای خۆم بە راشکاوانە لەسەر هەڵوەشاندنەوەی هێزە عیراقییەکان دەربڕی و وتم «بەڕای من هەڵە بوو، ئەو هێزەتان هەڵوەشاندەوە، لەبەرئەوەی هێزێکی ئۆپۆزسیۆن دەیانگرێتە خۆی و دەبنە مایەی سەرئێشەیەکی گەورە بۆ عیراق، سەربازەکان زۆربەی زۆریان کورە هەژارن، بژێویی ژیانیان لەسەر کارەکانیانە و دەیاننێرنە ماڵەوە و کار نییە، باشە چیبکەن؟ بێشک لەتاو نەبوونی، روو لە هەر شوێنێک دەکەن بژێوییان دابینبکات، ئێوە لەبری هەڵوەشاندنەوەی، دەبوایە سەربازە پلەدارە بەعسییەکانتان بگرتایە و بە دادگایەکی سەربازیی ئەوەی تاوانبارە سزایان بدەن، سەربازە بێ پلەکان گوێڕایەڵی گەورەکانن، پێیانبڵێن شەڕبکەن دەیکەن و ناتوانن لە فەرمانەکانیان دەربچن». پۆڵ بریمەر

وتی «بەس ئەوە رای حیزبەکەت نییە». وتم «ئەمە رای خۆمە، تۆش تەنیا داوای رای خۆمت کردووە، نەک رای حیزبەکەم».

هەروەها پرسیاری کرد؛ چۆن ئەتوانین تاقیکردنەوەی قۆناغی دووەمی خوێندنگاکانی عیراق ئەنجامبدەین؟ کە بەهۆی جەنگی عیراقەوە تاقیکردنەوەکانی خولی یەکەم دواخرابوون و لەوەشدا بە وردیی رای خۆمم پێوت. هەر ئەو چاوپێکەوتنە بوو بەهۆی بانگهێشتکردنمان وەک وەزارەتی پەروەردەی هەرێمی کوردستان بۆ هاوکاریی لیژنەی پەروەردەیی کە سەر بە بریمەر خۆی بوو، بەمەبەستی ئەنجامدانی تاقیکردنەوە، هەروەها بۆ بەستنی کۆنگرەی دەنگی ژنانی عیراق کە لە بەشێکی تری کتێبەکەدا باسمکردووە.

میللەتی کورد، دوای چاوەڕوانییەکی (٣٠) ساڵەی پڕ لە ئازار و قوربانیی و هەوڵ و تێکۆشان و دەربەدەری وماڵوێرانیی و هەزاران ئەنفال و کیمیاباران و پاشماوەکانی وێرانکردنی سەدان گوند و هەزاران زیندانی سیاسی و برسێتی و نەهامەتی، بە چاوی خۆی کەوتنی گەورەترین دوژمنی خۆی بینی.

دوای تێپەڕبوونی ئەو هەموو ساڵە بەسەر کەوتنی رژێمی سەدامدا، ناتوانم هەستە خۆشەکانی ئەوسام بخەمە چوارچێوەی پێناسەیەک بۆ ئەو سەردەمە، بەڵام لەخۆشیدا گریانم بۆ نەئەوەستێنرا، هەموو برینەکان و ئازارەکان و لەدەستدانی خۆشەویستەکانم وەبیرهاتبوونەوە. گریان، هەندێکجار تێکەڵەیەکە لە ئازار و خۆشی (هەربۆیە هەندێکجار مرۆڤ لەخۆشیدا دەگری)، لەگەڵ ئەو هەموو خۆشییانەشدا، ترسێکم هەبوو لەوەی ئەو هەموو دەستکەوتانەی لە ١٩٩٢-٢٠٠٣ بەدەستمانهێنابوون، لەدەستمان بچێ. لەبری باشە، بە خراپ بشکێتەوە بەسەرماندا، هەر لەبەرئەوەش بوو هەندێ هاوڕێم لە وەزارەتی پەروەردە وتیان «با لە گۆڕەپانی وەزارەت بیکەین بە ئاهەنگ». لە وەڵامدا وتم «هێشتا کاتی ماوە بۆ ئاهەنگگێڕان، بەڵام دەکرێ بە شێوەیەک لە شێوەکان خۆشیی دەرببڕین». هەستیشم دەکرد برینەکانی نەتەوەکەم هەمووی سوێی تێکەوتووەتەوە و هێشتا سەدام نەگیرابوو، ئەو خۆشییەش مابوو. بە گرتنی (عەلی حەسەن مەجید) لە ٢١ی ئابی ٢٠٠٣ و دواتریش بە گرتنی سەدام لە ١٣ی کانوونی یەکەمی ٢٠٠٣، سەرکەوتنەکە خۆشتربوو. زۆر لاشم گرنگە کە دارۆ لە دوارۆژەکانی کۆتایی ژیانیدا بە

چاوی خۆی ئەوانەی بینی، تۆڵەی لەسێدارەدانی برا (شەهید شەهاب) و خاڵم (شەهید جەعفەر) و چوار ساڵ تەمەنی گەنجێتیی لە زیندان و خەمەکانی میللەتەکەی و ئازارەکانیانی بە چاوی خۆی بینی و نەبوو بە گرێ لە دڵیدا و نەیبردە ژێر گڵ.

## کۆنگرەی دەنگی ژنانی عیراق

لەدوای رووخاندنی رژێمی سەدام، پۆڵ بریمەری حاکمی عیراق، (٤٠) ژنی لە سەرتاسەری عیراق کۆکردەوە، بەندەش یەکێک بووم لەو ژنانە کە ئەوسا وەزیری پەروەردە بووم لە حکومەتی هەرێمی کوردستان/ دەڤەری سلێمانی.

لە ٢٩ی ئایار ٢٠٠٣، یەکەم کۆبوونەوەمان کرد بە ئامادەبوونی پۆڵ بریمەر و هاوکارەکانی. لەو کۆبوونەوەیە، پێشنیازکرا کۆنگرەیەکی گشتیی بۆ ژنانی عیراق ببەسترێ، بۆ ئەو مەبەستە دەستەیەکی حەوت کەسییان دەستنیشانکرد و منیان کرد بە بەرپرسی ئەو دەستەیە.

لە ١٨ی حوزەیرانی ٢٠٠٣، کۆبوونەوەی دووەممان لەگەڵ بریمەر کرد و چەندین لیژنەمان پێکهێنا. کۆبوونەوەکانمان لە هۆڵی کۆنفرانسی پەرلەمان ئەنجامئەدا، لیژنەکان بۆ بواری جیاجیای پێداویستییەکانی ژن بوون لە سەردەمی دوای گۆڕانکاری. لەناو لیژنەکان، هەموو پێکهاتەکانی تێدابوون. بەستنی کۆنگرەکە کەوتە ٩ی تەمووزی ٢٠٠٣، پێش پێکهێنانی ئەنجومەنی حوکم کە لە ١٣ی تەمووزی ٢٠٠٣ دامەزرا. پێشنیازەکانی کۆنگرەمان خستە بەردەمی بریمەر و لەدواییشدا و پاش دروستبوونی، خستمانە بەردەم ئەنجومەنی حوکم.

وتەی کردنەوە و دواوتەی کۆنگرەکە، بە من درا. ئەندامانی کۆنگرە (٤٠٠) بەشداربوو بوون جگە لە میوانەکان و بەرپرسانی ئەمریکی و بەریتانی بۆ کاروباری ژنانیان کە لەو کۆنگرەیە ئامادەبوون، ژنە نوێنەری ئەمریکا (پاوڵە دۆبریانسکی) بە کردەوە رۆژێک لەگەڵماندا بوو. زۆربەی کەناڵە عەرەبی و بیانییەکان ئامادەبوون لەو کۆنگرەیە، کەناڵی جەزیرە یەکێکبوو لەو کەناڵانە و پرسیاری زۆر ئیستفزازیی لێدەکردم، یەکێک لەو پرسیارانەی ئەوەبوو؛ چۆن لەنێو ئەو هەموو پێکهاتە عەرەبە تۆیان دەستنیشانکردووە بە بەرپرسی

کۆنگرە؟ هەرچەند ویستی وەڵامی نەگونجاو بدەمەوە، بەڵام بوارم نەدا، تەنیا ئەوەم وت "ئەگەر ژنێکی عەرەب بوایە ئەو پرسیارەت لێدەکرد؟".

چەند کەسێکی نیشتەجێی بەغدامان دەستنیشانکرد بۆ ئەوەی راپۆرتی کۆتایی کونگرە بخەنە بەردەم ئەندامانی ئەنجومەنی حوکم، (ئەوەی بیرمە) لەوانە: میسون دەمەلۆجی، هەنا ئەدوارد، دکتۆرە رەجا خوزاعی و عەقیلە هاشمی. کە خۆشیان بوون بە ئەندامی ئەنجومەنی حوکم (کە لە ٢٥ ئەندام پێکهاتبوو) و توانییان لە سەردەمی عەدنان پاچەچی، رێژەی کۆتا بەدەستبهێنن و رێژەکە بە ٢٥٪ جێگیربوو. لەدواییشدا بە هەوڵ و کۆششێکی زۆر توانرا هەمان رێژە لە دەستووری نوێی عیراقدا دابنرێتەوە، بەڵام بەداخەوە تەنیا بۆ پەرلەمان و ئەنجومەنی پارێزگاکان پەسەندکرا.

ئەو سەردەمە، من وەزیری ژنان بووم لە حکومەتی فیدراڵ لە بەغدا.

له ١٧ی نیسانی ٢٠٠٤، لەسەر بانگهێشتی کۆمپانیای (هواوی) چینی بۆ دارۆ وەک خێزان و لێپرسراوی ئیدارەی گشتیی، بەرەو چین بەڕێکەوتین. مەبەست لەو سەردانە، چەند ئامانجێکی بازرگانی و ئابووری و بینینی پێشکەوتنەکانی چین لەو دوو بوارەدا و سەردانی پێشانگای نێودەوڵەتیی لە شاری کوانزۆ بوو. ڕێکخەرانی ئەو سەردانە، هەموو ئامانجەکانیان پێکا و لەهەمانکاتیشدا ئێمەیان (دارۆ، بەهرۆز قەشانی، هاوڕێ من) برد بۆ بینینی شوێنەوارە گرنگەکانی ئەو شارانەی کە سەردانمانکردن (پەکین، شەنگهای، کوانزۆ، شنزن)، هەریەکەش بۆ مەبەستێکی تایبەتی بوو.

له شاری پەکین، دارۆ و کاک بەهرۆز، چاویان بە چەند کۆمپانیایەک کەوت بەمەبەستی هەماهەنگیی لەگەڵ کوردستان و ئیدارەی گشتی.

له ٢٢ی نیسان، لە پەکین سەردانی شورای چینمان کرد کە یەکێکە لە حەوت سەرسوڕهێنەرەکەی دونیا، هەر لەوێش بە تەلەفریک ئەو ناوچە شاخاویانەیان پیشاندایـن کە شورای چینی پێدا ڕۆیشتووە. لەهەمان ڕۆژدا سەردانی (پەرستگای ئاسمان)مان کرد کە هێمای پەکینە و گەورەترین پەرستگایە لە چین. لەسەر داوای خۆشمان لە ٢٣ی نیسانی ٢٠٠٤ چووین بۆ سەردان و بینینی جەستەی ماو تسی تۆنگ (سەرۆک کۆماری چینی میللی و دامەزرێنەر و سکرتێری پارتی شیوعی چین) کە لە ٩ی ئەیلولی ١٩٧٦ کۆچی دواییکردووە.

دارۆ و منیش، دەیەها ساڵ لەسەر ڕێبازی ئەو سەرکردەیە ڕۆیشتین و هەڵگری بیروباوەڕی مارکسی - لینینی ئەندێشەی ماو تسی تۆنگ بووین. جەستەی ماو، بە شێوازی تایبەت پارێزراوە لەناو شووشەیەک لە ژوورێکی بێ ڕووناکیی دەستکرد، بەمەبەستی پاراستنی و لە بینایەکی تایبەت بۆ ئەو مەبەستە لە گۆڕەپانی (تیان ئان) بەرانبەر بە دەرگای چینی (سەردەمی ئیمپراتۆریەتی چین) دروستکراوە، لەبەرئەوەی ماو تسی تۆنگ، کۆماری چینی میلليی لەو گۆڕەپانەدا ڕاگەیاند. کاتی چوونە سەردانی، وێنەگرتن و وەستانی زۆر قەدەغەیە، بە جلێکی ڕەنگ خۆڵەمێشیی و قژێکی ڕەش و ڕەنگێکی زەرد، لەناو ئەو شووشەیەدا ڕاکشاوە.

دوای ئەو شوێنە دەچیتە سەر بازاڕێکی تایبەت بۆ فرۆشتنی یادەوەرییەکانی ماو تسی تونگ، هەروەها وێنەکەی خراوەتە سەر دەیان جۆر کەلوپەل، وەک: (قاپی شووشە و کاتژمێر و تابلۆ و تیشێرت...).

شاری پەکین، بە رواڵەت زۆر پاکە، شەقام و ڕێگاکان هیچ جۆرە پیسییەکی تێدا نییە. هەزاران کەسی بە تەمەن، باخەکانی ناوەندی شەقامەکانیان پاکدەکردەوە. وەک بۆیان باسکردین، زۆربەیان بە خۆبەخش یان بەرانبەر کرێیەکی کەم ئەو کارەباندەکرد، بەڵام پەکین لەگەڵ ئەو پاکییە رووکەشە، یەکێکە لە شارە هەرەپیسەکانی دونیا لەڕووی پیسیی هەواوە بەهۆی سووتەمەنی نەگونجاو و ئۆتۆمبێلی زۆر و کارگەکانەوە، زۆر بە ئەستەم ئەتوانی شاخەکانی دەوری چین ببینی تەنانەت لەسەر باڵەخانە بەرزەکانیشەوە، زۆربەی خەڵک لەسەر شەقامەکان ماسکیان بەستووە لەترسی پیسیی هەوا.

لە شاری کوانزۆ، سەردانی پێشانگای نێودەوڵەتیمان کرد کە (١٨٠٠) کۆمپانیای جیاواز بۆ بەرهەمهێنانی پیشەسازیی جۆراوجۆر بەشداربوون. ئەوەی سەرنجی ڕاکێشاین، بەهۆی هەرزانیی وەبەرهێنان و دەستی کار، زۆر کۆمپانیای گرنگ و براندی بەناوبانگی جیهانیی، بەرهەمەکانیان لە چین دروستدەکەن بەهەمان کوالیتیی دیاریکراوی کۆمپانیاکان، بۆ نموونە؛ براندەکانی (پرادە، ئەرمانی، باربری و... هتد). بۆیان باسکردین نیشانەی براندەکان، ئەرکی کۆمپانیا سەرەکییەکانی خۆیانە، هەروەها زۆربەی کەلوپەلی کۆمپانیای (ئیکیا) ی سویدی کە بۆ کەلوپەلی نووسینگە و پێداویستییەکانی ناوماڵە، لە وڵاتی چین و بە کوالیتیی کۆمپانیاکە دروستدەکرێت. هەروەها چەندین کەلوپەل و کەرەستەی ئۆتۆمبێلە بەناوبانگەکانی جیهانیش بەهەمان شێوە لە چین بەرهەم دێت. ئەمانە هۆکارێکن کە ئابووریی چین ڕۆژ بەڕۆژ بەرەو هەڵکشان دەڕوات، ئەمە جگە لە سیاسەتی ئابووریی کراوە.

دوای پێشانگاکە، ئێمەیان برد بۆ بینینی شوێنی گواستنەوەی ئەو کەلوپەلانە بۆ جیهانی دەرەوە. ئەو شوێنە، تازەترین تەکنەلۆژیا و سیستمی ئەلکترۆنیی تیا بەکارهاتبوو، سەدان هێڵی گواستنەوەی ئۆتۆماتیک دەڕۆیشت و بە کەسانی شارەزا بەڕێوەدەبران. ئەو شوێنە زەبەلاحە، چەند سەد کەسێک تێیدا کاریدەکرد، ئەوی تر هەمووی بە ئەلکترۆنیی بەڕێوەدەچوو، ڕاستەوخۆ

دەچووە ناو ئۆتۆمبێلی بارهەڵگر و لەبەر دەرگاکان سەدان لەو ئۆتۆمبێلانە وەستابوون و کەمترین دەستی کرێکاری بەردەکەوت.

شاری کوانزۆ، یەکێکە لە شارە گرنگەکانی چین لەڕووی ئابووری، بەتایبەتی بازرگانی و پیشەسازییەوە. بازاڕەکانی شوێنی سەردانی گەشتیارەکان و بازرگانەکانە، سەدەها کەلوپەلی کۆپی (تقلید) دەفرۆشران، لەو کەلوپەلانەی کە زۆر بوون: فرۆشتنی قوماشی چینی، جۆرەها بەردی بەنرخ بە کوالیتیی جیاواز، تەلەفۆنات و کاتژمێری مارکەی کۆپیکراو لەو بازاڕانەدا هەبوون، ئەگەر یەکێکی شارەزات لەگەڵ نەبێ، لەبنەوە قوڵت دەبڕن و بە نرخی گران پێت دەفرۆشن. لەو بەردانەی کە چین پێی بەناوبانگە بەهۆی سروشتی وڵاتەکەوە، بەردی (جێت کە زۆر پیرۆزە لایان، پیرۆزەی شین، مرواریی دەریای چاندراو و مەرجان و مرواری).

شاری شەنگهای کە ئەویش شارێکی زۆر قەرەباڵغی ئابوورییە، لەو شارە بۆ یەکەمجار سواری شەمەندەفەرێکی خێرا بووین کە خێراییەکەی دەگەیشتە ٣٥٠کم لە کاژێرێکدا. شەمەندەفەرەکە بە سیستمی موگناتیسیی هەڵواسراو بەڕێدەکەوت. هەروەها ئێمەیان بردە سێرکێکی جیهانیی، ئەوەندە سەرسوڕهێنەر بوو تەنیا لە چینییەکان دەوەشێتەوە ئەو جۆرە کردە پاڵەوانیانە بکەن. هەر لەو شارە، چووینە بەرزترین بورجی شاری شەنگهای کە زۆربەی کەناڵە تەلەفزیۆنییەکانی لێبوو، لەسەرەوەی بورجەکە، رێستۆرانتێکی خولاوەی لێبوو و لەوێ نانمان خوارد. هەروەها سەردانی باخی (یو)مان کرد کە لەناو دورگەیەکی ئاویدا بوو، لەسەر ئەو خانووەی کە پادشایەک بۆ باوک و دایکی دروستکردبوو، هەموو هێما ئەفسانەییەکانمان بینی لەناوەوە و لەسەرەوە دروستکرابوون وەک ئەژدیها (تنین) و تەیری عەنقا (قەقنەس)، ئەو دوو هێما ئەفسانەییەش لە زۆربەی هونەر و جلوبەرگەکانیان دەبینرێن. هەرچەندە وڵاتێکە زۆربەی باوەڕیان بە ئاین و خورافیەت نییە، ئەژدیها (تنین) لای چینییەکان مانای هێز و توانایە و ئەتوانێ دەسەڵاتی بەسەر دەریا و ئاو و بارانەوە هەبێ.

لەو ماوەیەدا، ڕۆژ بەڕۆژ تەندروستیی دارۆ بەرەو خراپیی دەڕۆیشت، بەتایبەتی ئازاری پشتی زۆر زیادیکردبوو. چەند جارێک فیسۆتەراپیان (چارەسەری سروشتیان) بۆ هێنا و بە دەرزیی چینی ویستیان چارەسەری

بکەن، بەڵام سوودی نەبوو، بۆئەوەی گەشتەکەش تێک نەچێ، ورەی ئەدایە بەرخۆی و بەبێ پشوودان کارەکانی دەکرد.

شاری شنزن، دەکەوێتە باشووری چین، لەسەر رووباری مرواری، بەرانبەر بە هۆن کۆنگ دروستکراوە لەشوێنی شاری (باوئان) و هاوشێوەی هۆنگ کۆنگ بنیاتنراوە. ناوچەیەکی ئابووری و ستراتیژی و شارستانیی سەردەم و گرنگی چینە، لە سەردەمی سەرۆک کۆماری چین (هۆ جین تاو) بنیاتنراوە کە ئەو سەردەمە بە سەردەمی گۆڕینی سیاسەتی ئابووریی چین بەرەو کرانەوە بە رووی جیهان و گەشەکردنی ئابووری و هاندانی کۆمپانیا خۆماڵییەکان و پشتیوانیکردنیان ئەژمار دەکرێ.

بارەگای سەرەکی کۆمپانیای (هواوی) کە ئێمە میوانی ئەوان بووین، لەو شارەدا بوو. لە شنزن، چووینە بەرزترین باڵەخانەی ئەو شارە کە ئەتوانرا لە چینەکانی سەرەوەی، شاری هۆنگ کۆنگ ببینرێ. جاران ئەو شارە، سەرقاڵی دەرهێنانی مرواری بوون لە دەریا و ئێستا بووەتە شارێکی شارستانیی ئابووریی زۆر گرنگ.

کۆتایی گەشتەکەمان لە چین، شاری هۆنگ کۆنگ بوو، بەهۆی فرۆکەوە گەیشتینە فرۆکەخانەی ئەو شارە، کە لە ساڵی ۱۹۹۷ گەڕێنرابووەوە سەر وڵاتی چین و بەپێی گرێبەستێک ئەو دوو شوێنە (چین و شاری هۆنگ کۆنگ) دوو سیستمی جیاواز و دوو جۆر بەڕێوەبردیان هەیە، خۆشیان دەڵێن یەک وڵات و دوو سیستمی جیاواز.

لە فرۆکەخانە ئێمەیان بەناو ئامێرێکدا بەڕێکرد تایبەت بوو بە وەرگرتنی پلەی گەرمی لەشمان لە ترسی تای ئەنفلۆنزای باڵندە کە ساڵی پێشتر (۲۰۰۳) ئەو پەتایە لەو شارە بڵاوبووبووەوە و بوو بەهۆی مردنی سەدان هاوڵاتی. لەناو ئەو ئامێرەش دارۆ تای نەبوو، تا ئەو رۆژەش هیچ تایەکی نەخۆشییەکەی نەبوو.

شارێکی زۆر پاک بوو، دەیان یاسای بۆ راگرتنی پاک و خاوێنی هەبوو، زۆر پێشکەوتوو بوو، هەزاران باڵەخانەی بەرز بە شێوازی ئەندازیاریی هونەریی بەرەو ئاسمان رۆیشتوون، لەگەڵ ئەوانەشدا زۆر باوەڕیان بە هەندێ خورافات هەیە. بۆ نموونە؛ لە نهۆمی باڵەخانەکان ناونانرێ ژمارە چوار، وتیان

"چونکە نووسینی چوار، هاوشێوەی نووسینی مردنە"، هەروەها بینا بەرزەکان دەبێ بەشێوەیەک بنیاتنرێ بەری شاخەکان نەگرێ بەرانبەر دەریا، چونکە ئەو چیا سەرکەشانە، هێمای ئەژدیهایە (تنینە) لایان کە دەبێ چاوی لە دەریا بێ بۆ ئەوەی دەریا شێت نەبێ و هەڵچێ. لەکۆندا زۆربەی خێزانەکانی ئەو شارە، لەناو بەلەمێکی تایبەت و لەناو رووبار و دەریا ژیانیان بەسەربردووە، هێشتا هەندێ ماڵ هەبوون بەو جۆرە دەژیان و هێشتبوویانەوە بۆ پیشاندانی میوانەکان.

تەندروستیی دارو و ئازارەکانی، تەنگی پێهەڵچنیبوو، زۆر کەم ئەیتوانی هاتووچۆ بکات. زۆرم لێکرد کە نەگەڕێینەوە بۆ کوردستان و بچینە سوید بۆ پشکنین، بەڵام بەگوێی نەکردین، وتی "بەڵێنم بە زۆر کۆمپانیا داوە، با ئەو کارانە جێبەجێبکەم ئەوسا دەڕۆم بۆ سوید". چەند جارێک لێی پاڕاینەوە خۆی نەکاتە قوربانیی کارەکەی و کەس منەتی پێ نییە، بەڵام سووربوو لەسەر قسەی خۆی و لەرێگای تورکیاوە گەڕاینەوە.

لە ٥ی ئایاری ٢٠٠٤ گەیشتینە ئیستەنبوڵ، دوای دوو رۆژ، لە رێگای فڕۆکەوە گەیشتینە دیاربەکر، لە دیاربەکرەوە بە ئۆتۆمبێل گەڕاینەوە بەرەو سلێمانی.

لە رێگا، دارۆ تەندروستیی زۆر خراپبوو، بۆ یەکەمجار کۆکەیەکی زۆر توندی تووشبوو کە نیشانەیەکی باش نەبوو، چەند جارێک لەتاو ئازاری پشتی و کۆکەی، شۆفێرەکە لە رێگا وەستا، هەر لە رێگاوە پەیوەندیم بە دکتۆر یادگارەوە کرد کە هاوڕێی دارۆ بوو و خزمایەتیشمان هەبوو، بۆ ئەوەی کاتێ دەگەین یەکسەر بێتە ماڵەوە بۆ پشکنینی.

ئەوە کۆتا گەشتمان بوو بەیەکەوە. لەو گەشتەدا وتی "نەرمین، ئێمە بەهۆی ئیشوکارەوە خۆمان بیرچووەتەوە وەک خێزان، حەقە ناوبەناو بەیەکەوە گەشتبکەین". بەداخەوە ئەو ئارەزووەمان نەهاتەدی و نەماندەزانی نەک گەشت، بەڵکو ژیانیشمان بەیەکەوە لەکۆتاییدا بوو. ئەو گەشتەمان ئاوێتەی رۆحم بووە وەک فیلمێکی رەنگاورەنگی تەمەنی (٣٥) ساڵ بە هەست و رۆحمدا گوزەردەکات و بیرم ناچێتەوە، بۆ هەمیشە لەگەڵمدا دەژی.

**نەخۆشییەکەی دارۆ**

رۆژی دوای گەیشتنمان بۆ سلێمانی، دکتۆر یادگار هاتەماڵەوە و پشکنینی وردی بۆ دڵی دارۆ کرد و پێیوت "دارۆ، دڵت هیچی نییە و هەمووی هیلاکییە، وردە وردە باش دەبیت"، بەڵام تەندروستیی دارۆ، هەموومانی خستبووە دڵەڕاوکێ و دکتۆر بە دکتۆر دەهاتنە ماڵەوە، دکتۆر محەمەد خۆشناو وتی "پێمباشە تیشک بگری بۆ سنگت". کاتێ چووینە لای دکتۆر تاهیر و ناردینی بۆ تیشک. ئەنجامی تیشکەکە چەند پەڵەیەک لەسەر سییەکانی دەرچووبوو. ئەو رۆژە ١٣ی ئایاری ٢٠٠٤ بوو، رۆژێکی شوومی ژیانمان بوو، ئیتر بڕیارماندا لەڕێگای ئێرانەوە بەرەو سوید دەرچین، لە ١٧ی ئایاری ٢٠٠٤ گەیشتینە تاران و لەتاو ئازاری پشتی و لەشی، نەیئەتوانی بۆ چرکەیەکیش بخەوێ. پزیشکەکانی تاران هەمان شتیان پێ وت.

رۆژی لەدایکبوونی نارین، ٢٢ی ئایارە، قسەم لەگەڵ نارین کرد بۆ دڵنەوایی و ئارامکردنەوەی، بە دارۆم وت "ئەتوانی لەگەڵ نارین قسەیەک بکەی؟". وتی "چی بڵێم؟ دلم نایە". رووی لە دیوار کرد، لەتاوا چوومە باڵکۆنەکە و بە هێمنیی و دڵ پڕلەئازار دەگریام. شەو وتی "نەرمین تۆزێ بخەوە". وتم "کێشەم نییە". وتی "ژیانێکی تازەی پڕ زەحمەت چاوەڕێت دەکات، پشوو بدە"، تێگەیشتم کە هەستی بە چارەنووسی خۆی کردووە، ئەم قسەیە وەک فیشەکێکی ئاگرین بەر رۆح و دڵم کەوت.

کاتێ لە سلێمانی بووین، برادەرەکانی و کەسوکار هەموویان لامانبوون، لەگەڵ ئەو هەموو ئازارە، خەمی کارەکانی و هەرێمی کوردستانی هەبوو. کاک کۆسرەت لێیپرسی؛ دارۆ، دەڵێی چی بچمە بەغدا؟ (ئەوسا سەروبەندی دروستکردنی حکومەتی بریمەر بوو). دارۆی کوردستانی و خەمخۆری وڵات، وتی "تکاتان لێدەکەم ئێرە چۆڵمەکەن، خەڵکی تر بنێرنە بەغدا". لە هەموو لایەکەوە تەلەفۆن دەکرا بۆ پرسیارکردن لە تەندروستی، مام جەلال رۆژانە تەلەفۆنی دەکرد.

دارۆ بەپێی خۆی بەرەو ئێران بەڕێکەوت، بەڵام لە ٢٣ی ئایاری ٢٠٠٤ بە عەرەبانە سواری فڕۆکەی ئێرانیمان کرد بەرەو سوید. لە سوید یەکسەر ئۆتۆمبێلی فریاگوزاریی لەبەردەم فڕۆکەکە وەستابوو، راستەوخۆ چووینە

نەخۆشخانەی کارولینسکا و بەشی تایبەت بە نەخۆشیی شێرپەنجە. ئەو نەخۆشییەی دارۆ، نەک ڕۆژ بەڕۆژ، بەڵکو چرکە بە چرکە خراپتر دەبوو. لە نەخۆشخانە، پزیشکەکان یەکسەر هاتنە سەری و دوای پشکنین و تیشکگرتن، بێهیوایان کردین، وتیان "هیچ چارەسەری نەماوە، شێرپەنجە بە هەموو لەشیدا بڵاوبووەتەوە". ئەم حاڵەتەی دارۆ، لە ملیۆنێک یەک حاڵەتی وا ڕوودەدات، نیشانەکانی دەرناکەون تا دەگاتە کۆتایی. ویستیان بەخۆی بڵێن، بەڵام زۆر لێیان پاڕامەوە کە پێی نەڵێن.

وتیان "ئێوە ئەتوانن پشوو بدەن". بە پزیشکەکەم وت "من خۆم چوار ساڵ لە نەخۆشخانە کارمکردووە. ئەزانم چۆن خزمەتی دەکەم، لێمگەڕێن من ئەم ئەرکە هەڵگرم". پزیشکەکە دوای تۆزێک گەڕایەوە، وتی "ئەتوانی و هەرچیەکت پێویست بوو ئێمە لێرەین".

دەمویست ئەو چەند ڕۆژەی لەژیاندا ماوە، بۆ چرکەیەکیش لێی دوور نەبم، ئیتر پەیوەندیم بە هەموو لایەکەوە کرد. هاوڕێ، بەهۆی پاسپۆرتەکەی، یەک ڕۆژ دوای ئێمە گەیشت و ئارام لە تاقیکردنەوەی سەری ساڵ بوو، مۆڵەتی وەرگرت و لەگەڵ نارین گەیشتن، کەسوکار و برادەران لە زۆربەی وڵاتانەوە گەیشتنە لامان. نەخۆشخانەکە، لەبەر دارۆ، هەموو کارئاسانییەکیان بۆ کردین و دوو ژووریان بۆ تەرخانکردین. ژنێکیان هێنا بۆ ئەوەی قسەم بۆ بکات و ورەم بەرزبکاتەوە. پێموت "ئەوەندەم نەهامەتیی بینیوە پێویستم پێ نییە"، ناوبەناو دەهاتە ژوورەکەمان و دەستێکی دەگرتم و دەڕۆیشتە دەرەوە.

دوا هەناسەی لە ٣١ی ئایاری ٢٠٠٤ دا، دەستی لەناو دەستم بوو، ڕەحمە خانی براژنی دارۆم لەگەڵ بوو. دارۆ، دوای چەند ڕۆژ قسەنەکردن، تەنیا وتی "خێڵی حەمە"، ویستم زیاتر بیدوێنم، بەڵام بێسوود بوو، نەشمزانی مەبەستی چی بوو، ئیتر وردە وردە دەستی لەناو دەستمدا شل و سارد بوو، بەپەلە ڕامکرد بۆ ژووری پزیشکەکان و منداڵ و کەسوکار هاتنە ژوورەوە.

بەهیچ شێوەیەک، قەڵەم ناتوانێ ئەو هەستەم بخاتە ڕستەکانەوە و دەریببڕم، هەستێکە وەک ژوورەکانی لەسێدارەدان و چاوەڕێی دواساتەکانی ژیان، وەک شێت لەم ژوور بۆ ژوورێکی تر دەڕۆیشتم. دارۆ، لەنیوەی ڕێگایەکی سەختی تەماویی، بە تەنیا بەرانبەر دەرگایەکی ڕەشەبا جێیهێشتین، نەمدەزانی شەپۆلە

شێتەکانی دەریای ژیان بەرەو کوێم دەبەن، دەمبەن بۆ بنی دەریا یان ئەتوانم خۆراگربم بەرانبەریان. ئەمپرسی؛ باشە ئەوە چی بوو؟ بۆ وا لەناکاو هات؟ خۆ ئێمە تازە دەمانویست بەیەکەوە ژیانێکی خێزانیی ببەینە سەر، هەموو ژیانمان راکە راکە و نەگبەتی و نەهامەتیی بوو، زۆربەی کات لەیەکەوە دووربووین.

کۆچی نـاوادەی دارۆ، بۆ هەمووومان زۆر قورسبوو. دارۆ، کەسێکی زۆر خۆشەویست بوو لای هەموو کەسوکار، خەمی هەموو لایەکی هەبوو. منداڵەکانمان هێشتا لە باوکیان تێرنەبووبوون، هەر بۆیە زۆر هۆگرییبوون، ئەستەمبوو باوەڕبکەین، ژیانمان دارۆی تیا نەماوە.

هەرچەندە مردن رەوایە و هەموومان بەو رێیەدا دەڕۆیـن، هەر کەسە لە فارگۆنێکی شەمەندەفەرەکەوە و لە وێستەگەیەک دائەبەزێ، بەڵام مردن راستییەکی زۆر تاڵە، نە گریان و نە خەم، ئارامیی بە دڵ ئەدا و نە مانای ژیان و نە خەونەکان و هیواکان وەک خۆیان دەمێنن، هەموویان دەبنە بیرەوەریی رۆژانە و چرکە بەچرکە لەگەڵماندا دەژین.

کەسایەتییەک بوو، دواهەناسەی پێشکەش بە وڵات و میللەتە ستەمدیدەکەی کرد، دواگوڵە ئەرخەوانیی کوڕەکانی شێخ نوری شێخ ساڵح هەڵوەری. کەسایەتییەک بوو؛ پڕاوپڕ لە جوانی، لە توانا، لە دڵسۆزیی، لە پاکی، لە بوێریی و لەخۆبوردەیی. ژیانی بۆ پرسی نەتەوەکەی تەرخانکردبوو لەگەڵ خۆیدا زۆر لە ئاواتەکانی نایە ژێر گڵی وڵاتەکەی.

مانگی ئایاری ٢٠٠٤، حکومەتی کاتیی لە بەغدا پێکهێنرا و یەکێ لەو وەزیرانەی دەستنیشانکرابوو، بەندە بووم بۆ پۆستی (وەزارەتی کاروباری ژنان).

کاتی پرسەکەی دارۆ بوو، هێشتا تەرمەکەیمان لە سوید نەهێنابووەوە کە ئەوەیان پێڕاگەیاندم. بڕیارم دابوو کە ئەو پۆستە وەرنەگرم، بەڵام دوای نزیکەی مانگێک، مام جەلال هاتە ماڵەوە (لە سلێمانی) بۆ سەرەخۆشی، وتی "دارۆ، زیاتر لە من رۆیشتووە وەک لە هەر کەسێکی تر، بەڵام دەبێ ژیان بەردەوام بێ. بریمەر، پێشنیازی تۆی کردووە بۆ وەزیری ژن، منیش رەزامەندیم لەسەر داوە، بۆیە دەبێ بچیتە بەغدا و دەستبەکاربی". وتم "مامە، رۆیشتنی دارۆ زۆر کتوپڕبوو، بۆیە نە باری دەروونیم و نە بارودۆخی ماڵەوەش لەبارن بۆ ئەوەی ئەو بڕیارە بدەم، هێشتا سەری خۆم لەم دۆخە دەرناکەم و ناتوانم منداڵەکان لەم کاتە ناسکەدا جێبهێڵم". وتی "منداڵەکان و هاوسەری هاوڕێش بابێن بەیەکەوە دانیشین" دانیشت لەگەڵمان، فەرمووی "دایکتان بووە بە وەزیر لە بەغدا، ناشمەوێ وەک ژنێکی ئاسایی لە ماڵ دابنیشێ و خەریکی پرسە بێ، ئێوەش هەمووتان کەسی باش و سەرکەوتوون و دەزانم یارمەتیی دایکتان ئەدەن". وتیشی "دایکتان نەهامەتیی زۆری بینیوە و ئازایە، بۆیە لێی رادەبینم، باوکتان لە من زیاتر رۆیشتووە"، چەند جارێک ئەم قسەیەی دووبارەدەکردەوە. منداڵەکان هەموویان وتیان "ئێمە پێمانخۆشە بڕوا". ئیتر مام، وتی "هەموو شتێکت بۆ ئامادە دەکەم، شوێن و پاسەوان و چەک و ئۆتۆمبێل تا شوێنی خۆت دەگری". وتم "مامە، چەند رۆژێک مۆڵەتم بدەری". دوایی لەماڵەوە زۆرمان قسەکرد و رازیبووم بچم. بە بەڕێز مام جەلالم وت "باشە دەچم، بەڵام با چلە بڕوا، دوای چلە دەچم". وتی "باشە، منیش وەڵامی بریمەر ئەدەمەوە".

لە ٢٨ی حوزەیرانی ٢٠٠٤، چوومە بەغدا بۆ سوێندخواردن، پاشان مۆڵەتم وەرگرت و گەڕامەوە. ئەو بەڵێنانەی مام جەلال پێی دابووم، بۆی دابینکردم تا خۆم جێگیربووم.

یەکەمجار بوو وەزارەتی ژن لە عیراقدا هەبێ، بۆیە یەکەم وەزیری ئەو وەزارەتە بووم. لەو کابینەیە، شەش وەزیری ژنی تێدا بوو لە کۆی ٣٦ وەزارەت، کە بریتیبوون لە:

نەسرین بەرواری - وەزیری شارەوانی.
مشکات موئمین - وەزیری ژینگە.
سەوسەن عەلی شەریف - وەزیری کشتوکاڵ.
لەیلا عەبدوللەتیف - وەزیری کاروباری کۆمەڵایەتی.
باسکاڵ ئیشو وەردە - وەزیری کۆچ و کۆچبەران.
نەرمین عوسمان - وەزیری کاروباری ژنان.

غازی مشعەل عەجیل یاوەر - سەرۆک کۆمار ، ئیبراهیم جەعفەری - جێگری سەرۆک کۆمار ،ڕۆژ نوری شاوەیس - جێگری سەرۆک کۆمار، ئەیاد عەلاوی - سەرۆک وەزیران، بەرهەم ساڵح - جێگری سەرۆک وەزیران بوون.

پێکهاتەکانی عیراق هەمووی ڕەچاوکرابوون، لەگەڵ ڕێژەی ژن. حکومەت بۆ ماوەی یەک ساڵ بوو، هەر لەوکاتەش لیژنەی داڕشتنی دەستووری عیراق پێکهێنرا، لەو لیژنەیەش لەکۆی (٥٥) ئەندام، نۆ ژنی تێدابوو.

وەزارەتی ژنان، وەزارەتی دەوڵەت بوو (بدون حقیبة) ڕاستەوخۆ پرۆژە پێشنیازکراوەکان لەلایەن ئەنجومەنی وەزیرانەوە بودجەی بۆ دابیندەکرا، هەربۆیە پێویستی بە کارمەندی زۆر نەبوو. ئەو کەسانەی کە کاروبارەکانمان لەنێوانیاندا دابەشکردبوون، وەک؛ بەڕێوەبەری گشتی و ڕاوێژکار و بەرپرس جگە لە کارمەندی بەڕێوەبردن.

سۆبیە مەحمود. سەلامە سمێسم، ئەزهار شەعر باف، فایزە بابەخان، جوان ئەکرەم، سەلمە جەبۆ، عیماد مەهدی، حسێن مەنسور ئەلعانی کە ڕاوێژکاری یاسایی بوو، ئەوانە و جگە لە دەیان کارمەند کە هاوکارمان بوون. لەو پرۆژە گرنگانەی کە کران و کەوتنە بواری جێبەجێکردنەوە:

پرۆژەی دانانی پلانی ستراتیژیی بۆ وێستگەکانی ژنان لە عیراق، بۆ ئەو مەبەستە لەڕێگای (UN Woman) کۆنفرانسێکمان بەست لە ئوردن، لە شاری عەمان. لە عیراقیش، لە ئوتێل ڕەشید، کۆنگرەیەکی گەورەمان بەست بۆ ژنان، لە هەموو پێکهاتەکان و نوێنەری شارەکانی عیراق بەشداربوون. دوای داڕشتنی ئەو ستراتیژە، لە ئەنجومەنی وەزیران ڕەزامەندیی لەسەر درا و کردمان بە پرۆژە و خستمانە بواری جێبەجێکردنەوە، بەپێی توانا و کات.

لەسەردەمی حکومەتی گواستنەوە، هەر بڕیارێک لە ئەنجومەنی وەزیرانەوە دەربچوایە، هێزی یاسایی هەبوو، لەبەر نەبوونی ئەنجومەنی نوێنەرانی عیراق، هەربۆیە پێشنیازی گۆڕینی هەندێ یاسای دژ بە مافی ژنمان کرد، هەندێکیان سەریانگرت، لەوانە؛ (گەشتکردن بەبێ مەحرەم) خۆشمان چاودێریی بەڕێوەبەرایەتییەکانی گەشت و رەگەزنامەمان دەکرد بۆ جێبەجێکردنی، هەرچەندە بڕیارەکەش دەرچووبوو، هەندێکیان هەر سەرپێچییان دەکرد.

بۆ دابینکردنی هاوکاریی (بیمە) بۆ ژنی کارمەند، کە ئەو هاوکارییە بۆ کاتی منداڵبوون و سکپڕیی و بەخێوکردن بۆ ماوەی ساڵێک بێ. هەروەها بیرۆکەی ئەژمارکردنی هەمان خاڵی خێزاندار بۆ ئەو کچانەی کە شوویان نەکردووە و تەمەنیان گەورەیە، لەکاتی دابەشکردنی زەویدا. ئەو پرۆژەیە کەوتە بواری جێبەجێکردنەوە و نەسریز بەرواری، هاوکاربوو لە جێبەجێکردنیدا.

بەمەبەستی نەهێشتنی توندوتیژیی دژ بە ژنان، پاش گرتنی دەیان کۆڕ و سیمینار، لە دەریای مردوو، لە ئوردن، بە چاودێریی نەتەوە یەکگرتووەکان، پلانمان داڕشت و لەلایەن ئەنجومەنی وەزیرانەوە پەسەندکرا.

لیژنەمان لە هەموو پارێزگاکان پێکهێنا لە ژێر ناوی (لجنه النهوظ بالمرأه) (لیژنەی کاراکردنەوەی ژنان) بەمەبەستی بەرزکردنەوەی تواناکان و چاودێریی حکومەت لە پێشێلکارییەکان دەرهەق بە ژنانی کارمەند و ناردنی کادیرەکان بۆ دەرەوەی وڵات و بینینی دەیان خول لەوبارەیەوە.

بە هاوکاریی رێکخراوی WHO دەیان خولی دروستکردنی کادیری میدیایی جێندەریمان کردەوە و بوو بەهۆی دامەزراندنی ئەو کادیرانە لە دەزگاکانی راگەیاندندا.

لە پرۆژە گرنگەکان، پرۆژەی وشیارکردنەوەی ژنان لە نەخۆشیی شێرپەنجەی مەمک، خۆپشکنین و خۆپارارستن و چارەسەر و هاوکاریی باری دەروونیی. بۆ ئەو مەبەستە لیژنەیەک لە سەرۆکایەتی ئەنجومەنی وەزیرانەوە پێکهێنرا بە سەرۆکایەتی من و ئەندامەکانی لە زۆربەی وەزارەتە پەیوەندیدارەکان بوون، وەک؛ وەزارەتەکانی پەروەردە، تەندروستی، رۆشنبیریی، وەرزش و لاوان، هەروەها وەقفی سوننی و شیعی و... هتد. بودجەکەی لەلایەن ئەنجومەنی وەزیرانەوە دابینکرا، جوان ئەکرەم و د.نەدا ئەلسودانی سەپەرشتییان دەکرد.

سەدان کۆڕ و کۆبوونەوە و خول و سیمینار کرایەوە، سەدان جۆر ڕێنمایی و پۆستەرمان چاپکرد و بڵاومانکردەوە، بۆ ئەو هەڵمەتە سەردانی مەیدانیی نەخۆشخانە و بنکە تەندروستییەکانم دەکرد، دەزگاکانی ڕاگەیاندن و ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگای مەدەنیش زۆر هاوکارمان بوون.

سیمینارێکی گەورەمان ئەنجامدا لەنێوان ژنانی ناو ئەنجومەنی نیشتمانی، وەزیرە ژنەکان و ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی بۆ هەماهەنگی و پشتیوانیی یەکتری.

لەو ماوەیەی کە وەزیری کاروباری ژنان بووم، چەند جارێک داوەتی حکومەتی ئەمریکی بووم بۆ مەبەستی جیاواز. یەکەم سەردان، بەڕێوەچوونی کاروبارەکانی ئەمریکایان نیشاندایین و چەندین کۆبوونەوەی فراوانمان کرد. ئەوکات (پاوڵە دۆبریانسکی) بەرپرسی ژنان بوو، لە حکومەتی بۆش، سەردانی کۆشکی سپی و لەوێش بەشی عیراق و کوردستانیشمان کرد. هەر لەوێ وتەیەکم هەبوو. سەردانی کۆنگرێسمان کرد و لەوێش وتەمان هەبوو. هەروەها سەردانی پنتاگۆنمان کرد و دۆناڵد رامسفێڵد، وەزیری بەرگریی ئەوکاتی ئەمریکامان بینی.

هەروەها لەگەڵ وەزیری ژنانی ئەفغانستان (مەسعودە جەلال)، سەردانی سەرۆکی ئەمریکا (جۆرج بۆش)مان کرد و بردیانینە نووسینگە و ماڵەکەی و (لاورا بۆش) پێشوازیی لێکردین.

لە سەردانی دووەمدا، لە ٣٠ی ئەیلولی ٢٠٠٤، داوەتی ڕێکخراوی (NDI) ئینستتیوتی دیموکراتیی نیشتمانیی بۆ کاروباری دەوڵەت بووین، ، دەیان کۆڕ و کۆبوونەوەمان لە شوێنی جیاجیا کرد. لە کۆبوونەوەی سەرەکیی، وتەی یەکەم، بۆ من بوو، ڕاپۆرتێکمان دەربارەی ژنی عیراق پێشکەشکرد.

لە ٢٨ی شوبات تاوەکو ٩ی ئازاری ٢٠٠٥، بەشداریمانکرد لە ساڵیادی کۆنگرەی بەیجین و لە نیویۆرک میوانداریکراین و لەوێش دەربارەی عیراق و ژنان، لە بارەگای نەتەوە یەکگرتووەکان ڕاپۆرتمان پێشکەشکرد.

لە ١٣ تا ١٦ی کانوونی یەکەمی ٢٠٠٤، بەشداربووین لە خولێکی گرنگ دەربارەی ڕۆلی ژنان لە پرۆسەی هەڵبژاردندا، بەندە، سەرۆکی شاندی عیراق بوو.

دوو کۆنگرەی گەورەی نیشتمانیمان دەربارەی پرسەکانی ژن بەست، یەکەم: لە ساڵی ٢٠٠٤دا. دووەم: کۆنگرەی نیشتمانیی دەربارەی ژن و هەڵبژاردن لە ٣٠ی تەمووزی ٢٠٠٥دا.

بەرنامەیەکمان دەربارەی ژن و هەڵبژاردن داڕشت و جێبەجێمانکرد. پرۆژەی (قاعدة بیانات) لە وەزارەتەکان دەربارەی ڕێژەی بەشداریی ژن لە دەزگاکان و ناوەندی بڕیاردا. هەروەها پرۆژەی بەرزکردنەوەی تواناکانی ژن لە ڕێگای کونسوڵخانەی ئەمریکی و ئیتاڵی.

یارمەتیی بەندیخانەکانی ژنان و بەندییەکانیان لە چەند ڕوویەکەوە، سەردانمانکردن بۆ گوێگرتن لە کێشەکانیان و لەلایەن پارێزەرەکانی وەزارەتەوە دەیان کەیسمان جووڵاند. هەروەها دانانی توێژەر لە بەندیخانەکان و چاککردنی بەشی تەندروستییان، بەشێکی دیکەی ئەرکەکانمان بوون.

هەموو ئەو ئەرکانە و هاوکات داڕشتنی پرۆژەیاسا و چاککردنی یاساکانی عیراق، تایبەت بە ژنان، لە یاسای باری کەسێتی و یاسای باری شارستانی و یاسای سزادان و ناردنیان بۆ بەردەم ئەنجومەنی شورای دەوڵەت و پێکهێنانی لیژنەی تایبەت بەو ئەو مەبەستە، پاشان ڕەزامەندیی لەسەر درا و خرایە بەردەم وەزارەتی داد و دواتر چووە ئەنجومەنی نوێنەرانی عیراق و پەسەندکرا.

هەروەها بەستنی کۆنگرەیەکی تایبەت بە ژن و دەستوور، بۆ هەمان مەبەست، ئەمە جگە لە بەستنی دەیان کۆڕ و سمینار و کۆبوونەوە.

هاوکات، بەستن و ئەنجامدانی کۆنگرەی دووەمی ژنان هەر سەبارەت بە ژن و هەڵبژاردن و دەستوور لە ٣٠ی تەمووزی ٢٠٠٥ لە هۆڵی کۆنگرەکان.

ئەمانە و چەندین کار و چالاکیی دیکە، وەک؛ پەخشکردنی بەرنامەی ڕادیۆیی تایبەت بە ژنان لەلایەن فایزە بابەجان لە ڕادیۆی (محبە) و بەهێزکردنی پەیوەندیی نێوان دەزگاکانی ڕاگەیاندن بەگشتیی لەگەڵ وەزارەتی ژنان.

هەر پەیوەست بە ڕاگەیاندن، لەوکاتەدا، خۆشم بەرنامەیەکی تایبەتم لە تەلەفزیۆنی حوڕییە پێشکەشکرد، لەژێر ناوی (وهکذا سكتت شهرزاد)، واتە؛ بەو شێوەیە شەهرەزاد بێدەنگبوو. دوای چەند زنجیرەیەک ئیشکردن، ئەوکات کە سەرەتای پرۆسەی ئازادیی بوو، هیوایەکی زۆری لەگەڵدا بوو، هەرچەند

باری ئاسایشی بەغدا زۆر خراپبوو، بەڵام ئومێدمان زۆربوو، وردە وردە ئەو ئومێدانەی لەچاڵنرا و کارکردن رۆژ بەڕۆژ سەختتر دەبوو. بەهۆی نەبوونی کات، وازم لە بەرنامەکە هێنا و بەرنامەکە گۆڕدرا و بوو بە (وهكذا تكلمت شهرزاد).

## کۆنگرەی قاهیرە

لە ١ تا ٣ی ئابی ٢٠٠٤، کۆنگرەیەک لە قاهیرە ئەنجامدرا بە سەرپەرشتیی سوزان موبارەک. زۆربەی وڵاتە عەرەبییەکان و هەندێ وڵاتی بیانیش بانگهێشتکرابوون. کۆنگرەیەکی گەورەبوو، هەم لەڕووی بەشداربووان و هەمیش لەڕووی بڕیارەکانەوە.

لەو کەسە ناودارانەی کە بەشداربوون، بۆ نموونە؛ خاتوو بەهیە حەریری - ئەندامی پەرلەمانی لوبنان، شێخە فاتمە کچی موبارەک - سەرۆکی یەکێتیی ژنانی ئیماراتی عەرەبیی یەکگرتوو (یەکێ لە ژنەکانی زاید بن سوڵتانە)، هەر وڵاتە وتەی خۆی پێشکەشکرد و بۆچوونەکانی بە راشکاوانە بۆ ئەندامانی کۆنگرەکە خستەڕوو. هەمووشی لەپێناو بەدەستهێنانی؛ یەکسانی، گەشەکردن، پێویستیی ناوچەکە بۆ بەدیهێنانی ماف و دادپەروەریی و ئاسایشی مرۆڤ و ئاسایشی کۆمەڵایەتی، گرنگیی نەهێشتنی نەخوێندەواری، وەستانەوە دژ بە نەریتی پیاوسالاری و کولتووری دواکەوتوو، رۆڵی میدیاکان لە کەمکردنەوەی جیاکاری و کەمکردنەوەی توندوتیژی. لە وتەی عیراقدا، کە من خوێندیەوە، ئەو خاڵە گرنگانەمان خستە باسەکەمانەوە:

- پێویستیی بەستنەوەی پرسەکانی ژن بە پرسە گشتییەکانەوە و بەکارهێنانی گوتاری سیاسیی ئەرێنی دەربارەی ژن و لابردنی لەمپەرە سیاسی و کۆمەڵایەتییەکان کە رێگرن لە پێشکەوتنی ژن.
- پێگەیاندن و گەشەپێدانی تواناکانی ژن بۆ مەبەستی وەرگرتنی پۆست و بەرپرسیارێتی، تا بچێتە ناوەندی بڕیار و بتوانێ کارەکانی بە سەرکەوتوویی ئەنجامبدات.

- دروستکردنی کەشێکی متمانە بەیەکردن لەنێوان ڕێکخراوە ناحکومییەکان و دەوڵەت.
- دروستکردنی تۆڕی پەیوەندیی لەنێوان ڕێکخراوە ناحکومییەکان لەسەر ئاستی ناوچە و وڵاتە هەرێمییەکان و پەلهاویشتن بۆ دەرەوەی ناوچەکە.
- هاندانی ڕێکخراوەکان بۆ چاودێری و بەدواداچوون دەربارەی پرسەکانی ژن و هەوڵبدەن ڕێگرییەکان کەمبکەنەوە.
- بایەخدان بە توێژی گەنج و پەروەدەکردنیان.
- دروستکردنی دەزگایەکی چاودێریی (مرصد)ێک بۆ پرۆژە و بەرنامە تایبەتەکان بە پرسی ژن.
- هاندانی ژن بۆ بەشداریکردن لەبواری ئابووری و چوونیان بۆ بازاڕی کار.
- جەخت لەسەر بەرنامەی نەهێشتنی نەخوێندەواری و بڵاوکردنەوەی زانیاریی لەسەر جێندەر.
- کردنەوەی خولی تایبەت بۆ بواری ڕاگەیاندن و پێگەیاندنی ژنانی لێهاتوو لەو بوارەدا.
- دانانی بودجەی تایبەت بۆ هەموو ئەو بوارانەی کە باسمانکرد.
- بایەخدان بە تەندروستیی ژن بەتایبەتی تەندروستیی بەرهەم و پارێزگاریی لە دایکایەتی و منداڵ و ڕێکخستنەوەی خێزان.
- هاندانی ژنان و باوەڕبوون بەتواناکانیان.
ئەوانە، خاڵە سەرەکییەکان بوون.

ڕۆژی دواتر، لیژنە پێکهێنرا و منیان لە یەکێ لە لیژنەکان دانا. تەوەرم هەبوو لەسەر گرنگیی ڕێژەی کۆتا و خاڵە ئەرێنی و نەرێنییەکانی. لەو پانێڵە، چەند کەسێک بەشدار بووین، وەک وەزیری (ڕۆشنبیریی نیشتمانی و خێزان و پرسەکانی ژنان) جەزائیرییەک و یەمەنییەک و لوبنانییەک کە بەداخەوە ناوەکانیانم نەنووسیوو. پانێڵەکە، لەلایەن کارۆلین کە ژنێکی سویدی بوو، بەڕێوەدەچوو.

کاتێ کە نۆرەی من هات، سەرەتا باسم لە دۆخی نالەباری سیاسی و ئاسایشیی عیراق کرد کە ئەوسا کردەوەی تیرۆریستیی زۆربوو لە عیراق

و تازه نانەواخانەیەکیان تەقاندبووەوە و دەیان منداڵی هەژاریان کردبووە قوربانیی کە لەبەردەم نانەواخانەکە بۆ نانکڕین وەستابوون. ژنە یەمەنییەکە کە منەقەبە (پەچەی کردبوو) بوو (لەگەڵ ڕێزم بۆ هەموو منەقەبەیەک)، بەڵام ئەو ژنە هیچ شوێنێکی دیار نەبوو، تەنانەت چاویلکەشی لە چاو بوو، وتی "ئێوە لەسەر پشتی تانکی ئەمریکی هاتوونەتە عیراق و سەدامتان لابردووە کە کەسایەتییەکی نیشتیمانپەروەر و عەرەبێکی راستەقینە بوو". وەزیرە ژنەکەی جەزائیریش پاڵپشتیی کرد. منیش زۆر تووڕەبووم و بە یەمەنییەکەم وت "جارێ تۆ باسی سیاسەت هەر مەکە، چونکە نە ئەتناسم و نە ئەتبینم". ڕوومکردە جەزائیرییەکە و وتم "تۆ چۆن باس لە عروبە دەکەی کە وتەکەت بە فەڕەنسی پێشکەشکرد و هەوڵتنەداوە عەرەبی فێرببی، کاتێ لە وڵاتی تۆ، ئیسلامییە توندڕەوەکان کوشتوبڕیان دەکرد، تیرۆر بوو، بەڵام لە وڵاتی ئێمە کە منداڵ دەکوژن، نیشتمانپەروەرن". وتم "من لە کۆڕی وا هەر دانانیشم" و چوومە دەرەوە، میدیایەکی زۆر بەدوامدا رایانکرد و داوای لێدوانیان لێکردم، منیش چیم لەدڵدا بوو وتم و ڕۆیشتم. ویستم بەیەکجاریی بایکۆتی کۆنگرەکە بکەم.

دیاربوو د.ئەیاد عەلاوی لەڕێگای میدیاکانەوە بیستبووی، تەلەفۆنی بۆ کردم و دەستخۆشیی لێکردم، بەڵام ئێوارەکەی سوزان موبارەکم بینی و داوای لێکردم بایکۆتی کونگرە نەکەم و بمێنمەوە، لەبەر دڵی ئەو مامەوە، بەڵام تا کۆتایی بەردەوام چاوپێکەوتنم لەسەر عیراق و رەوشی سیاسیی و ئاسایش دەکرد.

### کەنەدا و ئەزموونی فیدراڵی

لە کۆتایی ساڵی ٢٠٠٤، کاتێ وەزیری ژن بووم لە حکومەتی عیراق، شاندێکیان پێکهێنا بۆ سەردانی کەنەدا، بەمەبەستی شارەزابوون لە چۆنێتیی بەڕێوەچوونی سیستمی فیدراڵیی لەو وڵاتە، تا بتوانین سوودی لێوەربگرین بۆ عیراق. من یەکێکبووم لە ئەندامانی شاندەکە، بەڵام لە گەڕانەوەماندا دوای ماوەیەک، تەنیا یەکێکمان بوو بە ئەندامی لیژنەی نووسینەوەی دەستوور، ئەویش بەهۆی ئەوەی ئەندامی ئەنجومەنی نیشتیمانی بوو، کە قازی، وائیل عەبدوللەتیف بوو.

لە ٨ی ئابی ٢٠٠٥ ئەو لیژنەیە پێکهێنرا.

لیژنەکە، (٥٥) ئەندام بوون:

٢٨ ئەندام، لە پێکهاتەی هاوپەیمانیی نیشتمانی.

١٢ ئەندام، هاوپەیمانیی کورد.

٨ ئەندام، لیستی عیراقیە.

ئەوانی تریش لە کەمایەتییە نەتەوەییەکانی تر بوون.

دوای ئەوە (١٥) کەسیان لە پێکهاتەی سوننە دانا، بەڵام مافی دەنگدانیان نەبوو، چونکە ئەندامی ئەنجومەن نەبوون کە ئەوان بایکۆتی هەڵبژاردنیان کردبوو، دواتر شەش لیژنەیان پێکهێنا.

ئەو رۆژەی کە لە فڕوکەخانەی ئۆتاوای پایتەختی کەنەدا دابەزین، وەک شاندێکی عیراقی، ئێمەیان بردە بەشی VIP و هاتن پاسپۆرتەکانیان لێوەرگرتین. دوای کەمێک چاوەڕوانی، هاتنەوە و بە منیان وت "تۆ بۆت نییە بچیتە ناو کەنەداوە". بەلامەوە زۆر نامۆ بوو، یەکەمجار بوو لەو جۆرە رووداوەم تووشبێت. پاش پرسیارکردن، وتیان "تۆ لە گروپی تیرۆری، تۆ پێشمەرگەی یەکێتی نیشتمانیی بوویت و یەکێتی لای ئێمە بە گروپێکی تیرۆریست دائەنرێ". دوای ئەوە، بۆم دەرکەوت، لەو شەڕەی نێوان گروپە کۆمۆنیستەکان و یەکێتیی نیشتیمانیی پێکدادان دروستبوو، ئەو گروپە کۆمۆنیستە لە زۆربەی وڵاتان سکاڵایان کردووە. من زۆر نیگەرانبووم و وتم "باشە من وەزیرێکی عیراقیم، دەگەڕێمەوە بۆ عیراق و لەڕێگای یاساوە سکاڵا لەسەر ئێوە تۆماردەکەم». بەڵام ئەوسا هاوار کاکە زیاد باڵیۆزی عیراق بوو لە کەنەدا، لە دەرەوە لەگەڵ وەزارەتی دەرەوەی کەنەدا پەیوەندیی کردبوو، ئەوانیش لەگەڵ پۆلیسی ناو فڕۆکەخانە هەولبداندابوو و نەیانهێشت بمنێرنەوە و چوومە ناو کەنەدا. بەداخەوە کە گەڕامەوە بۆ عیراق و لای زۆر لە برادەرانی یەکێتی باسمکرد، ئەوسا زۆر کەمیان ئاگاداری ئەو حاڵەتە بوون.

لەناو کەنەدا، بایەخێکی زۆریان پێداین و بەرنامەیەکی چڕوپڕیان بۆ دارشتبووین.

کەنەدا، وڵاتێکی فراوانە، دووەم وڵاتی جیهانە لەڕووی رووبەرەوە، لە ١٠ بەش و سێ هەرێم پێکهاتووە. وڵاتێکی فرەکولتوور و فرەزمانە، دوو زمانی سەرەکیی هەیە (ئینگلیزی و فەرەنسی)، بە سیستمی فیدراڵیی لیبراڵی بەڕێوەدەچێت و لە وڵاتە هەرە پێشکەوتووەکانە. ٣٣٨ ئەندام پەرلەمان و ١٠٥ ئەندامی ئەنجومەنی پیرانیان هەیە، دەستوورێکی باڵا و هەر هەرێمێکیش دەستووری خۆی هەیە، بەڵام نابێ لەگەڵ دەستووری باڵا، دژبێنەوە. تائێستا شاژنی بەریتانیا، شای کەنەدایە، وردە وردە لەژێر دەسەڵاتی بەریتانیا دەردەچێت بێ کودەتا و بێ شۆڕش، هەنگاو بەهەنگاو بۆی دەڕۆن.

لە شاری ئۆتاوا زیاتر ماینەوە لە چاو شوێنەکانی تر، ئێمەیان بردە ناو پەرلەمان و ئەنجومەنی پیران و بۆیان باسکردین کە سیستمی وڵات چۆن بەڕێوەدەچێ. هەروەها بۆیان روونکردینەوە چۆن دەسەڵات دابەشکراوە لەنێوان ناوچە و هەرێمەکان و پایتەخت و لەسەر چۆنێتیی بەڕێوەچوونی شێوازی فیدرالیەتی ئابووری، زانیارییان داینێ.

هەروەها بە ڕاشکاوانە باسیان لە گرفتەکانیش کرد، بەتایبەتی لە کوبیک. سەردانی دانیشتووە رەسەنەکانیان، وەک (ئەسکیمۆکان و هیندیە سوورەکان) مان کرد، هەرچەندە کەنەدا بەشداریی شەڕی عیراق نەبوو، بەڵام لایان گرنگبوو ئاسایش لە عیراق بەرقەراربێ و پێشکەوتن بەخۆوەببینێ. لەگەڵ ئەوەی درێژترین سنوورپان هەیە لەگەڵ ئەمریکا و پەیوەندییەکی باشیان هەیە لە هەموو ڕوویەکەوە، بەڵام سیاسەتی دەرەوەیان سەربەخۆیە.

زۆر شتی جیاواز و کولتووری جیاوازمان بینی، هەروەها بۆ یەکەمجار بوو شیرینی ماپیلا ببینم و بیخۆم، کە لە چەشنی هەنگوینە و کەنەدا پێی بەناوبانگە، بە عەرەبی پێی دەڵێن شیرینیی (ئەسفندان یان قیقب).

شیرینی ماپیلا (سیرابی مابیلا)، لە داری ماپیل دەردەهێنرێ، ئەو دارە زیاتر لە شوێنی ساردا بوونی هەیە، گەڵاکانی گەورەن، پێکهاتەی ئەو دارە لەزستاندا مادەی نیشاستە لە قەد و رەگەکەی کۆدەکاتەوە، پاشان وردە وردە لە وەرزی بەهاردا دەگۆڕێ و دەبێتە شەکر، بەمەبەستی کۆکردنەوەی شیلە شیرینەکەی. چەند کونێک دەکەنە قەدی دارەکە و شیلەکەی پێدا دێتە

خوارەوە، پاشان کۆدەکریتەوە و دەکولێنرێ و پاکدەکریتەوە و دەبێتە ئەو جۆرە شیلە شیرینە، کە لەرووی تەندروستییەوە بەسوودە و وزەبەخشە و چەندین جۆر بەهای خۆراکیی تێدایە. دارەکە، میوەکەشی شیرینە و لە چەشنی ترێیە.

شاری ئۆتاوا، بە کەناڵی (ریرەوی ئاویی) ریدو بەناوبانگە، کە ئێستا نیمچە دەریایەکە لەناوشار.

کە گەڕامەوە، چوومە چەندین شاری عیراق و دەیان خولم لەسەر سیستمی فیدراڵیەت کردەوە. چوومە بەسرە، کەرکوک، رومادی، بەغدا، بەمەبەستی ئامادەکردنی گەلی عیراق بۆ سیستمی فیدراڵی و تاقیکردنەوەی کەنەدام وەک نموونە بۆ باسدەکردن.

## حکومەتی گواستنەوە

لە ۲۸ی نیسانی ۲۰۰۵، لە ئەنجومەنی نوێنەرانی عیراق، دەنگدرا لەسەر حکومەتی گواستنەوە و لە ۳ی ئایاری ۲۰۰۵ دەستبەکاربووین.

پێکهاتەی دەسەڵاتەکان:

سەرۆک کۆمار: جەلال حسامەدین نورەڵلا تاڵەبانی (مام جەلال)

جێگرەکانی: تارق هاشمی، عادل عەبدولمەهدی

سەرۆکی پەرلەمان (ئەنجومەنی نیشتمانی): حاجم ئەلحەسەنی

جێگرەکانی: حسێن شەهرستانی – عارف تەیفور

سەرۆک وەزیران: ئیبراهیم جەعفەری

جێگرەکانی: ئەحمەد چەلەبی- رۆژ نوری شاوەیس

لە کۆی ۳۲ وەزارەت، شەش وەزارەت بە دەست ژنەوە بوون، دوو وەزارەت لای من بوون (وەزارەتی ژینگە و وەزارەتی مافی مرۆڤ).

ناوی وەزیرە ژنەکان:

وەزارەتی زانست و تەکنەلۆژیا (باسمە بوترس).

وەزارەتی ژینگە (نەرمین عوسمان).
وەزارەتی مافی مرۆڤ (نەرمین عوسمان).
وەزارەتی گواستنەوە و گەیاندن (إتصالات) (جوان فوئاد مەعسوم).
وەزارەتی کاروباری ژنان (ئەزهار عەبدولکەریم شێخلی).
وەزارەتی شارەوانی (نەسرین بەرواری).

وەزارەتی مافی مرۆڤ، بەپێی دەسەلاتی (سلطة الائتلاف) ژمارە ٦٠ سالی ٢٠٠٣ دروستبووە و ئەرکەکانی بەپێی ئەو بڕیارە دیاریکرابوو:

- بایەخدان بە مافی هاولاتیانی عیراق.
- دۆسێی زیندانییەکان و قوربانیانی دەستی رژێمی پێشوو (رژێمی سەدام).
- گۆڕە بەکۆمەڵەکان.
- بەدواداچوون بۆ بارودۆخی گیراوەکان و ئاماری پێشێلکارییەکان بەرانبەریان، هەروەها چاودێریی حکومەت لە چۆنێتی جێبەجێکردنی ئەرکەکانی بەرانبەریان.

ئەوسا (٣٣٨٧٦) بەندکراو، لە بەندیخانەکانی سەر بە حکومەتدا هەبوون. بەشێک لە بەندکراوەکان لەژێر چاودێریی ئەمریکییەکاندا بوون، وەک بەندیخانەی بوکا و ئەبو غرێب.

بوکا، لە ئوم قەسر بوو، بەناوی (سەربازێکی ئەمریکییەوە ناونرابوو کە لە ١١ی سێپتەمبەری ٢٠٠١دا کوژرابوو)، هەربۆیە هەستێکیان دابووە عیراقییەکان کە ئەو بەندیخانەیە، تۆڵەیەکە.

بەندیخانەی بوکا، لە چەند یەکەیەکی نیشتەجێ پێکهاتبوو، زۆربەی بەندکراوەکان لە بەندیخانەی ئەبوغرێبەوە گواسترابوونەوە بۆ بوکا. بوکا، لە چەند روویەکەوە، وەک: خوێندن و خوێندنەوە و چاودێریی تەندروستی، لە ئەبوغرێب باشتربوو.

لەگەڵ ستافی وەزارەت، بە هاوکاریی سوپای ئەمریکا، بە فڕۆکەی تایبەت، سەردانی بەندیخانەی بوکام کرد. بەمەبەستی وەرگرتنی زانیاریی دەربارەی چۆنێتیی بەڕێوەبردنی، هەندی بەندکراوم بینی. لە پرسیار و وەلامدا، زۆربەیان ئەو شوێنەیان پێ باشتربوو لە ئەبوغرێب، نەخۆشخانەیەکی زۆر پێشکەوتووی لێبوو.

کەوتینە گفتوگۆ لەگەڵ ئەمریکییەکان بۆ جوولاندنی دۆسێی بەندکراوەکان، بەتایبەتی ئەوانەی تەمەنیان لە خوار (١٨) سالەوە بوو، هەروەها ئەوانەی لێپرسینەوەیان تەواو بووبوو. پاش گفتوگۆیەکی زۆر، سەرپەرشتیاری بەشی یاسایی و مرۆڤایەتی و یاساناسەکانمان، بەدواداچوونی چڕوپڕیان کرد و توانیمان (٣٧٥) بەندکراو لە بەندیخانەی ئەبوغرێب بەربدەین. بۆ ئەو مەبەستە،

سوپای ئەمریکی، بە هەلیکۆپتەر ئێمەیان بردە ئەبوغرێب، چونکە ئەو ڕێگایە هێشتا لەڕووی ئاسایشەوە بۆ ئۆتۆمبێل گونجاو نەبوو و ڕۆژانە تەقینەوە تێیدا ڕوویئەدا.

لەو سەردانە، نارینی کچم لەگەڵ خۆم برد، بۆ ئەوەی بە چاوی خۆی ببینێ ژیان چۆنە، ڕۆژانی گەنجێتیی باوکی و من کە تەمەنمان لەوێ بردەسەر. دارۆ، چوار ساڵ لەناو ئەو بەندیخانەیە بوو، مامی و خاڵی دایکی لەوێ لەسێدارەدران، (ئەوکاتەی دارۆ لە زیندان بوو، لە یەکێ لەسەردانەکانمان، زۆریان ئازاردابین، کە چوومە ژوورەوە، بە دارۆ و برادەراکانیم وت "ئەگەر ڕۆژێ ببمە وەزیر، بەڵێنبێ هەوڵبدەم زیندان نەمێنێ!")

خەونێکی گەورە لە ڕۆژێکی پڕنەهامەتی، ئەو دەسەڵاتەم نەبوو زیندان نەهێڵم، بەڵام قەدەر پیشانیدام و توانیم کارێکی بچووک بکەم بۆ بەردانی ٣٧٥ زیندانی.

بە هاوکاریی نەتەوە یەکگرتووەکان، ڕاپۆرتی وەرزیمان لەسەر ڕەوشی بەندکراوەکان دەنووسی و لایەنە پەیوەندیدارەکانمان لێ ئاگاداردەکردەوە. هەروەها چەند جارێک سەردانی بەندیخانەی زەعفەرانیەی ژنانم کرد، لەوێش هەندێ کەیسمان جووڵاند بەهۆی ئەوەی کە پێشتر وەزیری کاروباری ژنان بووم، سەردانم کردبوون و زیاتر ئاگام لەحاڵی ناو بەندیخانەکە بوو، کاری چاککردنی بژێوی و نیشتەجێمان زۆر بۆ کردن.

دەیان خولمان بۆ کارمەندی ناو بەندیخانەکان و پۆلیسی بەشی گواستنەوە و پۆلیسی لێکۆلینەوە و دادوەریی کردەوە، لەسەر چۆنێتیی مامەڵەکردن لەگەڵ بەندکراوان بەپێی ڕێنماییەکانی مافی مرۆڤ.

یەکێک لە کارە گرنگەکانمان، سەرپەرشتیی دۆسێی دیل و بەندکراوەکانی شەڕی عیراق و ئێران بوو. بەردەوام لە دانوستاندا بووین لەگەڵ لایەنی ئێرانی بۆ ئازادکردنی دیلەکان و توانیمان هەندێ ئاڵوگۆڕ بکەین، لەوانەی لە شەڕی عیراق - ئێران و عیراق - کوەیت ونبووبوون و دیلکرابوون، لەگەڵ وەزارەتی دەرەوەی عیراق ئەم دۆسێیانە چاودێری دەکران.

کارێکی ترمان چاودێریی ئۆردوگاکانی (موجاهیدینی خەلق) و ناردنیان بوو بۆ دەرەوەی عیراق لە ڕێگای نەتەوە یەکگرتووەکانەوە، هەروەها

ئاگاداربوون لە ئۆردوگاکانیان بۆ ڕێگریی لە دەستدرێژیکردنە سەریان. ئەوانە وەک پەناهەندەی نەتەوە یەککگرتووەکان سەیردەکران، بەڵام لای عیراقییەکان پەسەند نەبوون، بەهۆی هەماهەنگیی پشتریانەوە لەگەڵ ڕژێمی عیراق، بۆیە دەبوایە چاودێربین بۆ ئەوەی خێزانەکانیان لە توندوتیژیی بپارێزین.

لەلایەکی تریشتەوە، کارمان لەگەڵ کەنەدییەکان دەکرد بۆ هاوکاریی پرۆژەکانمان، بەتایبەتی خولەکانی دژ بە توندوتیژی، هاوکات سەرپەرشتیی راپۆرتی سیداو لەگەڵ وەزارەتی ژنان و کۆمەڵگەی مەدەنی و نەتەوە یەککگرتووەکان. هەروەها گەڕان بەدوای گۆڕە بەکۆمەڵەکان و پشکنینی (DNA) بۆ دۆزراوەکان و دەستنیشانکردنیان و قەرەبووکردنەوەی قوربانیانی شەڕی ناوخۆ و تەقینەوەکانی سەر شەقام و ماڵەکان.

کردنەوەی دەیان خول و سیمینار و کۆڕ و کۆبوونەوە بەمەبەستی بڵاوکردنەوەی وشیاریی دەربارەی مافی مرۆڤ و مافی ژنان و منداڵو خاوەن پێداویستییە تایبەتەکان، ئەرکێکی دیکەمان بوو. هاوکات دەرکردنی گۆڤاری مافی مرۆڤ (مجلة حقوق الانسان) و دەیان نامیلکە و بڵاوکردنەوەیان. هەروەها هەوڵی جدیمان ئەدا بۆ ئەوەی راپۆرتەکان شەفافیەتیان تیابێ.

لەو سەردەمە، کاتی دادگاییکردنی سەدام و تاوانبارەکانی تر بوو. لە ١٩ی تشرینی یەکەم ٢٠٠٥، یەکەم دانیشتنی دادگاییکردنیان بوو، لەسەر ڕووداوی دوجەیل، کە لە ساڵی ١٩٨٢ پاش ئەوەی قافڵەی سەدام بەر دەستڕێژ دەکەوێت و هەوڵی کوشتنی ئەدەن. لە تۆڵەی ئەوە، (١٤٨) هاوڵاتی بێتاوان دەکوژن و ١٥٠٠ کەس دەستگیردەکەن و (١٠٠٠) ماڵیش وێراندەکەن.

چووم بۆ ئەو دادگایە و بەچاوی خۆم بینیم چۆن دوژمنەکەم لە قەفەزی تاوانباریدا توندکراوە. ئەم کەیسە، لەلایەن حیزبی دەعوەوە جووڵێنرابوو.

دووەمجار، لەگەڵ (چنار سەعد عەبدوڵلا) ، کە ئەوسا وەزیری شەهیدان و ئەنفالکراوانی حکومەتی هەرێمی کوردستان بوو، لە دادگای تایبەتمەندی تاوانەکان (المحكمة الجنائية المختصة) ئامادەبووین کە لە سەردەمی بریمەر دروستکرابوو، ئەو دادگاییە بۆ پرسی ئەنفال بوو کە لەلایەن کوردەوە جووڵێنرابوو.

هەستێکی زۆر خۆشبوو، بەچاوی خۆت، دوژمنی خۆت ببینی بەهەمان چارەنووسدا ددروا، بەڵام چارەنووسێکی سەرشۆڕانە. رۆژانێ بوو داوامان لێدەکرد کە خالم و کاکە شەهاب و شەهید ئەنوەر لەسێدارە نەدات، بەڵام ئەوا ئێمە بینیمان خودا چۆن تۆڵەی ئەو هەموو خەڵکە بێگوناحەی کورد و عەرەب دەستێنێتەوە.

دووجار وەزارەتی ژینگەم لابوو، لە سەردەمی حکومەتی گواستنەوە بە سەرپەرشتیی د.ئیبراهیم جەعفەری، پاشان لە سەردەمی حکومەتەکەی نوری مالیکی.

لە سەردەمی مالیکی، تەنیا سێ وەزارەت بەدەست ژنەوە بوون، وەزیری مافی مرۆڤ (وجدان میخائیل)، وەزیری ئاوەدانکردنەوە (بەیان دزەیی)، منیش وەزیری ژینگە بووم، لە سالی ٢٠٠٦ دەستبەکاربووین.

ئەوکاتەی کە لە وەزارەتی ژینگە دەستم بە کار کرد، تەمەنی ئەو وەزارەتە تەنیا سالێک و شەش مانگ بوو کە لە سەردەمی (بریمەر) دروستکرابوو، هەربۆیە وەک دامەزراوەیەکی گرنگی ساوابوو. پێشتر، دوو وەزیر کاریان تیادا کردبوو و پێش من، دکتۆر (مشکات موئمین) وەزیر بوو.

پێویستبوو، یاسای وەزارەت و پەیکەری دامەزراوەیی و پێکهاتەکانی، بە یاسا و ڕێنمایی، ڕێکبخرینەوە. هەروەها پەیداکردنی شوێن و دروستکردنی دامەزراوەکانی وەزارەت لە هەموو شارەکانی عیراق، جگە لە کوردستان. هەروەها دارشتنی ستراتیژ و پلانی سالانە و بودجەی سالانە بەشێوەیەک کە بەپێی سیستمێکی سەردەمیانە کاربکەین.

دارشتنی ستراتیژ، بۆ هەموو عیراق بوو بە کوردستانیشەوە، بۆیە کادیرانی حکومەتی هەرێمیش بەشداربوون، بە هاوکاریی ڕێکخراوی پرۆگرامی ژینگە لە نەتەوە یەکگرتووەکان (UNEP).

بەهۆی ئەوەی عیراق تووشی کێشەی گەورەی ژینگەیی بووبووەوە و ڕژێمە یەک لەدوای یەکەکانی، ژینگەیان پشتگوێ خستبوو، یان زۆر کەم کاریان لەسەر کردبوو. بەتایبەتی لە سەردەمی ڕژێمی سەدامدا کە من بە سەردەمی تیرۆری ژینگەی ناودەبەم، بەهۆی ئەو هەموو شەڕوشۆڕەی کە تووشی عیراقی کردبوو. ئەمە جگە لەو سیاسەتە نادروستانەی کە ئەنجامی ئەدا. لەوانە: کێشەی پیسبوونی کیمیایی کە دیاردەیەکی ترسناک بوو، ئاستی پیسیی ئاوی دەریا و ڕووبارەکان و خاکی کشتوکالی و ژینگەی زیندەوەر، ئەو گۆڕانکارییانەی کەشوهەوا کە دەرئەنجامی شەڕ و وشککردنی زۆنگاوەکان و بڕینەوەی ملیۆنەها دار خورما و سووتان و وێرانکردنی زیاد لە (٤٥٠٠) گوند و سووتاندنی سەدان باخ بوو، بەکارهێنانی چەکی کیمیایی و چەکی

قەدەغەکراو، لبدانی ئیسرائیل لە ویستگەی ئەتۆمیی) تویثە) و دەیان کرداری تر. ئەمانە بوونەتە هۆی؛ دابەزینی جۆریی ژیانی مرۆڤ و زیندەوەرەکان،

داکشانی ریژەی تەمەنی مرۆڤ، کەمبوونەوەی خزمەتگوزاری، زیادبوونی ریژەی هەژاریی، هەڵکشانی ژمارەی دانیشتوانی شار و بێ بەرنامەیی و دیاردەی ئاوارەیی و راگویزان و گواستنەوەی ناڕیک لە گوندەکانەوە بەرەو شارەکان.

کە باس لە ژینگە دەکەین، باس لە پیکهاتەکانی دەکەین: (ئاو، زەوی، هەوا، جۆرەکانی زیندەوەر، گۆڕانکاری لە کەشوهەوا، ئاسایشی خۆراک، کولتوور و پاشماوەکان و زانیاریی دروست و وشیاریی ژینگەیی)، بۆیە دەبوایە بایەخ بە هەموو ئەو لایەنانە بدریت بەپیی پلانیکی دوورمەودا بۆ داهاتوو لە روانگەی ستراتیژیی ژینگەوە و هەروەها ستراتیژی وەزارەتی ژینگە لە روانگەی وەزارەت و دامودەزگا پەیوەندیدارەکانەوە، دەبوایە هەموو بەشداربن بۆ پاریزگاریی لە ژینگە لەوانە:

١-جەختکردنەوە لەسەر هەنگاوە کردارییەکان بۆ کەمکردنەوە و ریگری لە پیسبوون.

٢-گەشەپیدانی توانای دامودەزگاکان و پیگەیاندنی توانا مرۆییەکان لە هەموو ئەو بوارانەی پەیوەندییان بە ژینگەوە هەیە.

٣-هاندانی ریکخراوەکانی کۆمەڵگای مەدەنی لە چالاکیی ژینگەیی جیاوازدا.

٤-هەوڵدان بو بەکارهینانی کەرەستەی سروشتیی بەشیوەی دروست و گەشەی بەردەوام.

٥-گەشەپیدانی رۆڵی دەزگاکانی میری و تاک، بۆ بڵاوکردنەوەی زانیاری و رۆشنبیریی دەربارەی ژینگە.

٦- دارشتنی بەرنامەی خویندنی تایبەت لە سیستمی خویندن، لەسەر چۆنیتی پاریزگاریی لە ژینگە، لە هەموو قۆناغەکانی خویندن لە سەرەتاییەوە تا زانکۆ.

٧- کردنەوەی کەناڵی پەیوەندیی لەگەڵ دەزگاکان و دامەزراوەکانی ژینگەیی، لەسەر ئاستی ناوچە و نیودەوڵەتی، بۆ سوودوەرگرتن لە تواناکانیان.

٨-بەشداریکردنی عیراق لە ریکخراوە جیهانییەکانی ژینگە و پابەندبوون بە رینمایی و مەرجەکانیانەوە.

هەموو ئەمانە و زیادکردنی چاودێریی لەسەر جۆری ئاوی خواردنەوە و پیسییەکان لەسەر جۆری هەوا و کێشەی خۆڵ و خاشاک و پاشماوە و پاشەڕۆکان، هەروەها چاودیریی چالاکییە پیشەسازییەکان و پێشبینیی کاریگەریی ژینگە، چاودێریی بیابانەکان و زەوییە کشتوکاڵییەکان و جۆرەکانی زیندەوەر، چاودێریی زۆنگاوەکان و پاشماوەی مادە تیشکبەرەکان و پیسبوونی بە تیشک و سەرچاوەی مادە تیشکبەرەکان، دەبوایە پلانی کورتخایەن و درێژخایەن بۆ ئەو بابەتانە دابرێژرێن.

دوای ماوەیەک، بە بڕیاری سەرۆکایەتی ئەنجومەنی وەزیران، بەڕێوەبەرێتی گشتیی (مین) لە وەزارەتی پلاندانانەوە گواسترایەوە سەر وەزارەتی ژینگە و دەبوایە ئەویش پلانی بۆ دابڕێژدرێ، چونکە عیراق بە ناوچەیەکی پیسبوو بە مین دائەنرێ و لە دونیادا، زورترین مینی بەرانبەر تاک بەردەکەوێ.

بۆ ئەو مەبەستانەی کە باسمانکردن، پێویستبوو سەدان پرۆژە جێبەجێبکرێ و دەرگا بەسەر هەموو لایەنەکاندا بکەینەوە کە هاوکارو ڕێنیشاندەرمان بن.

هەندێ پرۆژەمان لەسەر ئاستی نێودەوڵەتی و ڕێکخراوە نێودەوڵەتییەکان ئەنجامدا، لەوانە: ئەو پروژانەی کە لەگەڵ ڕێکخراوی بەرنامەی نەتەوە یەکگرتووەکان بۆ ژینگە (UNEP) کەوتنە بواری جێبەجێکردنەوە، وەک:

١-هاوکاریی بەڕێوەبردنی ژینگە لە عیراق (الادارة البيئية). ئامانجی ئەو پرۆژەیە، هەڵسەنگاندنی باری ژینگەیی ناوچە هەرە پیسبووەکان لە عیراق بەهۆی؛ شەڕە یەک لەدوای یەکەکان، پاشماوەی کاولکارییەکان، تاڵانکردنی ناوچە پیشەسازییەکان و گەنجینەکان، گواستنەوەی ئەو ئۆتۆمبێل و تانکانەی کە بە مووشەکی تیشکدار تێکشکابوون لەلایەن خەڵکەوە.

(٣٠٠) ناوچە، پیسبوونی ژینگەیان بە ڕێژەیەکی زۆر هەبوو، بەڵام لەوانە پێنج ناوچەی زۆر پیسمان هەڵبژارد بۆ ڕاهێنان و پێگەیاندنی کادیرەکانی وەزارت و پاککردنەوە، کە ئەم ناوچانە بوون:

- ناوچەی میشراق: گەنجینەی مادەی گۆگرد بوو (کبريت)، بەبێ ڕەچاوکردن سووتێنرابوو. ئەو مادە کیمیاییانەی سووتێنرابوون، لەنێوان نیو بۆ یەک ملیۆن تەن بوون و هۆکاربوون بۆ دەرچوونی گازی$SO_2$ .

- ناوچەی خان زاری: پیسبوون بە مادەی چوارەم ئەسیلی قورقوشم (رباعي اثيل الرصاص)، خەڵکی ناوچەکە، مادەکانیان رشتبوو، بەرمیلەکانیان بەتاڵکردبوو و بردبوویان کە نزیکەی ٥٠ تەن بوو.

- ناوچەی گەنجینەکان (صويرة): لەوێیش بەرمیلەکانی مادەی (قەلاچۆکردنی مێرووەکان و جبوه)یان بەتاڵکردبوو.

- ناوچەی (منشاة القادسية): سەر بە پیشەسازی سەربازی بوو، هەندێ پێکهاتەی ژەهراویی کە بۆ بۆیەکردنی کەرەستەی کارەبایی بەکارهاتبوون، لەوانە: سیانید و کرۆمی شەشی مەترسیدار.

- ناوچەی عویرج: زەوییەکەی بەکارهاتبوو بۆ کۆکردنەوەی (ئالیاتی) سەربازی و تۆپ و چەکی لێدراوی شەڕەکان، بەشێکیان بە مووشەکی تیشکی یۆرانیۆم لێیاندرابوو، واتە پیسبوون بە تیشک.

٢-بەڕێوەبردن و زیندووکردنەوەی ناوچە زۆنگاوەکان و بەکارهێنانی تەکنەلۆژیا و ئامێر و ڕێگای گونجاوی ژینگەیی. ئامانجی ئەو پرۆژەیە، دابینکردنی ئاوی خواردنەوە و چارەسەرکردنی پاشەڕۆکان و ئیدارەدانی ژینگەیەکی تەندروست بۆ ناوچە شێدارەکان و گەشەپێدانی توانا مرۆییەکان لەو رووەوە.

٣- پرۆژەی چارەسەری پیسبوون بە یۆرانیۆمی (پیتێنراو) و گەشەپێدانی توانا مرۆییەکان لەو بارەیەوە.

بە هاوکاریی ڕێکخراوی تەندروستیی جیهانی (WHO) چەند پرۆژەیەکی هاوبەشمان هەبوو لەگەڵ وەزارەتی تەندروستیی عیراق وەک:

١- چاودێری و پشکنینی جۆری ئاوی خواردنەوە.

٢- پرۆژەی خۆپارێزیی کیمیایی.

٣- هاوکاریی تەکنەلۆژی بۆ جۆری ئاو.

٤- گوندی تەندروستی، ئەو پرۆژەیە، بۆ دەستنیشانکردن و دروستکردنی گوندی تەندروستی نموونەیی بوو.

٥- چۆنیتی مامەلەکردن لەگەڵ پاشەڕۆ و پاشماوەی نەخۆشخانەکان و جیاکردنەوە و کۆکردنەوەیان.

ئەو پرۆژانەی بە هاوکاریی بانکی نێودەوڵەتی ئەنجام ئەدران:

١- پرۆژەی پەرەپێدانی رۆشنبیری و زانیاریی ژینگەیی.
٢- گەشەپێدانی مرویی لەبواری ژینگەیی.
٣- هەڵسەنگاندنی ژینگە.
٤- پرۆژەی ئیدارەدانی کارەساتی ژینگەیی.

لەسەر بودجەی حکومەت، بینای دەزگاکانی ژینگەمان لە هەموو شارەکان دروستکرد، بە شوێنی تاقیکردنەوەکان و بە ئامێری پێویستەوە.

کاتێ دەستبەکاربووم، عیراق، لە هیچ رێکخراوێکی جیهانیی، ئەندام نەبوو. هەوڵی بێوچانمان دا لە بەئەندامبوونی عیراق لە رێکخراوەکانی ژینگەدا، ئەو رۆژەی کە جێمهێشت. لە (١١) رێکخراوی گرنگدا ئەندام بوو. بەشێکیان هاوکاری عیراق بوون لە بەرەنگاربوونەوەی کێشە ژینگەییەکان.

هەروەها چەند رێککەوتننامەیەکمان کرد لەسەر هاوکاری و پەیوەندیی ژینگە لەگەڵ چەند وڵاتێک، لەوانە:

- ئێران، لە ٢٥ ٢٨ی کانوونی دووەمی ٢٠٠٨، ئەو رێککەوتنەمان واژووکرد بە ئامادەبوونی بریکاری وەزیر و چەند کارمەندێکی وزاری. لایەنی ئێرانی، خاتوو فاتیمە جەوادی، جێگری سەرۆک کۆمار واژووی کرد. لەکاتی واژووکردنەکەدا، سەرپۆشەکەم لاچوو، فاتیمە جەوادی بەپەلە سەری داپۆشیمەوە، ئەمە لە هەموو کەناڵەکانەوە بینرابوو.

- واژووکردنی رێککەوتننامەی هاوکاری و پەیوەندیی لەگەڵ ئوردن، ئەوکات خالید ئێرانی وەزیری ژینگە بوو. (واژووکردنەکە لەلایەن من و خالید ئێرانی)یەوە بوو.

- لەگەڵ ئەنجومەنی ژینگەی ئیماراتی عەرەبی، واژوومان لەسەر هاوکاریی ژینگەیی و دانانی ستراتیژ کرد بۆ هەڵگرتنەوە و خۆپاراستن لە مین بۆ ساڵەکانی (٢٠١٠- ٢٠١٢)، هەروەها پاراستنی باڵندەی حیبارە و زۆرکردنی و ئەو باڵندانەی کە ناوچەی زۆنگاوەکانیان جێهێشتبوو بۆ گەڕانەوەیان و زۆرکردنیان.

- لەگەڵ حکومەتی تورکیا و ئێران و سوریا و قەتەر، گرێبەستێکمان بەیەکەوە واژووکرد تایبەت بە خۆڵبارین و چارەسەری هاوبەش و چاندنی هەزاران دۆنمی ناوچە بیابانەکان بە رووەکی بیابانی و پرۆژە بۆ هەمان

مەبەست. (محەمەد جەواد محەمەد - جێگری سەرۆک کۆماری ئێران، سەرۆکی دەزگای ژینگە بوو، کەوکەب سەباح - وەزیری ژینگەی سوریا، فەیسەڵ ئۆغڵو - وەزیری ژینگەی تورکیا، وەزیری ژینگەی قەتەری) پرۆژەکە لەلایەن وەزیرەکانەوە واژوو کرا.

- پرۆژەیەکی هاوبەش و ڕێککەوتننامەیەکمان کرد، لەگەڵ: ئوردن، سوریا، ئیماراتی عەرەبی، کوەیت، ئێران، تورکیا، لوبنان. بۆ پاراستن و بایەخپێدان بە هەندێ جۆری باڵندەی تایبەت کە مەترسی لەناوچوونیان لەسەربوو بەهۆی ڕووداوەکانی خراپبوونی ژینگە و گۆڕانکاریی کەشوهەوا.

لەو ڕێکخراوە جیهانی و نێودەوڵەتییە گرنگانەی کە عیراق واژووی بەئەندامبوونی لەسەر کرد و ڕاستەوخۆ پەیوەندیی بە ژینگەوە هەبوو، کە بە ڕەزامەندیی ئەنجومەنی وەزیران و وەزارەتی دەرەوەی عیراق و پەرلەمانی عیراق بوون:

- ڕێککەوتننامەی ڤیەننا و پرۆتۆکۆڵی مۆنتریاڵ، تایبەت بە کەرەستەکانی نەهێشتنی مادەی ئوزۆن، بۆ ئەم مەبەستە پلانی نیشتمانیی عیراقیمان داڕشت بۆ هەنگاونان بۆ لەناوبردنی کەرەستەکانی لابردنی توێژی ئۆزۆن.

لەماوەی (٣٠) ساڵی پێش لەناوبردنی ڕژێمی سەدام، عیراق تووشی دەیان شەڕی هەرێمی و نێودەوڵەتی و شەڕی ناوخۆ بوو، ئەمە بوو بەهۆی داڕمانی ژێرخانی ئابووری و سیاسیی عیراق، ئەمانە هەمووی هۆکاریش بوون کە عیراق نەیئەتوانی بەدوای هیچ پرسێکی ژینگەییدا بڕوات و ببێتە ئەندام لە ڕێککەوتننامە و بەڵێننامەکانی پەیوەست بە ژینگە.

لە ساڵی ٢٠٠٧ کە ئەوسا من وەزیری ژینگە بووم، یەکێ لەو ڕێککەوتننامانەی کە بڕیارماندا ببینە ئەندام، ئەم ڕێککەوتننامەیە بوو کە لە ٢٥ی حوزەیرانی ٢٠٠٨، پێویستییەکانی بوون بە ئەندام لە ڕێککەوتننامەی ڤیەننا و پرۆتۆکۆڵی مۆنتریاڵ و چوار ڕێنماییە تازەکەیمان پێشکەشکرد، دوای سێ مانگ عیراق بوو بە ئەندامی ژمارە (١٩٣)ی ئەو ڕێککەوتننامەیە.

لە کۆبوونەوەی (٢٠)ی لایەنەکان لە شاری دەوحەی پایتەختی قەتەر کە ئەوکات من سەرپەرشتیاری شاندی عیراق بووم، وتەیەکم پێشکەشکرد و ڕامگەیاند کە ئێمە ڕووبەڕووی دەیان گرفتی ئابووری و ئاسایشی و سیاسیی بووینەتەوە، ناتوانین بەشێوەیەکی باش و گونجاو مەرجەکانی ئەو

ڕێککەوتننامەیە بە تەنیا جێبەجێبکەین و پێویستمان بە هاوکاریی و هەماهەنگیی هەیە، لە کۆبوونەوەی (٥٤ و ٥٥)دا بڕیاری هاوکاریی عیراقیان دا.

بۆ ئەو مەبەستە، دەزگای (یەکەی ئۆزۆنی نیشتمانی)مان پێکهێنا بە سەرپەرشتیی د. توعمە ئەلحلو، بۆ لەناوبردنی لەسەرخۆی مادەکانی؛ کلۆر، فلۆر، کاربۆن، هالونەکان، چوارەم کلۆریدی کاربۆن. وەزارەتەکان هاوکارمان بوون بۆ ئەنجامدانی ئەم پرۆژەیە، کە تاکۆتایی (٢٠١٢) بەردەوام دەبوو.

- ڕێککەوتننامەی بازل، بۆ چاودێریی گواستنەوەی مادە مەترسیدارەکان لە سنوورەکانەوە، پاش ئەوەی کاری زۆری بۆ کرا لە ٣١ی کانوونی دووەمی ٢٠١١ بوو بە یاسای ژمارە سێ لە عیراق.

- ڕێککەوتننامەی (UNFCC) تایبەت بە گۆڕانکاریی کەشوهەوا کە تایبەتە بە جێگیرکردنی گازە گەرمکەرەکان و دەبێتە هۆی قەتیسبوونی گەرمای ڕێکخراو، بوو بە یاسای ژمارە (٧) لە ٢٣ی ئازاری ٢٠٠٩.

هەروەها پرۆتۆکۆلی تایبەت بە هەمان مەبەست، عیراق پابەندبوونی لەنێوان (٢٠٠٨- ٢٠١٣) لەگەڵ وڵاتان جێبەجێ دەکرد.

- ڕێککەوتننامەی ڕوتردام، تایبەت بە وەرگرتنی ڕەزامەندیی پێشوەخت بۆ گوێزانەوەی مادە کیمیاییەکان و قەڵاچۆکەرەکان لە بازرگانیی جیهانیدا (PIC).

- ڕێککەوتننامەی ڕامسار، تایبەت بە زۆنگاوەکان و زەوییە تەڕەکان کە بایەخێکی نێودەوڵەتییان هەیە، بەتایبەتی شوێنی باڵندە ئاوییەکانن.

- ڕێککەوتننامەی قەڵاچۆکردن و نەهێشتنی دیاردەی بە بیابان بوون (UNCCD)، پێکهاتووە لە هاوکاری و هاوبەشیی نێودەوڵەتی بۆ چارەسەرکردنی کێشەکانی ژینگەی جیهانی، (١٨٣) وڵات لەگەڵ هەندێ دامودەزگای نێودەوڵەتی و ڕێکخراوی مەدەنی و تایبەتی کاری تێدا دەکەن.

- ڕێککەوتننامەی تایبەت بە جۆرەکانی بایۆلۆژی (الاتفاقية المتعلقة بالتنوع البايولوجي) بەپێی یاسای ژمارە ٣١ی بەرواری ١٨ی ئابی ٢٠٠٨، بوو بە بڕیار و کەوتە بواری جێبەجێکردنەوە.

بۆ ئەو مەبەستە سەردان و بەشداریمان لە چەندین کۆنگرە و کۆبوونەوەدا کرد، لەوانە سەردانی بەرازیل و بەشداری لە کۆنگرەیەک لە شاری کۆرۆچیبا، لە ساڵی (٢٠٠٦) بۆ هەمان مەبەست لە ئەڵمانیا، لە شاری بۆن.

هەروەها گەڕاندنەوەی عیراق بۆ بوونی بەئەندام لە (ڕێکخراوی هەرێمیی بۆ پارێزگاری لە ژینگەی دەریا – المنظمە الاقلیمیە لحمایە البیئە البحریە). پاش سڕکردنی عیراق لە ئەندامێتی لە سەردەمی ڕژێمی سەدام و لە کۆنگرەیەک لە شاری (مەسقەت)ی پایتەختی (عوممان)، توانیمان ئەندامێتی عیراق بگەڕێنینەوە، توانیشمان بەشێک لەو قەرزانەی کەوتبوونە سەر عیراق لە ڕێککەوتننامە کۆنەکە، لێخۆشبوونیان بۆ وەرگرین.

جگە لەمانە، بەلێننامەی ئۆتاوا بۆ قەدەغەکردنی مین، لە ١٥ی ئابی ٢٠٠٧، عیراق واژووی لەسەر ئەو ڕێککەوتننامەیە کرد، بەوە دەبووین بە یەکێک لەو دەوڵەتە هاوبەشانە و لە ١ی شوباتی ٢٠٠٨ەوە ئەو ڕێککەوتننامەیە کاتی بۆ دەوڵەتی عیراق دیاریکرد و دەبوایە لە ١ی شوباتی ٢٠١٢ هەرچی مینی بەکارهاتووی دژ بە تاک هەیە، نەهێڵرێ و لەناوببرێن، ئەوانەی کە لە عەمبارەکانیشدا هەلگیراون.

دەبوایە ساڵانە ڕاپۆرتمان بدایەتە (ئۆتاوا) بۆ ئەو مەبەستە، ڕاپۆرتەکان وەزارەتی ژینگە و وەزارەتی بەرگریی عراق دایاندەڕشت.

بۆ هەمان مەبەست و پاککردنەوەی زەوییەکانی عیراق لە مین، لەگەڵ هەرێمی کوردستان و بە هاوکاریی ڕێکخراوی گەشەپێدانی نەتەوە یەکگرتووەکان و هەندێ ڕێکخراوی پەیوەندیدار، پلان و ستراتیژیمان تا ساڵی (٢٠٢٠) داڕشت، بە تەرخانکردنی بودجە لەلایەن حکومەتی عیراقەوە و هاوکاریی نێودەوڵەتی بۆ ئەو مەبەستە.

ئەوکات سەروکی شاندی عیراق بووم بۆ ئیسپانیا، لە کۆبوونەوەی ئەنجومەنی نێودەولەتی بۆ چاککاریی سروشت (مجلس الدولي لصيانة الطبيعة (IVCN)، لەوێ هەوڵمدا کۆبوونەوەیەک لەنێوان وەزیرە عەرەبەکان ڕێکبخەم بەمەبەستی هاوکاری و هەماهەنگی و یەکگوتاریی لە پرسە ژینگەییەکان و هەر لەوێش چاوپێکەوتنێکم لەگەڵ شازادەی شانشینی ئیسپانیا هەبوو بەمەبەستی هەماهەنگیی لەبواری ژینگە.

سەرۆکی شاندی عیراق بووم بۆ دوبەی، لەسەر چۆنێتیی ئیدارەدانی کەرەستەی کیمیایی.

هەروەها واژۆکردن لەگەڵ هەندێ وڵات بۆ هاوکاری و هەماهەنگی لەبوارەکانی ژینگە، لەوانە: (ئێران، ئوردن، میسر، ئیمارات و کوەیت) لە دەرەوەی رێککەوتنە گشتییەکان.

سەرۆکی شاندی عیراقی بووم لە کۆبوونەوەکانی ئیدارەدانی زۆنگاوەکانی عیراق لە شاری کیۆتۆ لە یابان، کە بەشێک لە پرۆژەی هاوبەشی نێوان عیراق و یابان تەواوکرابوو بە هاوکاریی مادی و چاودێریی حکومەتی یابانی.

پرۆژەی عیراق (پرۆژەکەی ئێمە)، لە لیژنەی (٢١)ی بەرنامەی نەتەوە یەکگرتووەکان، بە باشترین پرۆژەی ساڵی (٢٠٠٧) دانرا.

بەمەبەستی گەڕانەوەی عیراق وەک وڵاتێکی گرنگ و بایەخدار، بەشداریمانکرد لە زۆربەی کۆنگرە جیهانییەکان.

هەروەها هەوڵدان بۆ بەکارهێنانی سەرچاوەی نوێی ژینگەدۆستیی بۆ وزەی کارەبا، وەک: (ئاو، خۆر، هەوا) لەگەڵ لایەنە پەیوەندیدارەکان.

لەلایەکی تر پرۆژەی (لاما) بۆ پاککردنەوەی ناوچەی (تویثة)، کە دەکەوێتە باشووری بەغدا، بارەگای سەرەکیی ئەنجومەنی وزەی ئەتۆمیی بوو (مقر الرئيسي لهيئة الطاقة الذرية) بنکەی سەرچاوەکانی مادە تیشکدارەکان بوو، دووجار ئەو ناوچەیە بەر هێرشی ئاسمانیی کەوت، جارێکیان، لە ساڵی ١٩٨١ لەلایەن هێزی ئاسمانیی ئیسرائیلی، بەناوی هێرشەکانی (کۆبرا). دووەمجاریش، لە ساڵی ١٩٩١ لەلایەن هێزی ئاسمانیی ئەمریکی بوو، کە ناوچەکەی خاپوور کرد. لەلایەکی ترەوە لەبەر نەبوونی چاودێریی دەوڵەتیی لە سەردەمی رژێمی بەعس، خەڵک کەوتە تاڵانکردنی کەلوپەلەکان و بردنی تانکەرەکان و بەتاڵاکردنیان لە مادە تیشکدارەکان، بۆیە ناوچەکە بە ناوچەیەکی مەترسیداری پیسبوو بە تیشک ئەژمار دەکرێ. بۆ ئەو مەبەستە دەیان کۆبوونەوەمان ئەنجامدا لەگەڵ لایەنە عیراقییە پەیوەندیدارەکان، وەک وەزارەتی زانست و تەکنەلۆژیا و ئەنجومەنی گشتیی تیشک.

هەروەها کونسوڵخانەی ئەمریکا و ئاژانسی نێودەوڵەتیی وزەی ئەتۆم و ئەنجومەنی راوێژکاریی زاناکانی عیراق لەوبارەیەوە، دوای مشتومڕێکی زۆر رێگایان دا ئاژانسی نێودەوڵەتیی وزە ئەتۆم بێنە عیراق و ناوچەکە بپشکنن.

هەرچەندە ئەمریکییەکان گردێکی خۆڵیان بە درێژیی شەش میل و بەرزی (٥٠) مەتر لە دەوری ناوچەکە دروستکرد بەمەبەستی پاراستنی لە دەستی خەڵک کە لەلایەن هێزەکانی ئەمریکاوە دەپارێزران. ئەوسا د.محەمەد بەڕادعی بەڕێوەبەری گشتی جێبەجێکاری ئاژانسی نێودەوڵەتی وزەی ئەتۆم بوو. پاش ئەوەی دەزگاکانی وەزارەت لە پشکنینی هەندێ ناوچەی دەوروبەری (تویثة) بۆ رادەی پیسبوونی تیشک بۆیان دەرکەوت کە هەندێ شوێن رادەکەی گەیشتووەتە (١١) هەزار یەکەی پێوەر، جگە لەوەی هەندێ لەو بەرمیل و تانکییانە مادەکانی ناویان لەناو رووبار فڕێدابوون، بەو هەموو پەیوەندی و ناردنی راپۆرت و کۆڕ و کۆبوونەوەیە، توانیمان تیمێک لە (ئاژانسی نێودەوڵەتی وزەی ئەتۆم، UNEPو WHO، ئاژانسی نێودەوڵەتی نەهێشتنی شێرپەنجە) بێنینە ناوچەکە و راپۆرتی خۆیان نووسی و بڕیاریاندا هاوکاری عیراق بن بە پرۆژەی لاما. ئەو پرۆژەیە هاوبەش بوو لەنێوان وەزارەتی ژینگە و وەزارەتی زانست و تەکنەلۆژیا. ئامانجی پرۆژەکە بۆ چۆنێتیی چارەسەرکردنی پاشماوەکانی ئەتۆمی و چۆنێتیی لەناوبردنیان بەشێوەیەکی زانستیی بوو، بۆ ئەمە مەبەستە کادیرانی هەردوو وەزارەت راهێنران بۆ بەرزکردنەوەی تواناکانیان بۆ ئەوەی سوود لە توانای ناوخۆیی وەربگیرێت بۆ لابردن و پاککردنەوەی ناوچە پیسبووەکانی تیشک. ئەو پرۆژەیە، پرۆژەیەکی گەورە بوو، چەند ساڵێکی خایاند، من خۆشم چەند جارێک سەردانی تویپەم کرد و چوومەتە سەر شوێنە پیسبووەکان.

هەروەها دروستکردنی وێستگەی پێوانەیی تیشکی ئەتۆمی، لە هەموو پارێزگایەک وێستگەیەک و لە شاری بەسرە دوو وێستگەمان دروستکرد، بەهۆی ئەوەی لە هەموو ناوچەکان زیاتر بەر هێرشی مووشەکی یۆرانیۆم کەوتبوو، لە شەری ئازادکردنی عیراق و لە شەڕی عیراق و کوەیتیش، بووبووە شوێنی کۆکردنەوەی تانکە لێدراوەکان.

ئەو ناوچانەی کە مەترسیداربوون، (٢٢) وێستگە بوون، ئەو وێستگانە راستەوخۆ رادەی پێوەری تیشکیان دەنارده وێستگەی ئاگادارکردنەوە لە رووداوی تیشک و رادەکەی (مرکز البئية) (ئاگادارکردنەوەی پێشوەخت - الانذار المبكر).

جگە لەوە دروستکردنی چەند وێستگەیەکی تایبەت بە پێوەری کەشوهەوا، وێستگەکانمان بەسەر باشوور و باکوور و ناوەڕاستدا بەشکرد و ئەو وێستگانە خوێندنەوەی پێوەرەکانیان راستەوخۆ دەنارده وێستگەی سەرەکیی بۆ شیکردنەوە.

یەکێکی تر لە چالاکییەکانمان، داڕشتنی چەند جۆرە یاسا و بڕیار و ڕێنمایی و ڕێسایەک بوو، بەمەبەستی پاککردنەوەی ژینگە و ڕێگرتن لە پیسبوونی زیاتری، لەوانە: بە رەزامەندیی ئەنجومەنی وەزیران، هەر پرۆژەیەک لە عیراق جێبەجێبکرایە، دەبوایە رەزامەندیی وەزارەتی ژینگە وەربگرێ و رەزامەندیی وەزارەتەکانی تریش لای ئیمەوە پەسەند دەکرا. بۆ ئەم مەبەستە، چالاکییەکان بەپێی جۆرەکانی بەشکراوون بۆ سێ جۆر، هەندێکیان لە بەڕێوەبەرایەتییە گشتییەکان جێبەجێدەکران و رەزامەندیی ئەدرا و هەندێکیان وەک؛ پرۆژە مەزنەکان، لە دیوانی وەزارەت رەزامەندیی ئەدرا.

کارێکی ترمان، دروستکردنی تۆڕی وەزیرە ژنەکانی ژینگە بوو لە سەرانسەری جیهان، ئەو تۆڕە بەردەوامە و من تائێستاش ئەندامم و زانیارییەکانیانم بەدەستدەگات. لە هەموو کۆبوونەوە و کۆنگرە جهیانییەکان، کۆبوونەوەیەکی وەزیرە ژنەکان دەکرا و بەرنامەیان دائەڕشت و پەیڕەومان دەکرد، ئەو تۆڕە لە ڤیەننا بڕیاری لەسەر درا.

تۆڕێکی تایبەت بە ڕێکخراوە ناحکومییەکانی عیراقمان پێکهێنا و مانگانە کۆبوونەوەمان دەکرد بەمەبەستی چاودێری و هەماهەنگیی لە ژێر دروشمی هەموو تاکێک بەرپرسە لە پارێزگاریی لە ژینگە.

هەروەها دروستکردنی ئەنجومەنێکی راوێژکاری لەنێوان وەزارەتەکان و وەزارەتی ژینگە، بە سەرپەرشتیی بەندە، مانگانە کۆبوونەوەمان دەکرد بەمەبەستی هاوکاری و هەماهەنگی.

لە زۆربەی خوێندنگاکان دۆستانی ژینگە (اصدقاء البيئة)مان دروستکرد، بە هاوکاریی وەزارەتی پەروەردە کە توانییان رۆڵێکی باش ببینن بۆ بڵاوکردنەوەی زانیاریی دەربارەی ژینگە.

ئەو پرۆژەیەمان لە هەڵەبجەش ئەنجامدا و خۆشم سەردانی هەڵەبجەم کرد بۆ ئەو مەبەستە. لەهەمانکاتدا سەرچاوەی ئاوی خواردنەوەی چەند خوێندنگایەکمان جێبەجێکرد و تانکی ئاویشمان بۆ دابینکردن.

چالاکییەکی تر، دروستکردنی میدیای ژینگەیی بوو، بە خولی تایبەتی پێگەیاندن لەوبارەیەوە، دەیان کادیرمان هێنایە کارەکەوە و گۆڤاری ژینگە و ژیان (البیئة والحیاة)مان دەردەکرد و خۆم بووم بە خاوەن ئیمتیازی.

هەروەها کردنەوەی دەیان پێشانگای تایبەت بە ژینگە و دروستکردنی پۆستەراتی تایبەت و بەشداریپێکردنیان لە پێشانگا جیهانییەکاندا. لەوانە خوێندکارێکی سەرەتایی عیراقی لە پێشانگەیەکی جیهانیی لە ژاپۆن، بە پلەی سێیەم دەرچوو.

دەرکردنی هەندی یاسای تایبەت جگە لە یاسای ژینگەی عیراق و یاسای وەزارەت، کارێکی گرنگی دیکەمان بوو، بۆ نموونە؛ یاسای خۆپاراستن لە تیشکە نامۆکان، ئەوانەی لە دەزگاکانی تەلەفۆناتی مۆبایل دەرئەچن (الوقایة من الاشعة غیر المؤینة الصادرة من منظومات الهاتف المحمول).

لەو روانگەیەوە، هەر وێستگە و ئەنتێنێکی تەلەفۆنات دائەنرا، لەلایەن وەزارەتەوە پشکنینی بۆ دەکرا و رەزامەندیی بۆ دەکرا.

هەروەها چاندنی پێنج هەزار داری زەیتون لە شاری هەڵەبجە بە هەموو پێداویستییەکانیانەوە بۆ بەردەوامی و گەشەکردنیان.

ئەوە جگە لە ناردنی تیمێکی تایبەت بۆ شاری هەڵەبجە بۆ نووسینی راپۆرتێک لەسەر پیسبوونی کیمیایی بەهۆی بۆمبارانکردنی شارەکە بە چەکی کیمیایی.

هەموو ئەمانە و بەستنی دەیان کۆنگرە و کۆڕ و سیمینار لەسەر بابەتی جیاجیای پەیوەست بە ژینگە.

سەردانی هەموو ناوچەکانی عیراقم کرد بێ گوێدانە مەترسییەکانی هاتووچۆی ئەوسا، کە چەند جارێک بەو هۆیەوە کەوتوومەتە مەترسییەوە.

بایەخدان بە ناوچە شوێنەوارییەکان و هەوڵدان بۆ هێنانی یونسکۆ بۆ ئەو ناوچانە بەمەبەستی نووسینیان وەک ناوچەیەکی تایبەت، لەو ناوچانەش چەند شوێنێکی کوردستانی گرتەوە، وەک؛ (لالش) کە ئەو کارە چەند ساڵێکی دەوێ بۆ بڕیاردان لەسەری.

ئەو رێککەوتننامانەی کە عیراق تییاندا بوو بە ئەندام و یاساکان و رێنماییەکانی بەپێی ئەو رێککەوتننامانە، گۆڕی:

١- ڕێككەوتننامەی ڤیەننا و گرێبەستی مۆنتریاڵ بۆ پارێزگاریی چینی ئۆزۆن (اتفاقية فيينا وبروتوكول مونتريال لحماية طبقة الاوزون).

٢-ڕێككەوتننامەی جەمسەریی نەتەوە یەكگرتووەكان بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی دیاردەی بە بیابان بوون (اتفاقية الامم المتحدة الاطارية لمكافحة التصحر).

٣- ڕێككەوتننامەی بازل، دەربارەی كۆنترۆڵكردنی مامەڵەكردن و گواستنەوەی مادەی مەترسیدار لە ڕێگای سنوورەكانەوە (اتفاقية بازل بشأن التحكم بنقل المواد الخطرة عبر الحدود).

٤- ڕێككەوتننامەی جیهانیی بۆ هەمەجۆریی زیندەوەر و پابەندییە پاشكۆكانی (الاتفاقية العالمية للتنوع الاحيائي والبروتوكولات الملحقة بها).

٥- ڕێككەوتننامەی ڕێكخستنی بازرگانیی نێودەوڵەتی بۆ هەموو ئەو زیندەوەرانەی هەڕەشەی لەناوچوونیان لەسەرە (اتفاقية تنظيم التجارة الدولية للانواع الاحياء المهددة بالانقراض).

٦- ڕێككەوتننامەی جەمسەریی جیهانیی بۆ گۆڕانی كەشوهەوا (الاتفاقية الاطارية العالمية للتغير المناخي).

٧- ڕێككەوتننامەكانی ڕۆتەردام و ستۆكهۆڵمی پەیوەندیدار بە كەرەستە كیمیاییەكان (اتفاقيات روتردام وستوكهولم فيما يتعلق بالمواد الكيمياوية).

٨- ڕێككەوتننامەی پارێزگاریی لە جۆرەكانی باڵندەی كۆچەری (معاهدة المحافظة على الانواع الطيور المهاجرة).

٩- پاشكۆی ڕێككەوتننامەی ژینگەی جیهانی (مرفق الاتفاقية البيئة العالمي).

١٠- بەرنامەی ناوچە پارێزراوەكان (برنامج المناطق المحمية).

ئەو یاسایانەی كە لەو ماوەیەدا پێویستی دەكرد دەربكرێ لەسەر ئاستی نیشتمانیی بۆ پاریزگاریی لە ژینگە و پێكهاتەكانی، جگە لە یاسای وەزارەت و پێكهاتەكانی:

١- یاسای وەزارەتی ژینگە ژمارە ٣٧ ساڵی ٢٠٠٨.

٢- یاسای پاریزگاری و چاككردنی ژینگە ژمارە ٢٧ ساڵی ٢٠٠٩.

٣- پەیڕەوی ناوخۆی پێكهاتەكان و دامەزراوەكانی وەزارەت و ئەركەكانی ژمارە ١ ساڵی ٢٠١١.

٤- رێنمایی خۆپاراستن لە تیشکی نابارگاوی (غیر مؤین) کە لە سیستمی مۆبایل دەرنەچی، ساڵی ٢٠١٠.

٥- رێنماییەکان و پەیکەری رێکخستن و ئەرکی ئەنجومەنی وەزارەتی ژینگە ژمارە ٢ ساڵی ٢٠١٠.

٦-رێنماییەکانی ژمارە ٣ ساڵی ٢٠١١ لەسەر بنەما دیاریکراوەکان (محددات) ی ژینگە لەکاتی ئەنجامدانی پرۆژەکان و چاودێرییان لەئەنجامدانیاندا.

یەکێ لە دەزگا گرنگەکانی وەزارەتی ژینگە، سەنتەری خۆپاراستن لە تیشک (مرکز الوقاية من الاشعاع) بوو، ئەو سەنتەرە بەپێی یاسای ٩٩ی ساڵی ١٩٨٠ کاریدەکرد. کارەکانی چاودێریی مادە تیشکبەرەکان و خۆپارێزیی ئەتۆمی بوو، لە رێگای چاودێری و پشکنین و بەدواداچوونی تیشکە بارگاوییەکان، پێشتر سەر بە وەزارەتی تەندروستیی بووە.

بەپێی رێنماییەکانی ئاژانسی نێودەوڵەتیی وزەی ئەتۆم، لە ساڵی (٢٠٠٣)، ئەنجومەنی پاراستن و چاککردنی ژینگە، بوو بە وەزارەتی ژینگە، وەزیر بوو بە سەروکی ئەنجومەنی پارێزگاریی لە تیشک و لەلایەن (بوشرە عەلی ئەحمەد) بەڕیوەبەری گشتیی بەڕێوەدەچوو. ئەو دەزگایە، لەو سەردەمەی کە من کارم لە وەزارەت دەکرد، هەندێ پرۆژەی گرنگمان ئەنجامدا، لەوانە: دۆزینەوەی هەموو ئەو شوێن و ئالیاتانەی کە بەر لێدانی سەربازیی کەوتبوون بە مووشەکی یورانیۆم لەکاتی شەڕی کەنداو و لابردنی هەموو پاشماوەکانی ئالیاتی سەربازیی لێدراو و کۆکردنەوەیان، بەتایبەتی لەو شوێنانەی کە نزیک ماڵان و خوێندنگاکان بوون و دوورخستنەوەیان لە بەغداوە تاکو بەسرە. ئەو رووپێوییە کرا، سەدان تەن لەو پاشماوانە کۆکرانەوە و بوو بەهۆی کەمبوونەوەی ناوچە پیسەکان.

بە هاوکاریی بەرنامەی ژینگەی نەتەوە یەکگرتووەکان (UNEP)، پرۆژەی هەڵسەنگاندنی رادەی پیسبوون بە یۆرانیۆم لە باشووری عیراق بەپێی راپۆرت و نەخشەی سەربازیی لەلایەن هێزەکانی ئەمریکا دەستمان کەوتبوون، بوو بەهۆی داڕشتنی نەخشەیەکی نوێ بۆ ناوچە لێدراوەکان و هەروەها دانانی پلان بۆ چارەسەری ئەو کێشە گەورەیە.

هەروەها لە چوارچێوەی چاودێریی ژینگەیی مادە تیشکبەرەکان، چەند پرۆژەیەکمان ئەنجامدا، لەوانە: پرۆژەی ئاگادارکردنەوەی پێشوەخت (الانذار المبکر) و پێوانەی تیشک. دابەشکردنی ٢٢ وێستگە لە ناوچە جیاجیاکان و پێدانی پێوەرەکان بە سەنتەر کە لە بەغدا بوو، بەردەوامە لە کارەکانی لەکاتی روودانی هەر دیاردەیەکی نەگونجاو و ترسناک دەربارەی تیشکە ترسناکەکان.

هەروەها پرۆژەی پێوانەیی گازی رادون لە دەزگا پیشەسازییەکانی نەوت، کە بەشێوەیەکی سروشتیی پاشماوەی ئەو کەرەستە تیشکەبەرە سروشتییانە لەو دەزگایانە پەیدا دەبێ و پلانی پشکنینی ژینگەیی بۆ ئاو و هەوا و خاک لەو ناوچانە. هەروەها توێژینەوە لە کاریگەرییەکانی لە سەرتاسەری عیراق و داڕشتنی نەخشەیەکی تیشکیی گازی سروشتی لەکاتی پێویستیی دابەشکردنی، هەروەها بە هەماهەنگی لوجستیی ئاژانسی نێودەوڵەتیی وزەی ئەتوم بۆ داڕشتن و دانانی یاسا و رێنماییەکان بۆ هەڵوەشاندنەوە و لابردن و لەناوبردنی پیسبوون بە مادە تیشکەرەکان و گواستنەوەیان و رێساکانی پۆلێنکردنی جۆری سەرچاوەی تیشکەکان و رادەی ئەو تیشکەی کە هێڵی سوورە بۆ ئەو کارمەندانەی کە لەو بوارەدا کاردەکەن.

داڕشتنی رەشنووسی یاسای ئەنجومەنی نیشتمانیی چاودێریی ئەتۆمی و مادە تیشکبەرەکان، دروستکردنی تاقیگە بۆ پێوانی چالاکیی تیشک بۆ پێکهاتەکانی ژینگە بە باشترین ئامێر بۆ پشکنینی تیشکی (گاما، ئەلفا، بێتا) و دانانی پێوەری پشکنینی زانستیی ورد و بەکارهێنانی لە هەموو جۆرە پرۆژەیەکدا. هەر لە هەمان تاقیگە، کارمەندەکانی وەزارەتی تەندروستیی ئەوانەی لەسەر ئامێری تیشک کاریاندەکرد، پشکنینیان بۆ دەکرا و بەپێی ئەو پشکنینە رێگایان پێئەدرا کاربکەن، بەمەبەستی پاراستنیان لەڕووی تەندروستییەوە.

هەروەها پشکنینی شیری دایک و شیری ئاژەڵەکان، بۆ دەرخستنی رادەی تیشک بەتایبەتی لەو ناوچانەی کە مەزەندەی پیسبوون بە تیشکی لێدەکرا، (چونکە شیری دایک رادەی تووشبوون پیشان ئەدا)، ئەمانە جگە لە کاری رۆژانە و بەشداریی لە کۆڕ و سیمینار و بڵاوکردنەوەی زانیاریی لەسەر مەترسییەکانی تیشک و ئاگادارکردنەوەی لایەنە پەیوەندیدارەکان.

کێشەمان زۆر بوو، بەتایبەتی دەستێوەردان لە کاروباری وەزارەت و جێبەجێنەکردنی ڕێنماییەکان لەلایەن وەزارەتەکانەوە و پێشێلکاریی یاساکان. لەم وڵاتە، تا پرۆژەیەک بە ئەنجام دەگەیەنی، دە شەرت تووش دەبی. هەروەها ژینگەپارێزیی، وەک کارێکی لابەلا سەیردەکرێ و بە جوانکاریی دەزانن، هەربۆیە لە سەردەمی کابینەی حەیدەر عەبادی، هەڵیانوەشاندەوە و کردیان بە بەشێ لە وەزارەتی تەندروستی.

له ١١ی ئەیلولی ٢٠٠٧، تەقینەوەیەکی زۆر بەهێز له شنگال روویدا، له چەند شوێنێک زیانی زۆر گەورە بە خەڵک و ماڵ و سەروسامانیان گەیشت و دەیان قوربانیی لێکەوتەوە. له ئەنجومەنی وەزیران، لیژنەیەکیان پێکهێنا بە سەرپەرشتیی من و ئەندامێتیی؛ د.عیسام بریکاری وەزیری تەندروستی، بریکاری وەزیری مافی مرۆڤ، بریکاری وەزیری ئاوارەکان، هەروەها مانگی سووری عیراقی و پارێزگاری نەینەوا (موسڵ) و قایمقامیەتی شنگال و وەزیرێکی هەرێم (دکتۆر دەخیل).

بۆ ئەو مەبەستە، سەردانی شوێنی رووداوەکـەم کـرد، بە یـاوەریی ئەمریکییەکان و ستافێک له وەزارەت و لیژنەکە، رێگا زۆر مەترسیدار بوو، تووشی بۆمبی چێنراوبووین و ئەمریکییەکان بەتاڵیانکردەوە، لەدواییدا بە سەلامەتیی گەیشتینە شنگال و لەوێ کۆبوونەوەیەکمان لەگەڵ بەرپرسانی کارگێڕی و خەڵکی ناوچەکە کرد، بۆ ئەوەی گوێمان له بۆچوونەکانیان بێ و لەبەر رۆشنایی داواکانیان، پرۆژەیەک دابرێژین. دوای ئەوەش سەردانی شوێنی رووداوەکە و سەردانی (شێخ)مان کرد له لالش و بۆچوونی بەرێزیشیانمان وەرگرت.

لالش (دۆڵی هێمن)، تاکە پەرستگای ئاینیی سەرەکیی ئێزدییەکانە، له ناوچەیەکی شاخاویی نزیک کانیاوی شێخانە – ٦٠کم له شاری موسڵەوە دوورە و مەڵبەندی رۆحیی ئەنجومەنی ئایینیی ئێزدییە له جیهان. ئەو دۆڵە، دەکەوێتە نێوان سێ چیا. ناوچەیەکی سەوزە بەتایبەتی داری زەیتونی زۆر لێیە و لایان زۆر پیرۆزە، کۆنترین پەرستگایە له کوردستانی باشوور، بەپێی هەندێ سەرچاوەی مێژوویی، مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی سێی پێش زایین.

لەوێ هەموومان چووینە پەرستگای لالش و هەنگاوە ئایینییەکانی سەردانمان پیادەکرد، له دەرگایەکی گەورەوە چووینە ناو پەرستگاکە و بەپێی پەتی و بەپێی دەستووری ئاینەکەیان، نابێ قاچ لەسەر کۆسپی بـەردەم دەرگاکە دابنێیت و دەبێ بە هەنگاوێکی گەورە بیبڕی. لەناو هۆڵی پەرستگاکە، حەوت کۆڵەکەی لێبوو بە بەرزیی پێنج مەتر، هەر کۆڵەکەیەک نیشانەی فریشتەیەکە کە باوەڕیان بە حەوت فریشتە هەیە. دواتر درزێک هەیە سەرچاوەیەکی ئاوی تێدایە، پێی دەوترێ ئاوی ناسرەدین کە یەکێکە له پیاوە چاکەکانی ئێزدی. له

ژووریکی ناوەوە. دەیان گۆزەی گەورەی پڕ لە زەیتی زەیتون ریزکرابوون، هەیانبوو تەمەنی دەیەها ساڵ بوو، بۆ پیرۆزیی و چاککردنەوەی نەخۆشیی بەکاردەهاتن. نیوەڕۆ، لای ئەوان ماینەوە بۆ نانخواردن. بەپێی ئایینی ئێزدیی، ساڵی یەکجار لەو شوێنە حەج دەکرێ، لە هەموو دونیاوە بۆی دێن بەتایبەتی لە وڵاتانی دراوسێوە.

پرۆژەیەکمان داڕشت، کە بریتیبوو لە قەرەبووکردنەوەی زیانلێکەوتووان، وەک دەستپێک: دابەشکردنی (٢٠٠) چادر و (٧٥٠) بەشە خۆراک بۆ ماڵەکان، شەش دۆشەک و چوار بەتانی بۆ هەر ماڵێک، دابەشکردنی ئاوی شیرین بە بەردەوامی. لەدواییشدا دروستکردنی؛ (٤٠٠) خانوو، (٦٠) دوکان، بینایەک بۆ بەڕێوەبەریتی کاروباری کۆمەڵایەتی، بنکەیەکی تەندروستی لەسەر رووبەری (٥٠٠) مەتر دووجا و دابینکردنی کەلوپەلەکانی، دروستکردنی بیریکی ئیرتیوازی و ریگاوبان بۆ ئەو ناوچەیە، راکێشانی کارەبا بۆیان و قەرەبووکردنەوەی ئەو ماڵانەی کە خانووەکانیان نەڕووخابوون، بەڵام زیانیان پێگەیشتبوو، لە ریگای لیژنەیەکی پسپۆڕەوە ئەو کارە کرا. بەردەوامبووم لەسەردانکردنیان، خانووەکانمان دا بە خاوەنەکانیان کە خۆیان دروستیبکەن، بەڵام بەهەمان نەخشەی ئەندازیاری.

بۆ ئەو مەبەستە، (١٠) ملیۆن دۆلار دابینکرا و چەندین کۆبوونەوەمان لە بەغدا و هەریم و شنگال کرد و دەیان لیژنە کاریاندەکرد. هەندێکجار، بۆ قەرەبووکردنەوەی ماڵەکان و دابەشکردنی هاوکارییەکان، سەردانی دهۆکیشمان دەکرد.

خەڵکێکی زۆر ئاشتیخوازن و بڕوایان بە پێکەوەژیان هەیە، بەڵام بەدرێژایی مێژوو، (٧٢) جار تووشی جینۆساید (فەرمان) بوونەتەوە.

شاندێکی عیراقی بە سەروکایەتی بەندە پێکهات، بۆ بەشداریی لە کۆنگرەی هەمەجۆریی بایۆلۆژی (التنويع البايولوجي)، لە ٢٨ی ئازاری ٢٠٠٦، لە شاری کوریتیبا لە بەڕازیل.

لەو کۆنگرەیەدا، ١٨٨ دەوڵەت بەشداربوون و سەرۆکی بەڕازیل (لولا دا سیلفا)، سەرپەرشتیی کۆنگرەکەی دەکرد و کردنەوەی کۆنگرەکەش بە وتەی سەرۆک وەزیـران بوو. ئەو کۆنگرەیە، هەشتەمین کۆنگرەی جیهانیی بوو لەسەر ئەو بابەتە ببەستری. لەوتەکەیدا، (لولا دا سیلفا) باسی لەو نادادپەروەریە کرد کە لە دابەشکردنی سەرچاوەکانی ژیان لە جیهاندا هەیە و باسی لە گرنگیی هەماهەنگیی وڵاتە تازە گەشەکردووەکانی کرد بۆ گەیشتن بە خواست و داواکاری و ڕێگرتن لە نادادپەروەریی.

باس لەوە کرا، بۆ شاری کوریتیبا، بۆ ئەو کۆنگرەیە هەڵبژێردراوە. کوریتیبا، پایتەختی هەرێمی (بارانا)یە لە باشووری بەڕازیل و گەورەترین شاری باشوورە، شارێکی فرەکولتوور و ڕۆشنبیری و سیاسی و ئابوورییە، زەوییەکەی پڕ بەرهەمە و زۆر بەپیتە، بۆیە لەکۆنەوە لە هەموو جیهانەوە بۆ ئەو شارە هاتوون کە بووەتە هۆکاری فرەکولتووریی. بە سەوزترین شاری جیهان ئەژمار دەکرێ، بۆ هەر تاکێک (٥٠م٢) پانتایی لە سەوزایی هەیە.

لە ساڵانی شەستەکاندا سەرۆکی ئەوسای بەڕازیل، بڕیار ئەدا؛ لەجیاتی (ریۆ دی جانیرۆ)، پایتەختێکی تر بۆ بەڕازیل دروستبکات کە بەشێوازێکی تر بێ. بۆ ئەو مەبەستە، ئەندازیارێکی بەتوانای ماستەرپلان بەناوی (جایم لیرنر) دەستنیشاندەکات و کارەکەی پێدەسپێرێ، ڕایدەسپێرێ ئەو شوێنە بکات بە شارێکی شارستانیی دۆستی ژینگە و لە شارەکانی تری بەڕازیل نەچێ لەڕووی ناڕێکی و گەشەی بەردەوامی تێدا ڕەچاوبکرێت.

ئەو ئەندازیارە و هاوکارەکانی، ماستەرپلانێکی پوخت و تەواوەتییان دارشت و لەماوەی چوار ساڵدا، ئەو شارە گرنگەیان دروستکرد و لە شارێکی نوستووەوە کردیان بە شارێکی زیندوو کە ئێستا لە زۆر ڕووەوە یەکەمە لە جیهاندا. ئێستا هەڵگری چەند نازناوێکە؛ (پایتەختی سەوز، سەوزترین شاری جیهان، باشترین دۆستی ژینگە). وەک دەیانگێرایەوە؛ ئەو ئەندازیارە، دەبێت بە سەرۆکی شارەوانی و لەو کەسانە بووە ئەگەر پرۆژەیەک بە چوار مانگ تەواو بکرایە، ئەو بڕیاری ئەدا بە چوار ڕۆژ تەواوی بکات. هیچ پلانێکی بەبێ ڕاپرسیی نەکردووە. گەورەترین کارگەی گۆڕینی شوێنی سکراب و پاشماوەی شەڕەکانی دروستکردووە و

گۆڕیویەتی بو شوێنی سەوزایی، گەورەترین کارگەی پاشماوە و خۆڵ و خاشاکی هەیە بە دۆستی ژینگە، چەند ساڵێک بە باشترین سەرۆک شارەوانی جیهان ئەژمار دەکرا. دەیان باخی گەشتیاریی هەیە، لەوانە؛ باخی گوڵ و رووەکە نامۆکان و باخی فەرەنسی و باخی پەپولە و... هتد. کە لە هەموو جیهانەوە گەشتیار سەردانیان دەکەن وەک شارێکی گەشتیاری. ئامرازەکانی هاتوچۆی ناوشار، زۆر رێک و گشتییە. لە ٨٥٪ی دانیشتوانەکەی گواستنەوەی گشتیی بەکاردەهێنن و نرخی هەرزانە و پاسەکان بە کەرەستەی دۆستی ژینگە هاتووچۆ دەکەن و وا دروستکراوە کە خاوەن پێداویستییە تایبەتەکان بە ئاسانیی بەکاریانبهێنن.

شارێکە، لە کولتووری فووتبۆڵی بەڕازیلی دەرنەچووە و جوانترین یاریگای هەیە و دەیان دوکانی لێیە کە کەلوپەل و جلی تیپەکانی بەڕازیل و تیپیە جیهانییەکان دەفرۆشن.

### دەربارەی مین لە عیراقدا

لە ساڵی ٢٠٠٨، عیراق بوو بە ئەندام لە رێککەوتننامەی (ئۆتاوا) بۆ نەهێشتنی مینی دژ بە تاک. بەپێی مەرجەکانی ئەو رێککەوتننامەیە، ئەرکی حکومەتی عیراق بوو، وڵات لەو جورە مینە پاکبکاتەوە لە هەر شوێنێک بوونی هەبێت. پێش شوباتی ٢٠١٨ و بەپێی ئەندامێتیی عیراق، دەبوایە هەموو ئەرکەکانی ئەنجام بدات، بە رەچاوکردنی هەموو گرفت و ئاستەنگەکانی بەردەمی لە گەیشتن بەو ئامانجە.

بەپێی هەندی لەو زانیارییانەی کە ئامادەکران دەربارەی مینی زەمینی و پاشماوەکانی شەر لە تەقینەوەکاندا، عیراق بە پیسترین و بوونی زۆرترین ژمارەی مین تێیدا ئەژمار دەکرا. بەپێی ئەو ئامارە کەمەی لەبەردەستبوو، نزیکەی چوار هەزار ناوچەی پیسبوو بەو کەرەستانە هەبوون کە رووبەرەکەی بە (١.٧٣٠.٠٠) مەتر دووجا مەزەندە دەکرا و نزیکەی (١،٦) ملیۆن هاوڵاتیی لە نزیکیانەوە دەژیان. هەرچەندە ئەو بەرنامەیە بەردەوام بوو، بەڵام دەیان کێشەی وەک کەمیی ئامار و لێکۆڵینەوە هەبوون دەربارەی مین و زەوییە بە مین چێنراوەکان و پاشماوەی چەکی جەنگ. وەزارەتی ژینگە، بەرچاوی رۆشن نەبوو لەڕووی قەبارەی ئەو کێشەیە.

هەروەها باری ناجێگیری ئاسایش، رێگرێکی گەورەبوو لەبەردەم لێکۆڵینەوە و ئەنجامدانی پرۆسەی پاککردنەوە.

بەهۆی نەبوونی دەسەڵاتێکی چاودێریی یاسایی و چوارچێوەیەکی دیاریکراو لە رێکخستنی کاروبارەکەیان و نەبوونی هاوکاریی لەنێوان وەزارەتە

پەیوەندیدارەکاندا، نەئەتوانرا ئەو ئەرکە قورسە وەک پێویست ئەنجامبدرێ.
وەستانی کارکردنی وەزارەتی بەرگری لە کۆکردنەوە و لابردنی مینی تاک کە (١٨) مانگی خایاندبوو، یەکێک بوو لە هۆکارەکان کە عیراق نەتوانێ پەیوەستبێ بە رێککەوتننامەی قەدەغەکردنی مینی تاک.
بۆ ئەوەی حکومەت بتوانێ پابەندی و رووبەڕووبوونەوەی مەترسییەکانی مینە زەمینییەکان و پاشماوەکانی شەڕ لە چەک و تەقەمەنی جێبەجێبکات، دەبوایە بەرنامەیەکی وەهای دابڕشتایە کە ئەوانەی هەموو لەخۆبگرتایە و بە وردیی کاری لەسەریان بکردایە و چوارچێوەیەکی نیشتمانی و یاسایی و سیاسی و ستراتیژیی بۆ کاروباری مین لە عیراق دابنایە. دەبوایە هێزی مەدەنی و سەربازی بەشداربوونایە، بەرپرسیاریتیی مەدەنیی لە کاروباری رێکخستن و بەڕێوەبردن. پێش بەغدا، لە هەرێمی کوردستان ئەو کارە بەشێوەیەکی باشتر ئەنجام درابوو. بەڕێوەبەرێتی گشتیی مین هاتە سەر وەزارەت، کە بەهۆی بوونی کێشەی گەورە، لە وەزارەتی پلاندانانەوە هێنایانە سەر وەزارەتی ژینگە. هیچ یاسایەک نەبوو ئەو کارە رێکبخات و بتوانێ بەرپرسیارێتییەکی یاسایی و کارگێڕیی بگرنەدەست، لە سەرەتاوە دەستمانکرد بە کار وەک ئەوەی هیچ نەکرابێ، بۆ سڕینەوەی ئاسەواری ئەو گەندەڵییانەی کە پێشتر ئەنجام درابوون.
کێشەی مینی زەمینی و پاشماوەی جەنگ لە تەقەمەنی، تەنیا لە کۆکردنەوە و پاککردنەوەدا خۆی نەدەبینییەوە، بەڵکو لە پێنج خاڵدا خۆی دەبینییەوە:

١- لابردنی مینەکان.
٢- وشیارکردنەوەی هاولاتی لە مەترسیی مینەکان.
٣- هاوکاریی قوربانیانی مین.
٤- بانگەشە بۆ گەیشتن بە ولاتێکی دوور لە مەترسییەکانی مین و هاندانی حکومەت و دامودەزگاکان بۆ پابەندبوون بە رێکەوتننامەی نێودەوڵەتیی تایبەت بە مین.
٥- لەناوبردن و تەقاندنەوەی مینە هەڵگیراوەکان بەشێوازی زانستیانە.
ئەو رێککەوتننامانەی پەیوەستبوون بە مینەوە:
١-گرێبەستی نەهێشتن و قەدەغەکردنی بەکارهێنان و کۆکردنەوەی وەبەرهێنان و گواستنەوەی مینی دژی تاک و لەناوبردنیان کە بە (رێککەوتننامەی ئۆتاوا) ناسراوە.

٢-گرێبەست دەربارەی چەکی ئاسایی (پرۆتۆکۆل ٢ ، ٥).
٣-گرێبەست دەربارەی چەکی هێشوویی (عنقودي).
٤-گرێبەستی مافی قوربانیان و تووشبووان بە کەمئەندامێتی.

ئەو دامودەزگایانەی کە لەبواری مین کاریاندەکرد:
-وەزارەتی ژینگە، بە سەرپەرشتیی کەمال حسێن لەتیف، بریکاری وەزیر.
-بەڕێوەبەری گشتیی کاروباری مین (بەغدا)، عیسا رەحیم فەیاز.
-ئەنجومەنی عیراقی - کوردی بۆ لابردنی مین (هەولێر)، سیراج بارزانی، سەرۆکی ئەنجومەن.
-بەڕێوەبەریتی گشتیی لابردنی مین، حاجی مەسیفی، بەڕێوەبەری گشتی.
-ناوەندی هەرێمیی لابردنی مین (بەسرە) نبراس فاخر مەترود.
جگە لەم دەزگایانە؛ (UNOPS) و (WHO) و بە دەیان رێکخراوی جیهانی و خۆماڵی، سەرقاڵی بەرنامەکانی مین و پاککردنەوەی ناوچە مینرێژکراوەکان بوون.

**چاندنی یەک ملیار نەمام**

بەرنامەیەکی سەرتاسەریی جیهانیی بوو، عیراقیش لەسەر داوای وەزارەتی ژینگە و بە سەرپەرشتیی وەزارەتی ژینگە، بڕیارم دا؛ هەوڵبدرێ یەک ملیۆن نەمام و زیاتریش لە یەک ساڵدا لە عیراقدا بچێنین.
ئەو بەرنامەیە، ڕێکخراوی بەرنامەی ژینگەی نەتەوە یەکگرتووەکان (UNED)، لە ساڵی ٢٠٠٧ بانگەوازی بۆ دەکرد، بە سەرپەرشتیی (حەکیم ستێنەر) بەڕێوەبەری جێبەجێکاری بەرنامەکە.
وەزارەتی ژینگەی عیراق، تەنیا لە ساڵی ٢٠٠٧دا توانی شەش هەزار دار لە خوێندنگاکانی ناو بەغدا و دەوروبەریدا و (٢٥٠) هەزار لەناو کۆمپانیاکان و کارگەکان و شوێنە جیاجیاکاندا بچێنێ. بەهەمان شێوە لە شارەکانیش بەهەمان گوڕوتین کارکرا و توانیمان لە یەک ساڵدا زیاتر لە یەک ملیۆن نەمام بچێنین. هەر لەسەر هەمان بەرنامە بەردەوام بووین و بۆ یادی کارەساتی هەڵەبجەش، پێنج هەزار نەمامی زەیتونمان چاند و لە نەخۆشخانەکانیش بەهەمان شێوە. دوو بڕیاریش دەرچوو کە؛ بۆ هەر منداڵێک لەدایکدەبێ و هەر کوڕ و کچێکیش کە تازە هاوسەرگیری دەکەن، نەمامێک بچێنن.

له شوباتی ٢٠١٦، وەک چالاکترین ژنی سەرکەوتوو لە کاروباری سیاسی و کۆمەڵایەتی و رۆشنبیریدا، لەلایەن مونتەدای عیراقی نازک ئەلمەلائیکە، کاروباری رۆشنبیریی کوردی لە یەکێتیی رووناکبیران و نووسەرانی عیراقەوە، خەڵاتی ژنی ساڵیان پێبەخشیم و مەراسیمێکی تایبەتیان لە شاری بەغدا بەو بۆنەیەوە بۆ رێکخستم. لەو بۆنەیەدا، ئەزموونی خۆم لە کاری سیاسی و خوێندن و چالاکییەکانم و کارەکانم، بۆ ئامادەبووان باسکرد و خەڵکێکی زۆریان لە رووناکبیر و نووسەران کۆکردبووەوە، یەکەمجار بوو لەو جۆرە خەڵاتە ببەخشرێتە ژنێکی کورد.

## رێکخراوی ئاسودە

بەهۆی زۆربوونی دیاردەی توندوتیژیی بەرانبەر بە ژنان و نەبوونی دەزگایەکی حکومیی لەو سەردەمەدا، هەروەها بەهۆی نەبوونی ئارامگەیەک بۆ ئەو ژنانەی تووشی گرفتی کۆمەڵایەتی دەبوونەوە. پێویستبوو، رێکخراوێک بۆ ئەو ئامانجانە و هەندێ ئامانجی تری وەک چارەسەری دەروونی و چارەسەری کێشە کۆمەڵایەتییەکان و دۆزینەوەی رێگەچارە بۆ هەر گرفتێ کە رووبکاتە ئەو رێکخراوە، دابمەزرێ.

لەبەرئەوە، بەندە و هەندێ کەسایەتی تر، بە ئەرکی سەرشانی خۆمان دەزانی کە بیرۆکەیەکی لەو بابەتە جێبەجێبکرێت و بیکەینە کردار.

رێکخراوی ئاسودە، لە ٢٤ی کانوونی یەکەمی ٢٠٠٠، لە شاری سلێمانی دامەزرا و یەکەم بەیاننامەی لیژنەی ئامادەکاریی دامەزراوەکە لە ٥ی ئایاری ٢٠٠١ دەرچوو، بە دروشمەکانی:

- رێزدار و شکۆمەندبێت مرۆڤایەتی و مافەکانی مرۆڤ لە کوردستان.
- بەرەو نەمانی هەموو شێوازێکی توندوتیژیی دژ بە مێینەکانی گەلانی کوردستان.
- بەرەو کۆمەڵگایەکی مەدەنی و دروست لە کوردستاندا.

لەو رۆژەوە تا ئەمرۆ، ئەو رێکخراوە، کار و چالاکییەکانی بەردەوامە و ستاف و کارمەندەکانی، بێوچان کاردەکەن و بۆتە یەکێ لە رێکخراوە ناسراوەکانی عیراق و لە زۆر وڵاتی دەرەوەش وەک رێکخراوێکی باوەڕپێکراو کاردەکات.

**ڕێکخراوی دیداری عیراق**

ئەو ڕێکخراوە، لە ساڵی ٢٠٠٨ دامەزرا، بە سەرپەرشتیی د.بەرهەم بوو، منیش هەم لە بۆردی ڕێکخراوەکە بووم و هەم بەشێک لە چالاکییەکانیم ئەنجامدەدا. بەڕێوەبەری ڕێکخراوەکە، عەقیل بەسام بوو.

ئامانجی ئەو ڕێکخراوە، دروستکردنی پرسیارگەلی گەنجان بوو لە هەموو ڕوویەکەوە. هەروەها بەرزکردنەوەی تواناکانی ژن و منداڵ و کەمکردنەوەی جیاوازیی ڕەگەزی و گەیشتن بە یەکسانی و بەئاشتیکردنی کۆمەڵگا. هەروەها ئەنجامدانی ئەو جۆرە پرۆژانەی کە لە خزمەتی کۆمەڵ و کۆمەڵگای مەدەنیدان و کاریگەریی خستنە سەر دەسەڵاتی یاسادانان و جێبەجێکردن. هەروەها لە ڕێگای بەرنامەکانییەوە، پلانی بۆ دوارۆژ هەبێت و هەوڵبدات بۆ گەشەپێدان و پێشخستنی توانای هونەری و ڕۆشنبیری و زانستیی گەنج و ژن لەگەڵ ئەو توێژانەی کە بە هۆکاری جیاواز و ڕێگریی، نەیانتوانیوە هەلی پێشکەوتنیان هەبێت.

لە ڕوانگەی هەستکردن بە بەرپرسیارێتیی بەرانبەر بەو کەسانە و ئەو مافانەی کە دەبوایە هەیانبووایە بۆ ژیانێکی باشتر و دەرخستنی تواناکانیان و ڕەخساندنی هەلی گونجاو تا تواناکانیان بخستایەگەڕ بۆ ئەوەی ڕۆڵی کاریگەریان هەبوایە لەناو کۆمەڵدا، بە بواری هزری و سیاسیشەوە. لەو ڕوانگەیەوە، دیداری عیراق (ملتقى العراق) پشتگیریی لە پرۆژەی (واعدون) کرد بۆ سەرخستن و هاوکاریی خوێندکارە سەرکەوتووەکانی زانکۆکان. وەک یەکەم هەنگاو، لە شاری بەغدا دەستپێیکرد بۆ ئەوەی دواتر بەرەو زانکۆکانی تری عیراق بڕوات بە زانکۆکانی هەرێمیشەوە. پرۆژەکە بریتیبوو لە؛ بەخشینی بەخششێکی مانگانە بۆ خوێندکارە سەرکەوتوو و داهێنەرەکان. بۆ ئەو مەبەستە، وەک نوێنەری د.بەرهەم ساڵح، سەردانی هەموو زانکۆکانی دەرەوەی بەغدام کرد، هەروەها زانکۆکانی شاری (بەغدا، بەسرە، موسڵ، کوفە، دیوانیە، ئەنبار، بابل، ناسریە. کەرکوک، دهۆک، سلێمانی، کۆیە، عەمارە، موسەننا و...هتد) جگە لەوەی کە بە هاوکاریی سەرۆک زانکۆکان و مامۆستاکان و ڕێکخراوی دیدار، خوێندکارەکان دەستنیشان دەکران بۆ وەرگرتنی ئەو بڕە پارەیەی مانگانە پێیان ئەدرا، ساڵانەش لە مەراسیمێکی تایبەتدا باشترین خوێندکار و

باشترین لێکۆڵینەوە لە بەشەکان هەڵدەبژێردران و بە ئامادەبوونی خۆمان کە زۆربەی کات من و عەقیل بەسام ئامادە دەبووین، دەبەخشرا بەو خوێندکارانە. لەهەمانکاتدا، ڕێکخراوی (واعدون)، بەشە کوردستانییەکەی لە ژێر ناوی (ڕێکخراوی هیوا) بە هەماهەنگیی کاریدەکرد بۆ زانکۆکانی کوردستان.

دیداری عیراق (ملتقى العراق)، لە ڕێگای بەرنامەکانی و میدیاکانەوە، هەوڵیدەدا بۆ پتەوکردنی پەیوەندیی پێکهاتەکانی عیراق و بەردەوامیی پەیوەندیی کولتووری و ڕۆشنبیریی نێوانیان و هاوکاریی ئازادی و ئاشتیی کۆمەڵایەتی و دژایەتی توندوتیژیی. بۆ ئەو مەبەستە، چەند کۆنفرانس و کۆنگرەیەکیش لە شوێنە جیاوازەکان ئەنجامدران. هەروەها چەند گەشتێکمان ڕێکخست بۆ خوێندکارانی زانکۆ جیاوازەکان بۆ لای یەکتر، بۆ نموونە؛ زانکۆی بەسرە هاتنە سلێمانی. هەروەها لە ڕێگای تۆڕە کۆمەڵایەتییەکانەوە، ئەو پەیوەندییەمان پتەوترکرد بەتایبەتی لەنێوان خوێندکارە سەرکەوتووەکان. هەوڵماندەدا کەشێکی دۆستانە لەنێوان پێکهاتەکاندا دروستبکەین.

هەروەها چەند پێگەیەکی ئەلکترۆنیی تایبەتمان بۆ ئەو مەبەستە هەبوو، پێگەی ئەلکترۆنیی (پرۆژەی هیوا، واعدون، گۆڤاری الاسبوعية)، پەیوەندییەکی ئەلکترۆنیی بۆ بلاوکراوەکان بەتایبەتی نووسینە گرنگەکان، ئەم بەڕێزانەش بەردەوام ئەیاننووسی: (پارێزەر حەسەن شەعبان، عەبدولڕەزا عەلی، د.عەقیل ئەلناسری)، هەروەها دروستکردنی کتێبخانەیەکی ئەلکترۆنیی، کە دەیان کتێب و لێکۆڵینەوە و توێژینەوە و جۆرەها بابەتی زانستی و مرۆڤایەتی لەخۆگرتبوو.

جگە لە دەیان چالاکیی تر، بەسوودوەرگرتن لە پەیوەندییە ئەلکترۆنی و تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان، هەروەها بەشداریکردن لە کۆڕ و سیمینارەکانی تایبەت بە ئازادیی تاک و ڕۆژنامەگەری.

ئەو پرۆژەیە، پرۆژەیەکی سەرتاسەریی عیراق بوو، ناوبانگی لەسەر ئاستی عیراق دەرکردبوو. ساڵانە لە ڕێگای کۆمپانیای شارەزاوە، ڕاپۆرتی کۆتایی دارایی پێشکەشدەکرا بە هاوکاریی کارگێڕی و یەکەی ژمێریاریی ڕێکخراوەکە.

ئەندامانی بورد، بریتی بوون لە:

١- د. بەرهەم ئەحمەد ساڵح – سەرۆکی ئەنجومەنی بۆرد.

٢- نەرمین عوسمان حەسەن – جێگری سەرۆک.
٣- حاجم ئەلحەسەنی – ئەندام.
٤- مەیسون سالم فاروق دەمەلوجی – ئەندام.
٥- عادل کەریم کاک ئەحمەد – ئەندام.

یەدەگەکان:
١- سالح عەبدوڵڵا محەمەد.
٢- هەڵکەوت عەبدوڵڵا رۆستەم، (سەرپەرشتیی پرۆژەی هیوای دەکرد).
سالانە جگە لە هاوکاریی خوێندکارە سەرکەوتووەکانی زانکۆکانی عیراق، بە لایەنی کەمەوە، سێ جۆر پرۆژەی جۆراوجۆر دەکرا. دواتر بەهۆی نەبوونی هاوکاری و کەمبوونەوەی هاوکارییە دەرەکییەکان بۆ عیراق، نەک تەنیا بۆ رێکخراوی دیدار، بەڵکو بۆ هەموو رێکخراوەکانی تری عیراق، ئیتر کارەکانمان لە کۆتایی ساڵی ٢٠١١ زۆر کەمیکرد و هاوکارییەکانمان وەستاند.

وەزارەتـی ژینگەی عیراق، بە سەرۆکایەتی بەندە، شاندێکی ڕێکخست بە یاوەریی بریکاری وەزیر و ئەندامانی پەیوەندیدار، بۆ بەشداریی لە کۆنگرەی گۆڕانکاری کەشوهەوا، لە نیودەلهی پایتەختی هیندستان، لە ۲۳ی تشرینی یەکەمی ۲۰۰۹، کۆنگرە باسی لەو کێشانە دەکرد کە دەبنە هۆی گۆڕانکاریی کەشوهەوا، هەروەها چۆن ئەتوانرێ بەهۆی تەکنەلۆژیای پێشکەوتوو، ڕێبگرین لە گۆڕانکاری و بخرێتە خزمەت چارەسەرکردن.

بەرپرسانی زۆر وڵات بەشداربوون، لەوانە: سەرۆکی مالدیف (محەمەد نشید)، هەروەها دەیان کاربەدەست و بەرپرسی نەتەوە یەکگرتووەکان و چین. کۆنگرەکە، دوو ڕۆژی خایاند. کردنەوەی کۆنگرە، لەلایەن سەرۆک وەزیرانی هیندستان (مانموهان سینگ) بوو، باسی لەو کێشانە کرد کە دەبنە هۆی گۆڕانکاری و چۆنێتیی چارەسەرکردنیان. هەروەها وەزیری ژینگەی هیند (جیرام رامیش) وتەی خۆی پێشکەشکرد و باسی لەخۆئامادەکردن کرد بۆ کۆنگرەی کۆپنهاگن.

لە ئەنجامی کۆنگرەکە، ڕێککەوتننامەیەک لەنێوان (هیند و چین) واژووکرا کە دوو وڵاتی گەورەن و خاوەن پیشەسازییەکی گەورە و بەربڵاون.

هیندستان، حەوتەم گەورەترین وڵاتی دونیایە لەڕووی جوگرافیاوە، دووەم وڵاتە لەڕووی دانیشتوان و قەرەباڵغترین وڵاتە لەڕووی ڕێژەی دانیشتوان بەپێی ڕووبەر.

لانکەی شارستانیەتە، سیستمی وڵات، فیدراڵیی دیموکراتییە، لە ۲۸ ویلایەت و ۷ هەرێم پێکهاتووە. حەوتەم وڵاتە لەڕووی ئابوورییەوە، فرە کولتوور و فرە ئایینە، جیاوازیی چینایەتی زۆر زۆرە، بە هەزاران خێزان و تاک لەسەر شەقام و کۆڵانەکان ژیان بەسەردەبەن، هەیانە لە لەدایکبوونەوە تا کۆتایی ژیانی، لەو شوێنانە دەژی. بەپێی قسەی ئەو کارمەندە هیندییەی لەگەڵیان دانابووین، دەیوت "دەوڵەت زۆری هەوڵداوە نیشتەجێیان بکات، بەڵام زۆر کەمیان بەرگەی مانەوە دەگرن لەنێوان چوار دیواردا و لەگەڵ ئەو ژیانە ڕاهاتوون". زۆر بە ئاسانی جیاوازیی چینایەتی دەبینرێ، لەسەر شەقامەکان سەرتاشێ بە ئاوێنەیەکی لیلی بەدیواردا هەڵواسراو و کورسییەکی شکاوەوە، سەری پیاوان ئەتاشێ و کەسێک لەلایەوە ددانی نەخۆش چارەسەر دەکات و هەڵیدەکێشێ، توزێ بەولاوە باشترین سالۆنی خۆجوانکردن و باشترین

نەخۆشخانە و نۆرینگەی پزیشک دەبینی. گەورەترین وڵاتی دونیایە لەڕووی کولتوور و زمان و مێژوو، دوای کیشوەری ئەفریقا، هەمووشیان تاڕادەیەک پارێزگارییان لە کولتووری خۆیان کردووە.

بە هاوکاریی باڵیۆزخانەی عیراق، بەتایبەتی باڵیۆز (ئەحمەد بەرواری)، سکرتێرەکان زۆر شوێن و شوێنەواری ناو نیودەلهییان پیشاندابن. وەک؛ قەڵای سوور، (قطب مینار) و دەرگای هیندستان کە لە ناوەراستی نیودەلهی بۆ بیرەوەریی لەناوچوونی (٩٠) هەزار سەربازی هیندی لە جەنگی جیهانیی یەکەم و شەڕی ئەفغانستان بونیادنراوە، هەروەها شوێنەواری ئەگراسین کی باولی و کوشکی همایۆن کە پاشماوەی شارستانیەتی مەنگۆلەکان بوو و...هتد. لە هەموو شوێنە گەشتیارییەکان، سواڵکەر زۆر بوو. ئەو رۆژەی سەردانی دەرگای هیندستانمان کرد، لە ئۆتۆمبێلەکە هاتینە خوارەوە و سواڵکەرێک داوای یارمەتیی کرد، منیش هاوکاریم کرد، لەچاو تروکانێکدا دەورمان پڕبوو، بەپەلە چووینەوە ناو ئۆتۆمبێلەکە و ئامۆژگارییان کردم، وتیان "تا لێرەی کاری وانەکەیت، بەرتنادەن و رزگارت نابێ لەدەستیان". لەسەر داوای خۆم چووینە شوێنە میللی و هەژارنشینەکان و شوێنە گشتییەکان، خەڵکەکەی لەوپەڕی هەژاریدا دەژیان و لەدۆخی خۆیان رازین و کێشە و بۆڵەیان نییە.

هیندستان، تەنیا گۆرانی و سەما وخۆشیی نییە وەک ئەوەی لە فیلمە هیندییەکاندا دەمانبینی، (کاتێ کە گەنج بووم، سەرسام بووم بە فیلمەکانیان و فیلمم لێ دەرنەدەکرد، دەیان جار بەچاوی پڕگریانەوە دەهاتمە دەرەوە)، بەڵکو وڵاتێکە پڕە لە جیاوازیی.

### لیژنەی کاروباری ژنانی کارگەری عەرەبی

لە ١٨ تا ٢٠ی تشرینی یەکەمی ٢٠١١، لەسەر داوای حکومەتی عیراق و ئەنجومەنی وەزیران و دوای پێشنیازی وەزارەتی کاروباری کۆمەڵایەتی عیراق، وەک نوێنەری ژنانی عیراق کە ئەوسا وەزیری ژینگەی عیراق بووم، بەشداریم لە کۆبوونەوەی لیژنەی کاروباری ژنانی کارگەری عەرەبیی سەر بە کۆمکاری عەرەبی کرد.

کۆبوونەوەکە، لە میسر لە شاری (جونیە) ئەنجامدرا، بە بەشداریی بەڕێوەبەری کارگێڕیی چاودێریی کۆمەڵایەتی رێکخراوی کاری عەرەبی

و نوێنەرانی هەموو وڵاتە عەرەبییەکان و بەشداریی ڕێکخراو و کۆمپانیا گەورەکانی وڵاتەکان، ئەوانەی ژن بەڕێوەیان دەبردن.

دەبوایە لەو کۆبوونەوەیەدا، ئەمینداری گشتی، ئەو لیژنەیەی سەر بە کۆمکار هەڵبژێریێ، بۆ ماوەی دوو ساڵ، منیش یەکێکبووم لەو کەسانەی کە خۆم کاندیدکرد.

بەکۆی دەنگ، بووم بە ئەمینداری گشتی و یەکەمجار بوو کوردێک ئەو پۆستە وەربگرێ. ئەریج نەسر لە لوبنان و هودە مەلاش لە سوریا، بوون بە جێگر و هەریەکە لە: سەلامە خەلیل (فەلەستین)، وەسفیە ئەلیدەر محەمەد (میسر) و زینە خەیات لە (ئوردن)، بوون بە ئەندامی ئەو لیژنەیە.

هەر لەو کۆبوونەوەیەدا، دەیان راپۆرت، دەربارەی کار و چالاکی و گرفت و کێشەکانی ژنانی وڵاتە عەرەبییەکان پێشکەشکران. لەماوەی ئەو دوو ساڵەدا، چەند کۆبوونەوەیەکی گرنگ لە میسر و لوبنان و ئوردن و مەغریب ئەنجامدران بۆ بەدواداچوونی کێشە و راپۆرت و کۆتا و دەیان کەیسی ژنانی وڵاتانی عەرەبی.

ئەوسا بەڕێز عەمرو موسا، سەرۆکی کۆمکاری عەرەبی بوو، کاتێک لە (جونیة) وە گەڕامەوە قاهیرە بە فڕۆکە، بە گوڵ پێشوازییان لێکردم، کە لەلایەن عەمرو موساوە نێردرابوون، بۆ یەکەمجار بوو ژنێکی عیراقی و کورد ئەو پۆستە وەربگرێ، لەو ماوەیەدا دەبوایە ئاگاداربم لە رەوشی ژنانی عەرەب و بەدواداچوونم هەبێ.

لە ساڵی ٢٠٠٥، بووم بە ئەندامی نووسینگەی جێبەجێکار (المكتب التنفيذي) بۆ ئەنجومەنی وەزیرەکانی وڵاتە عەرەبییەکان بۆ پرسی ژینگە لە کۆمکاری عەرەبی، لەوێش دەبوایە ساڵانە راپۆرتی باری ژینگە لە عیراق بەکوردستانیشەوە پێشکەش بکەم، لەو شوێنە بۆ ماوەی پێنج ساڵ مامەوە.

لەناو کۆمکار، هەندی دەستەواژەی باو هەبوون، توانیم بیانگۆڕم، بۆ نموونە؛ بۆ ژینگە وتەیەک هەبوو دەوترا (للانسان العربي العيش في بيئة نظيفة) توانیم بیگۆڕم بە: (بۆ هەموو ئەو پێکهاتانەی کە لە وڵاتە عەرەبییەکاندا دەژین، مافی ژینگەیەکی پاکیان هەیە).

**ماددەی (١٤٠)**

ناوەڕۆکی مادەی (١٤٠)ی دەستووری عیراق، بریتییە لە:

١-لەسەر دەسەڵاتی جێبەجێکارە (السلطة التنفيذية) ئەو هەنگاوانەی کە لە مادەی (٥٨)ی یاسای بەڕێوەبردنی دەوڵەتی عیراق لە قۆناغی گواستنەوەدا (قانون أدارة الدولة العراقية للمرحلة الانتقالية) هاتووە بە هەموو خاڵەکانییەوە جێبەجێبکات.

٢-ئەو بەرپرسیارێتییەی لەسەر دەسەڵاتی جێبەجێکارە لە حکومەتی گواستنەوەو و بە روونیی لە مادە (٥٨)ی یاسای بەڕێوەبردنی دەوڵەتی عیراق لە قۆناغی گواستنەوەدا هاتووە و بەردەوام دەبێ بۆ دەسەڵاتی هەڵبژێردراو بەپێی ئەم دەستوورەی ئێستا لەسەریەتی ئەو خاڵانە بەتەواوی ئەنجامبدات : (ئاساییکردنەوە، سەرژمێری، کۆتایی دێت بە راپرسی لە کەرکوک و ناوچە ناکۆکەکان، بە مەبەستی دیاریکردنی ئیرادەی خەڵکی ناوچەکە و دەبێ تا ٣١ی کانوونی یەکەمی ٢٠٠٧ ئەنجامبدرێ).

بۆ ئەو مەبەستە، لیژنەیەکیان پێکهێنا لە سەردەمی کابینەکەی د.ئیبراهیم جەعفەری، ئەو لیژنەیە، لیژنەیەکی دەستوورییە، جێبەجێکارە، وزاریە، یاساییە، بە بڕیاری ژمارە ٤٦ (م و ن/ ١٣٧٣/٤٨) لە ٩ی ئابی ٢٠٠٦ پێکهێنرا بە سەرۆکایەتی وەزیری زانست و تەکنەلۆژیا د.رائد فەهمی، پاش دەست لەکارکێشانەوەی هاشم شبلی وەزیری دادی ئەو سەردەمە، هەموو پێکهاتەکانی عیراق لەو لیژنەیە بەشداربوون.

لەگەڵ راسپاردنم و پێشنیازکردنم لەلایەن حکومەتی ئیبراهیم جەعفەری بۆ ئەندامی لیژنەی مادەی (١٤٠)ی دەستوور، دوو لایەنم لەبەرچاوگرت. لەلایەک، وەک پرسێکی نەتەوەیی و نیشتمانی و بەرپرسیارێتییەکی مێژوویی کە کوردێکم و دەبێ شەڕی گەڕانەوەی ئەو ناوچانە بکەم بۆ کوردستان. لەلایەکی ترەوە، هەر لەسەرەتاوە بەپێی دۆخ و دەستکەوتەکان ئاستەنگەکانمان لەبەرچاوبوو، دەمانزانی تواناکانمان لەبەرانبەر ئەو هەموو ئاستەنگە سنووردارن، هەم نەیارەکانمان خواستێکی گەورەتریان بۆ پەکخستنی ئەو مادەیە هەبوو، هەمیش لەڕاستیدا خۆمان لە ئاستی سەرکردایەتیی سیاسیدا بە ئیرادەیەکی بەهێز کاری پێویستمان بۆ پرسەکە نەکرد، بەڵکو بەرژەوەندییە حیزبییەکان و دەستکەوتە مادییەکان خرانە پێش ئەم پرسە و بەرژەوەندییە نیشتمانییەکانی ترەوە.

هەر لە سەرەتای دروستبوونی لیژنەکەوە، کێشە دروستبوو لەناو

کۆبوونەوەی ئەنجومەنی وەزیران و ڕێگریی هەبوو لە شێوازی پێکهێنان و کارکردن، بوو بەدەنگەدەنگ لەنێوان وەزیرە کوردەکان و لایەنە توندڕەوەکان. د.بەرهەم وتی: «ئێمە لەم حکومەتە دەرئەچین و بەشدار نابین». هەڵسایین بڕۆین، د.ئیبراهیم جەعفەری دۆخەکەی هێورکردەوە (بەڕای من؛ سەرۆک وەزیران، دۆستی کورد بوو) و وتی «ئەم چەند کەسە بچنە هۆڵێکی تر وتووێژ بکەن». لە وەزیرە کوردەکان د.بەرهەم سەرپەرشتیی کۆبوونەوەکەی کرد و لەکۆتاییدا لەسەر شێوازی کارکردن پێکهاتین و ڕۆڵی د.بەرهەمی زۆر تێدابوو. هەر ئەم هەڵوێستەی ئێمە لەناو پەرلەمان باسکرا و کاتێ منیان بانگکرد بۆ پرسیارکردن لەسەر شێوازی قەرەبووکردنەوە، ئوسامە نوجێفی لەناو پەرلەمان وتی «ئێمە بۆیە ڕەزامەندیمان لەسەر لیژنەکە دا، چونکە د.بەرهەم و ئەم نەرمینە ویستیان واز لە حکومەت بێنن و نەمانویست دۆخەکە تێکبچێ».

**پێناسەی ناوچە ناکۆکیی لەسەرەکان**

ناوچە ناکۆکیی لەسەرەکان، بەو ناوچانە دەوترێت کە ڕژێمی سەدام گۆڕانکاریی دیمۆگرافی و سیاسەتی بەعەرەبکردن و گۆڕانکاریی لەڕووی دانیشتوانەوە بەسەرداهێناوە، بەهۆی گواستنەوەی زۆرەملێ و ئاوارەکردنیان و نشتەجێکردنی کەسانی تر لە شوێنیان. هەروەها دەستبەسەرداگرتنی موڵک و ماڵ و زەویان و لەسەر کار لابردنیان، ئەگەر کەسێک (تصحيح القومية) نەکردایە، واتە؛ شوناسنامەی خۆیان نەگۆڕیایە، مافی دامەزراندنی لێ ئەسێنرایەوە. ئەمە جگەلەوەی گۆڕانکاریی لە سنوورە ئیدارییەکانی هەموو ئەو ناوچانەدا کردووە. ئەو کاتە یاساییەی کە مادەی (١٤٠) کاری لەسەر دەکرد لەنێوان (١٧ی تەممووزی ١٩٦٧ تا ٩ی نیسانی ٢٠٠٣) بوو.

یەکەم، ناوچە ناکۆکی لەسەرەکانی پارێزگای کەرکوک کە بە مادەی ١٤٠ پەیوەستن:

هەموو پارێزگای کەرکوک بە قەزا و ناحییەکانی (داقوق، دوزخورماتوو، چەمچەماڵ، کەلار، کفری و تازەخورماتوو).

دووەم، ئەو ناوچانەی لە پارێزگای نەینەوا ناکۆکیی لەسەرە و پەیوەستە بە مادەی (١٤٠)ەوە:

١ . قەزای شنگال و ناحیەکانی.
٢ . قەزای شێخان و ناحیەکانی.
٣ . قەزای حەمدانی و ناحیەکانی.
٤ . قەزای تلکێف و ناحیەکانی.
٥ . قەزای بەعشیقە.
٦ . ناحیەی قەحتانیە (گرعوزێر) کە سەر بە (بەعاج)ە.
٧ . قەزای مەخمور و ناحیەکانی.
٨ . ناحیەی زومار.
٩ . قەزای ئاکرێ و ناحیەکانی، بەڵام ئەو پێویستی بە کارکردن نەبوو بەهۆی (برگەی م لە مادەی ٥٣) یاسای بەڕێوەبردنی دەوڵەتی عیراق لە قۆناغی گواستنەوە، کە ئاکرێ لەژێر دەسەڵاتی کوردیدا بوو و دەکەوتە ناوچەی قەدەغەی فڕین.

سێیەم، ناوچە جێناکۆکەکانی سەر بە پارێزگای دیالە کە پەیوەستە بە مادەی ١٤٠ی دەستوور:

١. قەزای خانەقین و ناحیەکانی (جەلەولا، سەعدیە).
٢. قەزای مقدادیە و ناحیەکانی.
٣. قەزای بەلەدروز ناحیەی (مەندەلی).
٤. قەزای بەدرە و ناحیەی جەسان و ناحیەی مەیدان و ناحیەی قۆرەتوو.

ئەرکەکانی لیژنەی مادەی ١٤٠

هەڵگرتنی هەموو ئەو زوڵم و زۆرداری و نادادییەی بەسەر گەلانی عیراقدا هاتبوون؛ بە ئاوارەکردنیان و هێنانی خەڵکی نامۆ بۆ ناوچە جێناکۆکەکان و ڕاگواستنی خەڵکی ڕەسەنی شارەکە و داگیرکردنی زەوی و ماڵ و خانووبەرە و تاپۆکردنیان لەسەر کەسانی سەر بە خۆیان.

لابردنی ئەو هەموو نادادییە، پێویستی بە وەرگرتنی هەندێ بڕیار و دانانی شێوازی کارکردن و جێبەجێکردنیان هەبوو، لەو هەنگاوانە:

١ . دانانی ڕێنمایی و ڕێککارەکان بۆ ئەوانەی بڕیارەکانی لیژنەی مادەی ١٤٠ دەیانگرێتەوە.

٢ . دەرکردنی بڕیاری ژمارە (١) لە بەرواری (١٦ی کانوونی دووەمی ٢٠٠٧) و گەڕاندنەوەی کارمەندەکانی دەوڵەت لە دانیشتوانە ڕەسەنەکان لە

(کورد، تورکمان، ئاشووری، کلدان و عەرەب) کە دوورخرابوونەوە لەسەر کارەکانیان بە هۆکاری سیاسی و رەگەزی و تایفیی و ئاینیی لەنێوان (١٧ی تەمووزی ١٩٦٧ تا ٩ی نیسانی ٢٠٠٣).

٣ . دەرکردنی بڕیاری ژمارە (٢) لە بەرواری (١٦ی کانوونی دووەمی ٢٠٠٧) بۆ گەڕاندنەوەی خێزانە ئاوارەکان بۆ شوێنی باوباپیرانیان لە ناوچە کێشە لەسەرەکان کە بەهۆی سیاسەتی رژێمی پێشوو راگوێزرابوون.

٤ . دەرکردنی بڕیاری ژمارە (٣) لە بەرواری (٤ی شوباتی ٢٠٠٧) بە گەڕاندنەوەی خێزانە هاوردەکان لە ناوچە کێشە لەسەرەکان بۆ ئەو شوێنەی لێوەی هاتبوون و قەرەبووکردنەوەیان.

٥ . دەرکردنی بڕیاری ژمارە (٤) لە بەرواری (٤ی شوباتی ٢٠٠٧) بە هەڵوەشاندنەوەی هەموو ئەو گرێبەستە کشتوکاڵییانەی بەمەبەستی سیاسەتی بەعەرەبکردن و گۆڕینی دیموگرافیی ناوچە کێشە لەسەرەکان دەرکراون.

٦ . دەرکردنی بڕیاری ژمارە (٥) لە بەرواری (١٣ی ئابی ٢٠٠٧) بۆ قەرەبووکردنەوەی ئاوارە هاوردەکان.

٧ . دەرکردنی بڕیاری ژمارە (٦) لە بەرواری (١ی تشرینی یەکەمی ٢٠٠٧) بۆ لابردنی ئەو تاوانەی بەرانبەر بە ناوچەی (تسعین) و (حەمزەلی) کرابوون هەرچەندە جێبەجێکردنی ئەو بڕیارە زیاتر لە ساڵێک لە ئەنجومەنی چارەسەرکردنی کێشەکانی موڵکیەتی عەقاری (خاوەندارێتیی خانووبەرە) دواخرا.

٨ . دەرکردنی بڕیاری ژمارە (٧) لە بەرواری (٢١تەمووزی ٢٠٠٩) بۆ لابردنی ئەو ناحەقیانەی کە لە ئەنجامی سیاسەتی رژێمی سەدام دژ بە ناوچەکانی ناوەڕاست و باشووری عیراق کرابوون.

٩ . هەشت نووسینگەمان لە (کەرکوک، بەسرە، میسان، بابل، واست، ذیقار، شنگال و خانەقین) کردەوە بەمەبەستی دابەشکردنی فۆرم و وەرگرتنەوەی، بۆ ئەوانەی مادەی ١٤٠ دەیانگرێتەوە.

١٠ . دروستکردنی لیژنەی بەدواداچوونی راستییەکان (لجنة تقصی الحقائق) لە (کەرکوک، بەسرە، میسان، بابل، واست، زیقار، شنگال و خانەقین).

١١ . دروستکردنی دوو لیژنەی هونەریی لە کەرکوک و بابل بەمەبەستی هەماهەنگیی لەگەڵ دەزگاکانی دەوڵەت.

١٢ ڕێکخستنی دوو جۆر لە فۆرم بۆ ئاوارەکان و هاوردەکان.

١٣ دانانی ڕێوشوێنی گواستنەوەی تۆماری پێناسی باری شارستانی هاوردەکان و ئاوارەکان.

١٤ . دانانی ڕێوشوێن بۆ گواستنەوەی پسووڵەی خۆراک بۆ هەردوولا.

١٥ دانانی ڕێوشوێن بۆ ئەو کێشانەی کە بەهۆی لابردنی گرێبەستە کشتوکالییەکانەوە پەیدابوون.

١٦ دروستکردنی لیژنەیەکی تایبەت بە گۆڕینی سنوورە ئیدارییەکانی نێوان پارێزگاکان بەهۆکاری سیاسی لە کوردستان و ناوەڕاست و باشوور.

ئەو لیژنەیە، بە سەرپەرشتیی بەندە (نەرمین عوسمان حەسەن) وەزیری ژینگە و ئەندامێتیی (حەنان فەتلاوی) کە ئەوسا راوێژکاری سەرۆک وەزیران بوو بۆ کاروباری هەرێمەکان و پارێزگاکان، ئەحمەد خەفاجی جێگری وەزیری ناوخۆ، ئاشوور یلدا ئەندامی لیژنەی مادەی (١٤٠).

لە ١٣ی کانوونی یەکەمی ٢٠٠٧، راپۆرتێکمان بە ژمارە (٣٦٢) پێشکەش بە ئەنجومەنی وەزیران کرد و لەدواییشدا هەر ئەو پرۆژە و راپۆرتە بوو خرایە بەردەم پەرلەمان لە ڕێگای سەرۆک کۆمارەوە.

چەند لیژنەیەکی تر هەبوون، لەوانە: لیژنەی دارایی، من بەرپرسی لیژنەی دارایی بووم. بۆ ئەوەی کاری لیژنەکە بە ڕێکی و یاسایی بەڕێوەبچێت، پەیکەری پەسەندکراو لەلایەن ئەنجومەنی وەزیرانەوە دارێژرا.

دوای ماوەیەک، لیژنەیەک لە پەرلەمان پێکهات بۆ مادەی ١٤٠، بە سەرۆکایەتی (د.سەعدی ئیسماعیل بەرزنجی).

رەوانشاد. د.سەعدی بەرزنجی، ئەندامی ئەنجومەنی نیشتمانیی قۆناغی گواستنەوە بوو (٢٠٠٤ – ٢٠٠٥)، دواییش ئەندام پەرلەمان بوو لەنێوان (٢٠٠٥ – ٢٠١٠). راوێژکاری یاسایی سەرۆکی هەرێمی کوردستان و راگری کۆلێجی یاسای زانکۆی سەلاحەدین بوو، لەسەر کەرکوک کاندیدکرابوو، لە ١٥ی تەمووزی ٢٠١٢ کۆچی دواییکرد.

د.رائد فەهمی، لەئێستادا سکرتێری لیژنەی مەرکەزیی حیزبی شیوعییە، هەڵگری بڕوانامەی دکتۆرایە لەبواری ئابووری لە فەرەنسا و لەدایکبووی بەغدایە، وەزیری زانست و تەکنەلۆژیا بوو لەوکاتەی کە بوو بە سەرۆکی لیژنەی مادەی (١٤٠).

بەوپێیەی هەردوو کەسایەتییەکە، دۆستی کورد و مرۆڤ دۆستبوون، بە چاوێکی دەستوورییانە و یاساییانە و مرۆڤدۆستانە دەیانڕوانییە گرنگیی جێبەجێکردنی ئەو مادە دەستوورییە. هەردوو لیژنەی حکومەت و پەرلەمان، هەموو پێکهاتەکانیان لەخۆگرتبوو.

ئەندامەکانی لیژنەی ماددەی (١٤٠)ی سەر بە حکومەت:

١ . د.رائد جاهد فەهمی، وەزیری زانست و تەکنەلۆژیا/ سەرۆکی لیژنەی مادەی (١٤٠)ی دەستووری عیراق.

٢ . نەرمین عوسمان حەسەن، وەزیری ژینگە/ ئەندامی لیژنە و جێگری سەرۆکی لیژنە.

٣ . د.محەمەد ئیحسان سلیفانی، وەزیر لە حکومەتی هەرێم/ ئەندامی لیژنە.

٤ . دکتۆرە حەنان سەعید موحسین فەتلاوی، نوێنەری نووسینگەی سەرۆک وەزیران/ ئەندام.

٥ . ئەحمەد عەلی موحسین خەفاجی، بریکاری وەزیری ناوخۆ/ ئەندام.

٦ . محەمەد خەلیل نسیف جبوری، ئەندامی ئەنجومەنی پارێزگای کەرکوک/ ئەندام.

٧ . تەحسین محەمەد عەلی کەهیە، ئەندامی ئەنجومەنی پارێزگای کەرکوک/ ئەندام.

٨ . بابەکر سدیق ئەحمەد، ئەندامی ئەنجومەنی پارێزگای کەرکوک/ ئەندام.

٩ . ئاشوور یلدا بنیامین، مافپەروەر، پارێزگای کەرکوک/ ئەندام.

سکرتێری گشتیی لیژنەکە (سالار عەبدولکەریم عەبدولجبار ئەلشێخ) بوو، کەسێکە زۆر جدیی کاریدەکرد. هەروەها (عەزیز هاشم سابت) هەندێکجار لە شوێنی ئەحمەد عەلی موحسین خەفاجی ئامادە دەبوو.

محەمەد خەلیل، ئەندامی لیژنەی مادەی ١٤٠ و سەرۆکی لیژنەی هونەریی، لە ١ی کانوونی یەکەمی ٢٠١٠، بە کردەیەکی تیرۆریستیی، لەناو کەرکوک شەهیدکرا.

ئەحمەد خەفاجی، بریکاری وەزیری ناوخۆ و ئەندامی لیژنەی مادەی ١٤٠، لە ١٥ی تشرینی یەکەمی ٢٠١٤، لە کردەیەکی تیرۆریستیدا لە گەڕەکی کازمیە لە بەغدا، تیرۆرکرا.

له بونامی (نەتەوە یەکگرتووەکان)، له ١١ی ئەیلولی ٢٠٠٧ تا کۆتایی ٢٠٠٩، ستیڤان دی مستورا، دانرا وەک بەرپرسی؛ ناوچە کێشە لەسەرەکان، کێشەی نێوان عیراق و کوەیت، دەرهێنانی عیراق له ژێر بەندی (٧)ی ئەنجومەنی ئاسایش. بەدەر له کار، پەیوەندییەکی هاوڕێیانە لەنێوانماندا دروستبوو. یەکەم، وەک دوو کەسی خاوەن ڕەگەزنامەی سویدی کە بە سویدیی بەیەکەوە قسەمان دەکرد. هەروەها وەک پەیوەندیی کارکردن بەیەکەوە کە بەردەوام لەسەر سنوورە ئیدارییەکان کارماندەکرد. زۆرکات دەهاتە ماڵی ئێمە و یەکێ له خووەکانی؛ قوتوویەکی بچووکی له گیرفانی دائەنا، پڕبوو له بیبەری تیژی سوور و بەسەر خواردنەکەیدا ئەکرد، زۆر تیژخۆربوو. ستیڤان دی مستورا، کە ئێستا نوێنەری نەتەوە یەکگرتووەکانە له سوریا، لەنێوان (١١ی ئەیلولی ٢٠٠٧ تا کۆتایی ٢٠٠٩) له عیراق بوو. لەدایکبووی سویدە و دوایی ڕەگەزنامەی ئیتاڵیی وەرگرتووە، دیپلۆماتکارێکی ئیتاڵییە، دەیان پۆستی گرنگی له ئیتاڵیا وەرگرتووە. له ٢٢ی نیسانی ٢٠٠٩، ڕاپۆرتەکەی دەربارەی گۆڕانکاریی له سنوورە ئیدارییەکانی ناوخۆی پارێزگاکانی ناوچە کێشە لەسەرەکان و بۆچوونی خۆی لەسەر مادەی ١٤٠ دا بە ئەنجومەنی وەزیرانی عیراق و سەرۆکایەتی هەرێمی کوردستان، پشتی بە ڕاپۆرتەکەی ئێمە بەست کە ئەنجاممان دابوو لەسەر هەمان بابەت.

## ڕاپۆرتەکە کاردانەوەی کوردی بەدوای خۆیدا هێنا

### هۆکارەکانی دواکەوتنی جێبەجێکردنی هەنگاوەکانی مادەی ١٤٠

١ . بەهۆی دواکەوتنی کاری لیژنەکە؛ سەرەتا لەسەردەمی د.ئەیاد عەلاوی، لیژنەیەک بە سەرپەرشتیی حەمید مەجید موسا (سکرتێری حیزبی شیوعی) پێکهێنرا و بری ٢٠٠ ملیۆن دۆلاری بۆ دابینکرا، بەڵام هیچیان بۆ لیژنەکە خەرجنەکرد. بوو بەهۆی وازهێنانی سەرۆکی لیژنە. دوای ئەوە، سەرۆکی لیژنە گۆڕا بە هاشم شبلی (وەزیری داد له کابینەی مالیکی) دوای چوار بڕیار، پەیوەندیی لەگەڵ لیستی عیراقییە کە خۆی ئەندامی ئەوان بوو، تێکچوو. هەروەها لەگەڵ سیاسەتی حکومەت نەگونجا و پێی وابوو ناتوانێ بەرپرسیارێتیی ئەو قۆناغە هەستیارە وەربگرێ و وازیهێنا، بەوپێیە له لیژنەی مادەی ١٤٠ نەما.

جارێکی تر له ئابی ۲۰۰۷، سەرۆکێکی تریان دانا که د.رائد فەهمی بوو. بەو گۆڕانکارییانە، ماوەیەکی باش له کاری لیژنەکه دواکەوت.

۲ . بەهۆی گرێ کوێرەکانی باری سیاسیی و لۆجستیی و نەبوونی ئیرادەیەکی بەهێز لەلایەن حکومەته یەک لەدوای یەکەکانی دوای ۲۰۰۳.

۳ . هەندێ لایەنی توندرەو و هەندێ لایەنی سەر به ئەجێندای دەرەوە، زۆر به توندی دژی جێبەجێکردنی مادەکه دەوەستان، بەتایبەتی دوای ئەو کاتەی دیاریکرابوو بۆ دوا وادەی جێبەجێکردن، دەیانوت "بەهۆی ئەوەی لەکاتی خۆی جێبەجێ نەکراوە، ئەو مادەبە کاریگەریی نەماوە و بەپێی یاسا کەوتووە (یسقط قانونیا)". ئەوانە لەڕووی دەستوورییەوە ناشی بوون و دەستوور دایکی یاساکانە، بۆیە دەستوور وەک خۆیەتی و هیچ مادەیەکی نەگۆڕدراوە تاکو بڵێین مادەی ۱٤۰ کۆتاییهاتووە.

٤ . هەندێ لایەن، وەک بەرەی تورکمانی یان لایەنی عەرەبیی توندڕەو، دەیانوت "کەرکوک، شارێکی تورکمانییە یان شارێکی عەرەبییە". دیسانەوە ئەوانە پشتبەست به هیچ بنەمایەکی مێژوویی قسەناکەن و نەیانکردووە، (بەپێی سەرژمێریی ساڵی ۱۹۷٥ که هەموو لایەنەکان لەسەری کۆکن و کەسێک لاریی لەسەر نەبووە، ئەوسا رێژەی کورد (٤٨,۳٪) و رێژەی تورکمان (۲۱,٥٪) و رێژەی عەرەب (۲۸,۲٪) و (۱٪)یش پێکهاتەکانی تر بوون.

بەهۆی سیاسەتەکانی رژێمی بەغدا، له سەرژمێریی ساڵی ۱۹۷۷ رێژەی عەرەب بەرزبووەوە و گەیشتە (٤۱,٤٤٪) و رێژەی کورد بوو به (۳۷,٥۳٪) و هەروەها تورکمانیش بەهەمان شێوە کەمیکرد و بوو به (۱٦,۳۱٪) که ئەو سیاسەتە بوو بەهۆکاری دارشتنی ماددەی ۱٤۰ی دەستووری عیراق. تائێستاش تۆماری ئەو سەرژمێریانە (۱۹٥۷ و ۱۹۷٥) لەبەردەستایە و بەڵگەیەکی بەهێزن بۆ کوردستانیبوونی کەرکوک.

هەندێکجار، بەرەی تورکمانی دەیانوت "بەڵگەمان لەبەردەستدایە که کەرکوک ناوچەیەکی تورکمانییە"، بەڵام دیسانەوە نەیانتوانی یەک بەڵگەی باوەڕپێکراو پیشانبدەن. بەڵام کورد وەک نەتەوە دەیان بەڵگەی باوەڕپێکراوی لەبەردەستدایە، لەوانەی که بەڕێز مام جەلال له سەردەمی ئەنجومەنی حوکم پیشانی ئەندامانی ئەنجومەنی حوکمی دا.

٥ . هەندێ کەموکوڕیی و ناڕوونیی لە پێناسەی مادەی ١٤٠، ئەوەش وایکرد کە هەندێ لە هەنگاوەکانی نەکرێ و بکرێت بە بیانوو بۆ دواخستنی، وەک؛ دیارنەبوونی ئەوانەی بە سەرژمێریی پەیوەستن کە چارەنووسی ناوچەکە دیاریدەکەن؟ ئایا راپرسیی لە هەموو پارێزگاکە دەبێ یان هەر ناوچەیەک بە جیا؟ یان ئایا کام سنووری ئیدارییە هەم سەرژمێری و هەم راپرسیش دەیگرێتەوە؟.

٦ . یەکێکی تر لە کێشەکان، پێکهاتەی سەرۆکایەتی کۆمار بوو، ئەوسا لە سێ ئەندام پێکهاتبوون (مام جەلال، عادل عەبدولمەهدی، تاریق هاشمی) کە هەر یەکێکیان مافی ڤیتۆیان هەبوو بۆ هەر یاسایەک یان بڕیارێک. ئەو کاتەی کە چاککردنمان لەسەر گۆڕانکاریی سنووری ئیدارییەکان تەواوکرد، من و د.محەمەد ئیحسان، سەردانی (عادل عەبدولمەهدی)یمان کرد، ئەو لاریی نەبوو، بەڵام دەیویست هەموو عیراق وەک یەک پاکێج بخرێتە بەردەم پەرلەمان. هەروەها سەردانی (تاریق هاشمی)مان کرد، ئەو لەگەڵ جێبەجێکردنی نەبوو. تەنیا ئەوەی لەگەڵی بوو، بەڕێز مام جەلال بوو، بۆیە نەخرایە بەردەمی پەرلەمان. لەو سەردەمەی کە بەڕێز مام جەلال بە تەنیا ئەو مافەی هەبوو و بۆ خولی دووەم سەرۆک کۆمار بوو، خرایە بەردەم پەرلەمان و هێشتاش لەوێ گیربووە و نەچووەتە بواری بڕیار و جێبەجێکردن.

٧ . کەمیی بودجەی مادەی ١٤٠، ساڵانە بڕێک پارە بۆ قەرەبووکردنەوە دائەنرا کە تەنیا ئەتوانرا بەشێکی قەرەبوو بکرێنەوە، هەرچەندە قەرەبووکردنەوە کێشە نەبوو لەبەردەم سەرژمێریی و راپرسیی، بەڵام خەڵکی لە دواکەوتنی وەرگرتنی ئەو بڕە پارەیەی کە تەرخانکرابوون بۆ ئاوارەکان و هاوردەکان، بێزاربووبوون (بڕی پارەکە، بۆ هەر خێزانێکی ئاوارە (١٠) ملیۆن دینار و بۆ هەر خێزانێکی هاوردە (٢٠) ملیۆن دیناربوو). هەندێکجار، میدیاکان دەیانپرسی: بۆ جیاوازی هەیە لەنێوان ئەو دوو بڕە پارەیەدا؟ وەڵامەکەش؛ زیاتر بۆ هاندانی عەرەبەکان بوو بۆ گەڕانەوەیان و خێزانە کوردەکانیش دەگەڕانەوە سەر ماڵ و موڵکەکانیان.

٨ . هەندێ هۆی ناوخۆیی هەبوون، لە ساڵی ٢٠٠٨ بابەتی تر دەخرایە پێشینەی کارەکان و بایەخی زیاتری پێئەدرا لە گفتوگۆکانی نێوان شاندەکانی

هەرێم و حکومەتی فیدراڵ، بۆ نموونە؛ مووچەی پێشمەرگە و چەک و هەروەها کێشەی نەوت و گاز و یاسای نەوت. ئەوانە بووبوونە بابەتە سەرەکییەکان و مادەی ١٤٠ کەمتر بایەخی پێدەدرا، هەندێکجاریش حکومەتی ناوەند بەدەستی ئەنقەست کەسانی ئیمەی رادەکێشا بۆ بابەتی لەو جۆرە و بۆ ئەوەی مادەی ١٤٠ و جێبەجێکردنی ساردیی تێبکەوێ.

بە بۆچوونی من، لە هەموو خاڵەکان گرنگتر کە رێگربوو لە جێبەجێکردنی مادەکە، نەبوونی ئیرادە و ترسی حکومەت بوو لە ئاژاوەی لایەنە دژەکان و دڵڕازیکردنیان هەرجارە بە هۆکارێک، بەتایبەتی نزیک هەڵبژاردنەکان یان کاتی هەبوونی خۆپیشاندان یان هەر هۆیەکی تر، هەروەها مەترسیی لە وڵاتە دراوسێکانی وەک تورکیا و ئێران کە دژی جێبەجێکردنین.

کارێکی گرنگی تری لیژنەکە، گەڕان بوو بەدوای هەموو ئەو دۆکیۆمێنت و بڕیارانەی کە درابوون بۆ بەعەرەبکردن و گۆڕینی دیمۆگرافیی ناوچەکان. رژێمی سەدام، هیچ کارێکی نەکردووە بەبێ تۆمارکردن، ئەگەر خراپەکاری و کوشتن و بڕینیش بووبێ. لەوانە: نزیکەی (٣٠٠) بەڵگەمان لە (وقائع العراقية) و بڕیارەکانی پارێزگاری کەرکوک و (منظومه الشمال) کۆکردەوە کە هەموویان بڵاوکراونەتەوە و حاشاهەڵنەگرن لە چۆنێتیی بەڕێوەبردنی سیاسەتی بەعەرەبکردن کە هەندێکیان لەم کتێبەدا بڵاودەکەمەوە و ئەوانی تریش لە لام پارێزراون و لەم کتێبەدا جێیان نابێتەوە. گەڕان بەدوای ئەو بڕیار و بەڵگانەدا، کارێکی ئاسان نەبوون.

ئەو گۆڕانکارییانەی کە لە سنوورە ئیدارییەکانی کوردستان بەگشتی و کەرکوک بەتایبەتیی ئەنجامدراوە، کارکردن و کاتێکی زۆری پێویستبوو، هەموو ئەو نەخشانەمان لە وەزارەت و دەزگاکانی حکومەتی عیراق بە چەند جۆرە شێوازێک پەیداکرد، بۆ ئەوەی زانیاریی لەسەر گۆڕانکارییەکان کۆبکرێتەوە کە بوو بە سەرچاوەیەک بۆ (یونامی) لەکاتی نووسینی راپۆرتەکەیدا. جاری وا هەبوو بە هەفتە ئەو نەخشانە لەسەر زەوی لە ماڵی ئێمە ریزکرابوون بۆ دۆزینەوەی راستییەکان و گۆڕانکارییەکان، لەسەر ئەو گۆڕانکارییە ئیدارییانە، نووسینگەی د.محەمەد ئیحسان، زۆر هاوکارم بوون، چەندین رۆژ خۆی و نووسینگەکەی خەریکی دۆزینەوەی راستییەکان بوون. کاتێ دەستمانکرد بە

کارکردن له لیژنەی مادەی ١٤٠، زۆر کەم بەڵگەمان لەبەردەستبوو تەنانەت ژمارەی ئاوارەکانی کەرکوک و ناوچە کێشە لەسەرەکان نە لە سلێمانی و نە لە هەولێر و نە لە هیچ شوێنێ داتایەکی ئەوتۆمان بە کۆرپێژە لەبەردەست نەبوو بۆ ئەوەی بتوانین پلانێکی ورد دابڕێژین.

نووسینگەی د.محەمەد ئیحسان، زۆر هاوکارم بوون و ستافێکی باشی دابینکردبوو بۆ بەدواداچوون و وەرگرتنی زانیارییەکان.

خۆشم هەوڵمدا لە سلێمانی نووسینگەیەکم هەبێ تایبەت بە مادەی ١٤٠، بەڵام بۆم رێکنەکەوت، بۆیە تەنیا نووسینگەکەی د.محەمەد ئیحسان ئەو کارەی دەکرد.

لەو ماوەیەی کە بەرپرسی لیژنەی دارایی بووم، رێژەی قەرەبووکردنەوە و دابەشکردنی چەکی پارە بەسەر ئاوارە و هاوردەکان، بەکۆی گشتی بەسەر (کەرکوک، شنگال، خانەقین، مەخموور) بۆ ئاوارەکان نزیکەی (٦٠) هەزار چەک بوون، هێشتا نیوەی هەردوولا مابوون کە قەرەبووبکرێنەوە.

چەند جارێک دانیشتنمان لەگەڵ لیژنەی مادەی ١٤٠ی پەرلەمان کرد بۆ روونکردنەوەی پرۆسەکە و دۆزینەوەی رێگاچارە بۆیان، جارێکیش بانگهێشتکرام بۆ پەرلەمان لەسەر ئەوەی بۆچی قەرەبووەکان تەنیا بۆ ناوچە کوردییەکان دەکرێ، ئەوسا هێشتا نووسینگەکانی ناوەڕاست و باشووری عیراق کارەکانیان ئەنجام نەدابوو. لەو دانیشتنەدا هەستمکرد کە چەند لایەن دژایەتیی ئەنجامدان و جێبەجێکردنی مادەکەن و رێگرییەکان لەوە زیاتربوون کە چاوەڕوانمان دەکرد.

لە یەکێ لە پرێس کۆنفرانسەکاندا، ناوی ناوچە کێشە لەسەرەکانی کوردستانم گۆری بۆ ناوچە دابڕێنراوەکان (المناطق المستقطعة)، ئیتر لەسەر ئەوەش گلەیی لایەنە دژەکانم زۆر هاتە سەر. لە میدیا دژەکان دەیانوت «بەو نەفەسە کاردەکات و دەڵێ ئەمانە ناوچەی کوردستانین، پێش جێبەجێکردنی مادەکە».

یەکێکی تر لە کارە گرنگەکانی لیژنەکە و نووسینگەی کەرکوک، گواستنەوەی تۆماری باری شارستانیی هەر خێزانێک بوو کە قەرەبوو وەردەگرێ، چەکیان نەئەدرایە ئەگەر هاتوو بەڵگەی گواستنەوەی تۆماری باری شارستانیی

نەهێنابایە، چونکە هەر کەسێ تۆماری لەو شوێنە نەبێ، ناتوانێ خاوەنی دەنگبێ لەکاتی ریفراندۆمەکە و دیاریکردنی چارەنووسی ناوچەکە.

لەهەمان کاتیشدا، داتابەیسێک لە نووسینگەی د.محەمەد ئیحسان دامەزرا بۆ کۆکردنەوەی زانیارییەکان کە چەند کەسێک لەسەری کاریاندەکرد.

یەکێک لە کێشە گەورەکان، کێشەی زەوی کشتوکاڵی و کێشەی خانووبەرە بوون، بەتایبەتی ئەوانەی دەستاودەستی کردبوو. لیژنەیەک لە کەرکوک بە سەرۆکایەتیی (مەهدی موبارەک حەمید) پێکهێنرا بۆ لێکۆڵینەوە و وردبینیی ئەو گرێبەستانەی کە لە جوتیارانی کورد وەرگیرابوونەوە و درابوون بە عەرەبە هاوردەکان لە ناوچە کوردییەکان، بۆ نموونە؛ هیچ گۆڕانکارییەک لە (قەزای حەویجە و ناحیەی ریاز و زاب) نەکرابوو، دیاردەی پاکتاوی رەگەزییان تێدا نەبوو، تەنیا لەو ناوچانە بەدیدەکران کە ناوچەی کورد و تورکمانەکان بوون. زۆربەی بەڵگەنامە فەرمییەکانی ئەنجومەنی باڵای شۆڕشی (مجلس قیادة الثورة) سەردەمی سەدام، ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن بڕیاری لابردن و نەهێشتنی تاپۆکردنیان بەبیانووی ئەوە بووە کە نزیک سەرچاوەکانی نەوتن و بە ناوچەی (محرمات نفطية) دانرابوون، بەڵام لەدواییدا دابەشکران بەسەر جوتیاری عەرەب و ئەوانەی لە دەرەوەی پارێزگاکەوە هێنابوویاننە ناوچەکانی کەرکوک و دەوروبەری.

لیژنەی چارەسەر و لابردنی کاریگەرییەکانی نەهێشتنی گرێبەستە کشتوکاڵییەکان، بە رایورت، پێشنیاز و چارەسەرەکانیان پێشکەش بە لیژنەی مادەی ١٤٠ دەکرد و باسی لەمپەرەکانیان دەکرد کە دەهاتنە بەردەمیان بۆ جێبەجێکردنی کارەکانیان بەپێی یاسا و رێنماییەکانی دوای رژێمی سەدام.

وەزارەتی کشتوکاڵ تارادەیەکی باش هاوکارمان بوون بۆ جێبەجێکردنی زۆربەی پێشنیازەکان. زۆربەی ئەو دۆکیۆمێنتانە لای من پارێزراون. بەشێک لە کارەکانیان لە رێگای ئەنجومەنی چارەسەرکردنی کێشەکانی موڵکداریی خانووبەرە (هيئة النزاعات الملكية العقارية) جێبەجێ دەکرا. کە جگە لە خانووبەرە، هەندێ لەو کێشانە دەچوونە لای ئەوان. ئەو ئەنجومەنە، بۆ هەموو کێشەکانی عیراق بوو، بەتایبەتی کوردە فەیلییەکان و ناوچە دابڕێنراوەکان. لە

٩ی کانوونی دووەمی ٢٠٠٦ دامەزراوە و بە یاسایەکی سەردەمیانە کاریاندەکرد کە لە (٤٠) مادە پێکهاتبوو.

لیژنەی هونەریی، بە سەرپەرشتیی محەمەد خەلیل نسێف، دەچوون بۆ سەردانی ئەو ناوچانەی کە کێشە لەسەرن، بۆ ئەوەی بزانن دەکەونە سنووری مادەی ١٤٠، بۆ نموونە؛ سەردانی ناوچەی (سەرگەڕان، چۆمە زەردەی سەروو و خواروو، پردی موفەر، بنگرد)یان دەکرد. بۆ ئەوەی بزانن ئەتوانین فۆرمەکان دابەشبکەین بەسەر هاوڵنیشتمانیانی ناوچەکەدا.

لیژنەی یاسایی، بە سەرپەرشتیی ئاشوور یلدا بنیامین، ئەرکیان بەدواداچوون و داڕشتنی یاسا پێشنیازکراوەکان و پێشێلکارییەکان بوو.

بابەکر سدیق ئەحمەد، سەرپەرشتیاری نووسینگەی کەرکوک بوو، لەهەمان نووسینگە، تەحسین کەهیە و محەمەد خەلیل نسێف، ئامادە دەبوون و بە هەماهەنگیی کارەکانیان دەکرد.

ئەنجومەنی چارەسەرکردنی کێشەی موڵکداریی، کارەکانی زۆر خاو دەڕۆیشتن، جیگیرکردنەوەی ئەو خانەوادانەی کە گەڕاونەتەوە شوێنەکانی خۆیان، دەبوایە قەرەبووبکرێنەوە یان زەوییان پێبدرێ یان هیچ نەبێ توانایەکیان پێبدرێ بەمەبەستی گواستنەوەیان.

## تایبەتمەندێتیی کەرکوک

لە مادەی (١٤٠)دا، تایبەتمەندیی بە کەرکوک دراوە، دەڵێ؛ ناوچە ناکۆکی لەسەرەکان بە کەرکوکەوە. هۆکارەکەی ئەوەیە؛ کەرکوک و قەزا و ناحیەکانی، سەرجەمیان گۆرانکاریی دیمۆگرافییان بەسەردا هاتووە، شوێن نەماوە لەو ناوچەیە وەک خۆی مابێتەوە یان سیاسەتی بەعەرەبکردنی بەسەردا نەهاتبێ یان سنووورە ئیدارییەکەی نەگۆڕدرابێ.

کەرکوک، پارێزگایەکە دانیشتوانەکەی لە؛ کورد و تورکمان و عەرەب و کلدۆ ئاشووری و پێکهاتەی تر، هەروەها لە سوننە و شیعەش پێکهاتووە.

بۆچوونی پێکهاتەکان، لەسەر چارەنووسی کەرکوک جیاوازە. زۆربەی عەرەبەکان، دەیانەوێ بچێتە سەر حکومەتی فیدراڵ و بەشێکیش لە تورکمانەکان، دەیانەوێ ببێتە هەرێمێکی سەربەخۆ. جگە لە فرەڕەنگیی

پێکهاتەکانی، دەوڵەمەندە بە نەوت و گاز و ناوچەیەکی گرنگی کشتوکاڵیشە، هەروەها سنووری پەیوەندیی نێوان هەرێم و بەشەکەی تری عیراقە. ئەمانە بوونەتە هۆی ئەوەی دەستێوەردانی دەرەکیی لە چارەنووسی ئەو ناوچەیە زۆربێت. زۆربەی وڵاتانی ناوچەکە، لایان پەسەند نییە کەرکوک بێتە سەر هەرێمی کوردستان، چونکە شارێکی دەوڵەمەندە بە سەرچاوە سروشتییەکان و ترسی ئەوەی هەیە ببێتە پاڵنەرێک بۆ بەدەوڵەتبوونی هەرێمی کوردستان، لەبەرئەوەی بالانسی هەرێم لەڕووی ئابووری و رووبەر و دانیشتوانەوە بەرزدەکاتەوە.

دوای کەرکوک، زۆرترین ناوچە کێشە لەسەرەکان، دەکەونە پارێزگای موسڵ و سنووریان لەیەکەوە نزیکە، وەک: شنگال، مەخمور، شێخان، بەعشیقە، حەمدانیە، زومار و قەحتانیە.

دواتریش، پارێزگای دیالە دێت کە لەوێش؛ خانەقین، جەلەولا، مەندەلی، مەیدان، بەدرەو جەسان و قورەتوو، ناوچە کێشە لەسەرەکانن.

لە پارێزگای سەلاحەدینیش، قەزای دوزخورماتوو، کێشەی زۆرە و وەک کەرکوک وایە بەهۆی پێکهاتەکانییەوە.

بۆ ئەوەی هاوردە عەرەبەکان بگەڕێنەوە ئەو ناوچانەی کە لێوەی هاتبوون، بە چەند بڕیارێک، زەوییان بەسەردا دابەشکرا. ئەوانەی چەکی پارەی قەرەبوویان لە نووسینگەی کەرکوک وەرگرتبوو، لە پارێزگای میسان و ئەنبار و بابل زەوییان بەسەردا دابەشکرا. ئەو هاوردانەش کە چەکی قەرەبوویان لە نووسینگەی شنگال وەرگرتبوو، لە پارێزگای نەینەوا، بڕیاری دابەشکردنی زەوییان بۆ دەرچوو. بەهەمان شێوە لە نووسینگەی واست و بابل و بەسرە و میسان و ذیقار زەویان بۆ دابینکرابوو.

ئەرکی جێبەجێکردنی مادەی ١٤٠ی دەستووری عیراق، ئەرکێکی زۆر گرنگ و ماندووکەر بوو، رووبەڕووی چەندین کێشە دەبووینەوە، کارێکی ئاسان نەبوو، بەلام بەلامەوە ئەرکێکی پیرۆز و نەتەوەیی بوو، بۆیە ئەوەی لەتوانامدا بووبێ وەک تاک، کەمتەرخەمیم نەکردووە و نەترساوم لە ئەنجامەکان و بەرپرسیارێتییەکانی. هەروەها هاوکارانم بەهەمان شێوە بوون، بەتایبەتی ئەو کوردانەی کاریان لە لیژنەکە دەکرد، بەگیانێکی نەتەوەییەوە کاریاندەکرد.

مادەی (١٤٠)، جێی بایەخی دونیا بوو، چونکە دەزانرا کێشەی عیراق و ئاشتەوایی لە عیراق، بەرئەنجامی جێبەجێکردنی ئەو مادەیەیە. بەردەوام کۆبوونەوە و سەردان و چاوپێکەوتنمان لەگەڵ باڵیۆزخانەکان و لایەنە سیاسییەکان و پەیداکردنی لۆبیی بۆ جێبەجێکردنی مادەکە هەبوو، هەروەها بۆ روونکردنەوەی شێوازی کارکردنمان بەمەبەستی کەمکردنەوەی ترس لە جێبەجێکردنی مادەکە. زۆربەی سەردان و چاوپێکەوتنەکان، لەگەڵ د.محەمەد ئیحسان، دەمانکرد.

دەبێت ئاماژە بۆ ئەوە بکەم کە د.رائد فەهمی کەسێکی وردبوو لە کارەکانی و دڵسۆزانە کاریدەکرد.

لیژنەکەمان (لیژنەی دارایی)، سەردانی هەموو بنکەکانمان کرد لە شارەکان بێ گوێدانە مەترسییەکانی رێگاوبانی ئەو سەردەمە، وەک سەردانی (کەرکوک، خانەقین، مەخمور، شنگال، موسڵ...هتد).

لیژنەکان، بەتایبەتی لیژنەی هونەریی، بە بڕیاری لیژنەی سەرەکیی مادەی (١٤٠)، سەردانی ناوچە کێشە لەسەرەکانیان دەکرد، بۆ نموونە؛ (سەرگەران، موفەر، بنگرد، جەبارە، قەرەهەنجیر، بایچی، پردێ، قەرەتەپە، دوزخورماتوو، لەیلان، تازەخورماتوو، شوان، قادرکەرەم، داقوق، ناوچەکانی خانەقین، ناوچەکانی شنگال و موسڵ..هتد). بۆ دڵنیابوون لەوەی ئایا ئەو ناوچانە رێنماییەکانی لیژنەی مادەی (١٤٠) دەیانگرێتەوە و ئەتوانرێ فۆرمی قەرەبووکردنەوەیان بەسەردا دابەشبکرێت. ئیتر لەسەر رێنمایی و راپۆرت، ئەو لیژنەیە فۆرمەکانیان دابەشدەکرد و دەخرانە ریزبەندییەوە. پاشان لیژنەی بەدواداچوونی راستییەکان، لە راستی و دروستیی مامەڵەکانیان دەکۆڵییەوە، دواتر دەهاتە لیژنەی دارایی و چەکی بۆ رێکدەخرا و بەپێی ریزبەندیی، قەرەبووەکان دابەشدەکران. هەموو ئەو لیژنانە، مانگانە راپۆرتی خۆمان ئەدا بە لیژنەی سەرەکی و دواتریش ئەو راپۆرتانە دەنێردرانە ئەنجومەنی وەزیران، چونکە لیژنەکە سەر بە ئەنجومەنی وەزیران بوو، دەبوایە لە ورد و درشت ئاگاداربکرێنەوە.

هەموو ساڵێکیش شەرێک دەکرا بۆ دابینکردنی بودجەی مادەی (١٤٠) و جێکردنەوەی لە یاسای بودجە کە دەچووە بودجەی سەرۆکایەتی ئەنجومەنی وەزیران.

له ٢ی تشرینی یەکەمی ٢٠١٢، لەسەر بانگهێشتی (HDK)، بەشداریمکرد لە کۆنگرەی نێودەوڵەتیی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست (Halkarin Demokratik Kongressis)، لە ئیستەنبوڵ. بەشداربووان زۆربەیان لە وڵاتە عەرەبییەکانەوە هاتبوون، لە باشووری کوردستانەوە، من و خەڵەف غەفور، بانگهێشتکرابووین. وتاری دەستپێک، لەلایەن وتەبێژ و رێکخەری کۆنگرە (فاتیمە کۆیک) خوێندرایەوە. یەکەم پانێل. لەسەر رەوشی وڵاتە عەرەبییەکانی دوای بەهاری عەرەبی بوو. بەشداربووان لەو پانێلە، نوێنەری وڵاتانی (مەغریب، میسر، لیبیا و نوێنەری پەرلەمانی ئەلمانی) بوون. زۆربەی قسەکانیان، وەڵامبوون بۆ هەندێ پرسیار، وەک:

ئایا بەهاری عەرەبی، شۆڕشە یان راپەرینە؟ یان بزووتنەوەیەکی جەماوەرییە؟ خۆڕسکە یان دەستی دەرەکیی لەپشتە؟ قۆناغێکی تازەیە یان تەواوکردنی قۆناغەکانی پێشووە؟

ئەو وڵاتانەی کە کاریگەرییان هەبووە لەسەر ئەو بزووتنەوانە، هەریەکە بۆچوونی خۆی لەسەر ئەو تەوەرانە روونەدەکردەوە. هەلپەرستان چۆن توانییان دەستبخەنە ناو بزووتنەوەکە؟ وەک تورکیا، چۆن یارمەتیی رەوتە ئیسلامییەکانی دا بۆ ئەوەی دەسەڵات بگرنەدەست؟ زلهێزەکان چۆن هاتنە پێشەوە؟ رۆڵی ئەمریکا و وڵاتە ئەوروپییەکان و روسیا، چی بوون؟

بۆم دەرکەوت کە هیچیان بەرچاو روون نین، پلان و ستراتیژێکی داڕێژراو نییە بۆ ئەوەی ئەو بزووتنەوە جەماوەرییە بگۆڕن بۆ شۆڕشێکی رۆشنبیری و ئابووری و کولتووریی، تەنیا ریزکردنی قسەی جوان و بریقەداربوو.

رۆژی دووەم، بە وتارێکی، سەباحەت تونجەل هاوسەرۆکی (HDK)، دەستپێیکرد. تەوەری یەکەم، لەسەر پرسی سوریا بوو، وەڵام بوو بۆ هەندێ پرسیار. دەستێوەردانی تورکیا لە کاروباری سیاسیی ناوخۆی سوریا، رۆڵی ئەمریکا و روسیا و ئەوروپا و ئێران لە بزووتنەوە جەماوەرییەکەی سوریا و چۆنێتیی پاراستنی بەرژەوەندییەکانی ئەو وڵاتانە لەو ناوچەیەدا. یەکێ لە قسەکەرەکان، فودی بێنلیسۆی (Fodi Benlisoy) نووسەر و توێژەر و نوێنەری پارتە چەپەکانی تورکیا بوو، ئەویش وشەکانی وەڵامبوون بۆ پرسیارەکانی پێشوو. هەروەها ئینعام، لە پارتی شیوعی سوری، قسەی

کرد و رای وابوو: "میللەت خۆی چارەنووسی خۆی هەڵبژێرێت و سوود لە بەرژەوەندییەکانی وڵاتانی دەرەوە وەربگرێ. هەروەها رۆڵی روسیا و چین و پاراستنی بەرژەوەندییە سەربازی و ئابوورییەکانیان لە ناوچەکە و هاوکاریی رژێمی سوری، خیانەتێکی کەمتر نییە لە دەستێوەردانی وڵاتەکانی رۆژئاوا و پرۆژەی تایبەتیان هەیە. نە روسیا، روسیای سەردەمی لینینە و نە چین، چینی سەردەمی ماو تسی تۆنگە و زۆر گۆڕاون". هەروەها پێیوابوو؛ "دەستێوەردان، هەمووی یەکە و هەمووشی بۆ بەرژەوەندییە ستراتیژییەکانی خۆیانە، بەپێچەوانەوە ئەوانە کاری بزووتنەوەی چەپی سورییان تێکداوە، بۆیە دەبێ پشت بە میللەتەکانی خۆمان ببەستین".

هەروەها باسیان لە کەوانە (هیلال)ی شیعیی کرد، چۆن ئێران و شیعەکانی عیراق و سوریا خەریکی دروستکردنین.

لەکۆتایی قسەکانیان، ئامانجەکانیانم لەوەدا بەدیدەکرد؛ بزووتنەوە جەماوەرییەکان، بێ رێکخستنی هێزەکان، هەرگیز ناتوانن دەسەڵات بگرن بەدەستەوە و بەبێ بوونی دامودەزگای بەهێز بۆ بزووتنەوە جەماوەرییەکان، هەلپەرستەکان کاری خۆیان دەکەن.

هەروەها نوێنەری فەلەستینییەکان، باسی لە رەوشی فەلەستین و فەلەستینییەکان و پارتە سیاسییەکانی کرد، رای کۆتایی وادەرکەوت دەبێ گوتاری سیاسیمان بگۆڕین بەرەو کرانەوە، هەروەها هەموو بزووتنەوەیەکی جەماوەریی دەکری ببێ بە شۆڕش بە گۆڕینی سیاسەتی ئابووریی لە ناوچەکە و لەگەڵیدا سیاسەتی کۆمەڵایەتی و کولتووری و رۆشنبیریی و دەبێ پارتە دیموکراتخواز و مەدەنیی و لیبراڵەکان، زۆر ئاگاداری رەوشەکە بن و ناکۆکییەکانیان بەلاوەنێن و یەک گوتار و یەک هەڵوێستبن.

پانێلی چوارەم، کە کۆتاپانێل بوو، لەسەر پرسی کورد لە ناوچەکە بوو، بەشداربووان: بەندە (نەرمین عوسمان)، سەباحەت تونجەل لە تورکیا (باکووری کوردستان)، هەروەها سوریاش نوێنەریان هەبوو.

تەوەرەکەم، کاژێریکی خایاند، دەربارەی رەوشی کوردستانی باشوور بوو.

لەکۆتاییدا، کۆنگرە پێشنیازەکانی کۆنگرەی خوێندەوە و بە سروودی نێونەتەوەیی (ئینتەرناسیۆناڵ) کۆتاییهات.

بەپێویستمزانی، ئەو ڕێککەوتننامانەی کە وەک ئەمانەتێک لای من هەڵگیراون، وەک وەفایەک بۆ دارۆ کە لە هەندێکیاندا بەشداربوو، لەم کتێبەدا بڵاویان بکەمەوە، هەم بۆ خوێنەر و هەمیش وەک دۆکیۆمێنتێک، بەبێ دەستکاریی بڵاومکردونەتەوە، وەک ئەمانەتێکی مێژوویی.

## ڕێککەوتننامەی پاریس

ڕۆژانی ١٦- ٢٢ی تەمووزی ١٩٩٤، هەردوو شاندی (ی.ن.ک) و (پ.د.ک)، بۆ چارەسەرکردنی کێشەکانیان و وتووێژکردن لەسەر بارودۆخی ئێستا و پاشەڕۆژی کوردستانی عیراق، لە فەرەنسا کۆبوونەوە.

### یەکەم: ڕێکخستنی دەسەڵات

لەمەولا، سیستمێکی دیموکراسیی، کوردستانی عیراق بەڕێوەئەبات، ئەمەش فرەحیزبی و ڕێزگرتنی ڕاگەیاندنی جیهانیی مافەکانی مرۆڤ و مافی کەمینە نەتەوەیی و ئاینییەکانی زامن ئەکات.

یەک/ سەرۆکایەتی کوردستانی عیراق:

أ- سەرۆکی هەرێم، لە دەنگدانێکی ڕاستەوخۆدا هەڵدەبژێردرێ، بۆ ماوەی چوار ساڵ و دەسەڵاتی دیاریکراوی ئەبێ بەپێی یاسای ژمارە (٢)، ناوی رابەریش ئەگۆڕێ بە سەرۆک.

ب- بەر لە هەڵبژاردنی سەرۆکایەتی، ئەنجومەنێکی سەرۆکایەتی لە دەسەڵاتە دیاریکراوەکانی سەرۆک ئەکۆڵێتەوە کە لە یاسای ژمارە (٢)دا هاتووە، ئەنجومەنەکە لە سەرەک وەزیر و سەرۆکی ئەنجومەنی نیشتمانی و سەرۆکی دادگای (تەمییز) پێکدێت و بڕیارەکانی بەکۆمەڵ ئەبێت.

ج- ئەبێ پەرلەمان ئەو ئیجرائە بەدەنگدان پەسەندبکات.

### دوو/ حکومەت:

أ- تا سازدانی هەڵبژاردنی داهاتوو، حکومەتێکی ئیئتیلافی، هەرێمی کوردستانی عیراق بەڕێوەئەبات.

ب- ئەو حکومەتە، بەرفراوان ئەکرێ، تا ئەو گروپانەش بگرێتەوە کە لە پەرلەماندا نین، وەک حیزبە سیاسییەکان و کەمینە نەتەوەییەکانو کەسایەتییە بێلایەنەکان.

ج- بریاردان لەناو حکومەت و ناو وەزارەتەکاندا، بێ دەستێوەردانی حیزبە سیاسییەکان ئەبێت.

د- دوای لێکۆڵینەوەیەکی گونجاو، ڕێکخستنەوەی حکومەت دەستپێدەکات و پسپۆڕی و شارەزایی ڕەچاوئەکرێ، لەپێناو پێکهاتنی یا هەڵوەشاندنەوەی هەندێ وەزارەت، ڕووبەڕووبوونەوە و خۆئامادەکردنی باشتر بۆ دابینکردنی پێویستییەکانی هەرێم.

هـ- پێکهێنانی ئەم دامەزراوانە:

- مەجلیسی خدمەی مەدەنی، بەرپرسیار ئەبێ لە دامەزراندنی کارمەندان، بەپێی بنەمای لێهاتوویی و پسپۆڕیی نەک حیزبایەتی.

- دیوانی چاودێری و دارایی، بەرپرسیار ئەبێ لە پیاچوونەوەی بەڕێوەبردنی دارایی هەرێم.

- ئەنجومەنی چاودێریی پلاندانان، بەرپرسیار ئەبێ لە دانانی پلانی ئابووریی هەرێم و گەشەپێدانی بخاتە ریزی پێشەوە.

- پێویستە سپاردنی ژمارەی پۆستی وەزارەتە حەساسەکان بەپێی پرەنسیپی هاوسەنگیی لەنێوان هەردوو حیزبی سەرەکیدا، لە پێکهێنانی حکومەتی نوێدا رەچاوبکرێ.

- هەر وەزیرێک دەسەڵاتی خۆی لە بەڕێوەبردنی وەزارەتەکەدا پەیڕەو ئەکات کە بەپێی یاسا پێی دراوە، وەکیل وەزیریش ئیشەکانی خۆی بەپێی ئەو دەسەڵاتە بەڕێوەدەبات کە وەزیرەکەی بەپێی یاسا ئەیداتێ.

- ئیدارەی ئێستای کوردستانی عیراق، سەلماندی کە بێتوانایە و پێویستی بەسەرلەنوێ ڕێکخستنەوە هەیە بەگشتی و بە سەرپەرشتیی ئەنجومەنی وەزیران، ئەبێ کارمەندان بەپێی توانا و شارەزایی دامەزرێن و بە ئینتیمای سیاسی نەبێ، کارمەندانیش پێویستیان بە مووچەی باش هەیە، تا گەندەڵیی ئیداری قەڵاچۆبکرێ و ئیدارەیەکی بەتوانا و شارەزا بێتەکایەوە.

**سێ/ دەستوور:**

دەبێ دەستوورێک بۆ هەرێمی کوردستان ئامادەبکرێ و پەیمانگای (ئنیستیتۆی کورد) پسپۆڕانی دەوڵەتە فیدراڵییەکان بانگ بکات و کۆیان بکاتەوە بۆ ئەوەی پێش تشرینی یەکەمی ساڵی (١٩٩٤) پرۆژەی دەستوور ئامادەبکەن، پاشان پرۆژەکە ئەخرێتە بەردەم ئەنجومەنی نیشتمانیی کوردستان بۆ پەسەندکردنی بەر لە کۆتایی هاتنی ساڵ.

**چوار/ هەڵبژاردن:**

أ- دوای تەواوبوونی وادەی پەرلەمانی ئێستا، مانگی ئایاری ساڵی ١٩٩٥ هەڵبژاردنی سەرۆکایەتی و پەرلەمان ئەنجام ئەدرێ.

ب- پێویستە پرۆسەی ئاساییکردنەوەی بارودۆخ پێش هەڵبژاردن بێت.

ج- بەمەبەستی ئامادەکردنی لیستی راست و دروستی دەنگدان، ئەبێ سەرژمێریی دانیشتوان بکرێ بەر لە هەڵبژاردن.

د- پێویستە ژمارەیەکی زۆر چاودێرانی بیانی، سەرپەرشتی و چاودێریی هەڵبژاردن بکەن.

هـ- پێویستە سەرکردەی حیزبەکان، لەبەردەم رای گشتیی ناوخۆ و جیهان، بەڵێن بدەن، ئەنجامی هەڵبژاردنەکە هەرچۆنێک بوو، قبوڵی بکەن.

و- ئەنجامی هەڵبژاردنەکە هەرچۆنێک بێت، حکومەتێکی ئیئتیلافیی پێکدێت لەبەر رۆشنایی تەرازووی هێزەکان، واتە بەپێی رێژەی نوێنەرایەتی هەر حیزبێک لەناو ئەنجومەنی نیشتمانیی کوردستاندا.

ز- هەڵبژاردنی شارەوانی بەپێی یاسا ئەنجامبدرێت، کاتی ئەم هەڵبژاردنەش بەپێی رێککەوتنی هەردوو حیزب دەستنیشاندەکرێ.

**دووەم: سوپا و ئاسایشی هەرێم:**

أ- سیستمی بەرگریی نیشتمانیی، ئاشکرایکرد کە بێتوانایە و پێویستە بەشێوەیەکی بەرفراوانتر سەرلەنوێ رێکبخرێتەوە. بۆ ئەم مەبەستە، پێویستە هەیئەیەکی ئەرکان جێی وەزارەتی پێشمەرگە بگرێتەوە، ئەم هەیئەتەش لە گەورە ئەفسەران پێکدێت و راستەوخۆ ئەخرێتە ژێر کۆنترۆڵ و چاودێریی سەرۆک وەزیر و جێگری سەرۆک وەزیر.

ب- پێویستە سوپایەکی یەکگرتوو بەتەواویی لە خزمەتی حکومەتدا بێت و بەرپرسیاری بەرگری و پارێزگاریی هەرێمی کوردستانی عیراق بێت، خزمەتکردنی سەربازیش، ئیلزامی بێت.

ج- لەم قۆناغەدا، پێویستە ژمارەی هێزی پێشمەرگە زۆر کەم بکرێتەوە بگاتە ئەو رادەیەی کە هەردوولا بە هاوبەشی لەسەری رێکبکەون.

د- هەڵوەشاندنەوەی میلیشیاکان، بەپێی خشتەیەکی زەمەنی، کە هەردوولا بە هاوبەشی لەسەری رێکبکەون، پێویستە پێشنیازبکرێ بۆ ئەوەی چەکدارانی میلیشیاکان رووبەرووی خەدەماتی (ضمان)ی اجتماعی بکرێنەوە.

*هـ- بۆ ئەوەی خاڵەکانی ئەم ڕێککەوتننامەیە بە عەمەلی جێبەجێبکرێ، پێویستە کەڵک لە ئەزموون و شارەزایی بیانیی وەربگیرێ.*

**دوو/ هێزی پۆلیس و ئاسایش**

أ- سەرلەنوێ و بەپەلە، هێزی پۆلیس و ئاسایش ڕێکبخرێتەوە و بەتەواوی بخرێتە ژێر کۆنترۆڵی حکومەتەوە، چونکە ئەهمیەتی زۆرە و سەلامەتیی خەڵک و مومتەلەکاتی هەرێم دابین ئەکات.

ب- پێویستە پرۆسەی سەرلەنوێ ڕێکخستنەوە بە سەرپەرشتیی لێپرسراوانی ئەنجومەنی وەزیران بێت، ئەوەش پێویستی بەتوانای تەکنیکی و دارایی هەیە، پێویستە هێزی پۆلیس و ئاسایش، مەشق و مووچەی تەواویان هەبێ تا بتوانن ئیلتیزام بە ئەرکەکانیانەوە بکەن بە تەواوی و ڕێکوپێکی.

ج- کولیەی شرگە بکرێتەوە بۆ مەشقپێکردنی پۆلیس و ئاسایش.

د- هێزی پۆلیس و ئاسایش، مەشقی تایبەتییان پێبکرێ لەسەر پرەنسیپەکانی هەڵسوکەوتی مەدەنی و دیموکراتی و ڕێزگرتنی مافەکانی مرۆڤ و دڵسۆزییان بۆ حکومەت.

هـ- پسپۆڕانی بیانیی بانگ بکرێن، بۆ یارمەتیدانی هێزی چەکدار، بەتایبەتی لەبواری تەکنیکی و مەشقدا.

و- بەپەلە جەدوەلێکی زەمەنی دابنێرت بۆ دیاریکردنی ڕادە و قۆناغەکانی سەرلەنوێ ڕێکخستنەوە، کۆنفرانس بۆ هێزی پۆلیس و ئاسایش ببەسترێ، بەر لە کۆتایی مانگی ئاب، تا جەدوەلی زەمەنی و شێوازەکانی ئاڵوگۆڕ دەستنیشان بکرێ.

ز- ئەو دەزگا و دامەزراوە و کارمەندانەی کە سەر بە حیزبەکانن لەناو پۆلیس و ئاسایش، پێویستە بگوێزرێنەوە بۆ دەزگا خزمەتگوزارییەکانی تری حکومەت و وەرگرتنی پۆلیس و ئاسایش ئەبێ بەشێوەی تەجنید بێت و دەرچووی زانکۆکان و پسپۆڕان، دوای مەشق لە دەزگاکانی پۆلیس و ئاسایش وەربگیرێن.

**سێیەم: ئابووری و دارایی**

أ- بەهۆی باری خراپی ئابووری لە کوردستانی عیراق، کە بەدەست گەمارۆی دوو جەمسەر و ئاسەواری جەنگە یەک بەدوای یەکەکانەوە ئەناڵێنێ و زیاتر لە (٥٠٪) خەڵک بێکارن و ئەم بارودۆخە یەکێک بوو لە هۆیەکانی ناکۆکییەکانی ئەم دواییە، دوای سەقامگیربوونی هێمنیی لەهەرێمدا، پێویستە یارمەتییەکی نێودەوڵەتیی گەورە دابین بکرێت.

ب- سووککردنی ئابلوقەی نەتەوە یەککگرتووەکان، فاکتەری هێمنییە، تا بتوانرێ ئامێر و دەزگای پێویست دابینبکرێ بۆ ژیانەوە و بوژاندنەوەی ئابووری، بەتایبەتی دابینکردنی پێداویستییە سەرەکییەکانی دانیشتوان لەبواری وزەدا.

ج- لەبەرئەوەی دابەشکردنی یارمەتییە نێودەوڵەتییەکان لە ڕێگای ڕێکخراوە ناحکومییەکانەوەیە، حکومەت هیچ بەرنامەیەکی نییە بۆ ڕێکخستن و پلانی ئابووری، پێویستە حکومەتی هەرێم ڕاستەوخۆ داوا لەو وڵاتانە و لەو ئاژانسە فریاگوزارییانە بکات، ڕاستەوخۆ یارمەتیی حکومەت بدەن، بۆ ژیانەوەی ئابووریی هەرێم.

د- ئەنجومەنی نیشتمانیی کوردستان، بەزووترین کات یاسایەک دابڕێژێ بۆ دیاریکردنی سنوور و کاری ڕێکخراوە ناحکومییە ناوخۆیی و بیانییەکان.

هـ- پێویستە داهاتی گومرگەکان بچێتە ناو خەزێنەی گشتییەوە و ئەبێ حیزبەکان حساباتی هەموو ئەو داهاتانە تەسلیم بە حکومەت بکەن، کە لە سەرەتای مانگی ئایار (١٩٩٤)ەوە دەستیانکەوتووە، حکومەت بەهیچ جۆرێ یارمەتی حیزبەکان نەدات. تا گومرگەکان بەتەواویی کۆنترۆڵ نەکات.

و- بەشی بەڕێوەبەرایەتی گومرگ سەرلەنوێ ڕێکبخرێتەوە و پاکبکرێتەوە لە هەموو کەسە بێتواناکان و کارمەندی پسپۆڕ بخرێتە جێیان، شارەزایی و لێهاتووییان ڕەچاوبکرێ و ئینتیمای سیاسییان نەکرێتە پێودانگ.

ز- پێویستە بانکی هەرێم، لەلایەن هێزی پۆلیسی حکومەت بپارێزرێ و پاسەوانیی بکات، حیزبەکان کاریان نەبێت بەسەرییەوە.

**چوارەم: پەیوەندی ناوچەیی و دەرەوە**

**یەک/ پەیوەندی لەگەڵ وڵاتانی دراوسێ**

ا- ئیدارەی کوردستان، مافی پەنابەرێتی ئەدات بە هەموو کوردێکی زوڵملێکراو، بەمەرجی بنکەی سەربازیی لەناو کوردستانی عیراقدا دانەنێت، لە سنوورەوە هێرشی چەکداریی نەکەنە سەر دەوڵەتی مەرکەزی.

ب- لەکاتێکدا بڕوامان بە پرەنسیپی دەستێوەرنەدان لە کاروباری ناوخۆی وڵاتانی دراوسێ هەیە. هەردوولا پێشوازیی ئەکەن لە ڕێگاچارەی ئاشتییانە و دیموکراسییانەی کێشەی کورد لەو وڵاتانەدا.

ج- هەر هاریکارییەک لەگەڵ وڵاتانی دراوسێ و حیزبە سیاسییەکان ئەبێ بۆ بەرژەوەندیی یەک لایەن بەکارنەیەت، بەڵکو ئەبێ بۆ بەرژەوەندیی گەلی کورد بێت لە کوردستانی عیراق، بۆ ئەم مەبەستە هەردوولا ئاگاداری یەکترئەکەن و هاریکاریی یەکترئەکەن و خۆئەپارێزن لە هەر دەستپێشخەرییەکی یەکلایەنە کە لەسەر حسابی کوردی وڵاتانی دراوسێ بێت.

**دووەم/ نوێنەرایەتی حکومەتی هەرێمی کوردستان لە دەرەوە**

ا- نوێنەری حکومەتی هەرێم، نوێنەری رەسمیی حکومەتە، پێویستە هاریکاریی جێگرەکەی بکات لەبواری پەیوەندییەکانی دەرەوەدا.

ب- نووسینگەی حیزبەکان، نابێ دەست لە کاروباری نوێنەرەکانی دەرەوەی حکومەتی هەرێم وەردەن.

ج- دامەزراندنی نووسینگەکانی حکومەتی هەرێمی کوردستان لە دەرەوە، کۆمەککردنیان لەلایەن حکومەتەوە، هەردوو حیزب لە قۆناغی یەکەمدا پێداویستییەکانی ئەو نووسینگانە دابینئەکەن.

د- نوێنەرایەتی حکومەتی هەرێم لە دەرەوە، بە رێکوپێکیی دەوری یەکتر ئەبینن و چاویاز ئەکەوێ بە سەرکردایەتیی هەروو حیزب.

هـ- سازکردنی سیمینار و کۆبوونەوە بۆ نوێنەران و رەخساندنی بەشداریکردنیان لە مەشق و دەورەی دیپلۆماتیدا.

و- پێکهێنانی کۆمیتەیەکی باڵا لە پسپۆڕان و شارەزایانی سیاسەتی دەرەوە تا حکومەتی هەرێم لە مەسەلەی سیاسیی دەرەوەدا راوێژی پێبکات.

ز- دامەزراندنی نووسینگەی حکومەتی هەرێم لە نیویۆرک و برۆکسل.

**پێنجەم: جەدوەلی زەمەنی**

أ- ئاساییکردنەوەی دەستبەجێ.

ب- ئەبێ بەر لە کۆتایی مانگی ئابی ١٩٩٤ حکومەتێکی نوێ و ئەنجومەنێکی سەرۆکایەتیی پێکبێت.

ج- ئەبێ مانگی تشرینی یەکەمی ١٩٩٤ سەرژمێریی دانیشتوان بکرێ و لیستی دەنگدەران بەر لە کۆتایی مانگی کانوونی دووەم تەواو ببێ.

د- ئەو پسپۆڕ و شەخسیاتانەی کە بەڕێز کۆشنەر بەڵێنیداوە بیاننێرێ بۆ کوردستان، ئەبێ بەر لە سەرژمێریکردن بگەنە کوردستان.

هـ- ئەبێ پسپۆڕان و چاودێرانی هەڵبژاردن، پێش هەڵبژاردن بگەنە کوردستان، گەر بکرێ سەرەتای ساڵی ١٩٩٥ بگەن.

و- ئەبێ پرۆژەی دەستووری هەرێم بە یارمەتیی پسپۆڕان لە تشرینی یەکەم ئامادەبکرێت و پێشکەش بە (ئە. ن. ک) ئەنجومەنی نیشتمانیی کوردستان بکرێ بۆ پەسەندکردنی، کۆتایی ساڵی ١٩٩٤.

ز- پێویستە حکومەتی نوێ، پێش کۆتایی ساڵی (١٩٩٤)، دامەزراوە نوێکان، وەک؛ ئەنجومەنێکی خزمەتگوزاریی مەدەنی، دیوانی چاودێریی دارایی، ئەنجومەنی پلاندانان پێکبێنێ.

**شەشەم: چاودێری و حەکەمی**

دەقی ڕێککەوتننامەکە بە هەردوو زمانی ئینگلیزی و فەرەنسی، لە ٢٢ی تەمووزی ١٩٩٤ ئیمزاکرا، بە ئامادەبوونی بەڕێزان، بێرنارد دووران، ڕاوێژکاری دەوڵەت و باڵیۆزی فەرەنسا و کەنداڵ نەزان، سەرۆکی ئەنستیتۆی کورد لە پاریس، د.نەجمەدین کەریم، سەرۆکی کۆنگرێسی نیشتمانی کورد KNC ئەم بەڵگەنامانە باوەڕپێکراون.

کۆمیتەیەکی چاودێریی لە شەخسیەتی کوردی و بیانی و ڕاوێژکاران پێکدێت، بۆ حەکەمی و یەکلاییکردنەوەی بیروڕا جیاوازەکان سەبارەت بە ڕوونکردنەوەی جێبەجێکردنی بەندەکانی ڕێککەوتننامەکە.

**پێکهاتەی ئەم کۆمیتەیە**

پێش ئیمزاکردن لەلایەن هەردوو سەرکردەی کورد و دوای پرس و ڕا لەگەڵ چەند حیزبێکی دیاریکراودا دەستنیشان دەکرێ.

نەوشیروان مستەفا، سەرۆکی شاندی (ی.ن.ک)
سامی عەبدولڕەحمان: سەرۆکی شاندیی (پ.د.ک)

**ڕێککەوتنی ئەنقەرە (ئۆکتۆبەر)**

نوێنەرانی تورکیا و ئەمریکا و بەریتانیا لەگەڵ وەفدی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان و پارتی دیموکراتی کوردستان و بەرەی تورکمانی، لە ڕۆژانی ٣٠ و ٣١ی ئۆکتوبەری ١٩٩٦ لە ئەنقەرە کۆبوونەوە.

هەموو لایەنەکان لەسەر ئەوە (ڕێککەوتن) کە ئامانجی بنەڕەتیی گفتوگۆکان بەم شێوەیە بێت:

١- بەردەوام بوون و پتەوکردنی ئاگربڕی نێوان پارتی دیموکراتی کوردستان و یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان، بەهیوای ئەوەی ببێتە ئاگربڕێکی هەمیشەیی.

٢- چەسپاندنی ئاشتی و پاراستنی لە باکووری عیراقدا، بە دەستپێکردنی پێکهاتنەوەی سیاسیی.

**چالاکیی حیزبەکان:**

١- نابێ ئەو کۆبوونەوەیە، یان ئەو ڕێککەوتننانەی کە لە ئەنجامی ئەو کۆبوونەوەبە دێنەکایەوە، یەکپارچەیی خاکی عیراق بخاتە مەترسییەوە.

٢- ئایندەی عیراق، لەسەر بنەمای داواکاریی ئازادانە و هاوبەشی هەموو کۆمەڵانی خەڵکی عیراق دیاریدەکرێ و لە ڕێگای گفتوگۆ و پاراستنی مافەکانی مرۆڤ و مافە سیاسییەکانی هەموو هاوڵاتیانی عیراق هەر وەک لە بڕیاری ٦٨٨ ئەنجومەنی ئاسایشی سەر بە نەتەوە یەکگرتووەکاندا هاتووە، ئەو بڕیارەش ڕێز لە سەروەریی عیراق و یەکپارچەیی خاکەکەی و سەربەخۆییەکەی دەگرێ، هەروەک لە بەڵێنەکانی هەموو ئەندامانی نەتەوە یەکگرتووەکاندا هاتووە.

٣- پێویستە بایەخی ئەمنیەتی تورکیا و وڵاتانی تری دراوسێ و پاراستنی سنووری نێودەوڵەتیی بە هەند هەڵبگیرێ.

٤- هەردوو حیزب لەسەر ئەوە ڕێککەوتن کە داوای دەستێوردانی هێزی تر نەکەن، کە دەبێتە هۆی قووڵکردنی جیاوازییەکان و زیادکردنی گرژییەکان و هەر هێزێکی لەو بابەتە لە پارێزگاکانی باکووردا هەبن، بەجێیبهێڵن.

**سەبارەت بە ئاگربڕ:**

٥- شوێنی هێزەکانی پارتی دیموکراتی کوردستان و یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان دیاریدەکرێت، هەروەک سەعات دوانزەی شەوی ٢٣ی ئۆکتۆبەر،

لەلایەن نوێنەرانی هێزی چاودێریی ئاشتی و ئەندامانی (اعضاء الاتصال)ی نێوان هەردوو حیزب لە نزیکترین کاتدا، هێڵەکانی ئاگربڕ دیاریدەکرێن لە ڕێگای ئەو ڕاپۆرتانەی کە بۆ دەستەی سەرپەرشتیاری چاودێری ئاشتیی دەنێردرێ.

٦- هەردوو حیزب لە شوێنەکانی بەرگریی خۆیان دەمێننەوە و دەستدرێژیی بۆ سەر یەکتری ناکەن.

٧- هێزێکی بێلایەن بۆ چاودێریکردنی ئاشتیی پێکدەهێنرێ و بەکاردەبێ بۆ چاودێریی ئاگربڕ، یەکەکانی ئەو هێزە بە درێژایی هێڵی ئاگربڕ لەو ناوچانەی کە لەسەری ڕێکدەکەون دەستبەکار دەبێت و سەرپەرشتیی بارودۆخەکە دەکات.

ئەو هێزەش نوێنەرانی دەبێ لەو ناوچانە و ڕاپۆرتەکانی خۆشیان دەنێرنە بارەگای هەرێمایەتییان لە هەولێر.

لەم هێزەدا، تورکمان و حیزبە کوردییەکان و ئاشووری و بێلایەنەکانی باکووری عیراق بەشداریی تێدا دەکەن، کە بەشداربووانی ئەم کۆبوونەوەیە ڕەزامەندیی لەسەر ئەو هێزە دەدەن.

٨- هەردوو حیزب بەشێوەیەکی ڕێکوپێک، هاوکاریی هێزی چاودێریی ئاشتیی دەکەن و ئیشەکانی ئاساندەکەن و ئەندامانی (اعضاء الاتصال) نێوانی خۆیان و ئەم هێزانە بەتەواوی دیاری دەکەن و هاوکاریی لەگەڵ لێپرسراوەکانیان و نوێنەرەکانیان دەکەن بۆ چاودێریکردنی ئاگربڕ و دۆزینەوەی چارەسەر بۆ هەر ناکۆکییەک و لێکۆلینەوە دەربارەی بەپێی پێویست.

٩- لێرەش دەستەیەک بۆ چاودێریی ئاشتی و سەرپەرشتیی چالاکیی هێزی چاودێریی ئاشتی و بۆ لێکۆڵینەوە لە شکایەتی هەردوولا پێکهێنرا، ئەم دەستەیەش زانیاریی لە ڕێگای چاودێرانی نەتەوە یەکگرتووەکانەوە وەردەگرن بۆ جێبەجێکردنی ئیشوکارەکانی.

١٠- دەستەی سەرپەرشتیی چاودێریی ئاشتیی، بارەگاکەی لە ئەنقەرە دەبێ و لە نوێنەرانی تورکیا و ئەمریکا و بەریتانیا و پارتی دیموکراتی کوردستان و یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان و هێزی چاودێریی ئاشتیی پێکدێت، ئەم دەستەیە لە هەفتەی یەکەمی نۆڤەمبەری ١٩٩٦ کۆدەبێتەوە بۆ دانانی بەرنامەی کارەکانی ناوخۆی.

١١- هەر ئەندامێک لەم دەستەیە بۆی هەیە شکایەتی خۆی پێشکەش بکات.

١٢- هەردوو حیزب شەڕی راگەیاندن لە هۆیەکانی راگەیاندنی خۆیان رادەگرن.

١٣- هەردوولا دیلەکان و گیراوەکان ئازاد دەکەن و تەرمی کوژراوەکانیش دەدەنەوە بەیەکتری.

١٤- هەردوولا لەسەر ئەوە رێککەوتن کە خزمەتگوزارییە مەدەنییەکان لە هاتووچۆ و ئاو و کارەبا و سووتەمەنی و پێداویستییەکانی تەندروستی و خۆراک، پێشکەشبکەن و لەبەر هۆیە سیاسییەکان تەگەرە نەخەنە بەردەم پێشکەشکردنی ئەو خزمەتانە، هەردوولا هاوکاریی یەکتردەکەن بۆ چاککردنەوەی خزمەتگوزارییە مەدەنییەکان، وەک ئاو و ئاوەڕۆ و کارەبا لە باکووری عیراقدا و داوا لە رێکخراوەکانی نەتەوە یەکگرتووەکان دەکرێ، یارمەتی و چاودێریی خۆیان لە چوارچێوەی دەسەڵاتەکانیان پێشکەشبکەن بۆ جێبەجێکردنی ئەم کارە.

١٥- هەردوولا بەڵێنەکانیان لەمەڕ سەلامەتیی و ئەمنیەتی کارمەندی رێکخراوە خێرخوازەکان و خێزانەکانیان دووپاتکردەوە.

١٦- هەردوولا تەئکیدیان لەسەر ئەوە کردەوە پەنابەرە عیراقییەکان و دەربەدەرەکان مافەکانیان یەکسان دەبێ وەکو هەموو ئەوانی تر بۆ وەرگرتنی یارمەتییە مرووییەکان بێ گوێدانە رەنگی سیاسی و رەگەز، لەسەر ئەوەش رێککەوتن کە داوای یارمەتی لە کۆمسیۆنی باڵای کاروباری پەنابەرانی سەر بە نەتەوە یەکگرتووەکان بکرێ، پەنابەرەکان ئەوانەی دەیانەوێ بگەڕێنەوە بیانهێننەوە شوێنەکانی خۆیان.

١٧- تورکیا و ئەمریکا و بەریتانیا، یارمەتیی پێویست پێشکەش دەکەن.

**ئاشتبوونەوەی سیاسی:**

١٨-وەک مەسەلەیەکی بنەڕەتی، هەردوولا رێککەوتن و بەڵێنیان دا؛ گفتوگۆی دیکەش ئەنجامدەن بۆ پێکهێنانی ئیدارەیەکی کاتیی بۆ ناوچەکە لە باکووری عیراقدا، بە بەشداریی هەموو حیزب و کەمینەکان وەک تورکمان و ئاشووری لەسەر بنەمایەکی یەکسان.

١٩- کۆکردنەوەی داهاتەکانی گومرگ و باجەکانی تر بەشێوەیەکی ئاشکرا و بەکارهێنانی لەبوارەکانی خزمەتگوزاری و گەشەپێدانی هاوبەشی بۆ هەموو خەڵکی ناوچەکە لە رێگای دابەشکردنی موناسبی داهاتەکەوە.

٢٠- ئەنجامدانی هەڵبژاردنێکی نوێ لەکاتی موناسبدا، بەشداربووانی ئەم کۆبوونەوەیە لەگەڵ ئەو لایەنانەی کە پەیوەندارن بە مەسەلەکە، زەمینە بۆ هەڵبژاردنێکی ئازاد و رێکوپێک خۆشدەکەن.

**بایەخی ئەمنیەتی تورکیا:**

٢١- حیزبەکان لەسەر ئەوە رێککەوتن کە رێگا بە خەڵکی تیرۆریست نەدەن، لەناوچەکە بن و جموجوول ئەنجامبدەن بەتایبەتی (پ.ک.ک)

٢٢- هەموو لایەنە بەشداربووەکان رێککەوتن کە کاربکەن و پشتگیریی کۆمسیۆنی باڵای کاروباری پەنابەرانی سەر بە نەتەوە یەکگرتووەکان بکەن، بۆ گەڕاندنەوەی ئارەزوومەندانەی هاوڵاتیانی تورکیا لە ئۆردوگای ئەترۆش بەزووترین کات، دوای ئەوەی بەشداربووان دڵنیابوون کە بڕیاری داخستنی ئۆردوگاکە دراوە ئەو (مبادیء)انە، وەک (مرشد)ێکە بۆ کاری هاوبەش، لەپێناوی چەسپاندنی ئاگربر و کردنی بە ئاگربڕێکی هەمیشەیی و دەستپێکردنی پرۆسەی ئاشتبوونەوە.

بەشداربووان لەسەر ئەوە رێککەوتن کە لە ١٩٩٦/١١/١٥ کۆبوونەوەیەکی دیکە بکەن، بۆ چاوپێخشاندنەوە سەبارەت بەو پێشکەوتنانەی کە لە جێبەجێکردنی ئەو (مبادیء)انە بەدەستهاتوون.

**رێککەوتننامەی واشنتۆن**

دەقی رێککەوتننامەی نێوان (ی.ن.ک) و (پ.د.ک) کە ئیمزاکراوە لەلایەن بەڕێزان جەلال تاڵەبانی و مەسعود بارزانی لە واشنتۆن رۆژی ١٩٩٨/٩/١٧.

**دووبارە دڵنیاکردنەوەی دەستکەوتەکانی پێشوو:**

لەجیاتی پارتی دیموکراتی کوردستان و یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان، زۆر سوپاسی بەڕێز مادلین ئۆلبرایت و حکومەتی ئەمریکی دەکەین، بۆ ئاسانکردنی زنجیرەیەک کۆبوونەوەی ئاشتییانە و بەردار لە واشنتۆن لەم چەند رۆژەی

دواییدا، سوپاسی رۆڵیان دەکەین لە پرۆسەی ئاشتبوونەوە و یارمەتیدانمان بۆ داڕشتنی بەرنامەیەک بۆ هاوکاریی لەداهاتوودا.

کۆبوونەوەکان هەنگاوێکی گەورەبوون بۆ ئاشتبوونەوەیەکی بەردەوام و تەواو کە هیوابەخشە بە کوردەکان و تورکمانەکان و ئاشوورییەکان و کلدانییەکان کە لە هەرێمی کوردستانی عیراقدا دەژین.

هەردوو حیزبەکە پێشوازیی لە هەوڵە بەردەوامەکانی هەردوو حکومەتی ئەنقەرە و لەندەن دەکەن لە پرۆسەی ئاشتی و ئاشتبوونەوەدا، هەروەها دان بەو رۆڵە بەرچاوەدا دەنێن کە وتووێژە جیاجیاکان لەگەڵ ئەنقەرە و لەندەندا بینییان لە سەرخستنی ئەم رێککەوتنە.

لە واشنتۆن باسی ئەو رێککەوتن و رێگایانەمان کرد کە پێویستن بۆ باشترکردنی بەڕیوەبردنی هەر سێ پارێزگاکە، هەروەها نەهێشتنی ناکۆکییە سیاسییە دوورودرێژەکان لە چوارچێوەی رێککەوتننامەکانی ئەنقەرەی ساڵی ١٩٩٦دا. هەروەها گەیشتینە چەند هەنگاوێکی گرنگ لەسەر چۆنێتی جێبەجێکردنی ئەو رێککەوتننامەیە کە جەخت دەخاتە سەر یەکبوون و یەکپارچەیی خاکی عیراق، هەر سێ پارێزگاکەی باکوور (دهۆک، هەولێر، سلێمانی) بەشێکن لە خاکی عیراق، هەردوو حیزب بەبێ جیاوازیی دەنگ، سنووره دانراوە نێودەوڵەتییەکانی عیراق دەسەلمێنن و پابەندن بە نەهێشتنی پێشێلکردنی سنوورەکانی لەلایەن تیرۆریست و کەسانی ترەوە.

هەردوو حیزب لە داهاتوودا هەوڵدەدەن بۆ دروستکردن و پێکهێنانی عیراقێکی یەکگرتوو و فرەحیزبی و دیموکراتیی کە تیایدا مافە سیاسییەکان و مافەکانی مرۆڤ زامندەکات بۆ کوردە عیراقییەکان و هەموو عیراقییەکانی تر لەسەر ئەو بنەما سیاسییانەی کە خەڵکی عیراق بڕیاری لەسەر دەدەن، هەردوولا خوازیارن کە عیراق چاکبکرێت لەسەر بنەمای فیدراڵیی کە یەکپارچەیی خاک و گەلی عیراق دەپارێزێ و دڵنیاین کە ویلاتە یەکگرتووەکان رێز لەم ئامانجانە دەگرێت بۆ هەموو گەلی عیراق.

هەردوولا شەڕی ناوخۆ مەحکوم دەکەن و هەوڵدەدەن بۆ رێگرتن لە گەڕانەوە بۆ توندوتیژی و نەهێشتنی ناکۆکییەکان یان گەڕان بەدوای دەستێوەردانی دەرەکی دژی یەکتری و هەوڵدەدەین ئەوانەی ئاشتی پێشێلدەکەن، راپێچیان بکەین بۆ دادگا، لە هەر پۆستێکدا بن یان هەر دەسەڵاتێکی سیاسییان هەبێت.

هەروەها هەردوولا ڕێکن لەسەر ئەوەی کە عیراق پێویستە بڕیارەکانی ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوە یەکگرتووەکان جێبەجێبکات لەوانە بڕیاری ٦٨٨ کە بەندەکانی تایبەتە بە مافەکانی مرۆڤ.

بۆ زامنکردنی خوڵقاندنی ژینگەیەکی ئاشتییانە بۆ ئاشتبوونەوە، هەوڵدەدەین بە هەموو توانایەکمانەوە ڕێز لە ئاگربەست بگرین و هاتووچۆی هاولاتیان ئاسانبکەین، هەروەها ڕێ لە توندوتیژیي ڕاگەیاندن بگرین بەتایبەتی ڕۆژنامەکان.

### قۆناغی گواستنەوە (الفترە الانتقالیە)

هەردوولا ڕێککەوتن لەسەر باشترکردن و بەهێزکردنی کۆمیتەی باڵای ڕێکخستن (ک.ب.ر) بۆ زامنکردن و دابینکردنی پێویستییە مرۆڤایەتییەکانی دانیشتوانی کوردستانی عیراق و بەدیهێنانی مافەکانی مرۆڤ و مافە سیاسییەکانیان، بڕیارەکانی (ک.ب.ر) بە ڕازیبوونی ئەندامەکانی دەبێت بەکۆی دەنگ.

(ک.ب.ر) ڕێوشوێن ئامادە دەکات بۆ ئاشتبوونەوەیەکی تەواو و ئاساییکردنەوەی بارودۆخ لە هەولێر و سلێمانی و دهۆک و دووبارە دامەزراندنەوەی ئیدارەیەکی یەکگرتوو و ئەنجومەنێک لەسەر بنەمای هەڵبژاردنەکانی ساڵی ١٩٩٢ کە دەسەلاتێکی تەواوی هەبێت بەسەر هەموو داهاتەکاندا لە هەرێمەکەدا. هەروەها ڕێکخستنی هەڵبژاردنێکی تازە.

(ک.ب.ر) ڕێکخستن و هاوکاریی بەهێز زیاد دەکات لەنێوان وەزارەتە خزمەتگوزارییە گشتییەکانی ناوخۆ کە لە خزمەتی پێویستییەکانی خەڵکی هەرێمی کوردستانی عیراقدان، هەردوولا ئەوە زامندەکەن کە ئەو وەزارەتانە داهاتی تەواویان پێدەگات بۆ جێبەجێکردنی ئیشەکانیان لەلای (پ.د.ک) روونە و دانی پیادەنێ کە جیاوازیی داهات پێویستی دەکات کە سەرمایە لە ناوچەکانی ژێر دەسەلاتی (پ.د.ک) بچێت بۆ ناوچەکانی ژێر دەسەلاتی (ی.ن.ک) بۆ خزمەتگوزاریی مرۆڤایەتی.

(ک.ب.ر) پرۆسەیەک گەلاڵە دەکات بۆ یارمەتیدانی گەڕاندنەوەی ئاوارەکان بۆ ماڵوحاڵی خۆیان کە لە ئەنجامی دووبەرەکی و ناکۆکیی نێوان حیزبەکانەوە ناچاربوون بەجێیبهێڵن و موڵکەکانیان بدرێتەوە یان قەرەبووبکرێنەوە بۆ ئەو زیانانەی کە لێیانکەوتووە.

(ک.ب.ر) زامنی هاوکاریی هەردوو حیزبەکە دەکات بۆ نەهێشتنی پێشێلکردنی سنوورەکان لەلایەن ئێران و تورکیاوە، هەروەها ڕێوشوێنی گونجاو دادەنێت بۆ چاودێریکردن و کۆنترۆڵکردنی هاتووچۆکردن، بە درێژایی ئەو سنوورانە و قەدەغەکردنی چالاکیی تیرۆریستان، بە هاوکاریی لەگەڵ (ک.ب.ر) هەردوو حیزب نکوڵیی دالدەدانی پارتی کرێکارانی کوردستان دەکەن لە هەرێمی کوردستانی عیراقدا، زامنی نەمانی بنکەکانیان دەکەن لە ناوچەکەدا، هەروەها ڕێ لە شێواندن و تێکدان و لاوازکردنی ئاشتی یان پێشێلکردنی سنوورەکانی تورکیا دەگرێ لەلایەن (پەکەکە)ەوە.

(ک.ب.ر) هەوڵدەدات بۆ پێکهێنانی حکومەتێکی هاوبەشی کاتیی لەماوەی سێ مانگی داهاتوودا کە باوەڕپێکراوبێ لەلایەن ئەنجومەنی نیشتمانییەوە.

## ئیدارەی یەکگرتوو:

ئەنجومەن لە ماوەی سێ مانگی کارکردنیدا بۆ چاککردنەوەی بارودۆخ کۆبوونەوە سازدەکات لە بیناکەی هەولێر لەگەڵ کۆبوونەوەی تر لە سلێمانی و دهۆک، ئەندامانی ئەم ئەنجومەنە کاتییە بریتی دەبن لە هەمان ئەو ئەندامانەی کە لە ساڵی ١٩٩٢ هەڵبژێردران.

یەکەم کۆبوونەوەی ئەنجومەنی کاتی لە ماوەی سێ مانگدا دەبێت و دوای ئەوەی کە بە تەواوی دادەمەزرێت هەموو بڕیارەکانی (ک.ب.ر) و حکومەتە کاتییەکە سەرپشکدەکات.

ئەنجومەنی کاتی دەتوانێت بڕیاری زیادکردنی کاری تر بدات بۆ ئەرکەکانی (ک.ب.ر) لەوانە یەکخستنی پەیوەندییەکان لەگەڵ کۆمەڵی نێودەوڵەتیدا.

بۆ پاراستن و زامنکردنی هەڵبژاردنەکان و بۆ ئاساییکردنەوەی بارودۆخ لە سلێمانی و دهۆک (ک.ب.ر) و ئەنجومەن بڕیاری دامەزراندنی هێزێکی ئاسایشی هاوبەش دەدەن لە (ی.ن.ک) و (پ.د.ک) و (تورکمان) و (ئاشووری)، حکومەتی تازە لەدواییدا پێوانەی زیاتر وەردەگرێت بۆ یەکخستنی پێکهاتەی هێزی پێشمەرگە.

دوای هەڵبژاردن (کە لە خوارەوە باسکراوە) ئەنجومەنێکی تازە جێی ئەنجومەنە کاتییەکە دەگرێتەوە کە دەستدەکات بە پێکهێنانی حکومەتێکی تازە کە بەندە لەسەر دەنگەکانی هەر حیزبێک لە ئەنجومەندا پاش پێکهێنانی حکومەتی هەرێم، (ک.ب.ر) لەخۆیەوە هەڵدەوەشێتەوە بەشێوەیەکی ئۆتۆماتیکی و ماوەی ئەنجومەن و حکومەتی هەرێم سێ ساڵ دەبێت.

**بەشکردنی داهات:**

تا کاتی پێکهێنانی حکومەتی کاتی، سەرمایەیەکی جێگیر بۆ وەزارەتە گشتییە خزمەتگوزارییەکان لە ناوچەکانی ژێر دەسەلاتی (پ.د.ک) دەچێت بۆ ناوچەکانی ژێر دەسەلاتی (ی.ن.ک) بەهۆی جیاوازیی داهات لە هەردوو ناوچەکەدا.

(ک.ب.ر) بە راوێژکردن لەگەڵ وەزارەتەکانی باج و ئابووری (ئەوانەی کە ئێستا هەن) بەرپرسیارە لە دابەشکردنی داهات لە هەموو هەرێمەکەدا، پاش ئەوەی کە حکومەتی کاتیی هاوبەش دادەمەزرێت، لێپرسراوێتیی کۆکردنەوە و دابەشکردنی داهات دەگرێتە ئەستۆ.

دوای هەڵبژاردنی ئەنجومەنێکی نیشتمانیی تازە، وەزارەتی باج و داهات دەسەلاتی دەبێت بۆ کۆکردنەوەی هەموو داهاتەکانی (لەوانە باج و گومرگ) و ئەو داهاتەی کە کۆدەکرێتەوە لەبەر دەستی حکومەتی کاتیدا دەبێت بۆ بەکارهێنانی بەسەر پشککردن لەلایەن ئەنجومەنەوە.

**بارودۆخی هەولێر، دهۆک، سلێمانی:**

ئەنجومەنی کاتی (ک.ب.ر) هەوڵی ئاساییکردنەوەی بارودۆخی هەولێر و دهۆک و سلێمانی و شوێنەکانی تر دەدەن. (ک.ب.ر) ئەگەر بەپێویستی بزانێ دەتوانێ پەنا بەرێتە بەر ناوبژیوانی نێودەوڵەتی بۆ ئەم مەسەلەیە.

بارودۆخی ئەم شارانە پێویستە ئاساییبکرێتەوە بە جۆرێک کە بتوانرێت هەڵبژاردنێکی ئازاد و رەوا ئەنجامبدرێت.

**هەڵبژاردن:**

دوای پێکهێنانی ئەنجومەنی کاتی، ئەم ئەنجومەنە لەگەڵ (ک.ب.ر) بەرپرسیارن لە سازکردن و رێکخستنی هەڵبژاردنێکی ئازاد و رەوا بۆ پێکهێنانی ئەنجومەنێکی تازە لە ماوەی شەش مانگی داهاتوودا، پێکهێنانی ئەنجومەنێکی تازە بەند دەبێت لەسەر باشترین سەرژمێریی دانیشتوانی هەر سێ پارێزگاکە و دابەشبوونی کۆمەڵە رەگەزی و ئاینییەکان تیایاندا، کورسی تەرخاندەکرێت بۆ کوردەکان و تورکمان و ئاشووری و کلدانی.

ئەگەر بکرێت ئەنجومەنەکان و (ک.ب.ر) بە ئیشکردن لەگەڵ کۆمەڵی نێودەوڵەتی هەڵدەستن بە سەرژمێرییەکی ناوچەکە بۆ پێکهێنانی تۆمارێکی هەڵبژاردن و ئەگەر یارمەتیی نێودەوڵەتی بەرجەستە نەکرا ئەوا ئەنجومەنەکان

و (ک.ب.ر) خۆیان هەڵدەستن بە ئەنجامدانی ئەو سەرژمێرییە یان بە راوێژکردن لەگەڵ شارەزایانی دەرەوە باشترین خەمڵاندنی ژمارەی دانیشتوانی ناوچەکە دەکەن، (بەسوودوەرگرتن لەو زانیارییانەی کە لەبەردەستدا هەن).

هەروەها ئەنجومەنی کاتی و (ک.ب.ر) هەڵدەستن بە بانگکردنی چاودێرانی هەڵبژاردنی نێودەوڵەتیی بۆ یارمەتیدان لە ئەنجامدانی هەڵبژرادن و راهێنانی چاودێرانی ناوخۆ.

**بارودۆخی هەرێمی کوردستانی عیراق:**

بڕیاری ٦٨٩ی ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوە یەکگرتووەکان، باس لەو دامرکاندنەوە و چەوساندنەوەیە دەکات کە دووچاری گەلانی عیراق بووە بەتایبەتی کوردەکان و ئەم چەوساندنەوەیە لانەچوو هەتا راپەڕینەکەی ساڵی ١٩٩١ کە بڕیارەکەی تیا جێبەجێکرا. شایەنی باسە کە لە ساڵی رابردوودا هەواڵنێری تایبەتی نەتەوە یەکگرتووەکان، هەواڵی دۆزینەوەی بەڵگەی بەهێزی راگەیاند دەربارەی کوشتنی سەدان زیندانیی عیراقی و بەردەوام بوونی سیاسەتی دەرکردنی کوردەکان و تورکمانەکان لە کەرکوک و شارەکانی تر.

ئەم سیاسەتە ئامانجی پاککردنەوەی رەگەزیی کوردەکان و تورکمانەکانە لەو ناوچانە و دەستەسەراگرتنی ماڵ و سامانیان و بەخشینی بە رەگەزی عەرەب کە ئەمانیش بەشداربەدەکەن لەم سیاسەتی راگواستنەدا لەبەر هەڕەشەی حکومەتی عیراق.

لەبەر رووناکی ئەو هەڕەشە بەردەوامە، ئێمە قەرزاربـاری کۆمەڵگای نێودەوڵەتین بۆ یارمەتیدانمان لە پێویستییە مرۆڤایەتییەکاندا و لە نەهێشتنی دووبارەبوونەوەی رووداوە تراژیدییەکانی ساڵی ١٩٩١ و هەڵمەتەکانی ئەنفالی ساڵی ١٩٨٧و ١٩٨٨.

بەرنامەی تایبەتی نەتەوە یەکگرتووەکانی نەوت بەرانبەر خۆراک بۆ خەڵکی کوردستان، بارودۆخی خەڵکی ناوچەکەی باشترکردووە.

ئێمە بەخێرهاتنی یارمەتییەکانی کۆمەڵگای نێودەوڵەتی دەکەین بۆ بەردەوام بوونی ئەم بەرنامەیە و بەشە تایبەتییەکەی کوردستان و هیواداریـن لە داهاتوویەکی نزیکدا نووسینگەیەکی پەیوەندییەکان بۆ هەرێمەکە دابمەزرێت لە بارەگاکانی ECOSOC بۆ باشتر رێکخستنی کاروباری ئەم یارمەتییانە.

هەروەها هیوادارین (لەحاڵەتێکدا ئەگەر سوودەکانی بەرنامەی نەوت بەرانبەر بە

خۆراک وەستێنرا بەهۆی کاری بەکلایەنیی حکومەتی عیراق) نەتەوە یەکگرتووەکان بەردەوام بێت لە یارمەتیدانی باری ناهەمواری خەڵکی کوردستانی عیراق.

ویلاتە یەکگرتووەکان و کۆماری تورکیا و بەریتانیا یارمەتیدەربوون لە پاراستنی کوردستانی عیراق لە ڕێگای هەڵمەتەکانی چاودێرییەوە و ئێمە داوا لەوان و دەوڵەتەکانی تر دەکەین کە بەردەوامبن لە جێبەجێکردنی ئەرکە پارێزگارییەکانیان.

زۆربەی ڕێکخراوە ناحکومییە نێودەوڵەتییەکان کە ئیشدەکەن لە سێ پارێزگاکەی باکوور بە زۆر ڕێگا یارمەتیدەربوون لەوانە، نەهێشتنی بارودۆخی کەنارگیریی.

**کۆبوونەوەکانی داهاتووی هەردوو سەرۆک:**

سەرۆکی (پ.د.ک) و سکرتێری گشتیی (ی.ن.ک) بەلایەنی کەمەوە دوو مانگ جارێک کۆدەبنەوە لەناوەوە یان دەرەوەی کوردستان لە شوێنی گونجاو بۆ هەردوولا.

تا کاتی ڕێککەوتنی هەردوو حکومەت، هیواداربن کە یەکەم کۆبوونەوەی لەم جۆرە لە ئەنقەرە سازبکەین و کۆبوونەوەیەکی تر لە لەندەن.

کۆبوونەوەی ئەنقەرە وتووێژ دەربارەی نەهێشتنی تیرۆر لەخۆدەگرێت، ئەویش بە دانانی پارێزگاریی بەهێزتر بۆ سنوورەکانی عیراق. کۆبوونەوەکەی لەندەن خاڵی زیاتر لەخۆدەگرێت دەربارەی بارودۆخی دهۆک و هەولێر و سلێمانی و دامەزراندنی میکانیزمێک بۆ هەڵبژاردنێکی سەربەست و ڕەوا.

ئیمزا:

جەلال تاڵەبانی

یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان

مەسعود بارزانی

پارتی دیموکراتی کوردستان

شایەت:

دیڤدس وێڵیش

یاریدەدەری بریکاری وەزیری دەرەوە بۆ کاروباری خۆرهەڵاتی نزیک/ واشنتۆن ١٩٩٨/٩/١٧

**خشتەی كات**

١٩٩٨/١٠/١ (پ.د.ك) دەستدەكات بە یارمەتیی ئابووریی مانگانەی گونجاو بۆ وەزارەتە خزمەتگوزارییە گشتییەكانی ژێر دەسەڵاتی (ی.ن.ك).

١٩٩٨/١٠/١٥ كاتی گەڕانەوەی ئاوارەكان بۆ سەر ماڵوحاڵیان كە بەهۆی ناكۆكییەكانی لەوەوپێش دەركرابوون، رێككەوتن لەسەر گەڕاندنەوەی موڵكەكانیان یان قەرەبووكردنەوەیان لەلایەن بەرپرسەكانەوە.

سەرەتای مانگی تشرینی دووەم: وتووێژی هاوبەش لەگەڵ حكومەتی توركیا.

١٩٩٨/١١/١ هاوكاری و رێكخستنی وەزارەتە مرۆڤایەتییەكان، داهاتی دانراو بۆ وەزارەتەكان لە ناوچەكانی ژێر دەسەڵاتی (پ.د.ك) دەچێت بۆ ناوچەكانی ژێر دەسەڵاتی (ی.ن.ك).

١٩٩٨/١١/١٥ بەرەوپێشچوونی كاروباری گەراوەكان، یەكگرتنی وەزارەتەكان و دابەشكردنی داهات.

١٩٩٩/١/١ یەكەم كۆبوونەوەی ئەنجومەنی كاتی، حكومەتی كاتی هاوبەش پلانی ئاساییكردنەوەی بارودۆخی هەولێر، دهۆك، سلێمانی، دادەنێ.

١٩٩٩/٤/١ حكومەتی كاتیی هاوبەش، پلانی رێكخستنی هەڵبژاردن دادەنێت.

١٩٩٩/٧/١ هەڵبژاردنەكان.





بسم الله الرحمن الرحيم

جامعة بغداد

بناءً على ما عرضه مجلس كلية التربية / ابن الهيثم
وأقرّه مجلس جامعة بغداد منحت
نرمين عثمان حسن
شهادة البكالوريوس في علوم الرياضيات بتقدير جيد
وبذا أصبح لها حق التمتع بكل ما تخولها هذه الشهادة من حقوق وامتيازات

كُتب ببغداد في اليوم السابع من شهر جمادي الأول من سنة ألف وثلاثمائة وواحد وتسعين هجرية
الموافق لليوم الثلاثين من شهر حزيران من سنة ألف وتسعمائة وأحدى وسبعين ميلادية

رئيس الجامعة
الأستاذ الدكتور

العميد
الأستاذ الدكتور

٠٧١٠٥٨٩٥٢



The Royal Scientific Society of Jordan, the Iraqi International Center for Science and Industry, and the US Civilian Research and Development Foundation are pleased to certify that

**H. E. Mrs. Narmin Othman**

has attended the

**Al-Tuwaitha Research Project Meeting**

at the Royal Scientific Society of Jordan in Amman, Jordan
on the dates of 23-25 April, 2007

Cindi Warren Mentz,
US Civilian Research &
Development Foundation

Debra J. Nagel,
Iraqi International Center
for Science and Industry

Dr. Bassam Hayek,
Royal Scientific Society
of Jordan



نتائج الامتحانات العامة للدراسة الاعدادية
لوائي سليمانية وكركوك الفرع العلمي



بەڵێ
نۆبڵی
بۆ

ژیانەوە
ژن.. خەبات.. ژیان
AWA

هەفتەنامەیەکی کۆمەڵایەتی و رووناکبیریی تایبەتە، یەکێتی ژنانی کوردستان دەریدەکات


# خەڵاتی ژنی ساڵ لەعێراق دەبەخشرێتە ژنێکی کورد



مونتەدای عێراقی نازک ئەلمەلائیکەو کاروباری رۆشنبیری کوردی لەیەکێتی ئەدیبان و نووسەرانی عێراق، خەڵاتی ژنی ساڵ لەعێراق دەبەخشنە خاتوو ئەرمین عوسمان ئەندامی سەرکردایەتی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان.

لەکاروباری سیاسی و کۆمەڵایەتی و رۆشنبیری، خاتوو ئەرمین عوسمان ئەندامی سەرکردایەتی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان لەلایەن مونتەدای عێراقی **نازک ئەلمەلائیکەو کاروباری رۆشنبیری کوردی لەیەکێتی**

لەچەند رۆژی رابردوودا مەراسیمێکی تایبەت بەخەڵاتکردنی ئەرمین عوسمان لەشاری بەغدا **رێکخرا**، لەمەراسیمەکەدا باسی لەبەسەرهاتەکانی ژیانی خۆیو ئەزموونەکانی کرد وەک ژنێکی کورد

The fate of democracy in Afghanistan and Iraq may rest with wives and mothers who have channeled pain and loss into political will.



Narmin Othman
Minister of Environment, Iraq



Dr. Massouda Jalal
Minister of Women's Affairs, Afghanistan

# These Women Are Changing Their Nations

By Lyric Wallwork Winik

THEY ARE MOTHERS with children, a wife and a widow who are risking their lives for a shot at politics. Narmin Othman, 57, is an Iraqi Kurd and a one-time high school teacher. Massouda Jalal, 41, is an Afghan and a doctor by training who boldly ran for president in last fall's elections. Both are now cabinet ministers in their respective countries. But their journeys have been arduous. Othman lost most of her family to Iraqi strife, while Dr. Jalal was threatened with arrest and hanging by the Taliban.

Indeed, like or loathe the U.S.-led invasions of Iraq and Afghanistan, both nations now must struggle to create working governments. And U.S. leaders are pinning significant hopes on these women to help transform their countries. I had a chance to talk with Othman and Dr. Jalal one morning as they made a whirlwind trip through Washington, D.C. There were no ground rules. Everything was up for discussion.

## Othman: Activism Born of Pain

Narmin Othman knew long ago the price of politics in Iraq, where guerrillas already have assassinated two high-ranking female officials as well as mid-level activists. "I started my life in a political family," she said in a voice raspy from lack of sleep and years of cigarettes. Like many stories, Othman's story is heavy with hardship, and her eyes fill with tears as she talks. Her father, brother and husband were active in the Kurdish resistance and spent years hiding in the mountains of northern Iraq, living as guer-



Narmin Othman with a bodyguard.

"Loving your people is larger than loving yourself."
—Narmin Othman



### On the Cover

Our Declaration of Independence includes those words, of course. You can read the entire document at www.constitution.org/us/declar.htm on the Web.

COVER PHOTOGRAPH BY ROB ROWAN/PROGRESSIVE IMAGE/CORBIS

فەخامەتی سەرۆك كۆماری عێراقی فیدرال

جەنابی مام جەلال

وێرای ڕێزمان ...

داوا لە یەزدانی گەورە دەكەین كە تەندروستیتان لەوپەڕی باشیدا بێت ، لەبەر ئەوەی كاتی جەنابتان چڕە و سەرقاڵن بە كارەوە بۆیە بەم نامەیە ئەم پرۆژەیە بۆ جەنابتان بەرز دەكەینەوە بە ئومێدی ڕەزامەندیتان لەسەری .

بەڕێز د. كاظم حبیب پرۆژەیەكی ئامادە كردووە بۆ بەرگری لە شوێنكەوتوانی ئاین و مەزهەبەكان لە عێراق ، پاش ئەوەی لە هەولێر كۆنگرەی پشتگیری دۆسیەی كوردی ئەنجامدا ، دەیەوێت بۆ ئەم پرۆژەیە لە سلێمانی كۆنگرەی بۆ ببەسترێت بە ڕەزامەندی و سەرپەرشتی فەخامەتان .

فەرمون پرۆژەكە بۆ بەر چاوی جەنابتان .

لەگەڵ ڕێزماندا ....

ئەرمین عوسمان

ئەندامی سەركردایەتی ( ی . ن . ك )

٢٠١٢/٦/٩

DIANNE FEINSTEIN
CALIFORNIA

United States Senate
WASHINGTON, DC 20510-0504

March 10, 2005

The Honorable Narmin Othman
State Minister for Women's Affairs
Republic of Iraq

Dear Minister Othman,

It was a great pleasure to meet with you and your delegation. I really appreciated your insight on the future of Iraq.

Know that the Women of the U.S. Senate are with you and your colleagues in making sure that Iraq is democratic, stable, and respectful of the rights of women.

I wish you all the best.

Sincerely,

Dianne Feinstein
United States Senator

بسم الله الرحمن الرحيم

**REPUBLIC OF IRAQ** — جمهورية العراق

Prime Minister's Office — مكتب رئيس الوزراء

No: — العدد:

Date: / / — التاريخ: ٢٨ / ٣ / ٢٠١٠

معالي وزير العلوم والتكنولوجيا السيد رائد جاهد فهمي / رئيس لجنة تنفيذ المادة (١٤٠) من الدستور
معالي وزيرة البيئة السيدة نرمين عثمان حسن / عضو لجنة تنفيذ المادة (١٤٠) من الدستور
الدكتور محسن إحسان السليفاني / وزير في حكومة إقليم كردستان / عضو في اللجنة
الدكتورة حنان سعيد محسن الفتلاوي / ممثلة مكتب رئيس الوزراء / عضو في اللجنة
السيد أحمد علي محسن الخفاجي / وكيل وزارة الداخلية لشؤون القوى الساندة / عضو في اللجنة
السيد محمد خليل نصيف الجبوري / عضو مجلس محافظة كركوك / عضو في اللجنة
السيد تحسين محمد علي كهيه / عضو مجلس محافظة كركوك / عضو في اللجنة
السيد بابكر صديق أحمد / عضو مجلس محافظة كركوك / عضو في اللجنة
السيد آشور يلدا بنيامين / محامي / محافظة كركوك / عضو في اللجنة
السيد سالار عبد الكريم عبد الجبار الشيخ / سكرتير عام اللجنة
السيد عزيز هاشم ثابت / رديف السيد أحمد علي محسن الخفاجي

م / **شكر وتقدير**

السلام عليكم ورحمة الله وبركاته

تثميناً لجهودكم المخلصة في عملكم في لجنة تنفيذ المادة (١٤٠) من الدستور ، نقدم لكم شكرنا وتقديرنا ، آملين منكم المزيد من العطاء خدمةً لشعبنا وبلدنا.

نوري كامل المالكي
رئيس الوزراء
/٤/٢٠١٠

صورة عنه إلى /
- مكتب رئيس الوزراء
- وزارة الداخلية – مكتب الوزير
- وزارة البيئة – مكتب الوزير
- حكومة إقليم كردستان
- مجلس محافظة كركوك
- محافظة كركوك – مكتب المحافظ
- الأمانة العامة لمجلس الوزراء – مكتب الأمين

للعلم ... مع التقدير.

- لجنة تنفيذ المادة (١٤٠) من دستور جمهورية العراق / مذكرتكم (١٢٥) في ٢٠١٠/٤/١ / للعلم ... مع التقدير.
- برمجة الدائرة
- إضبارة الشكرات
- إضبارة الكتب الصادرة

ح/١٩٠٩

Politicalpartiesandorganizations in HDK, neitherhavingtorelinquishnortoimposetheircorporateidentitiesuponotherconstituens of theCongress, havemutuallydeveloped a uniqueidentityandcollective form of existenceunderitsexpandedroof.Fortifiedwiththeparticipation of independantandvoluntaryindividuals, foundation of theCongress has created a significantlyeffectivesocialstrugglefront, bringingtogetherforthefirst time in a consistentstructure, KurdishandTurkishpeoplesalongwithallotheroppressedsections of thesociety.Youthandwomenactupontheirowninitiativesandareorganized in Youth Assembly andWomen Assembly wheretheyfreelydiscussissuesdeterminedbyparticipants in localand general assemblies, as well as takingindependantdecisionsforyouthandwomen.

Whilecoordinatingallorganizationalproceduresandpoliticaldecisionmakingthroughthe General Assembly **consisting of 121 peoplemost of** whomareelectedandExecutive Board **consisting of 25 people 6 of** whomconstitutethe Assembly Council, HDK alsofocuses on specificissuesandproposesconcreteactionmindingtheinterest of thepeoplesthroughvariousCommissionssuch **as** Human Rights, Labour, **International Solidarity, Ecology, PeoplesandFaiths**. **Education, OccupationalHealthandSafety. Allmentionedlocalandcentralbodiesworkwith 50% genderquotaforwomen, In whicheffortscontinue** not **onlytocomplywiththespecifiedpercentage but alsotoincrease it.**

HDK finds **it an** essentialtasktoblossomandmaturedemocracywithinitsownstructure. TheCongress, strivingtoraisedemocracythroughstrugglesconducted **in** specificfields **in thelocals, basesitsorganizationalstructure on** community, districtandprovinceassembliesanddevelopesactivities, eventsandprojectscorrespondingtolocalandpoliticalneedsviacommissionsconstitutedwithintheseassemblies.

---

*(*)TheLabour, FreedomandDemocracyBlockestablishedpriortonationalelections,ranwith 61 independentcandidates in* ***39*** *provinces, 36 of whomwereelectedas Member of Parliment of theTurkish* ***Grand National Assembly***.

HALKLARIN DEMOKRATİK KONGRESİ

www.halklarindemokratikkongresi.org

## PEOPLES' DEMOCRATIC CONGRESS (HDK)

Inspiredwiththesuccess of 'Labour, FreedomandDemocracyBlock' in theJune 2011elections(*) in Turkey, Peoples' DemocraticCongress (HDK) wasfounded on 16th November 2011, withcongregation of numeroussocialistandrevolutionarypoliticalparties, trade-unions, NGOs, intellectuals, humanrightsdefendersandindependantindividuals,withtheobjectiveto put intopractice a newpoliticalperspective.HDK adoptstheconcept ofmakingpoliticsfor-and-withthepeoples in perspectivewith "democraticsociety, freeindividualsandecologic life".Labour, peace, justice, freedomandequalityarethefundamentalpoliticalvaluespursuedby HDK.

HDK,whichequallyembracesculturesandfaiths of allpeoples of Mesopotamiaand Anatolia, a diversepattern of ethnicitiessuch as Turkish, Kurdish, Arab, Laz, Georgian, Assyrian, Armenian,Greek, Gypsy, Caucasian, Abkhasian,considersone of itsforemostobjectivetodefendequalityandfreedomforallpeoples, sustainability of existinglanguagesandcultures,freedom of conscienceandfaith. HDK is thenewface of theoppositionfrontinTurkey, defendingtherights of labourersagainstcapitalists, womenagainstmale-dominatedsocietyandoppression, Alawitesandnon-MuslimsagainstSunnimajority'soppression, LGBT individualsagainsthomophobicmindset, Kurdishpeopleandallpeoplesagainstchauvinistturkishnationalism.

HDK regards as itsdutytodefendtherights of alltheliving in Nature, providingsanitaryanddurabledwellingsforeveryone, creatingpublicawareness on children'srights, abolishingalltheobstacles on freedom of creatingforwritersandartists,establishinghealthylivingandworkingconditionsfor thedisabled, providingfreehealthandeducationservices in mothertongue, institutionalisingdemocraticautonomouseducationsystem. Not confiningpoliticstoremonstrantstand, HDK considersamongitspurpose of existancetointerfereimmediatelyandeffectivelytheunrighteouspoliciesof thegovernmentandthestate. HDK is a dynamicorganization, promotingeffectivesolutions on crucialissues of TurkeyandMiddle East such as theKurdishQuestionanddemocratization, unemployment, ecological life, culturalpluralizm. HDK pursuesandraisestheopinion of thegrassroots on allplatforms, implementingpoliticsfromstreetstoParlimentandvice a versa.



iletisim@halklarindemokratikkongresi.org

Congress of the United States
House of Representatives
Washington, D.C. 20515

Kay Granger
Twelfth District, Texas

April 19, 2005

Narmin Othman
Minister of Women's Affairs
Baghdad, Iraq

**Dear Minister Othman:**

**It was a pleasure seeing you again at the Iraqi Women's Leadership Conference in Jordan. I always enjoy spending time with you and I believe the conference was a great success.**

**I am writing to thank you for the beautiful scarf you gave me. The hand painting done by Muna Al-Kateeb on the scarf is one of a kind. It is a special memory of a wonderful trip – and a new friend!**

**Thanks again and I look forward to working with you in the future.**

**Sincerely,**

Kay Granger
Member of Congress

THE CHIEF OF PROTOCOL
WASHINGTON

April 22, 2005

**Mr. Jeffrey:**

On behalf of President Bush, I am pleased to forward several photographs taken during the President's meeting with Iraqi & Afghan Women Ministers on March 9, 2005. These photos, taken in the Oval Office, include a signed photo for Dr. Narmin Othman, Minister of Women's Affairs in Iraq.

**I thought you might want to take the opportunity to deliver these photographs personally to Dr. Othman.**

**Best personal regards.**

**Sincerely,**

**Donald Burnham Ensenat**
**Ambassador**

Mr. James F. Jeffrey
Charge' d'Affaires
American Embassy
Baghdad

